11

.عەلی وەردی

# خەونەکان لەنێوان زانست و بیرو باوەڕدا




و. عەبدوڵلا جبار

ئەندامی کارای سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی کوردستان

ئەندامی فیدراسیۆنی ڕۆژنامەنوسانی جیهان



چاپی یەکەم

٢٠٠٥

# خەونەکان
# لە نێوان زانست و ئایدۆلۆژیا دا

**لێکۆڵینەوەیەکە**

سەبارەت بە کاریگەرییەکانی خەون لە بیر و باوەڕ و نەریتی خەڵکی و ئەو بیردۆزانەی کە زانستی نوێ لەم بارەوە پێی گەیشتوە


نوسینی: دکتۆر عەلی وەردی

گۆڕینی بۆ کوردی: عبداللە جبار (مەشخەڵ کەوڵۆسی)

ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنوسانی کوردستان

ئەندامی فیدراسیۆنی رۆژنامەنوسانی جیهانی



سلێمانی ـــــــــــــــــــــــــــ ٢٠٠٥

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : خەوتەکان لەنێوان زانست و بیروو باوەڕدا

بابەت : لێکۆڵینوە

نوسینی : د/ عەلی وەردی

گۆڕینی بۆکوردی : عبدالله جبار

تایپ : شێرزاد موکریانی

شوێنی چاپ : چاپەمەنی گەنج

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم

ساڵی چاپ : ٢٠٠٥

تیراژ : (١٠٠٠ ) دانە

ژمارەی سپاردن: ( ٢٢٧ ) ساڵی٢٠٠٥ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

# پێڕست

## دەروازەی سێیەم

زانست و دیاردە نائاسییەکانی خەون



## پاشکۆکان

## (پێش دەستی پاچڤەکار)

ئەمرۆ باری ڕۆشنبیری و کەلتوری گەلی کورد بە قۆناغی دروست بوون و فۆرمەلە بووندا تێدەپەڕێت ، هێشتر (ڕۆشنبیریی کوردی ) ئەدگار و خەسڵەتەکانی ئاشکرانین ••• زۆرێك ڕوتەن و، لێرەوارو ، ئاوێژەو، زورگەن و ، کەژو ، کێف ماون کە ڕوناکبیری کورد تا هەنوکەش خۆی لەقەرەیان نەداوە و هەڵوێستەی لە ئاقاریاندا نەکردووە ، چ جای ئەوەی تێگەیشتنێکی تۆکمەی هەبێت لەسەریان ، گەر هەشی بێت نا توانێت ئەو تێگەشتنە بگوازێتەوە بۆ نێو ئاوەزی تاکی کوردی، چونکە زۆر جار بابای ڕۆشنبیر بۆ خۆیشی یان توخنی (پرس) ەکە نەکەوتووە ، یاخود هێشتا ماویەتی تێگەشتنێکی تۆکمەی لە ئاقاردا گەڵاڵە بکات •

هەر بەم پێودانگە دەتوانین بێژین : (کتێبخانەی کوردی ) یش ، هەرچەندە هەنگاوی باشی بریوە بەڵام لەزۆر ڕووەوە هەژاری و نەداری ( و فرە جاریش لاساری ، بەتایبەت کەدەبینین شەپۆلێ کتێب و ناملیکەی کوردی بێ ئەرزشی زانستی و ڕۆشنبیری چاپ دەکرێن و دەخرێنە سەر شۆستە و جادە کانمان !!) پێوە دیارە ••• ئینجا پڕکردنەوەی ئەو ئاتاجەش ئەرکی هەموانە و تەنها کاڵای باڵای بژاردە و کۆمەڵە کەسانێکی تایبەت نیە ، ئەمەش بەو واتایەی کە کار کردن لە کایە کەلتوریەکاندا ئەوەندەی ئەرك و بەر پرسیاریە ، نیو ئەوەندە ئیمتیاز و دەستکەوت نیە ، هەر بۆیە دەبینین شەقامەکانی بازێڕی ڕۆشنبیریمان چۆڵ و هۆڵن و تاك وتەرا خەڵکیان تێدا دەبینرێت •

هۆکاری خامۆشیو کرو کپی شەقامی ڕۆشنبیریمان ڕەنگە لەم دوو خاڵە دا قەتیس ببێت :

١- لە بنەڕەتەوە بوارە ڕوناکبیری و کەلتوریەکەمان هێندە بەر تەسك و کەم مەودایە ڕێگە نادات ڕێبوارەکانی نێوی ، وەك ئەوەی هەن خۆیان نمایش بکەن •••

بە دەربڕینێکی دیکە : بوارە ڕوناکبیریەکەمان هێشتر کۆربەیە !! بەم پێ یە کەم وکوری و ناتەواوی زۆریشی تێدا بەدی دەکرێ ، هەم لە ڕووی خودی بوارە کەوە و هەم لە ڕووی کارەکتەرەکانی ناویەوە •

٢- زۆر بەداخەوە کۆمەڵگەی کوردی ، ئەوەندەی ڕێز و حورمەتی چەقۆکێش و پیاوە قۆشمەکانی لەلایەو دەیان نرخێنێ ، ئەوەندەی پیاوی دەوڵەمەند و موتریفی تێدا سەنگینە ، نیو ئەوەندە نگینەکانی فیکر و زاری ڕۆشنبیرانی لا بەبایەخ نیە ؟! ••• حیزبەکانی کوردستان و دەستەڵاتی کوردییش لەم ڕووەوە هیچیان کەمتر نیە لە کۆمەڵگەی کوردی ، هەر دەبی واش بێ ! چونکە خۆ دەستەڵاتی کوردی لە بۆشایی ئاسمانەوە نەهاتووە ، ئەدی هەر کوڕی نێو کۆمەڵانی خەڵك نیە ؟•

لە نێو کۆمەڵگەی کوردی ولەژێر سایە وساباتی دەستەڵاتی کوردی دا ، تەنانەت نوسەر و ڕۆشنبیرە مەزنەکانیشمان ( ئەگەر هەبن !!) نابێ چاوەڕوان بن ڕۆژێك لە ڕۆژان بە چاوی ڕێزەوە لە کۆمەڵگەدا سەیر بکرێن ••• بەڵکو ئەبێت هەمیشە چاوەڕوان بن تاکو لە ژیاندان بکرێنە دەرەوەی کۆمەڵگەوە ( کەنگێ بابای

ڕۆشنبیری ڕوت و ڕەجاڵ هاوشانی پیاوە بەرز و دراو لەمشت و چەك لەپشتەکان دەبێ ؟ ) بۆیە دەبێ چاوەڕوان بن لە بری ئەوەی پاداشت بکرێن ، باجی زمان درێژی و ڕەخنە گرتن و چاو تیژیەکەیان بدەن ، چونکە توانیویان ناتەواو یەکانی کۆمەڵگە و دەستەڵات ببینن !!•

وەلێ ئەفسوس ! کەنوسەرە گەورەکانمان دەمرن و عومری درێژ بۆ پیاوە دەبەنگەکان بە جێ دێڵن ، ئەوجا هەزار خاوەنیان بۆ دروست دەبێت ••• یەکێك پەیکەرێکی بۆ دەتاشێ ، ئەوی تر دێت پارکێ یان شەقام وشارێیەکی بە ناوەوە ناو زەد دەکات •••• هتد !!•

ئەدی هەیاران ، ئەمە کوشندە ترین پەتا نیە لەنێو ئەقلیەتی جەماعی کوردی دا؟ ئەمە سەقەت ترین تێرامان نیە لە ڕۆڵ ونرخی ڕۆشنبیران ؟؟ ئەمە بەهێزترین فاکتەر نیە بۆ وەی خەڵکی لە بوارە ڕۆشنبیریەکان دوربکەونەوە و ، شەقام و تولە ڕێکانی بازێری ڕۆشنبیریمان چۆڵتر بکەن ؟•

*** *** ***

ئەمە حاڵ وباڵی پانتایە ڕۆشنبیریەکەمانە و ، لە نێو ئاوا بارو دۆخێکدا پەڕاوگەیەکمان بنیات ناوە ، و ناونراوە ( کتێبخانەی کوردی) ! کەهێشتر زۆرێك لە ڕەفەکانی بەتاڵ و خاڵین و چاوەڕوانن بە بەرهەمی بەهێز پڕبکرێنەوە •• لەم کاتەشدا پتر لەهەر ساتێکی کە پێویستە بە بابەت و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی هەمەجۆر و پڕ بایەخ کتێبخانەکەمان پڕبکەینەوە •

*** *** ***

ئەم پەرتوکەی هەنوکە لە بەردەست و دیدی خوێنەرانی بەرێزدایە ، یەکێکی ترە لە هەوڵ و کۆششە زانستی یەکانی مامۆستا( دکتۆر عەلی وەردی) ••• لەم لێکۆڵینەوەیەدا ( د• وەردی) توانیویەتی هەڵکورمان و هەڵوێستەیەکی قوڵ وکاریگەر بکات لەگەڵ ( خەون ) دا ••• چ لەڕووی زانستی یەوە یان لەڕووی کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانی خەونەوە •

من بۆ خۆم کاتێ پەرتوکەکەم خۆندەوە و لە تەکیدا ژیام ، هەستم کرد پێویستە ئەرکی بە کوردی کردنی لە ئەستۆ بگرم ، چونکە بەڕاستی وەرچەرخانێکی نوعی دروست دەکات لە تێگەشتنی دیاردەی ( خەون ) دا ، سەرباری ئەوەش هێشتر ئەم پەرتوکە سەنگینە نەکراوەتە کوردی ، کە دەبوا بەر لە چەندین ساڵ بە کوردی کرابا ، وەلێ ئێستاکەش نەچوە بچێ !! بالە ئیستەوە بکرێتە جوانترین مەدالیا و بیکەین بەبەرۆکی پەڕاوگەی کوردی •

هەر چەندە نامەوێت لێرەدا خوێندنەوەیەکی کورتی کتێبەکە بکەم ، یاخود (دکتۆر عەلی وەردی) بە ئێوەی بەڕێز بناسێنم ، چونکە یم وایە ئەو زۆر لەمێژە لای هەموان ناسراوە•• بەڵام ئەوەندە دەڵێم : پەڕاوەکە بەهایەکی زانستی و ڕۆشنبیری گەورەی هەیە و، لەکاتی خوێندنەوەشی دا پتر بەنێو دەریا فراوانەکەی ( د• وەردی) دا ڕۆدەچین و ، پەی بەزۆرێك لەو نهێنیانە دەبەین کەلە بابەتی خەون و کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانیەوە لەلامان شاردراوەبوون ••• وەلێ با لێگەڕێین لێکۆڵینەوەکە خۆی نمایشی خۆی بکات •

*** *** ***

بەر لەوە ی کۆتایی بەم پێش دەستی‌یە کورتە بێنم ، حەز دەکەم ئاماژەیەك بدەم بەو ورتکە رەخنانەی کەلەدوای چاپکردنی پەرتوکی ( واعیزەکانی سوڵتان ) ئاراستەی من ( وەکو وەرگێڕی کتێبەکە ) کرابوو ••• نەخاسمە ئەو برادەرەی کەلە رۆژنامەی (ڕێگای کوردستان ) دا لە گۆشەی (بێژن ) دا بەتوانجەوە نوسیبووی :( یەژن برادەرێ پەرتوکێکی عەلی وەردی وەرگێڕاوە و لەبەرانبەر "صاحب الشوکە " دا " خاوەنی دڕك " ی بەکار هێناوە ) •

مەبەستی لەوەیە : من لەبەرانبەر واژەی " صاحب الشوکە" ی تێکستە عارەویەکەدا ، واژەی " خاوەنی دڕك " م وەکار بردووە ، ئەو برادەرەشمان ئەو تەرزە بەکار هێنان و پاچڤە کردنەی بە هەڵەو ناتەواو داوەتە قەڵەم !! بۆیە بە شانازیەکی زۆرەوە ( وەك هەنگی لە گوێزدا دیبێتەوە ) لە ڕۆژنامەکەی دا ئاماژەیەکی گاڵتە جاڕیانەی پێ دابوو ••• هەنووکە منیش دەخوازم زۆر بە کورتی لە وەڵامی ئەو برادەرە دا بێژم :

١- من خۆم بە خاوەنی ئەو وەرگێڕانە دەزانم و شانازیشی پێوە دەکەم •

٢- گرفتی هەندێ لە ڕۆشنبیرەکانی لای ئێمە ، ئەوەیە ڕەخنە دەگرن ،بەڵام بێ ئەوەی بزانن ڕەخنە لەچی دەگرن و ، قوڵ بوونەوەی پێویستیان هەبێت لە بابەتەکەدا••• بەدەربڕینێکی تر: هەندێ لەو بەڕێزانە تەنها بۆ خۆدەرخستن و " ئیسپات وجود " لە ڕۆژنامەکاندا دەنوسن ، نەك لە خەمی پرۆسە ڕۆشنبیریەکەدا بن ( ئەدی سەرێ لەنێو سەراندا نەبێت بۆ بڕین نەبێ بۆ چی باشە ؟ - وەك کورد دەڵێت ) !! هەر بۆیە زۆر جار نوسینەکانیان تەنها دێڕ ڕەش کردنەوەیە بێ ئەوەی پەیامێکیان هەبێت •••

٣- ئەبێ ئەو برادەرەمان بزانێت ، هەر ووشەیەك پێك دێت لە دووبەش ( فۆرم + ناوەڕۆك) بۆیە من کاتێ "صاحب الشوکە" م کردۆتە "خاوەنی دڕك " گەر تەنها لەم ڕووەشەوە سەیربکرێت ، واتە لەڕووی فۆرمی وشەکەوە سەدا سەد مەبەستم پێکاوە و ، هیچ زمان زانێکیش ناتوانێت بڵێت: وانیە !!

٤- نوسەر کەدەڵێت : "صاحب الشوکە" مەبەستی لە کەسێکی بەدەستەڵات وستەم کارو زۆردارە ( ئەمە مانا " ئیستلاحی" یەکەی ئەو وشەیە ) ئەو برادەرەش پێی باش بوە منیش بەو شێوەیەم وەربگێڕایە ••• بەڵام من وەکو کوردێك لەکاتێکدا مامەڵە لەگەڵ دەقێکی بێگانەدا دەکەم وئەمەوێت بیکەمە کوردی ، سەربەستم لەوەدا بەهەرکام لە دیالێکتە کوردیەکان وەری بگێرم ، مادامێك ئەو وشەیەی بەکاری دێنم لە تۆشەدانی فەرهەنگی کوردی دا جێگەی دەبێتەوە و کوردیش لێی حاڵی دەبن •• لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕونکردنەوەیەدا ، بە برادەرەکەی ( ڕێگای کوردستان ) دەڵێم : لە بناری سورێن و حەوزەی شارەزووردا بەهەرکەسێك گوترا: " فلان کەس دڕکی هەیە " ، مەبەستیان لەوەیە: " زۆردارە و توند وتیژی ودەستەڵات و توانای هەیە " ••• من بەزمانی خەڵکی دەڤەری شارەزوور ئەو وشەیەم وەرگێڕاوە " واش دەزانم کارێکی خراپ و یاساغم نەکردبێت ! " ئیدی گوناهی، من یان خەڵکی دەڤەری شارەزوور چی یە، کە برادەرێکی

ڕەخنەگرو زمان زانمان لەو دیالێکتە کوردیە تێ نەگات ؟! ئەو برادەرەمان دەتوانێت بچێتە شارەزوور و لەهەر کوردێك بپرسێ : " فلان کەس دڕکی هەیە ، یانی چی ؟" دەست بەجێ وەڵامی دەدەنەوە :" مانای ئەوەیە زەبر و زەنگ و دەسەلاتی هەیە " جانازانم ئێستا ئەو برادەرەمان قەناعەت دەکات یاخود زەحمەتی سەفەرێك بۆ دەڤەری شارەزوور دەخاتە بەر خۆی ؟!•

لە کۆتایی دا بەو برادەرە دەڵێم : بەڕێزت مەحکومیت بەوەی زیاتر بخوێنیتەوە و ، شارەزایی لە لەهجە ناوچەییەکانی زمانی کوردیدا پەیدا بکەیت ، نەك ئێمە ومانان ناچار بین بەوەی لەبەر ئارەزوو و ئاستی تێگەشتنی بەڕێزتان دەست بەرداری ووشە ڕەسەنەکانمان بین !!•

*** *** ***

ماوەتەوە بڵێم : هەندی لەو دەستەواژەو شێوازە نوسین و زاراوانەی لەم پەرتوکەدا بەکارهاتوون ، مامۆستا ( عەلی وەردی ) بە شێوازی تایبەتی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا کردوون ، تەنانەت ڕەنگە هەندێ لە ناوزەد کردنەکان تەنها مڵکی ( د• وەردی) بن ••• بەندەش لەو ڕوانگەیەوە ، هەندێ جار ناچاربووم مامەڵەیەکی ( حەرفی ) ڕووت لەگەڵ ناوزەد کردنەکاندا بکەم ، هەرچەندە هەوڵیشم داوە تاڕادەیەکی زۆر ناوزەد کردنەکان هەم نزیك بن لە تێگەشتنی خوێنەری کوردەوە و ، هەم بە بابەتەکەشەوە گرێ بدرێت و لە بازنەی مەبەستەکەی نوسەر دەرنەچێت •

بۆنمونە: مامۆستا (وەردی) ئاماژە بەیەکێك لە قوتابخانە فەلسەفیەکان دەکات وناوی دەنێت(لاادریین ) ئینجا من لە ئاقاری ئەم وشەیەدا لەوڕێگەیە زیاترم پێ شك نەهات کەبە ( نازانمیەکان ) وەری بگێرم ، واتە ناچار بوم مامەڵە لەگەڵ (فۆرم )ی وشەکەدا بکەم ، چونکە هەرچەند سەرنجم دەدا لەگەڵ مەبەستەکەی مامۆستادا وێك دەهاتەوە ، جگە لەوەش هەقە دان بەو ڕاستی یەدا بنێم کەلەوشێوازە دەربڕینە جوانترم شك نەبردا!!•

ئیتر نازانم لەگۆشەی کام ڕۆژنامەدا بابایەکی تر دێت و بەمەرەدی "صاحب الشوکە" کەی لەمەڕ واعیزەکانی سوڵتان "سەر پێیی یانە توانجمان ئاراستە دەکاتەوە ؟؟ •

لەو توانجە سەر پێ یانەش بترازێ ، ئیدی شادومانم بە خستنە ڕوو و پێشکەش کردنی ڕەخنە بابەتی و زانستی و قوڵەکانتان ، وەك دیاریەکی سەنگین و خەڵاتێکی بەنگین ••• تاکو لەچاپەکانی داهاتوودا کەڵکی لێ وەربگرم•

سەربارى ئەم ڕازانەش، خوازیارم ڕۆشنبیران و خوێنەرانی کورد ، ئەم هەوڵەم وەك دیاریەکی بچوك لێ قبوڵ بفەرموون ( ئاخەر دیاری شوان یان شنگە یان هەڵەکۆك ) ••• هیوادارم توانیبێتم ڕازەیەکم بە خوێنەرانی کورد و پەراوگەی کوردی کردبێ ••

عەبدووڵا جەبار شەمسەدین (مەشخەڵ کەوڵۆسی)

mashxalkaulusy @yahoo.com abdula_m@hotmail.com
mob- 07301121586 tel - 0538840167

# پێشەکی

## پەیڤێ کە دەبێ بگوترێ

ئەم پەرتوکەی هەنوکە لە بەردەستی خوێنەراندایە چیرۆکێکی هەیە کە لە کۆمیدیا خالّی نیە، لە مانگی نیسانی سالّی ١٩٥٧ دا دەستم بە چاپکردنی ئەم پەرتوکە کرد، وا بڕیار بوو لە هاوینی هەمان سالّدا کۆتایی بە چاپکردنی بێت، هەر بۆیە چەندین جار لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا باسم لە وادەی نزیکی دەرچونی پەرتوکەکە کرد.

پەرتوکەکە وەك خوێنەر دەبینێت دابەشکراوە بۆ سێ بەش، هێشتر چاپخانە لە چاپکردنی دوو بەشی سەرەتا نەبووبوویەوە کە داوام لێکرد چاپکردنی رابگرێت، و دوای بخات و ئەو بەشانەش کە چاپکراون لەسەر ڕەفەکان دابنێت .. چاپخانەش بێئەوەی بزانێت هۆکاری ئەم داوایەم چییە، بە قسەمیان کرد ... ئیدی پەڕە و بەشە چاپکراوەکانی پەرتوکەکە لە نێو گەنجینەی چاپخانەکەدا پەیتا پەیتا تەپ و تۆزی لەسەر دەنیشت و تیشکی خۆر لێی دەدا و دەی پورتوکاند.

بەم باسە نامەوێ بانگەشەی ئازایەتی و پالّەوانێتی بۆ خۆم بکەم،یاخود وا نیشان بدەم کە پەرتوکەکە دژایەتیەکی ئاشکرای ڕژێمی رامیاری پێشووی تێدایە ... لەراستی دا کتێوەکەم خالّیە لە هەر جۆرە دژایەتیەکی بەو شێوەیە ... خوێنەریش هەر کە پەرتوکەکەی خوێندەوە راستی گوتەکەمی بۆ دەردەکەوێت ... وەلێ دواخستنی چاپکردنەکەی بۆ وە دەگەرێتەوە کە هاورێیەکم ئامۆژگاریەکی کردم و باسی شتێکی کرد کە من لە بەردا هەستم پێ نەکردبوو.

لە کۆتاییەکانی سەردەمی پێشودا، نەریتم وابوو کتێبێکم چاپ و بلاو نەدەکردەوە بۆ خەلّکی، دوای ئەوە نەبێت کە ئەم خستنە بەر دەستی هەندێك لەو هاوەلّ و برادەرانەی کە دەرك بە ناواخنی شتەکان دەکەن و سەریان لەسیاسەت دەرئەچێ ...

ئنجا گوێشم بۆ ئامۆژگاریەکانیان دەگرت تاکو نەگلێم لە گرفتێکەوە کە هیچ پێویستیەکم پێی نیە، یان خۆم وەردەم لە بابەتێك بەهۆیەوە توند بکرێم لەبەندیخانە.

ڕۆشتم بۆ لای هاوەڵێکم و بابەتەکانی ئەم کتێوەم خستە بەر دەستی، سەیرێکی کرد و ئنجا برۆکانی بەرز کردەوە و زەردەخەنەیەکی نائومێدی لەسەر لێوی بوو، گووتی: براکەم! ئامۆژگاریت دەکەم کە لەم کاتەدا ئەم پەرتوکە بڵاو نەکەیتەوە.

لەم ئامۆژگاریەی هاوڕێکەم سەرسام بووم، چونکە دڵنیا بووم لەوەی پەڕاوەکە باسی (خەون) دەکات و هیچ فرێکی بەسیاسەتەوە نیە، نە لە دوور و نەلە نزیك ... لە راستیش دا لە نێو هەموو پەڕاوە چاپکراوەکانم دا کەمترین سیخورمە و گەستنی تێدایە...

بەڵام هاوڕێکەم دەربارەی کتێبەکەم گوتی راستەوخۆ هەستی بنەماڵەی دەستەڵاتدار و خێزانی پاشایەتی بریندار دەکات، چونکە بە پەنامەکی توخنی (چینی شەریفان)[1] دەکەوێت کە وەچەی پێغەمبەرن ... ئەم توخن کەوتنەش پادشا و خزمەکانی تورە دەکات، چونکە ئەمان لە حوکم کردن دا (وەك خۆیان بڕوایان پێیەتی) پشتیان بەستوە بەو مافەیان کە بە میراتی بۆیان ماوەتەوە بەو پێیەی کە لە (ئەهل و بەیتی) پاکی پێغەمبەرن.

هاوڕێکەم گەشتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەوان ئارام دەگرن لەسەر رەخنەیەك کە ئاراستەی سیاسەتی وەزیرەکان یاخود فەرمانبەرەکانیان بکرێ، بەڵام ئارام ناگرن لە کاتێك دا رەخنە ئاراستەی بنەماڵەی پادشا یا خود ئەو هێزە پەنامەکیە بکرێت کە لە پشتی پەردەوە یارمەتییان دەدات ... بنەماڵەی پادشا بە جەفەنگ و دروشمی رژێم دادەنرێن، جا ڕەخنەگرتنیش لەو جەفەنگە لە دیدی واندا گەورەترین و درێوترین تاوانە کەمرۆڤ لەم وڵاتە دا بیکات ... وەك بانگەشەیەکیشە بۆ ڕماندنی ئەو بناغەیەی کە قەوارەی رژێمەکەی لەسەر بنیات نراوە.

هێشتر ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم هەڤپەیڤینەی من و هاوڕێکەم دا گوزەری نەکردبوو، کە لە عێراق و لوبنان و ئوردون دا، هەرایەك بەرپاکرا، لەبەرانبەر وتارێك دا کە نوسەرێکی میسری بڵاوی کردبویەوە و تیای دا ئاماژەی دابوو بەوەی کە ئیسلام

یاساوڵ و داربەدەستەکانی سەردەمی رابردوو ئەم هەلەیان قۆستەوە و دەهاتن و دەچوون و هەر مل نەدانێك بە فەزڵ و پلە وپایەی نەژادی (شریف)یان بەدەرچوون لە ئاین دەدایە قەڵەم.

ئەز لەم هەرایە دا جارێکی‌تر هۆکارێکی جیدیم بینی کەهانی دام بڵاوکردنەوەی ئەم پەڕاوە دوا بخەم ... گەر بهاتبا و ئەم پەرتوکەم لەکاتی هەراکەدا چاپ بکردایە ئەوا هەندێك لە خەڵەتاوەكان دوودڵ نەدەبوون لەوەی لەبەر خاتری خوا بمکوژن، وەك ئەوەی کە هەوڵیان دا لە دوای چاپکردنی پەرتوکی (واعیزەکانی سوڵتان) دەرهەقم بیکەن.

لێرەدا دەمەوێت سەرنجی خوێنەر رابکێشم بۆ لای ئەوەی کە من لەم پەرتوکەدا هەوڵم نەداوە لە پلە و پایەی (ئەهل بەیت) بێنمە خوارێ، چونکە من خۆم یەکێکم لەوانەی بڕوایان بە فەزڵ و رێزی (ئەهل بەیت)ی پێغەمبەر (د.خ) هەیە ... تەنانەت لە هەندێ لە پەرتوکەکانی پێشوم دا باسم لە شوێنەواری چاکی ئەوان لە ئیسلام دا کردوە.

بەڵام گەر ئێمە (ئەهل بەیت) بە پیرۆز بزانین تەنها پشت بە نەژاد نابەستین، چونکە نەسەب لای خودا چ نیە ... وەك زانراوە ئیسلامیش یەکسانی خستە نێوان گەورەیەکی قورەیشی و کۆیلەیەکی حەبەشی.

لە ئیسلام دا پێوەری رێز و پلە و پایە کردەوەی چاکە، وەڵێ ئەو سەیدەی کە کردەوەی بەد دەکات و ستەم لە خەڵکی دەکات لای خودا نەژادەکەی شفاعەتی بۆ ناکات کە لەوەچەی پێغەمبەرە ... لە پێغەمبەریش گێڕدراوەتەوە کە دەرهەق بە ئەهل و بەیتی خۆی فەرموویەتی (إنی لااغنی عنکم من الله شیئا)!

ئەهل و بەیت لەسەرەتای ئیسلام دا بۆیە پلە و پایەی بەرزیان هەبوو، چونکە تێکۆشەر و شۆڕشگێڕ بون و ماڵ و گیانی خۆیان بەخشی لە پێناوی قەڵاچۆکردنی ستەم دا،وەڵێ ئەوانەیان کە لایەنگری ستەم کاران بوون، موسڵمانە یەکەمینەکان بە سوك سەیریان دەکردن، وەك چۆن هەر کەسێکی‌تری لایەنگری ستەم کارانیان بە سوك و بێ‌ئەرزش سەیر دەکرد.

پێغەمبەر، دژایەتی ئەو چینەی دەكرد كە بەهۆی نەژادیانەوە خۆیان لە خەڵكی بە بەرزتر دەزانی ... بۆیە ناچێتە عەقڵەوە پێغەمبەر لە وەچەكانی خۆی چینێك دروست بكات جێگەی ئەو چینە بگرێتەوە (كە خۆی لەناوی برد)... لەم ڕووەوە ملەجەڕی ئەوە ناكەم كە پێغەمبەری ئامۆژگاری نەتەوەكەی كردبێت تا بەچاكی و جوانی لە گەڵ وەچەكانی دا بجوڵێنەوە ... بەڵام ئەمە یانی نە كە لە ئەهل و بەیتەكەی چینێك پەیدا ببێت كە بە باڵایی تاهەتایە بمێنێتەوە.

پێغەمبەر (د.خ) بۆیە ئامۆژگاری بەچاكی جوڵانەوەی كرد لە گەڵ وەچەكانی دا، چونكە بە چاو تیژی خۆی دەیزانی، كە هەندێ لەوانەی كە دژن بە خۆی! لە دوای مردنی تۆڵە لە وەچەكانی دەكەنەوە، وەك نەفامەكان كە بەرانبەر دوژمنەكانیان دەیكەن ... لە بەر هەمان هۆكاریش ئامۆژگاری خەڵكی كردوە لە گەڵ پشتیوان (ئەنسار)ەكان دا بەچاكی بجوڵێنەوە. خوداش زاناترە.

*** *** ***

ڕەنگە یەكێك لێم بپرسێت: جا چ پەیوەندیەك هەیە لە نێوان ئەم كتێبە دا كە لە خەون دەدوێت لە گەڵ مەسەلەی سەیدەكان و ئەهلی بەیت دا؟

ڕاستیەك كە شیاوە خوێنەر بەر لەوەی ئەم پەرتوكە بخوێنێتەوە بیزانێت، ئەوەیە كە من لە بارەی خەونەوە، لەسەر شێوازی زانا دەروونناسەكانی پێشوو نەمنوسیوە، دانیش بەوە دا دەنێم كە من پسپۆڕ نیم لە بابەتی خەون لە ڕوە سایكۆلۆژیەكەیەوە، پسپۆڕێتی بەندە، وەك خوێنەریش دەزانێت، بریتی‌یە لە زانستی كۆمەڵناسیی، وەڵێ هەستم كرد كە (خەون) بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ توخنی بابەتی پسپۆڕێتیەكەم دەكەوێت ... ئەمەش مەسەلەیەكە لە وڵاتە پێشكەوتوو شارستانیەكاندا زانایانی سۆسیۆلۆژی گرنگی پێنادەن ... چونكە ئەوان وا نابینن كە لە وڵاتەكانیان دا خەون پەیوەندی توند و تۆڵی هەبێت بە پرسە كۆمەڵایەتیەكانەوە، ئەمە لە كاتێك دا لە وڵاتەكانی ئێمە دا، بە پێچەوانەیە.

دەتوانم بڵێم: ئێمە لەو نەتەوانەین كە زۆر لە ژێر كاریگەری خەون داین، لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە زۆربەی بیر و باوەڕ و نەریتەكانمان، لە ئەنجامی بە پیرۆزكردنی

خەونەکانمانەوە تیاماندا دروست بون و گەشە و نەش و نمایان کردوە ... هەندێك لە پیاوانی ئاینی لای ئێمە پێیان وایە جاری وا هەیە هەندێك لە خەونەکان دەربڕی سروش (وحی)ن کە نابێت گومان لە ڕاستی و دروستیان بکرێ ... نەخوێندەوارەکانیش لەم ڕووەوە بە دوای پیاوانی ئاینی دا ڕۆشتون، تا ڕادەیەك کاریگەریەکی زۆر خراپی کۆمەڵایەتی لێکەوتۆتەوە.

ئەم بیر و باوەڕە کاتێك تیایاندا زیاتر بنج دادەکوتێ کە لە خەویاندا پێغەمبەر (د.خ) یاخود پێشەوایەکی ئایینی دەبینن و فەرمانێکیان پێ‌دەدەن. ئەمان لەو کاتەدا بڕوایان وایە خەوەکانیان راست و دروستە بۆیە دەبینین هەوڵ دەدەن بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو فەرمانەی پێغەمبەر (د.خ) یان پێشەوا ئاینی‌یەکە لە خەودا پێی گوتون، هەروەکو لەکاتی بێداری دا پێی گوتبن. یەکێك لەو فەرمودانەی کە لەم بارەوە گێڕدراونەتەوە، ئەو فەرموودەیە کە (ئەهلی سوننە) دەیگێڕنەوە و لە پەڕاوەکانیشیان داهاتووە، و دە فەرمێت: (من رآنا فقد رآنا، فان الشیطان لایتکوینی)[٢] واتە "هەر کەس بمان بینێ لە خەودا، ئەوە هەر بەراستی بینیوینی، چونکە شەیتان خۆی ناکات بە ئێمە"، هەر لەم بارەوە شیعەکانیش ئەم فەرمودەی ئاوها لە پێشەواکانیان دەگێڕنەوە. فەرمودەی دیکەی هاوشێوەی ئەم فەرمودەیە بە بەربلاوی لە نێو پەرتوکەکانی فەرمودە دا هەن ... ئەمەش بەلگەیەکە لەسەر ئەوەی هەموو پێڕە ئیسلامیەکان، جگە لە (موعتەزیلە و زەیدیە)، یەکڕان لەسەر ئەوەی هەرچی لە سەر زاری پێغەمبەر و پێشەوایان هاتە دەرێ کاتێ لە خەودا دەبینرێن راست و دروستە ... ئەمەش وایکردووە موسڵمانان هەندێ بیر و بۆچوونی وا وەرگرن کە خودا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەهێناوەتەخوارێ.

یەکێکە لەو بیر و باوەڕانەی بە هۆی خەونەوە تەشەنەی کرد و دروست بوو لە نێو موسڵمانان دا بریتی‌یە لە (بیر و باوەڕی پیرۆزکردنی سەیدەکان "وەچەکانی پێغەمبەر") بە چاوپۆشین لەوەی چ کارێك دەکەن یان چ ئاکارێکیان هەیە.

لە بەشی چوارەمی ئەم پەرتوکە دا چیرۆکی هەندێ لەو خەونانەم باسکردوە، کە تیای دا موسوڵمانێك پێغەمبەر (د.خ) یان فاتیمەی زەهرا، یاخود پێشەوایەکی ئایئی

ئەهل و بەیتی دیوە و، فەرمانی ئەوەیان پێداوە کە ڕێز لە سەیدەکان بگرێت و گوێڕایەڵیان بێت سەرەڕای هیچ و پوچی و ستەم کارییان ... هەندێك لە موسڵمانانیش زۆر بە داخەوە ، ئەم چیرۆکانە دەگێڕنەوە و بڕوایان پێیەتی و بە کرۆکی شەریعەتی ئیسلامیشیان دادەنێن.

خوێنەر لە بەشی چوارەمی ئەم پەرتوکە دا دەبینێت، کەمن بە تایبەتی باسم لەو خەونانە کردووە کە (ئیبن و لحەجەری هەیتەمی) لە کتێبەکەی دا (الصواعق المحرقە) باسی کردوە ... ئەو پەرتوکەی (ئیبن و لحەجەر) بۆ ئێمەی عێراقی گرنگی تایبەتی هەیە ... چونکە ئەو لە کاتێك دا ئەو پەرتوکەی نوسیوە، لە (حیجاز) دا ژیاوە، لە ژێرستەمی بنەماڵەی (هاشمی) دا، ئەو بنەماڵەیە کە ئێمەش بەم دواییانە کەوتینە ژێر ستەمیان و ئەوی چەشتمان بە دەستیانەوە چەشتمان.

وا دیارە (ابن الحجر) یەکێك بوە لە (واعیزەکانی سوڵتان). هەرلە بەر ئەوەش دەبینین لە پەرتوکەکەی دا ستایشی بنەماڵەی هاشمیەکان دەکات و باس لەو خەونانە دەکات کە تیایان دا پێغەمبەر (د.خ) یاخود فاتیمەی کچی بینراون و فەرمانیان بە موسڵمانان کردووە (سەیدەکانیان خۆشبوێت و مل کەچی حوکم و دەستەڵاتیان بن و ڕێزیان بگرن).

**هەندێ ئاکار و بیر و باوەڕ:**

کاریگەری خەون لە سەر موسڵمانان تەنها لەو بوارە دا کورت هەڵناهێنرێ کە لێی دواین ... بەڵکو چەندین بواریتر هەیە کە خەون تیایاندا جێپەنجەی کۆمەڵایەتی گەورەی هەبوە ... لەم کتێبە دا هەندێکیانم باسکردوە و هەندێکیتریشیانم لە دەست چوە و باسم نەکردوە.

لەم ماوەیەی دوایی دا نامیلکەیەکی بچوکم دۆزیەوە پەیوەندیەکی بەم باسەی ئێمەوە هەیە .. نامیلکەکە بریتییە لە ژیاننامەی شێخ (ئەحمەد ئەحسائی) و هەر بە پێنوسی خۆیشی نوسراوە.

زۆرینـەی خوێنـەران شـێخ (ئەحمـەد ئەحسائی) ناناسـن، دیـارە ئـەویش پیاوێکـە شایستەیە خوێنـەران بیناسـن و لێکۆڵینـەوە لـە ئاسـەوارەکانی بکـەن، ئـەم پیـاوە لـە کۆتاییەکانی سەدەی دوانزەی کۆچی دا، گروپێکی ئیسلامی تایبەت بە خۆی دامەزراندوە و شوێنکەوتوانێکی زۆری هەبوە و ئەمڕۆش لە هەندێ ناوچەی عێراق و ئێران دا بڵاو بونەتەوە ... ئەم گروپە بـە زیادەڕەوّیی ناسـراون لـە بەرانبـەر دوانزدە ئیمامەکەدا ... دواتـر هـەر لـەم گروپـەوە، گروپـەکانی (کەشفی و بـابی و بـەهائی و ... هتـد) سـەریان هەڵدا.

کاتێ سەرنج لە ژیاننامەی (شێخ ئەحمەد ئەحسائی) دەدەین، دەبینین زۆربەی بیر و باوەڕە توندەکانی لە خەونەوە وەرگرتوە، پشتیشی بەو فەرمودەیە بەستوە کە دەڵێت: (من رآنا فقد رآنا حقاً ...).

شێخ دەربارەی خۆی دەڵێت: یەکـەمجار لـە خـەودا حەسـەنی کـوڕی عـەلی (سڵاوی خوای لێ بێت)ی بینیوە، داوای لە حەسەن کردوە شتێکی فێر بکات هەر کات حەزی کرد حەسەن یان هەر کەسێکیتر لە خەودا ببینێت، ئەو حەزەی بێتـە دی و لەخـەو دا بیـان بینێت... بۆیـە حەسـەن چـەند کۆپلەیـە هۆنراوەی فێرکـردوە ... دواتـر ئـەو چـەند کۆپلەیە بونە کلیلی گەنجینەیەکی گەورەی زانیاریەکانی شێخ ... چونکە بـە هـۆی ئـەو کۆ پلانەوە توانیویەتی بەپێی پێویستی خۆی هەر ئیمامێکی بوێت لە خەو دا ببینێت.

شـێخ ئەحمـەد بـۆ خـۆی سـەبارەت بـە خەونـەکانی ئاوەهـا دەدوێـت بـە دەق: "لـە ئەنجامدا زۆرینەی پێشەواکانم لە خەو دا دیوە ... تەنانـەت دەڵێم هـەموویان جگـە لـە جەواد - سڵاوی خوای لێبێت - کە گومانم هەیە لە بینـینی - هـەر کامێکیشیانم دیوە بـە دەم داواکاریەکانمەوە هاتون ... چەندینساڵ هەر چیەکم لێ گیر بوبێـت لـە بێـداریم دا ئەوا لە خەون دا چارەکەیم پێ گوتراوە. شتەکانیش هێنـدە زۆرن نـاتوانم بـە تـەواوی و وردی باسیان بکەم ... لەوەش سەیرتر: لە خەون دا بەو شێوەیە دیومن کە لـە بێداریم دا دەمەوێت، بە جۆرێ هەر چی پشتیگیری بەڵگەکانی بکات بۆم دەکرێتـەوە و نیشانم دەدرێت و بەپێچەوانەوە .. ئەگەر تۆش دەتەوێت راستی قسەکانم بزانیت ئەوا سـەرنجی کتێبە (حکمی - فەلسەفی، وەرگێڕ)یەکانم بدە، دەبینی لە زۆربەیان دا و لەزۆرینەی هەرە

زۆری بابەتەکان دا، پێچەوانەم لە گەڵ ڕای فەیلەسوفان دا. لەو لاتر گەر سەرنجی ڕاکانم بدەیت دەبینی هاوتایە لە گەڵ فەرمودەی پێشەوایان دا(سڵاوی خوایان لێ بێت) هیچ فەرمودەیەك نابینی پێچەوانەی قسە و ڕاکانی من بێت ... دەشبینی، وتەی زۆرینەی فەیلەسوف و ئەهلی کەلام پێچەوانەن بە ڕاکانی من و فەرمودەکانی پێشەوایان ... جا کەواتە من قسە ناکەم بە بەلگەی ئەوانەوە نەبێت".

(هەروەها شێخ باسی ئەوە دەکات کە لە خەو دا حەسەنی کوڕی عەلی بینیوە و پرسیاری هەندێ شتی لێکردوە، حەسەن وەڵامی داوەتەوە، ئنجا دەمی خستۆتە سەر دەمی شێخ و لیکی دەمی خۆی کردۆتە دەمی شێخەوە، شێخیش ماوەی نیو کاتژمێر لەو لیکەی خواردۆتەوە، هەر چەند لیکەکە گەرم بوە بەڵام لە هەنگوین بە تامتر بووە...)[٤].

بەم باسە نامەوێت بیر و باوەڕی گروپی (شێخی‌یەکان) یان گروپەکانی‌تر پوچەڵ بکەمەوە، چونکە خوێنەر دەتوانێت کتێب و دانراوەکانی ئەو گروپانە بخوێنێتەوە و ئنجا خۆی حوکم دەربکات ... بەڵکو دەمەوێت هەندێ نمونە باس بکەم، لە بارەی کاریگەری خەون لە سەر بیر و باوەڕی موسلمانان.

خەریکم بڕوا بێنم بەوەی کە خەون کاریگەری هەیە لەسەر ڕەوشت و ئاکار و سیستەمی کۆمەڵایەتی، هەروەك چۆن کاریگەری هەبوە لەسەر بیر و باوەڕ و ڕاکانی. ئەمەش لەو چیرۆکەی (ابن عکاشە) دا ڕوون دەبێتەوە کە لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبە دا باسم کردوە.. ئەم پیاوە لە خەون دا پێغەمبەری دیوە، پێغەمبەر یەکێك لەو قسانەی بەو پیاوەی گوتوە ئەوە بوە کە گوتویەتی: یەکێك لە بنەڕەتەکانی سوننەتی محمد ئەوەیە کە موسڵمانان لە ژێر بەیداخی سوڵتان دارێ بکات و هەرگیز بە شمشێر لە دژیان نەوەستێت هەر چەندە ئەوان ستەم کاریش بن...

ئەمەش یانی شۆڕش کردن لە دژی سوڵتانی ستەم کار، پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە و گوێڕایەڵی سوڵتانیش گوێڕایەڵی کردنی خودایە.

(ابن حجر)یش لە (الصواعق المحرقة)دا، هەندێ لەو خەونە پیرۆزانە باس دەکات کە بەلگە بەدەستەوە دەدەن لەسەر ئەوەی سوڵتان هەر چەندە ستەم کار و بەد ئەتوار و خوێنڕێژ بێت، قەیدی نیە چونکە لەوانەیە خودا بەشفاعەتی پێغەمبەر یاخود ئەهل و

بەیتەكەی لێی خۆش بوێت!! ... بۆ نمونە (تەیموری لەنگ) كە (ئیبن حەجەر) خۆی دان بەوە دا دەنێت، ستەمكارترین دروستكراوی خودا بوە، لەخەو دا بینراوە كە خودا لێی خۆش بوە، چونكە ئەو وەچەكانی پێغەمبەری خۆش دەویست.

هەروەها (ئیبن حەجەر) دەگێڕێتەوە بۆمان، یەمەنیەك لە گەڵ ماڵ و خێزانی دا دێن بۆ حەج بۆ شاری مەككە، لە ڕێگە دا پاسەوانەكانی (شەریف) زۆر توند و تیژیان لە بەرانبەری نواند كە ئەو كات (شەریف) فەرمانڕەوای ناوچەكە بوە ... یەمەنیەكە دەستی كردە پاڕانەوە لە خودا دژی شەریف... بەڵام پێغەمبەر (د.خ) چوە خەوی یەمەنیەكە و پێی گوت: ئایا هیچ كەسێكیترت لەم كوڕەی من ستەمكارتر نەدیوە؟! یەمەنیەكە بە ترساوی لە خەو ڕاپەری و پەشیمان بوەوە، لەوەی توخنی هەر یەكێ لە وەچەكانی پێغەمبەر بكەوێت كە خودا ڕێزگرتنیانی سەپاندوە بەسەر بەندەكانی دا.

لە هەندێك لەو خەونە پیرۆزانە دا كە هەندێك لە نوسەران دەیگێڕنەوە، ئەوە دەردەكەوێت كە شفاعەتی پێغەمبەر یان ئەهل و بەیتەكەی موسڵمان دەرباز دەكات لە هەر هەڵەیەك كردبێتی هەر چەندە هەڵەكەی قورس و گەورەش بێت.

بەر لە چەند دە ساڵێك كتێبێكم لە بازار بینی چەندین چیرۆكی لەمجۆرەی لە خۆ گرتبوو ... وا چەند نمونەیەكی دەخەمە بەر دەستی خوێنەر، دانەری پەرتوكەكە باس لە هۆزانڤانێكی سەرخۆش دەكات كە عارەق خۆر بوە و ئەهل و بەیتیشی خۆش ویستوە و بە هۆنراوەكانی هەمیشە ستایشی كردون ... لەسەرەمەرگدا ڕوی ڕەش هەڵگەڕا و زمانی شكا و لە گۆ كەوت... بەڵام لە دوای مردنی، كوڕەكەی لەخەو دا بینیویەتی كە كڵاوێكی سپی لەسەرە و جلكێكی سپیشی لە بەرە... كوڕە پرسیاری لێكرد خودا چی دەرباره كردوە؟ شاعیرەكە لە وەڵامدا دەڵێت: ئەوەی لە سەرەمەرگ دا لێی بینرا وەك ڕووڕەش بون و زمان شكان، ئەنجامی عارەق خواردنەوە بوە لەو دنیا دا... بەڵام لە دوای مردنی پێغەمبەری بینیوە و هەندێ لە هۆنراوەكانی خۆی بۆ خوێندۆتەوە كە باس لە ستایشی ئەهل و بەیت دەكەن .... لە بەر ئەوە پێغەمبەر شفاعەتی بۆ كردوە و جلكە سپیەكەی خۆیشی داوەتێ[٥] .

وەك خوێنەریش دەزانێت، ئەم چیرۆکە، کاریگەریەکی کۆمەڵایەتی خراپ لەسەر خەڵك دا دەنێت، چونکە هانیان دەدات لە دنیا دا چی دەکەن بیکەن بە ئارەزووی خۆیان، ئنجا لە دوای مردن پێغەمبەر دێت و شفاعەتیان بۆ دەکات و لە سزای دۆزەخ رزگاریان دەکات.

هەر هەمان دانەر چیرۆکێکی دیکە دەگێرێتەوە کە لە خراپی و کاریگەری نێگەتیڤی دا لەوەی پێشو کەمتر نیە... پوختەکەی ئەوەیە هۆنەرێك عەلی کوڕی ئەبی تالب لە خەون دا دەبینێ، لە بەر دەستی عەلی دا هۆنراوەیەك لەستایشی عەلی دا دەڵێت بەم تەرزە:

| | |
|---|---|
| ابا الحسن انت عين الاله | فهل عنك تعزب من خافية |
| وانت مدير رحى الكائنات | وإن شئت تشفع بالناصيه |
| وانت بك الذي ام الانبياء | لديك إذا حشرت جاثيه |
| فمن يك قدتم ايمانه | يساق الى جنة عالية |
| واما الذين تولواسواك | يساقون غداً الى الهاوية |

راوی دەڵێت: ئیمام زەردەخەنەیەکی کردوە و بە هۆنەرەکەی گوتوە: (ئافەرم)! هۆنەرەکەش چەمیوەتەوە و دەستەکانی ئیمامی ماچ کردوە.. ئنجا لە خەو ڕاچەنیوە و هۆنراوەکەی لە بەر بوە، خەڵکیش ئەم هۆنراوەیەیان لێوە وەرگرتوە و دەماودەمیان پێکردوە و کردویانەتە پێنج خشتەکی و کۆپلاندویانە..(٦)

لێرەدا دەمەوێت بپرسم: کاریگەری ئەم هۆنراوەیە چی دەبێت لە سەر ئاوەزی ئەوانەی گوێیان لێی دەبێت و باوەڕی پێدەکەن؟!

ئەم هۆنراوەیە لای زۆر کەس دەبێتە بیر و باوەڕێك بەو پێیەی کە خودی ئیمام عەلی پێی باش بووە و مۆڵەتی داوە .. دیارە هۆنراوەکەش لەو هۆنراوە زیاد رۆچوانەیە کە موسڵمان وا لێ دەکەن متمانە بکەن بەوە لە ئاخیرەت دا رزگار دەبن، تەنها بەوەی دەست بگرن بە ویلایەتی ئیمام عەلیەوە، ئیدی قەیدی نیە لە دنیا دا بە ئارەزوی خۆی چی دەکات.

**گلکۆ وەهمیەکان:**

دەمەوێت ئەم هەلەم لەکیس نەچێت، تا ئاماژە بدەم بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە ناو موسڵمانانىدا کە لە دێرزەمانەوە ناسراوە، و پەیوەندیەکی گەورەشی بە خەونەوە هەیە.. ئەویش بریتی‌یە لە دیاردەی گۆڕە وەهمیەکان کە خەڵکی سەردانیان دەکەن و بە پیرۆزیان دەزانن و قوربانیان بۆ سەر دەبڕن، کەچی لە ڕوی مێژووییەوە ئەو گۆڕانە هیچ پشتیوانێکیان نیە.

وا دەبێت کەسێك لە خەونی دا شتێك دەبینێ کە دەگرێتە بەڵگە لە سەر بونی گۆڕی یەکێ لە ئەولیاکان یان وەچەی ئیمامەکان لە جێگەیەکی تایبەت دا... ئنجا لە خۆشیاندا لە خەو رادەپەڕێت و مەسەلەی گۆڕەکە بە خەڵکی رادەگەیەنێت، ئەوانیش بڕوای پێ دەکەن و دادەبارن بەسەر جێگلکۆکە دا و تەبەڕکی پێ دەکەن ... پیاوەکەش بەو هۆیەوە پلە وپایەکی کۆمەڵایەتی بەرزی دەست دەکەوێ.

مامۆستا (جعفر الخليلي) لە یەکێك لە پەرتوکەکانی دا چیرۆکی پیاوێکمان بۆ دەگێڕێتەوە ناوی (مزعل الفحام) بوە، ئەم پیاوە زۆر هەژار بوە و بە درێژایی ساڵ کاری کردوە و هیچ سودێکی لە کارەکەی نەدیوە... لە دوایدا بیری لە فێڵێك کردۆتەوە تاکو ئەو هەژاریە لەسەر خۆی و خێزانەکەی لابەرێت.

ئەم پیاوە رۆژێك بەناو خەڵکی دا بڵاوی کردەوە کە (حەزرەتی خدر) لە خەوی دا پێی گوتوە، گوایە گۆڕی هەندێ پیاوچاك لە ماڵەکەی دا (واتە لە ماڵی مزعل الفحام - مزعلی خەڵوزفرۆش) دا هەیە!.

هەواڵی ئەم خەونە بەناو خەڵکی دا بڵاو بویەوە، خەڵکی گوندەکە پێی دڵخۆش بوون، چونکە دەیان زانی گوندەکەیان لەوەولا دەبێتە مەزارێکی پیرۆز ... ئەوە بوو هەر بە ڕاستی گوندەکە بویە مەزارێکی گەورە و خەڵکی لە هەموو لایەکەوە ڕویان تێ‌کرد... مزعلی خەڵوز فرۆشیش بوە شێخێکی گەورە و گران کە لە هەموو لایەکەوە پارە و پوڵیان بۆ دەهێنا.

لەوانەیە ئەم قسە خەیاڵی بێت، بەڵام لێكچوونی زۆری هەیە بەوەی زۆر جار لە نێو خەڵك دا ڕوو دەدات.

(دكتۆر مصطفى جواد)یش، بەسەرهاتی خەونێك دەگێڕێتەوە كە ساڵی (٥٣٥ی كۆچی) لە بەغداد بینراوە، لە كۆتایش دا ریسواییەكی ئایدیۆلۆژی گەورەی لێكەوتەوە... پوختەی بەسەرهاتەكەش ئەوەیە، یەكێك لەو فێڵبازانەی پڕوپاگەندەی دنیانەویستی و پارێزگاری دەكەن، بەشەو دەچێتە سەر گۆڕی منداڵێك كە تازە بە تازە مردووە و خراوەتە ئەو گۆڕەوە، تەرمی منداڵەكە دەردێنێ و لە جێگەیەكیتر دەینێژێ... دوای ئەوە ڕای دەگەیەنێت گوایە لە خەونی دا عومەری كوڕی خەتتاب و عەلی كوڕی ئەبی تاڵبی دیوە و پێیان گوتوە: لە فلان جێگەدا گۆڕی منداڵێكی عەلی كوڕی ئەبی تاڵبی لێیە.

خەڵكی دابارین بەسەر جێگەكە دا و هەڵیان كەند، دەبینین تەرمی منداڵێكی تێدایە، خەڵكەكە دەست دەكەن بە دڕینی كفنەكەی و هەر كەس پارچەیەكی لێدەكاتەوە بۆ بەرەكەت و پیرۆزی، هەر كەسێكیان تاڵی موی لەسەری منداڵەكەی بەربكەوتایە وەك ئەوە بوو هەموو دنیای درابێتێ... پیاوانی دەوڵەت و خەڵكێكی زۆر و زەوەند لە جێگەكە كۆبونەوە و گوڵاو و بخوردێكی زۆریان بردە سەر گۆڕەكە، ئاپۆڕاكە هێندە زۆر بوو، كەس نەیدەتوانی بچێتە سەر گۆڕەكە، خەڵكەكە هەر بۆ پیرۆزی دەستیان كرد بە بردنی خۆڵی سەر گۆڕەكە... لەولاتریش دەگەڕانەوە بۆ لای كابرای فێڵباز كە گۆڕەكەی دۆزیبویەوە و دەستیان ماچ دەكرد و ئاپۆرەیان لە سەر دروست دەكرد، ئەمیش پارێزكاری خۆی نیشان دەدا و لە ترسی خودا دەگریا!

تەرمەكە چەند ڕۆژێ لەسەر زەوی مایەوە و دانەپۆشرایەوە و خەڵكی بەردەوام ئاپۆڕەی زیاتریان لێدەدا و ماچیان دەكرد، تا ئەوە بوو بۆگەنی پەیدا كرد... لە ناو حەشاماتی خەڵكەكەدا باوكی منداڵە مردوەكەش هاتبوو (باوكی راستەقینەی تەرمەكە)، هەر كە تەرمەكەی بینی، بە ناو حەشامەتەكەدا هاواری كرد! (بە خودای ئەمە كوڕەكەی منە...!) هەر كە پیاوە فێڵبازەكە ئەوەی بیست ڕای كرد و خەڵكی كەوتنە

شوێنی، دەستگیریان کرد، دانی نا بەوەدا کە بە فێڵ وای کردوە، ئەوە بوو سزایان دا بەوەی سواری گوێ درێژێکیان کرد و بە بازێڕدا سوڕاندیانەوە بۆ سوکایەتی پێکردنی.(٨)

هەر لە بەغدا و لەسەردەمی (مەغۆل) دا بەسەرهاتێکیتر ڕوی دا، لەوی پێشو خراپتر... لەو کاتەدا پیاوێ لەوانەی خۆیان بەوەچەی عەلی دەزانن، هەڵدەکوتێنە سەر منداڵێك و دەیکوژێت، بە جلەکەی خۆیەوە دەینێژێت، پیاوەکە کاغەزێك دەخاتە ژێر سەری کوژراوەکە و لێی دەنووسێت "ئەمە گۆڕی عمر کوڕی عبداللەیە".. ئنجا لەناو خەڵکی دا بلاوی کردەوە کە لەخەوی دا پێیان وتوە گۆڕی منداڵی هەندێ ئیمام لەو شوێنە دایە کە خۆی تەرمەکەی تێدا شاردبویەوە... خەڵکی ورووشەیان کردە سەر جێگەکە و هەڵیان کەند و تەرمەکەیان دەرهێنا ... لەو کاتە دا یەکێك لە ئامادەبوان هاوار دەکات: بە خودا ئەوە کوڕی منە و چەند رۆژێکە دیار نەماوە... هەر کە (صاحب الدیوان) ئەم بەسەرهاتەی بیست، پێداگری کرد لەسەر کوشتنی کابرای فێڵباز کە درۆکەی ئاشکرا بوە، بەڵام پیاوماقوڵ و ریش سپیەکان شفاعەتیان بۆ کرد لەبەر خاتری ئەوەی لە وەچەیەکی پیرۆزە.(٩)

جگە لەوانەش چەندین بەسەرهاتیتر لە بەغدا ڕویان داوە، تیای دا هەندێ خەڵکی بانگەشەی ئەوەیان کردوە لە خەویان دا پێیان گوتراوە گۆڕی وەچەی هەندێ ئیمام لە شوێنێکی دیاریکراو دایە، خەڵکیش بڕوایان پێکردوون بێئەوەی فێڵەکە ئاشکرا بێت... وابوە لەو جێگەدا گۆمەزی گەورە کراوە و پارە و پوڵی زۆر خەرج کراوە، تەنانەت ڕەنگە هەندێکیان تا ئەمرۆ مابێتن.

مەبەستم ئەوە نیە بڵێم هەموو ئەوانەی گۆڕی پیاو چاکانیان لەرێگەی خەونەوە دۆزیوەتەوە فێڵباز و درۆزن بوون .. بەڵکو دەگونجێت تیایاندا بێت بەڕاستی خەونی بینی بێت... پێغەمبەر یا خود ئیمامێك هاتبێتە خەونی و هەواڵی بونی گۆڕێکی پیرۆزیان لە جێگەیەکدا، پێدابێ، بەڵام ئەمە ناکرێتە بەڵگە لەسەر بونی گۆڕەکە لەو جێگەیە دا لەڕووی مێژووییەوە.

مرۆڤ لە خەونی دا پێغەمبەر یان ئیمامێك دەبینێت، وەك چۆن هەر کەسێکیتر دەبینێت... لە ڕوی زانستیشەوە ئەوە ڕوون بۆتەوە کە مرۆڤ لە بێداری دا حەز لە هەر چی بکات و بەهەر جۆرێك لە جۆرەکان بیری لێبکاتەوە، خەون بەوەوە دەبینێ.

کەواتە ناکرێت خەون بکرێتە بەڵگە لەسەر هیچ شتێ، تەنانەت با لە خەونەکەدا هەموو پێغەمبەران و پیاوەپیرۆزەکانیش دەربکەون.

یەکێك لەو کەسانەی جێگەی متمانەن، خۆی خەڵکی نەجەفە باسی ئەوەی بۆ کردم کە زۆرینەی مەزاری پێغەمبەران و پێشەوایان کە ئێستە لە مزگەوتی (کوفە) و مزگەوتی (السهلة) دان دروستکراوی خەونن... سەد ساڵ بەر لە ئێستا (بەر لە نوسینی کتێبەکە - وەرگێڕ) گۆڕێك لە نزیك شاری (هندیە) دەرکەوت، گوتیان گوایە گۆڕی کوڕەزایەکی (جعفری صادق)ە کە ناوی (صطبان) بووە .. سەیریش لەوە دایە ئەم ناوە عەرەبی نیە و عەجەمیە و واتای پاسەوانی سەگ (سەگەوان) دێت!! ئیدی من نازانم چۆن دەبێت کوڕەزای (جعفر صادق) ناوێکی ئاوا سەیر وسەمەرەی لێبنرێت؟! هەر چۆن بێت خەڵکی بڕوایان پێکرد، وروشەیان کردە سەری بۆ تەبەڕك و قوربانیبۆ کردنی... شایەنی گوتنە هۆکاری دەرکەوتنی گۆڕەکە خەوێك بوە کە لادێییەکی ناوچەکە دیویەتی و گۆڕەکەیان نیشان داوە.

ڕوداوێکیترم بیستوە کە بەر لە نزیکەی چل ساڵ (چل ساڵ بەر لە نوسینی کتێبەکە - وەرگێڕ) لە نزیك نەجەف ڕوی داوە... پوختەی ڕوداوەکە ئەوەیە: کابرایەکی جوتیاری خەڵکی گوندی (قریشات)ی نێوان (کوفە) و (سهلة)، لە خەوی دا بینیویەتی گوایە پیاوچاکێك کە ناوی (سید محمد)ە لە نزیکی ماڵەکەیەوە نێژراوە... هێشتر چەند ڕۆژێ بەسەر بڵاو بونەوەی خەونەکە دا تێنەپەڕی بوو، خەڵکی بۆ تەبەڕك ڕوویان لێکرد ... جوتیارەکەش بەو هۆیەوە دەوڵەمەند بوو .. ئەمەش وایکرد کەسانیتریش خەون ببینن بەوەی گۆڕێکیتر بەناوی (سید ابراهیم) لەو ناوە دا هەیە، هەروا گۆڕی سێیەم و چوارەمیش دەرکەوت (هەر بە خەون) تاوای لێهات ناوچەکە پڕبوو لە گۆڕی پیرۆز بە جۆرێ شیاوی گاڵتەپێکردنە.

ماوەیەك بەر لە ئێستا لە گۆڤارێکی میسری دا هەواڵی گۆڕی پیاوچاکێکی تازەم خوێندەوە لەشاری (بنی سویوف)، کە گلکۆکەی بوەتە مەزارێکی سەیر و خەڵکی زۆر و زەوەند ڕوی تێدەکەن و داوای جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی خۆیانی لێ دەکەن ... لە بەدواداچوونی گۆڤارەکەدا دەردەکەوێت خاوەنی گۆڕەکە چ نەبووە، جگە لە گەنجێکی شێت کە زۆر لە مردن دەترسا، بە جۆرێ هەر کە تەرمێ بەلای دا تێپەڕیبا دەبورایەوە و لە هۆش خۆی دەچوو... ئنجا کە دەمرێ دێتە خەوی باوکی خۆی و داوای لێ ئەکات لەسەر گۆڕەکەی مەزارێ دروست بکات، تا وای لێهات خەڵکی لە دورەوە هەستیان بە تیشك و نور دەکرد کە لەسەر گۆڕەکەی دەدرەوشێتەوە. ئنجا هەندێ لە نەخۆشەکان لە خەودا دەیبینن کە لە نەخۆشینەکە چاکیان دەکاتەوە، جا هەر بەهۆی ئیحانی دەرونیشەوە هەر بەڕاستی چاك دەبنەوە.

نوسەری گۆڤارەکە پیاوێکی ئایینی لە سەر گۆڕەکە دەبینێت و پرسیاری لێ دەکات، پیاوە ئایینی‌یەکە لە وەڵامی دا دەڵێت گوایە کە هەواڵی کەرامەتەکانی پیاوچاکە تازەکەی بیستوە لەسەرەتا دا باوەڕی نەکردوە، بەڵام پیاوچاکەکە هاتۆتە خەوی و داوای لێکردوە سەردانی مەزارەکەی بکات ... ئەوەتا ئەمیش پەیمانی داوە هەموو هەفتەیەك سەردانی مەزارەکەی بکات.[١٠]

## بەرەنجام و هۆکارەکان

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بدەم بەو کەسانەی بڕوا بە خەون دەکەن و دەڕۆنە سەرگۆڕە وەهمیەکان، سوود و کەڵکی دەروونی لێ دەبینن.. زۆربەیان هەژار و نەخۆشن و ئازاردیدەن و لەدنیایان دا چارەسەرێ بۆ نەخۆشین و گرفتەکانیان نابینن .. بۆیە پەنا دەبەنە بەر (وەهم) و لە نێو وەهمدا دڵدانەوەیەك یاخود ئیمانێکی دەروونی دەبینن. زۆر جاریش ئەم ئیمانە سودیان پێ دەگەیەنێت... وەلێ ئەمە لە ڕویەکیترەوە زیانیان لێدەدات، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی بیر و باوەڕێك وەرگرن کە پوچە و ئارەزویان بەنج دەکات و ڕێگەکانی ژیانیان لێ پڕدەکات لە لەمپەر و کۆسپ.

ئێمە پاساوێك دەبینین بۆ بلاوبونەوەی وەهم لەچاخە دێرینەكاندا، وەلێ لەم سەردەمە دا كە تیایدا دەژین، پێویستە كەمتەرخەمی نەكەین لە هەولی قەلاچۆكردنی دا، هیچ نەتەوەیەك كە لە سەدەی بیست دا بژی ناتوانێت یەكبینە دەست بگرێت بە وەهمەكانی چاخە بەسەر چوەكانەوە.

لەوەی رابورد، گوتومە موسلمانان زیاد لە هەموو نەتەوەكانیتر پابەندن بەوەهمەكانی خەونەوە... ئەمەش مانای ئەوە نییە كە، نەتەوەكانیتر بەتەواوی خالین لەم وەهمە ... لە راستیدا هەموو نەتەوەكان بەو قۆناغە دا كەم و زۆر گوزەریان كردوە كە موسلمانان گوزەری پیا دەكەن .. بەلام موسلمانان بەوە جیا دەكرێنەوە لەوانیتر كە هەندێك خەونیان خزاندۆتە نێو كرۆكی شەریعەتەكەیان و بەوەی لە قورئان و فەرمووده دا هاتوە پشت ئەستوریان كردوە... بۆیە هەر وەكوو سروشتێ هاتبێتە خوارێ وایە لایان.

لە پەڕتوكێكی (شێخ مفید) دا وتەیەكم خوێندەوە كە دەیەوێت ڕای (موعتەزیلە و زەیدیەكان) كە ملەجەڕێ لە خەون دەكەن پوچەلێ بكاتەوە... بەڕای شێخ خودی قورئان پشت ڕاستی خەون دەكاتەوە[11]... وەلێ منیش هەر وەك موعتەزیلە و زەیدیە بڕوام وایە: قورئان زۆر بەرزتر و گەورەترە لەوەی غەش و چاوبەست لە شوێنكەوتەكانی بكات، یاخود بیانخاتە سەر رێگەی وەهم و ئەندێشە.

*** *** ***

بڕوا بوون بە راستی خەون نەریتێكی دێرینە، خەلكی لە گەلەسەرەتاییەكانەوە بۆیان ماوەتەوە... ئەوانەی لێكۆلینەوە لە گەلە سەرەتاییەكان ئەكەن بۆیان دەركەوتوە: مرۆڤی سەرەتایی جیاوازیەكی گەورە نابینێت لە نێوانی ئەوەی لە خەون دا دەیبینێت و ئەوەی لەبێداری دا دەی بینێت ... لای مرۆڤی سەرەتایی خەون بەهۆی دەرچونی گیان لە جەستە لە كاتی نوستن دا دروست دەبێ، گیان لەو كاتەدا بەئاسۆكاندا دەگەڕێت و ڕاستیە دور و نزیكەكان دەردەخات... هەربۆیە ناتوانێت (گیان) بەدرۆ بخاتەوە لە هەر هەوالێك كە لە خەون دا دەیداتێ... بۆ نمونە ئەگەر لە خەون دا ببینێ كەشتێك

هینی ئەوە و لای کەسێکیترە (واتە کەسێکیتر بەراستی خاوەنیەتی ـ وەرگێڕ) دوای ئەوەی خەوەکەی بینی ڕەوایە بۆی بچێتە سەر خاوەنی شتەکە و، داوای شتەکەی لێبکاتەوە (چونکە لە خەوی دا هینی خۆی بووە! ـ وەرگێڕ) تەنانەت رەنگە خاوەنی راستەقینەی شتەکەش، شتەکەی بداتێ؟!

مرۆڤانی سەرەتایی سەرسام نابن لە پیاوێك کە دوژمنایەتی و ڕقەبەرێتی کەسێك بکات کە لەخەوی دا خراپەیەکی دەرهەق کردوە... تاوانباریش ناتوانێ مل جەڕێ لە تاوانەکە بکات ... ئەمە چونکە لە خەون دا دیتراوە کە کارێکی کردوە، بۆیە چار نیە، ئەبێ دان بە تاوانەکەی دابنێت.

ماموّستا (هادفیلد) بۆمان دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە (هندیە سور)ەکان لە خەوی دا دەبینێت یەکێك لە مژدەدەرەکان (المبشرین) ، شوتیەك لە بێستانەکەی دەدزێت.. پیاوەکە لە خەوەکەی ڕادەچەنێت و زۆر تورە دەبێت، عەزمی جەزم ئەکات کە داوای قەرەبوو بکاتەوە لە مژدەدەرەکە، بۆ ئاگاداریش کابرای مژدەدەر لە جێگەیەك دەژیا کە (دووسەد میل) لەو جێگەوە دوور بوو کە هندیە سوورەکەی تیا دەژیا... ئاوڕی دایەوە بە لای بێستانەکەی دا، بینی شوتیەکە لە جێگەی خۆی دا ماوە ونەدزراوە و کەسیش دەستی لێنەداوە... لە گەڵ ئەوەشدا پێداگری کرد لەسەر داواکردنی قەرەبوو، چونکە بڕوای پتەو بوو بەوەی بینینی مژدەدەرەکە لە خەو دا بەدزی کردنەوە، بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لە سەر ئەوەی کابرا ئامادەباشە بۆ دزیکردن ئەگەر لەنزیکی بێستانەکە بوایە.

هەر ماموّستا (هادفیلد) باسی ژنێکی گەنجمان بۆ دەکات کە تازە بە تازە شوی کردوە، گوایە لە خەونی دا دیویەتی هاوسەرەکەی لەگەڵ ژنێکی سور و سپی دا دەم سوعبەتی کردوە، بۆیە بە تورەیی و شپرزی لە خەو ڕاپەڕی، دەستی کردە بۆڵە لە تەك مێردەکەیدا و بەخیانەت کردنی هاوسەرێتی تۆمەتباری کرد، کە پێشی گوترا مێردەکەت پاکە لەو تۆمەتەی بۆی دەگەیت.. گوتی: ئەگەر من لە خەونی خۆم دا بینیم مێردەکەم لەگەڵ ژنە سور و سپیەکاندا دەم سوعبەت دەکات، ئەبێ خۆی لە خەونی دا چی دەبینێت بەخۆیەوە و چی دەکات؟![١٢]

لێرەدا ئەوەی شیاوە ئاماژەی پێبدەین،ئەوەیە: ئەم وەهمە سەرەتاییانەی لە مەڕ خەون باسكران، لەلایەكەوە، لەو وەهمانە دەچن كە لەنێو موسڵمانان دا بڵاون و لە لایەكیتریشەوە لێك جیاوازن.. گەلانی سەرەتایی هەموو خەوێك بەبێ جیاوازی بەڕاست و دروست دەزانن، ئەمە لە كاتێكدا موسڵمانان تەنها بڕوا بەو خەونانە دەكەن كە پێغەمبەر یان ئیمامەكان تیای دا دەربكەون... موسڵمانان ئەوەیان لە دەست دەرچووە كە خەونەكان هەمویان چون یەكن، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان خەونێك دا پیاوچاكێكی تیادا دەربكەوێت و یەكێكی‌تر كەشەیتانی تیادا دەربكەوێت، چونكە هەر دوو خەونەكە بەرەنجامی ئەو بیركردنەوانەیە كە مرۆڤ لە بێداری دا پێیەوە سەرقاڵە و، دواتر لە خەون دا بەجۆرێك لە جۆرەكان دەیبینێتەوە.

شێخ حفید دەڵێت: (ئێمە حوكمە ئایینیەكان لە ڕێگەی خەونەوە سەقامگیر ناكەین و ناسەلمێنین، بەڵكو ڕاڤەی ئەو حوكمانە دەسەلمێنین كە لەڕێی خەونەوە یەكێك لە وەچەی پێغەمبەران دەی بینن)... دەگرێ ئەم ڕایەی شێخ بە ڕایەكی جوان وەرگرین، بەڵام وتەكەی نابێتە ڕێگرلەوەی نەخوێندەوارەكان بخزێنە نێو ئەو وەهم و بیر و باوەڕانەی كە لە ڕێی خەونەوە دروست دەبن.

نەخوێندەوارەكان لە هەموو سەردەمەكان دا، وا ڕاهاتوون بیر وباوەڕیان لەو دەوروبەرە وەرگرن كە تیای دا پێگەیون، زۆربەی جاریش بیر و باوەڕەكەیان پوچە، كەچی خۆیان بە هەقێكی دەزانن كە پێغەمبەران و پیاوچاكان لێی ڕازین و هەموو ئەوانەش پێچەوانەی ئەو بیر و باوەڕانە بن، كافر و تاوانبارن!! دوریش نیە یەكێك لەو نەخوێندەوارانە لە خەودا پێغەمبەرێك یان پێشەوایەك ببینێت و پشتیوانیشی لێ بكەن لە بیر و بۆچونە هەڵەكەی دا، تەنانەت ڕەنگە لە خەونی پێغەمبەر فەرمانی پێبدا شمشێرەكەی هەڵبكێشێت و بیخاتە سەرگەردنی خەڵكی... كە وایشی كرد هەست بە نارەحەتی ویژدانی ناكات... بەڵكو بە پێچەوانەشەوە، بڕوای وایە موجاهیدێكە لە پێناوی ڕێگەی خودادا و، خوداش بەهەشتی دەداتێ لە بەرانبەر خوێن ڕشتن و تاڵانكردنی ماڵی خەڵك دا.

پوختـەی قسان: بڕوابـوون بـە خـەون زۆربـەی جار بـە زیـان دەشكێتەوە لـە ڕوی دەرونی و كۆمەلایەتیەوە.. هەروەها ئەم هەلە لەدەست نەدەم و باسی ئەوە بكەم كە من چاوم كەوتوە بەهەندێ لە پیاوە ئاینی‌یە تێگەیشتو و پێگەیشتوەكان و پرسیاری ئـەم مەسەلەیەم لێكردوون، دەبینم ئەوانیش ڕای موعتەزیلە و زەیدیە كۆنەكانیان هەیە لەم ڕوەوە پێیان وایە، هیچ خەونێك نابێتە بەلگە لە سەر هیچ شتێ.

هیواخوازم ئـەم بۆچونە بـەهێزە لـە نێـو موسلمانان دا بـلاو بێتـەوە... ئەمـەش مەبەستی یەكەمینە لە نوسینی ئەم پەڕاوەدا.

*** *** ***

**بەشەكانی ئەم پەرتوكە :**

لەسـەرەتای ئـەم پێشـەكیە دا ئامـاژەم كـرد، بۆ ئـەوەی ئـەم پەرتوكـە كراوەتـە سـێ بەش... مەبەستی یەكەم لە دانانی ئەم پەرتوكە لە بەشی یەكـەمی دا قـەتیس دەبێـت، چونكە لەم بەشەدا لە ڕوی كۆمەلایەتیەوە تاوتوێی خـەون دەكـەین. بـەلام دوای ئـەوەی دەستم بەتال بوو لـە نوسینی ئـەم بەشـە، هەسـتم كـرد، بابەتەكـە ناتـەواو دەردەچێت، ئەگەر هاتوو توێژینەوەیەكی لەمـەڕ بیردۆز و بۆچونەكانی تایبـەت بەخـەون، بـەدوا دا نەنوسرێت... ئەم بیردۆز و ڕایانەش دابەش دەبـەن بۆ دوو بـەش... لقێكیـان لـە خـەون دەكۆلێتەوە و لە ژێر ڕووناكی (زانستی شیكردنەوەی دەرونـی)دا، لقەكـەی دیكەشیان لـە خـەون دەكۆلێتـەوە لـە ژێـر ڕونـاكی زانستێكی نـوێ دا كـە هەنوكـە نـاونراوە (زانسـتی پاراسایكۆلۆژی)... لـە بـەر ئـەوە لـە بەشی دوەمـدا هـەولم داوە بیـردۆزە دەرونیـەكانی تایبـەت بـە خـەون كـورت بكەمـەوە، پاشـان لـە بەشـی سـێیەمدا هـەولم داوە بیـردۆزە پاراسایكۆلۆژیەكان كورت بكەمەوە.

لێرەدا دەمەوێ دان بەوە دا بنێم كـە لـە بەشـی دووەمـدا بەتـەواوی سـەركەوتنم بـە دەست نەهێناوە.. لەبەر ئەوەی كورت كردنەوەكانم بۆ بیـردۆزە دەرونیـەكان كورتەیەكـە و گشتگیر نیە.. لە ناتەواویەوە نزیكترە وەك لە تەواوی و كاملی .. هۆكارەكەیشی ئەوەیە

کە گرنگیم زۆر داوە بەو بیردۆزانەی لە وولاتانی خۆرئاوا دا دەرکەوتوون، وەك بیردۆزەکانی (فرۆید و ئەدلەر)... بێ ئەوەی گرنگی بدەم بەو بیردۆزانەی لە ولاتانی رۆژهەلات وەك یەکێتی سۆڤیەت و چین دا سەریان هەلداوە.

لە ماوەی گەشتەکەی ئەم دواییەم دا بۆ (چین و ڕوسیا)، بۆم دەرکەوت کە لەوێندەر چەندین بیردۆز لەم بارەیەوە هەیە کە گاڵتەیان پێناکرێ... بەلام بەداخەوە نەمتوانی بەتەواوی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەم، لە بەر کەم وکورتی ئەو ماوەیەی لەوێ مامەوە، هەروا لە بەر ئەوەی زمانەکەشیانم نەدەزانی ... کاشکای بتوانم لە داهاتووی دور یان نزیك دا ئەو بۆشاییە پڕ بکەمەوە... نەخاسمە کە شۆڕش دەروازەکانی جیهانی بۆ خستوینەتە سەر پشت و دەتوانین بێهیچ سانسۆر و سنوردانانێك لێکۆڵینەوە بکەین لە هەموو بیردۆز و بۆچونە زانستییەکان.

هەر چۆن بێت، هەست دەکەم سەرەڕای ناتەواوییەکەی، بەلام بەشی دووەم سودبەخش دەبێت بۆ خوێنەران... لەوانەیە خوێنەر هەندێ شتی تیا بدۆزێتەوە کە رۆشنبیری بکات یان حەزی ئەوەی تیا بجولێت کە زیاتر شت لەو بارەوە فێر بێت... ئەوجا بۆی ڕون دەبێتەوە کە چەندە پێشینیان بەهەڵە دا چون، کاتێك لە ڕێگەی خەونەوە ڕەگ و ڕیشەی بیر و بۆچونە کۆنەکانیان وەرگرتوە.

*** *** ***

بەلام بەشی سێیەمی پەرتوکەکە، ئەو بەشەی کە لە بیردۆزەکانی (پاراسایکۆلۆژی) دەدوێت، خوێنەر هەندێ زانیاری سەرنج ڕاکێشی دەربارەی خەون تیادا دەبینێت... کە چۆن هەندێ جار دەتوانێت ڕوکارەکانی کات و شوێن ببەزێنێت و ڕوداوەکانی ئایندە پەی پێبەرێت.

پێویستە کەمێك لێرەدا هەلوێستە بکەم، بۆ وەی وەلامی هەندێك لەو ڕەخنانە بدەمەوە کە لەسەر ئەم بابەتە دەوروژێنرێن... ڕەنگە کەسێك بلێت: چۆن ڕێگەت پێدراوە، ئەو بیر و باوەڕانەی لە سەر خەون بەندن، پوچەڵ بکەیتەوە، لەبەشی یەکەمی

پەرتوکەکەدا و، دواتر لەبەشی سێیەمدا دێیت و پشتگیری ئەو پڕوپاگەندانە دەکەیت کە لەمەڕ توانای لەڕادەبەدەری خەون بڵاو دەکرێنەوە؟ ئایا دژایەتی و ناچونیەکیەیەك لەمەدا نیە؟!

وەڵامی من بۆ ئەو ڕەخنەیە: مەسەلەکە ناچۆنیەکی نیە! ئەو خەونانەی کە پشت بە (مألوفات)ی ناو خەڵك دەبەستێ، لەوانەیە بە جۆرێ بێ لە گەڵ بیر و باوەڕ و شتە باو و مەئلوفەکانی ناو خەڵك دا بگونجێت، بەو پێیەش هیچ ڕاستیەکی بابەتی تێدا نیە... سەرەڕای ئەوەش، خەون هەندێ جار پەردە لادەدات لە ڕوی ئەو هێزە گەورە و تیشکە داهێنەرانەی لە ناو دەروندان.. ئەمەش پرسێکە لێکۆڵینەوەی ئەزمونی نوێ، دانی پێداناوە تا ڕادەیەك نارەحەتە گومانی لێبکرێ.

دروست و ڕەوایشە بۆمان، کە بخزێینە نێو (ڕق بوون) لە خەونە (عەقیدەییەکان) و شۆڕش کردن لە دژیان.

لە بەشی دووەمی پەرتوکەکەدا ئاماژەم بەوە داوە (کاردانەوە) پاڵی ناوە بە هەندێ لە توێژەران لە چاخی نوێدا، کە ملەجەڕێ بکەن لە سەرجەم ئەو بیر و باوەڕانەی لە چاخە کۆنەکاندا بڵاو ببونەوە، بە بێجیاوازی... ئەمەش پێچەوانەی سروشتی ڕێبازی زانستیە.

لەمەسەلەی (خەون)دا، نابێت توندڕەو بین و بە توندی پشتگیری ئەوانە بکەین کە خەون بە ڕاست دەزانن، یاخود توندڕەو بین و بەتوندی پشتگیری ئەوانە بکەین کە خەون بە درۆ دەخەنەوە... بەڵکو پێویستە لەو نێوەندە دا ڕایەکی ناوەندی وەربگرین، تاکو بە پێی توانا لە لێکۆڵینەوەکەماندا بابەتی بین.

زانستی (پاراسایکۆلۆژی) لە توێژینەوەی خەوندا ئەم ڕێبازە ناوەندیە دەگرێ... خەونەکانی خستۆتە سەر مێزی لێکۆڵینەوەی ئەزمونی و ئاماری.. لەو ڕێیەش گەشتۆتە بەرەنجامێکی بابەتی سارد کە هیچ جۆرە توند و تیژی و دەمارگیریەکی پێوە نیە.

ساڵی ١٩٤٥ لە وڵاتی میسر دا پەرتوکێ لەبارەی (خەون)ەوە لە نوسینی (دکتۆر تۆفیق تەویل) بڵاو کرایەوە... پەرتوکێکی بەسود بوو، تەنانەت ڕەنگە باشترین کتێبێ بوبێ لە

بارەی خەونەوە بە زمانی عەرەبی نوسرابێ.. بەڵام نوسەر کاتێك مەسەلەی ئەو دیاردە نائاساییانەی دەدرێتە پاڵ خەون باس دەکات، حوکمی بەپەلەی بەسەردا دەدات و دەڵێت: ئەو شتانەی باس دەکرێن پێچەوانەی ژیرین.(١٤)

وا دەردەکەوێت (دکتۆر تەویل) لێکۆڵینەوەی نەکردوە لەسەر ئەو بۆچونانەی بەم دواییە لە زانستی پاراسایکۆلۆژی دا هاتوون.. تەنانەت ڕەنگە نەزانێت زانستێ بەو ناوە هەبێت!! ئەمە لە کاتێکدایە کە ناوبراو نوسراوەکەی پێشکەشی کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی قاهیرە کردوە تاکو بڕوانامەی دکتۆرای پێوەربگرێ.(١٥)

پێویست بوو لەسەری هەرچی نوسراوێ زۆر یان کەم پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە، بتوێژێتەوە.

خەریکە بڕوا بکەم بەوەی، ئەو هۆکارەی هانی دکتۆر (تەویل) داوە نکوڵی بکات لە دیاردە نائاساییەکانی خەون، ئەوەیەکە لە ژێر کاریگەری ئەو نەزعە مادیە دایە کە زاڵ ببوو بەسەر ئاوەزی زانایان لە سەدەی نۆزدەیەمدا... وا دیارە زۆربەی بیریارەکانمان تا هەنوکەش لە ژێر کاریگەری ئەو نەزعەیە دان، بەهەمان شێوەی (دکتۆر تەویل)، بێ‌ئەوەی ئاگادار بن یان گرنگی بدەن بەو گۆڕانە گەورەیەی کە لە سەدەی بیستەمدا هاتۆتە ئاراوە.

زانایانی سەدەی نۆزدە، هەر وەك زانایانی کۆنی ئیغریق لە مادە تێدەگەیشتن.. ئەویش ئەو مادەیەی کە لە هەموو شوێنێك دا دەی بینین... ئەوان بڕوایان وابوو هەموو گەردوون لەم مادەیە پێکهاتوە و جگە لەمە پێکهاتەکەی شتێکی‌تری تیادا نیە... (بوخنەر) لە نێوەڕاستی سەدەی ڕابردوو دا پەرتوکێکی دەرکرد و ناوی نابوو (هێز و مادە)... تیای دا هەوڵی داوە هەموو گەردون ڕاڤە بکات، لە سادەترین شتیەوە تاکو ئاڵۆزترینی، بە هۆی کارلێکی مادە و جوڵەوە... پەرتوکەکەشی بوە سەرچاوەی هەرە گەورەی (مادیەکان) لەو سەردەمەدا، تەنانەت کردبویانە ئەو ئینجیلەیان کە هیچ گومان هەڵناگرێ... لێرەوە وایان لێهات بڕوایان نەدەکرد بەڕاستی هیچ دیاردەیەکی سروشتی ئەگەر هۆکارێکی مادی نەبوایە، بەو جۆرەی خۆیان لە سروشتی مادە تێدەگەشتن.

هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، زانایان نهێنییەكی سەرسامكەریان لە گەردوندا دۆزیەوە، سەرسامكەر تاڕادەیەك زۆربەی تێگەشتنە كۆنەكانیانی واژگون كرد... بەوەی دەركیان كرد كە گەردون لە شەپۆلی (كارۆموگناتیسی)[16] پێكهاتوە... جۆرەكانی ئەم شەپۆلەش هیندە زۆرن ئامار ناكرێن... تەنانەت ئەم مادەی هێمە دەی بینین چ نیە جگە لە جۆرێكی تایبەت لەو شەپۆلە، كە لەوانەیە لەسەر شێوازێكی دیاریكراو بێت.

زانست ژمارەیەكی كەم نەبێت لەو شەپۆلانەی لە گەردون دان، هیچیتری نەدۆزیوەتەوە، بەڵام لە ڕێگەدایە بەرەو دۆزینەوەی زۆرترین ژمارە لەو شەپۆلانە، هەر كات ئامێر و ئامرازەكانی باشتر بوون (واتە كە ئامێری باشتر لەبەر دەست دابوو، زانایان شەپۆلی زیاتر دەدۆزنەوە ـ وەرگێڕ)، ئەمەش یانی ئەو گەردونەی تیایدا دەژین لێوانە لەو شەپۆلانەی كە نابینرێن و، لە هەموو ساتێكیش دا، بەر لەشمان دەكەون، بێئەوەی هەستیان پێبكەین یاخود دەرك بكەین بەڕادەی كاریگەریان لەسەر جەستەمان.

تكام وایە لە خوێنەران، وا تێنەگەن ئەم تێگەیشتنە نوێیە تایبەتە بە زانایانی ڕۆژئاوا یاخود زانایانی ڕۆژهەڵات.. بەڵكو تێگەیشتنێكی زانستی گشتییە و هەموو زانایان هاوبەشن تیای دا لە هەموو جیهان دا، بەچاوپۆشین لە ڕەوتی ڕامیاری و ئایدیۆلۆژییان.

پوختەی مەبەست: زانایانی ئەمڕۆش، تا هەنوكە لەبیركردنەوەیاندا مادیین.. بەڵام مادە لەبەر دەستی ئەماندا لەشێوەیەكەوە گۆڕاوە بۆ شێوەیەكیتر.. دوای ئەوەی دەگوترا مادە پێكهاتوە لە (گەردیلە)ی بچوك كە دابەش ناكرێن.. ئێستا بڕوا وایە ئەو مادەیە پێكهاتوە لە ئەنرژی لەسەر شێوازی شەپۆلی (كارەبایی ـ موگناتیسی).

ئەم ئاڵ و گۆرە، یاخود ئەم چەمكی گۆڕانە لە تێگەیشتنی مادە دا، ئاسۆیەكی فراوانی بیركردنەوەی لەبەر دەم زانایان دا خستە سەر پشت كە لەبەردا پێی ئاشنا نەبوون.. بەم پێیەش ئەو مەسەلانەی لەڕابردوو دا جێگەی بڕوا نەبون لەمڕۆماندا دەگونجێت جێگەی بڕوا بن... یەك لەو مەسەلانەش، پرسی تایبەت بە (دیاردە نائاساییەكانی) خەونە.

زانایانی ئەمڕۆ سەرسام نابن، گەر بۆ نمونە ببیسن: ژنێك خەون ببینێت بە مردنی کوڕەکەیەوە، لەکاتێکدا کوڕەکەی سەدان میلیش لێیەوە دوور بێت.. ئنجا بەدەم پرمەی گریانەوە لە خەوەکەی ڕاچەنێت... دواتر هەواڵی بۆ بێت کە هەر بەڕاستی کوڕەکەی مردوە... ئەم چیرۆکە لە سەدەی نۆزدە دا شایستەی بڕوا پێکردن نەبوو.. وەلێ ئێستا لەژێر ڕوناکی (ڕاڤەی نوێ بۆ مادە) دا، بەتەواوی جێگەی بڕوایە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر مادە کراون، سەلماندویانە (مێشکی مرۆڤ)یش وەك هەر شتێکیتری نێو ئەم گەردونە شەپۆلی تایبەتی کارۆموگناتیسی هەیە.. بەم پێیە دەگونجێت وەڵامدانەوەیەکی (شەپۆلی)ی هەبێت لە نێوانی کوڕەکە و مێشکی دایکی دا سەرەڕای دووری نێوانیان... وەك زانراویشە (دووریی) لەمڕۆ دا ئەو گرنگیەی نەماوە کە لەدوێنێ دا هەیبوو.

دەگەڕێمەوە و دەڵێم: دکتۆر تەویل زۆری پەلە کردوە لە کاتێك دا حوکمی داوە بەسەر دیاردە نائاساییەکانی خەون دا و هەموو دیاردەکانی بە پێچەوانەی ئاوەز داناوە... هەرگیز لە خۆی نەپرسیوە: کام ئاوەز نکۆڵی لە دیاردە نائاساییەکانی خەون دەکات، ئایا ئاوەزی سەدەی نۆزدەیە، یاخود ئاوەزی سەدەی بیستەم؟

بەڕاستی دنیا گۆڕاوە، بێئەوەی تێگەیشتنەکان لەگەڵی دا بگۆڕێن...

لەساڵی ١٩٥٢ پەرتوکێکم دەرکرد بەناوی (خوارق اللاشعور).. لەو پەرتوکە دا هەندێ دیاردەی نائاسایی دەروونی مرۆڤم باسکردوە، لەهەمان ئەو جۆرەی کە لەبەشی سێیەمی ئەم پەرتوکەدا باسکراوە... حەسرەتبار بووم کە بینیم هەندێ لەبیریار و ئەدیبەکانمان بۆ گاڵتە پێکردن لچیان لە پەرتوکەکەم هەڵدەقورچاند و بە پەرتوکێکی ناماقوڵ و ئەفسانەیی دایانە قەڵەم، بۆیە دەشترسم بەهەمان شێوەی پەرتوکەکەیترم سەیری ئەم کتێبەی ئێستەشم بکەن.

گرفتی ئەوانە بەگشتی ئەوەیە مەغرورن بە ئاوەزیان، شتە باوەکانی ناوخۆیان چۆنیان ئاراستە بکات، ئاوەزی خۆیان بەو جۆرە دەسوڕێنن، بێئەوەی سەریەشەی ئەوە ئاوقەی خۆیان بکەن کە سەرنجی ئەو بەرەنجامانە بدەن کە زانست لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی ئەزمونکاریەوە پێی دەگات... ئەوان حوکمی ناماقوڵ یاخود ماقوڵی شتێك

دەدەن، دوای ئـەوەی سـەرنجێکی ئەبستراکتیکی لێ دەدەن... ئیـدی ناشـزانن سـەرنجی ئەبستراکتیکی عەقلی ناگونجێت لەگەڵ ئـەو ڕێبـازە مادیـە دا کـە زانستی نـوێی لەسـەر دادەمەزرێت.

بەدەربڕینێکیتر: ئەوان جیاوازی ناکەن لە نێوان زانست و ئاوەز دا... لەکاتێکدا ئـەو دوانـە هەنـدێ جار پێکـەوە دەگونجێن و هەنـدێ جاری زۆریش نـاکۆك دەبـن... ئـەقڵ ئەگەر ئەبستراکت بێت، هەمیشە پێوەرەکانی لەو شتە باوانەوە وەردەگرێت کـە لەسـەری پێگەیوە... لەبەر ئەوەشە دەبینین کە ئەمڕۆ حوکم دەردەکات کە فلان شت نامافـوڵـە و، دواتـر و دوای ئـەوەی خـووی پێـوە دەگرێـت هەست دەکات کەشتەکە مافوڵـە... وەلێ زانست حوکم نادات بەسەر هیچ شتێك دا دوای ئەوە نەبێت کە ئەزمونی لەسـەر دەکات و بەشێوازێکی بابەتی دەیسەلمێنێت. ئیدی لەو کاتەدا گوێ نادات بە شتە باوەکانی نێو خەڵك یاخود بە ئیعتیبارە ئەقڵیەکانیان.

مامۆستا (رابن) دەڵێت: (زانسـت، ئەسـتەم ناناسـێت)،[١٧] ئـەم گوتەیـە هەقـە لـە بـەر چاومان بێت هەر کە ویستمان لە دیاردە جۆراوجۆرەکانی گەردون بکۆڵینەوە.. تا ئێستە چەند پرس هەبووە لە ڕوی ئەقڵیەوە بە ئەستەممان زانیوە، دواتر بۆمان دەرکەوتوە کە لەسەر هەڵە بووین... گەر باب و باپیرانمان لە گۆڕەکانیان زیندوو ببنەوەو چاویان بەو هەموو دۆزینەوانە بکەوێت کە لە ژیانی ئێمـە دایـە، بڕوای پـێ ناکەن، تەنانـەت ئێمـە خۆشمان باوەڕمان پێنەکرد، کە یەکەمجار هەواڵەکەیمان پێگەیشت... وەلێ دواتـر پێـیان ڕاهـاتین و ئێسـتاکە لامـان بونـەتـە شـتانێکی مـاقوڵ... جگـە لـەوەش دێـین فرەبلـێیی دەکەین و باسی کەمالی عەقلی خۆمان دەکەین.

لـە گەشـتەکەمدا بـۆ وڵاتـی (چـینی میللـی)، بینـیم (ماوتسـی تـۆنگ)ی رابـەر و فەیلەسوفی چینیش بەدەست هەنـدێ لـە بیریـارە چینیەکانـەوە دەناڵێنێـت، وەك چۆن ئێمە بە دەستی هەنـدێ لـەبیریار و وێژەوانەکانمانـەوە دەناڵێنین... ئـەو جـۆرە کەسـانە بەئەنقەسـت مشـت و مـڕی درێـژ و پـان دەکـەن. تـەنها بـە پشـت بەسـتن بـەوەی بیرکردنەوەی خۆیان سروشیان دەداتێ، بەبێ ئەوەی کەمێك ئیست بکەن و لێکۆڵینـەوە بکەن لەو واقعەی کە هەیە، تاکو تێبگەن و بزانن چ بابەتێکی نوێی تێدا دەبینرێت.

بەڕاستی زانست وەك ئاوەز نیە.. ئەمەش یانی نا، ئێمە لە نرخی ئاوەزی مرۆڤ دێنینە خوارێ... چونكە بەڕاستی ئاوەزی مرۆڤە چەكێكی گەورە و سەنگینی مرۆڤ و رۆڵێكی گەورەی دیوە لە ڕەوتی گەشتنی ژیاری مرۆڤایەتی بە لوتكە سەركەشەكان... ئەوەندە هەیە دەمانەوێت ئاوڕ بدەینەوە بەلای ئەو هەقیقەتە دا كە ئاوەزی مرۆڤ چەكێكی دوو دەمە... لە لای توێژەرێكی ئەزمونكار هۆكاری پێشكەوتنە... لە لای كابرای ژیری لەخۆبایی بە ئاوەزیەوە، ئاوەز دەبێتە لەمپەری بەردەم پێشكەوتن.

## پەیڤی كۆتایی:

دوای ئەوەی هەر بەشێك لەم پەرتوكەم بە جیاواز باس كرد، دەخوازم بە شێوەیەكی گشتی باسی هەموو پەرتوكەكە بكەم... وەك لەمەو پێشیش باسم كردوە، ئەم پەرتوكە، بەشی هەرە زۆریم بەر لە هەڵایسانی شۆڕش نوسیوە و چاپیشم كردبوو... ئەمەش یانی لە ڕووی شێواز و سروشتی بیرۆكەكانیەوە جیاواز نیە لەو پەرتوكانەی دیكەم كە لە سەردەمی رژێمی پێشوو (سەردەمی پادشایەتی عێراقی مەبەستە - وەرگێڕ) دا نوسیومن... بۆیە دەبێت دان بەو راستیەدا دابنێم و بڵێم: ئەم پەرتوكە ئەگەر بۆ سەردەمی ڕابردوو گونجاو بوبێت، ئەوا بۆ ئەم سەردەمە شۆڕشگێڕیە نوێیە ناگونجێت.

ئەمە لە ڕووی دان نان بە واقیع دا دەڵێم هەر چەندە تاڵیش بێت، هەقە دان بەو خاڵە دابنێم و ئاشكرای بكەم تاكو خوێنەر بەرچاوی ڕون بێت، لە كاتێكدا ئەم پەرتوكە یان هەر پەرتوكێكیترم دەخوێنیتەوە كەلە سەردەمی پێشوو دا نوسیومە... ڕاستیەك هەیە نابێ لەبیر خۆمی بەرمەوە، ئەویش بریتیە لەوەی زەوقی خوێنەری عێراقی بەهۆی هەڵایسانی شۆڕشەوە گۆڕانی گەورەی بەسەر دا هاتووە... جاران چێژیان لەو بابەتە كۆمەڵایەتی و دەرونیانە دەبینی كە من و هاوشێوەی من دەمان نوسی و توخنی سیاسەت نەدەكەوتین، بەڵام خوێنەری ئێستە دەیەوێت نوسەر لە نێو كرۆكی سیاسەتەوە بنوسێت و ڕای خۆشی دەربارەی ئەو مەسەلانە ڕابگەیەنێت كە خەڵكی ململانێی لەسەر دەكەن.

وام دێ بە خەیاڵ دا، کە خوێنەرێ ئەم پەرتوکەم دەخوێنێتەوە خەندەی بەزەیی هاتنەوە بکەوێتە سەر لێوەکانی، ڕەنگە بشڵێت: سەرنج بدەن لەو نوسەرە باس لە خەو دەکات لە کاتێکدا مرۆڤ دەچێتە سەر مانگ... بەڵێ... من نکوڵی ناکەم لەو قسەی ئەو خوێنەرە دەیکات... گەر منیش لە شوێنی ئەو بوایەم هەمان قسەم دەکرد.. گومانی تێدا نیە شۆڕشی (١٤ی تەمموز)، شۆڕشێکی ڕادیکاڵی گەورە بوو، ئەقڵی خەڵکی لەرزاند و تێگەیشتنەکانیانی واژگون کرد.. بڕواشم وایە سەردەمی شۆڕش پێویستی بە کۆمەڵێ نوسەر و وێژەری نوێ هەیە، کە جیاواز بن لەو وێژەر و نوسەرانەی، خەڵکی لەسەردەمی ڕابردوو دا پێیان ڕاهاتبوون. لەوانەشە کەسێك بپرسێت: ئەگەر مەسەلەکە وابێت کە خۆت دەیڵێیت، دەی کەواتە بۆچی شێوازی خۆت ناگۆڕیت تاکو بگونجێت لە گەڵ سەردەمی نوێ دا؟!

وەڵامیش بۆ ئەم قسەیە، بەم تەرزەیە: نوسەر بە شێوەیەکی گشتی ئاسان نیە بۆی بە ویستی خۆی شێواز بگۆڕێت، چونکە شێواز بەشێکە لە کەسێتی، کەواتە ناگۆڕێت مەگەر پێکهاتەی کەسایەتی ئەو بگۆڕێت، ئەمەش زۆر سەختە، نەخاسمە لە کەسێکدا وەك من وابێت، و سەردەمی لاوێتی گوزەراندبێت و ماوەیەکی درێژیش بێت پێی نابێتە سەردەمی پیرێتی‌یەوە... وە بیرم دێت خۆشم جارێکیان لە کۆبونەوەی یەکێتی ئەدیبان دا ئاوا قسەیەکم کرد، هەندێ لە ئەدیبە لاوەکان کە ئێستا ئامادەگی‌یان هەیە پێی قایل نەبوون.

ئەو لاوانە وا دەزانن نوسەر چۆنی بوێت و هەر کات بیەوێت دەتوانێت شێوازی خۆی بگۆڕێت... ڕەنگە بۆیە ئەو ڕایەیان هەبێت چونکە هێشتر گەنجن و کەسایەتیان لە قاڵب نەدراوە وەك ئێمەومانان... گەر ڕێگەشم بدەن پێیان دەڵێم: زۆربەیان خاوەنی نوسینی تایبەت بە خۆیان نین، تاکو ڕەوا بێت پێیان بڵێین دەتوانن شێوازەکەیان بگۆڕن... هەندێ لەوانەیان کە لەسەردەمی شۆڕش دا دەنوسن، نوسینەکانیانمان تاقی کردۆتەوە و ئەو شێوازەمان تێدا نەدیوە کە کەسایەتی هەر یەکێکیانی پێوە دەناسرێت... تەنانەت لەوانەیە زۆربەی بەرهەمەکانیان لە ڕووی دەربڕینەوە لەیەك دەچن، وەك ئەوەی

لەیەك سەرچاوەوە هاتبن... بەجۆرێ گەر بمەوێت وەکو ئەوان بنوسم، زۆرێ لەو نوسینانە دەنوسم... وەلێ بەدیدی من گرفتەکە زۆر لەوە قوڵترە...

زۆر سەرسامم لە قسەی ئەو وێژەوانە گەورەیەی کەلە یەکێك لە کۆبونەوەکانی (یەکێتی ئەدیبان) دا کردی. ئەو ئەدیبە گەورەیە لۆمەی زۆری ئەدیبانی عێراقی کرد، بەڕای ئەو گوایە ئەدیبەکان لە دوای جەماوەرەوە ڕۆشتون نەك لە پێشی جەماوەرەوە... هەر ئەمەش بوە هۆی تێوەگلانی جەماوەر لە چەندین هەڵەی بەئازار دا کە وایکرد ڕێگەی ژیان لەم وڵاتە دا پڕ بێت لە کۆسپ و لەمپەر.

*** *** ***

نامەگەلێ پێگەیشتووە لە خوێنەرانەوە، تیای دا پرسیاری ئەوەم لێدەکەن کە بۆچی لەم قۆناغە گرنگەی ژیانمان دا بێدەنگیم هەڵبژاردوە... خاوەنی ئەو پەیکانە وایان لەمن دەوێت کە وەك پێشوتر لەسەر نوسین بەردەوام بم... واش گومان دەبەن مەسەلەکە بە دەست منە و قەڵەمەکەشم گوێڕایەڵە و چۆنم بوێت دەتوانم ئاراستەی کەم بە ئارەزووی خۆم و بەگوێرەی ویستی بارودۆخە کۆمەڵایەتیە نوێکەش.

لەراستی دا لەسەرەتای شۆڕشەوە، هەوڵم دا وتار بنوسم بۆ ڕۆژنامەکان و تیای دا سروشتی شۆڕش شی بکەمەوە.. دوای ئەوەی وتارەکانم بڵاو کردەوە هەستم کرد شکستم هێناوە... بەڵای زۆرێکیشەوە وتارەکان پوچ و سارد بوون، پتر لە جارێکیش لۆمە و سەرزەنشت کرام بە هۆی ئەو وتارانەوە. خوداش دەزانێت زۆر نیگەران بووم و ئەفسوسم خوارد، کاتێ بینیم دەستەوسانم لەوەی بە پێنوسەکەم لە گەڵ ڕەوتی شۆڕش دا بگوزەرێم، وەکو چاوەڕانم لێدەکرا... وەلێ ئەفسوس خواردن هیچ سودێ ناگەیەنێت.

هەر کەس پەرتوکەکانی پێشوم بخوێنێتەوە هەست دەکات من ئارەزوم لەوەیە بە دوای ناتەواویەکانی کۆمەلگە و ئەو بیر و باوەڕە زیانبەخشانەدا بگەڕێم کە بەسەر ئاوەزی ڕۆڵەکانی کۆمەلگەدا زاڵن... پێدەچێت قسەیەکی راست بێت ئەگەر بڵێم: من

پسپۆڕیم لەو جۆرە نوسینە کۆمەڵایەتیە دا پەیدا کردوە، تۆزقاڵێك نەبێت ئیتر ناتوانم لەو شێوازە لا بدەم.

لە ماوەی ڕابردوودا بوارم هەبوو تیای دا بنوسم و لە لایەن خوێنەرانیشەوە دەست خۆشی بکرێم و هان بدرێم... وەلێ هەنوکە شۆڕش دەروازەکانی نوسین و بڵاوکردنەوەی والاّ کردوە، ئیدی کاتی ئەوە هاتوە من و هاوشێوەکانی من گۆشەگیری بکەین لە نوسین و بوار بدەین تازەنوسەرەکان ئەسپی خۆیان تاو بدەن.

لەبەر ئەوە داوا دەکەم لە خوێنەران باری گرانی ئەم پەرتوکەم هەڵگرن و ئارام بگرن لەسەری، لەڕاستی دا ئارەزووم نەبوو لەوەی بڵاوی بکەمەوە ئەگەر بەر لە شۆڕش بەشی هەرە زۆری چاپ نەکرایە... ماوەیەك پشت ئەستور بوم لەوەی چاپی نەکەم و ئەو پارە و هەوڵەش تیای دا سەرفم کردوە بە فیڕۆ بچێت... هەر چۆن بێت خوێنەران دەتوانن ئەم پەرتوکە بە فیلمێکی سینەمایی سەرنەکەوتو بدەنە قەڵەم... لەبەر ئەوەش هەوڵم داوە نرخی یەك دانەی بە قەدەر نرخی بلێتێکی چونە نێو سینەما بێت.. چەند زۆریشن ئەو فیلمانەی خەڵکی دەچن بۆ بینینیان و دوایی کە دێنە دەرێ پەشیمانن لە بینینی.

*** *** ***

پەرتوکێکم هەیە بەر لە چەند ساڵێ ئامادەم کردوە بۆ چاپ... جارێکیان بانگەوازێکی کۆمێدیم بۆ کرد و گوتم: ئەو پەرتوکە خوا بیەوێت لە دوای مردنی نوسەر بڵاو دەکرێتەوە... هۆکاری ئەم بانگەوازە کۆمیدیەش ئەوە بوو کە من بڕوام نەدەکرد: لای ئێمە شۆڕش لەماوەیەکی نزیك دا ڕوو بدات... ئێستاش کە شۆڕش خێراتر لەوەی من بۆی دەچووم، بەرپا بووە، ئایا من دەتوانم ئەو پەڕاوە کۆنانە چاپ و بڵاو بکەمەوە؟ نەخێر!

یەك لەو پەرتوکانەی ئامادەم کردون بۆ چاپ، هەوڵێکی زۆرم لە گەڵ داوە و ناوم ناوە (شاکاری خەڵکی عێراق)... هەر چۆن بێت، کتێبێکە لە ناتەواویەکانی کۆمەڵگای عێراق و ئەو بەها خراپ و توندڕەویە دەکۆڵێتەوە کە لەو کۆمەڵگەیە دایە.

هەر کەس لە دۆخی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری ئەو سەردەمانەی رابردوو بکۆڵێتەوە وەك گەلی عێراق گوزەری کردوە پیایان دا، دەگات بەهەمان بەرەنجام کە بەندە پێی گەشتووم.. لەگەڵ ئەمانەش دا متمانەم پتەوە بەوەی گەر ئێستە ئەو پەرتوکە بلاو بکەمەوە زۆرێك لە خوێنەران بە تەرێزلێکردن پێشوازی لێدەکەن و ڕووبەڕووی دەبنەوە... خوێنەران لەو هەلوێستەیان دا لۆمەیان لەسەر نیە... ئەوان لەم قۆناغە شۆرش گێریە دا دەیانەوێت نوسەر شتێ بۆ گەل بنوسێت هانی بدات و کردەوەکانی بەرز راگرێت... نەك لۆمەی بکات و... هەڵەکانی بۆ بژمێرێت.

*** *** ***

لە پەندێکی کۆن دا هاتووە: هەر سەردەمە پیاوی خۆی هەیە... لەسەر هەمان تەرزی ئەو پەندە، دەکرێت بێژین: هەر سەردەمێ نوسەر و خوێنەری خۆی هەیە...

و علی کل فالأمر لله الواحد القهار!..

د.عەلی وەردی

## پەراوێزەكانی ئەم پێشەكیە:

١- چینی شەریفان (طبقه الاشراف): مامۆستا وەردی مەبەستی لەو گروپە خەڵكانەیە كە نەسەبی خۆیان دەدەنەوە پاڵ پێغەمبەری خودا... لە نێو كوردەواری دا بەو چینە دەگوترێ (شێخ یان سەید "سەیی") و بەخەڵكانیتر دەگوترێ (مسكێن یاخود ئۆمی) ئێمە لە ئێستە بەدواوە دەستەواژە كوردیەكان (یان بەكوردی كراوەكان) لە كاتی وەرگێڕاندا بەكار دێنین بە تایبەت هەر دوو وشەی (سەید) بۆ چینی ئەشراف و (ئۆمی) بۆ خەڵكی رەشۆكی، وەك باوە لە نێو كوردەواری دا بە كار دێنین، مەبەستمانە لە فۆرمی ئاسان دا مەبەستەكان بگەیەنین، نەك ئێمە پشتگیری یان دژی زاراوەكان بین ـ وەرگێر ـ

٢- بنوارە: مصطفى عمارة، جواهر البخارى، ل ٥١٥.

٣- بنوارە: محمد السماوى، ظرافة الاحلام، ل ٥.

٤- بنوارە: د. حسين محفوظ. سيرة الشيخ احمد الاحسائى، ل ١٧.

٥- بنوارە: محمد السماوى، ظرافة الاحلام، ل ١٥ - ١٦.

٦- بنوارە: هـ . س. ل ٢١ - ٢٢.

٧- بنوارە: جعفر الخليلى، اولاد خليلى، ل ١١ - ١٤.

٨- بنوارە: مصطفى جواد ، ونسيم سوسة، بغداد، ل ٢٢٠ - ٢٢١.

٩- بنوارە: هـ . س، ل ٣٢٢

١٠- بنوارە: آخر الساعة، ژمارەي رۆژي ١١/ ١٢/ ١٩٥٩.

١١- بنوارە: مقالات الشيخ الحفيد، ل ٩٢ - ٩٣.

١٢- بنوارە: Hddfield, Dreams and Nightmares, p 3 – 4

١٣- بنوارە: Rhine, new World of the mind

١٤- بنوارە: توفيق الطويل، ل ٢٠.

١٥ـ کۆلێژەکەش بڕوانامەی دکتۆرای پێبەخشی (سوپاس بۆ خودا) و ئێستاکە دکتۆرێکە بە ئەنگوست ئامازەی بۆ دەکرێ.

١٦ـ بنواڕە: Electro-magintic, Waves

١٧ـ بنواڕە: Jeans Mysterious universe, p 93 – 94

١٨ـ بنواڕە: Rhine, Reach of mind, p 50

# بەشی یەکەم:

## (بۆچونی قەیمیەكان لە مەڕ خەون)

**خەون لای خەڵكە سەرەتاییەكان:**

مرۆڤی کۆن بـە سـادەیی بیرکردنـەوەی دا دەناسـرێتەوە، ئـەو دەبینێـت کۆمـەڵی دیاردەی سەیر لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوە، ئیدی هەوڵ دەدات بە گوێرەی چەمك و تێگەیشتنە سادەکانی خۆی ئەو دیاردانە شیکار بکات.

خەون یەکێك بوە لەو دیاردانەی کە مرۆڤی سەرەتایی سەرسام کردوە.. لەوانەیە لە خۆشی پرسیبێت چۆن دەتوانێت شتێك لە خەونی دا ببینێت کە لە نزیکیشەوە نین... بۆیە پێدەچێت بەو هۆیەوە گەشتبێتە ئەو بڕوایەی کە خوداوەند و شەیتانەکان ڕۆڵیان هەیە لە دروست بونی خـەون دا.. لە دیدی وی دا بـە تـەنها خوداوەند و شـەیتانەکان دەتوانن کاری وا بکەن.

هـەر بۆیـەش بڕوایـان وابـوو، خـەون ئـەرکێکی زۆر گـەورەی مرۆیـی لەسـەرە، ئەرکەکەش بریتی‌یە لەوەی خەون ئەو شتە نادیارانە بۆ مرۆڤ دەدۆزێتەوە کە ڕۆژگار لێیانی شاردۆتەوە.[1]

دەڵـێن: لـە نێـو هـۆزە سـەرەتاییەکان دا، کەسـەکان جیـاوازی ناکـەن لـە نێـوان کردەوەیەکدا کە بە واقعی و لـە ساتەوەختی بێداری دا بیکەن و کردەوەیـەکیش کە لەساتی خەوبینین دا بیکەن.. ئەگەر لە خەون دا ببینێت کەسێك دەست درێژی دەکاتە سەر یاخود هەڕەشە و گوڕەشەی لێدەکات، بە تەواوی بڕوا بەوە پەیدا دەکات کە فلان کەس هەر بە ڕاستی وای کردوە. تەنانەت سڵ ناکاتەوە لەوەی بەیانی بڕواتـە سـەر ئـەو کەسە و لۆمەی بکات یاخود تۆڵەی لێبکاتـەوە.... جێگەی پێکەنینیشە کە دەبینین دو پیاوی سەرەتایی دوژمنایەتی سەختی یەکتر بەوپەڕی توندی دەکەن بە هۆی ئەوەی

یەكێكیان لە خەونی دا دیویەتی كەسەكەی تر دەست درێژی كردۆتە سەری... خەڵكیش لە دەوروبەری دا ئەوە بە شتێكی ئاسایی دەبینن كە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە.

نەریتی هەندێ هۆزی سەرەتایی رێگە بەوە دەدات، كابرایەك كیژێك بكاتە ژنی خۆی، ئەگەر لە خەونی دا ببینیبێتی لە گەڵ ئەو كیژەدا كردەوەی سێكسی دەكات[٢] بەبڕوای ئەوان مادەم لە خەون دا كردەوەی سێكسی لە گەڵ ئەو كیژە كردوە، ئەوا ڕەوایە لە ژیانی واقیعیش دا درێژە بەو كردەوەیە بدات.

**خەون و ئاینی سەرەتایی:**

لە زانستی كۆمەڵناسی دا دوو بیردۆز هەن كە لە مەسەلەی دروست بونی ئاین دا گرنگی زۆر بە خەون دەدەن، دوو بیردۆزەكەش بریتین لە تیۆری (سبنسر و تیۆری تیلەر).

(سبنسر) دەڵێت: مرۆڤە سەرەتاییەكان جیاوازی ناكەن لە نێوان نوستن و مەرگ دا... لە هەر دوو حاڵەتەكەدا رۆح لە جەستەی خاوەنەكەی دێتە دەرێ... بەڵام لە دوای نوستن دەگەڕێتەوە نێو جەستەی خاوەنەكەی.. ئەمە لە كاتێكدا لەباری مردنی دا بەتەواوی لێك جیا دەبنەوە... بەڕای (سبنسر) ئەم بۆچونە سەرەتاییە، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ئاینە جۆراوجۆرەكان... هەر كەسێكیان لێبمردایە، خزم و نزیكەكانی هەڵپەیان دەكرد بۆ جێبەجێكردنی هەندێ سروتەی تایبەت و قوربانی كردن بۆ رۆحەكەی، لەپێناوی ئەوەی لە رۆحەكەیەوە یارمەتی وەرگرن... لێرەشەوە (پەرستنی پێشینان) سەری هەڵدا كە یەكەمجۆری پەرستنە لە نێو مرۆڤ دا.[٣]

(تیلەریش) پێی وایە بیرۆكەی (رۆح) لای مرۆڤی سەرەتایی لە تێبینی كردنی خۆیەوە لە كاتی نوستن دا پەیدا بوە... ئەو خەونە سەیر و سەمەرانەی كە دەیان بینێت هانی دەدەن بۆ بیركردنەوە لە بونی (گیان) لە جەستەی دا... ئەوەش گەیاندیە ئەو بڕوایەی كە هەموو شتێ لەم دنیایەدا گیان و جەستەی هەیە، بەم پێودانگەش جیهان پڕە لە ژمارەیەكی بێكۆتایی (رۆح).. گیانیش لە یەك كاتدا دەتوانێت هەم سود و هەم زیانیش بە مرۆڤ بگەیەنێت... خواوەندەكانیش ج نین جگە لە بژاردەیەكی

تایبەتی ئەو (رۆحانە) و لە رۆحەكانیتر بەرز بوونەتەوە و، بەو جۆرە بونەتە جێگەی ترسان و پەرستن...[٤]

ئەوەی جێگەی ئاماژەپێدانە هەرتكە تیۆرەكە بە لای زانایانی سۆسیۆلۆژی نوێوە كۆن بوون... چونكە لە بریتی ئەم دوو تیۆرە، بیردۆزی نوێ سەریان هەڵداوە كە لە شیتەڵ كردنی سەرهەڵدانی ئاین دا ڕای نوێتریان پێیە... بەڵام هەر چۆن بێت ئاماژە دەدەن بە كاریگەری خەون لەسەر بیركردنەوەی مرۆڤی سەرەتایی.

## خەون لەشارستانیەتە دێرینەكاندا:

وا دەردەكەوێت گەلانی پێشكەوتووی سەردەمی كۆن زۆر جیاواز نەبوون لە گەلە سەرەتاییەكان لە مەسەلەی بەپیرۆز سەیركردنی خەون و بە ئیلهام لە قەڵەمدانی... دەڵێن بابلیە كۆنەكان خودایەكی تایبەت بە خەونیان هەبوە بەناوی (ماخر)ەوە... هەروەها میسریەكانیش خوایەكی تایبەتی خەونیان هەبوە بەناوی (بس)، تەنانەت وێنەی ئەم خودایە لەسەر زۆربەی ئەو سەرینانە نەخشێنرابوو، كە میسریەكان بۆ نوستن سەریان دەخستنە سەر.[٥]

قورئان و تەورات ئاماژە دەدەن بەوەی چەندە میسریە كۆنەكان گرنگیان داوە بە شرۆڤەكردنی خەون... و باسی ئەوە دەكەن كە چۆن (یوسفی راستگۆ) توانیویەتی لە ڕێگەی زیرەكی لە ڕاڤەكردنی خەونەوە بگاتە بالاترین پۆستی دەوڵەت.

ئیغریقە كۆنەكان لەم ڕووەوە لە میسریەكان دەچون... تەنانەت لەوانەیە هەندێ لە بیر و باوەڕەكانی تایبەت بە خەونیان لە ڕێگەی دەریاوە لە میسریەكان وەرگرتبێت... دەستەلاتدارانی (ئەسپارتە)ش، لێیان دەگێڕنەوە كە لە نێو پەرستگایەكی تایبەت دا دەخەوتن، بەو هیوایەی لە كاتی نوستنەكەیاندا دەنگ و باسی غەیبی و نادیار وەربگرن.. خەون كاریگەری گەورەی هەبوو لە ئاراستەكردنی سیاسەتەكانیان بۆ حوكم كردنی وڵات.

لە (ئەسینا) دادگای باڵا لە ڕێگەی بڕیارێكەوە كە لە خەون دا دەدرا، بڕیاری تاوانباری و بێتاوانی دەدا بەسەر تۆمەتبارەكانی دا.. دەشگێڕنەوە پیری فەیلەسوفەكانیان (ئەفلاتۆن) بڕوای بە ڕاستی خەون هەبووە.

لە (ڕۆما)ش، ڕەوشەكە جیاواز نەبوو لە (ئەسینا و ئەسپارتە)... سەیریش لەوە دایە ئەنجومەنی نوێنەرانی ڕۆمانی، بەدەم داواكاری هەر خەونێكەوە دەچوو كە كەسێكی ئاساییش بیدیبا.

**یەكەم دانەر لە بواری خەوندا:**

كاتێ لە نێو ئیغریقەكان دا نەریتی دانان لە بواری زانستە جیاجیاكاندا بڵاو بویەوە، لە نێویاندا نوسەرێ بە دەركەوت كە تایبەتمەند بوو لە بواری خەون دا بەناوی (ئەرتەمیدۆس).. ئێمە بە دڵنیاییەوە نازانین: ئایا لەم بوارە دا كەس پێشی ئەم دانەرە كەوتوە یان نە..ئەوەی دەیزانین تەنها ئەوەندەیە ئەم كابرایە یەكەم دانەرە لە بواری خەون دا لە مێژووی جیهان دا... پێنج كتێبی لەسەر خەون نوسیوە كە لەسەردەمی عەباسیەكاندا گرانە عەرەبی... كتێبەكانی شوێنەوارێ گاڵتە پێنەكراویان لە بیركردنەوەی ئیسلامیدا بەجێهێڵا.

(ئەرتەمیدۆس) هەموو خەونەكان دەداتە پاڵ خواوەندەكان... بەڵام دەیانكاتە دوو بەشەوە: بەشێكیان بێپەردە و ڕاشكاون و ڕاستەوخۆ هەواڵی غەیب دەدەن. بەشێكی دیكەشیان شاراوەن... ئەرتەمیدۆس لە پەرتوكەكانی دا یاسا و ڕێسای داناوە بۆ شیكردنەوەی جۆری دووەمی خەونەكان...كە كتێبەكانیشی دەخوێنینەوە هەست دەكەین لێكچونێكی زۆری هەیە لە گەڵ ئەو پەرتوكانەی لە نێو موسڵمانان دا بڵاون.

ئەرتەمیدۆس بڕوای وایە جەفەنگەكان لە خەون دا ڕەگ و ڕیشاڵی خۆیان لە بارودۆخ و نەریتی كۆمەڵایەتی و كەسێتی كەسە خەو بینەكەوە وەردەگرن. لە بەر ئەوە پێویستە (شرۆڤەكەری خەون) ئەم مەسەلانە بە تەواوی لە بەر چاو بگرێت و لێیان تێ بگات، تاكو بتوانێت پەی بەرێت بەوەی جەفەنگی نێوخەونەكان واتای چ هەواڵێكی نادیار و غەریب دەگەیەنن.(٧)

**تیۆری ئەرەستۆ لەبارەی خەونەوە:**

(ئەرەستۆ تالیس) بەوە لە بیریارانی دێرین جیا دەکرێتەوە، کە ئەم بەشێوەیەکی بابەتی لە خەونی کۆڵیوەتەوە، خەونی داڕنیوە لە دەست تێوەردانی خواوەند... دەکرێ ئەرەستۆ لەم ڕووەوە بەیەکەم زەندیقی شیزامی دابنرێت... ئەو دەڵێت خەون لە ئەنجامی کاریگەریە بەرهەستەکانەوە پەیدا دەبێ... زۆر جار مرۆڤ لە بێداری دا چێژێ یان ئازارێکی پێدەگات بەڵام گرنگی پێ نادات لەبەر ئەوەی سەرقاڵە بە ئەرکەکانی ژیانەوە... بۆیە کە دەخەوێت بە ئاشکرا لە خەونی دا ئەوەی بۆ دەردەکەوێت... ئەمەش یانی خەون هەستکردنە بچوکەکان دەگۆڕێت بۆ هەستکردنی گەورەکراو... کەسێکی خەوتوو گەر ورتەورتێکی سوك ببیسێ، لە خەونی دا وا دەزانێت چەخماخەیەك کەوتۆتە سەری.. یاخود گەر کەمێك قلْخ (بەڵغەم) بە گەروی دا بچێتە خوارێ، لەخەونی دا وادەزانێت هەنگوینی زۆر بەتامی نۆش کردوە... یان گەر کەمێك گەرمی بەر لەشی بکەوێت، لە خەونی دا وادەزانێت بە نێو ئاگر داگوزەر دەکات...

ئەرەستۆ هەروا پەی برد بە کاریگەری ئارەزوو و سۆز و میزاجە جیاوازەکان لە دروستکردنی خەون دا... خۆشەویست دارێ لەخەونی دا بەگوێرەی ئارەزووی خۆی خەو دەبینێ. ترسنۆکێکیش هۆکاری ترسەکەی لە خەونی دا دەبینێ.. تەنانەت زۆر جاران مرۆڤ خەون بەشتێکەوە دەبینێ کە جێگەی گرنگی پێدانی بوە لەساتەوەختی بێداری دا...[8]

گەورەیی (ئەرەستۆ) لەکاتێکدا دەردەکەوێت کە بەرەو ڕووی (خەونە ڕاستەکان) دەبێتەوە.. (خەونە ڕاستەکان) ئەو خەونانەن کە بە ماوەیەك لە دوای بینینیان دێنە دی... ئەرەستۆ پێی وایە هاتنە دی ئەو خەونانە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی بەڕاست هەواڵی نادیاری داوە، وەك ئەفلاتۆن و بیریارانیتر پێیان وابوە.. بەڵکو هاتنەدی ئەو خەونانە بۆ چەند فاکتەرێ کە دورن لە دەست تێوەردانی خواوەندەکان، دەگێڕێتەوە.

ئەرەستۆ چوار فاکتەر بۆ هاتنەدی خەونەکان دیاری دەکات. بەم تەرزە:

١- هۆکاری ڕێکەوت: ئەمەش زۆر جار لە هەر دوو حاڵەتی خەون و بێداری دا بەسەر مرۆڤ دا دێت... زۆر جار مرۆڤ باس لە ڕوودانی شتێك دەکات و ماوەیەك دوای ئەوە بە ڕێکەوت شتەکە ڕوو دەدات.

٢- هۆکاری ئیحا: بەواتای ئەوەی مرۆڤ کاتێ خەون بە ڕودانی شتێکەوە دەبینێ، ئەو خەونە لە لای وەك ئیحایەکی لێدێت و بەسەر ئاوەزی دا زاڵ دەبێت، ئەمەش هانی دەدات کە هەوڵ بۆ بەرجەستەکردنی خەونەکەی و هێنانەدی ڕووداوەکە بدات.

٢- هەستکردنی قەبە کراو: هەندێ جار مرۆڤ خەون دەبینێ بە نەخۆشین یان مردنەوە کە دوچاری دەبن.. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەست کردنی بە (ئاڵۆز بوونی وردی ئەندامی) لە کاتی نوستن دا... ئەم هەستکردنەش بەڵگەیە لەسەر بونی نەخۆشییەکی پەنهانی کە مرۆڤ بە هۆی سەرقاڵی بەژیانی ڕۆژانەیەوە هەستی پێناکات.

٣- گرنگی دانی تایبەت: ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆوەی مرۆڤ گرنگی زۆر دەدات بە بارودۆخی خزم و نزیکەکانی زیاد لەو گرنگی‌یەی دەیدات بە بارودۆخی خەڵکانی‌تر... بۆیە هەندێ جار لە خەونی دا دەبینێ ڕوداوێك دێت بەسەر خزمەکانی دا، دواتر هەر بەڕاستی ڕوداوەکە لێیان ڕودەدات، ئەمەش بۆ ئەو گرنگی‌یە دەگەڕێتەوە کە لە کاتی بێداری دا بە خزم و نزیکەکانی داوە.

**تیۆری ڕەواقیەکان:**

تیۆری ڕەواقیەکان لە خەون دا پێچەوانەیە لە گەڵ بیردۆزەکەی (ئەرستۆ)دا... ئەمان دوچاری سەریەشەی زۆر بوون لە بەرگری‌کردنیان دا لە (خەونی ڕاست) و بە سروش لە قەڵەم دانی... ڕەواقیەکان دەڵێن: دەروونی مرۆڤ لە کاتی بێداری دا نێچیری ئارەزووە جەستەییەکانیەتی، بەخەوتن لەو ئارەزوانە قوتار دەبێت، بەو جۆرە بە هێزتر دەبێت بۆ دۆزینەوەی شتە نادیارەکان.

ئەرستۆ پشتی بەخەون دەبەست کە نکوڵی لە خەونی ڕاست دەکرد.. ئنجا ڕەواقیەکان هاتن و گوتیان: ئاوەز ناتوانێت لەمجۆرە بابەتانەدا ببێتە دادوەر، ناکرێ

مرۆڤ ملەجەڕەی شتێ بکات تەنها لە بەر ئەوەی عەقڵی دەستەوسانە لەوەی پێشبینی بکات یاخود لێی تێبگات.

ڕەواقیەکان بە نمونەیەکی بەرهەست پشتگیری ڕاکەیان دەکەن کە ئەویش (موگناتیسە)...

هەر کەس نهێنی هێزی موگناتیسی نەزانێت، ملەجەڕێ دەکات لەوەی موگناتیس ئاسن ڕادەکێشێت، لە کاتێکدا بە چاوی خۆشی دەیبینێت[٩] .. بەڵام کاتێ خەڵکی بەو دیاردەیە ڕاهاتن، ئێستا بە شتێکی ماقوڵی دەزانن، کەچی دیاردەکە (ڕاکێشانی ئاسن لە لایەن موگناتیسەوە) هیچ پاساوێکی لۆژیکی ماقوڵی نیە.

**کورتکردنەوە و جیاکاری:**

ئەمانەی باسکران کورتەی ئەو ڕایانە بوون کە بەر لە ئیسلام لە مەڕ خەون گوتراون.. دەتوانین بەم تەرزە بیان پۆلێنین:

١- بۆچونە گشتییەکان: بریتین لەو ڕایانەی کە خەونیان دەدایە پاڵ دەستێوەردانی خواوەند و شەیتانەکان... ئەم ڕایە زاڵ بوو بەسەر ئاوەزی زۆربەی بیریارەکاندا.

٢- بۆچونە ئەرستۆ تالیسیەکان: بریتییە لەو بۆچونانەی لە ڕویەکی عەقڵانیەوە ڕاڤەی خەون دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکی هێزە میتافیزیکیەکانی بەسەرەوە بێ.

٣- بۆچونە ڕەواقیەکان: ڕاو بۆچونگەلێ ڕەخنەگرانەی سۆفیانەن، لە پلەی ئاوەز دادەبەزێنێت و هەوڵی ئەودیوی ئەقڵ دەدات.

لە بەشی داهاتوودا، خوێنەر دەبینێت، چلۆن ڕای موسڵمانانیش دابەشبوە بۆ ئەو سێ بۆچونە... ئەو نەزعەیەی لەم سەردەمانەی دوایی دا زاڵ بوە بە سەر ئاوەزی موسڵمانان دا نەزعەی ڕەخنەگەرایی بوو... مەبەستیشمان لەو نەزعەیە کە لە پلە و پایەی ئاوەز دادەبەزێنێت و دان دەنێت بە کەمتوانایی ئاوەز لە تێگەشتن لە ڕاستی ڕەها.

وا دیارە سۆفیەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە بڵاوبونەوەی ئەو نەزعەیە بە نێو موسڵماناندا... وەك لەمەودوا ڕون دەکرێتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم:

١. بنوارە: Freud Bascic Wirtings. P 184

٢. بنوارە: ابومدين الشافعى، الوهم. ل ٢٤.

٣. بنوارە: روجيه باستيد، علم الاجتماع الديني، ل ٢١٨ ـ ٢١٩.

٤. بنوارە: هـ. س، ل ٢٢٠ ـ ٢٢١.

٥. بنوارە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ١١٢.

٦. بنوارە: هـ. س، ل ١١٤ ـ ١١٥.

٧. بنوارە: Freud Interprehion Dreams, p 82

٨. بنوارە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ٦٩.

٩. بنوارە: توفيق الطويل، التنبؤ بالغيب، ل ١٦٩.

# بـــەشـی دووەم:

# ڕای موسڵمانان لە بارەی خەونەوە

## گرنگی دانی زۆر بە خەون:

دەتوانین بڵێین نەتەوەی ئیسلامی، یەکێکە لەو نەتەوە کۆنانەی کە زۆر گرنگیان بە خەون داوە و بە پیرۆزیان داناوە.. لەم ڕووەوە تەنها (موعتەزیلە) و کەمێك لەو فەیلەسوفانە لێیان جیا دەبنەوە کە لە ژێر کاریگەری موعتەزیلەدان.

جێگەی سەرنجە، ئەو فەیلەسوفانەی ئیسلام کە لە دوای (ئەرستۆ) چوون، لە زۆربەی بۆچونەکانی دا، لەمەسەلەی خەون دا پێچەوانەی ئەرستۆن و ڕای ئەویان پەسەند نەکردوە... بەڕای ئەمان لەکاتی خەو دا دەروون پەیوەست دەبێ بە ئاوەزی کاراوە (کە ئەوان ناویان ناوە ئاوەزی گەردونەکان) و ئیدی بەو جۆرە و لەو ڕێگەیەوە دیاردە نادیارەکان دەدۆزێتەوە...

وا دیارە فەیلەسوفەکان لە توڕەیی و ڕقی خەڵك ترساون، بۆیە لە مەسەلەی خەون دا هاوشانی جەماوەر ڕۆشتون و لە گەڵیان دا لەپیرۆزراگرتنی خەوندا هاوڕان...

خەون و فەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ):

لە پێغەمبەرەوە (د.خ) فەرمودەگەلێ زۆر لە بارەی خەونەوە دەگێڕنەوە.. سەرجەمیشیان ئاماژەن بۆ وەی (خەونی ڕاست) سروشێکە لە خوداوە.. بەناوبانگترینی ئەو فەرمودانە، دوو فەرمودەن.. یەکیان دەڵێت: "خەون بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی...[1]" لەویتریان دا هاتووە: "سەحابەکان ناڕەحەت بوو بەلایانەوە کە لە دوای پێغەمبەر (د.خ) ئیدی سروشی دەپچڕێت.. بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دڵنیای کردونەتەوە و گوتویەتی: (لە دوای من هەندێ شتی مژدەدەر دەمێنێتەوە)،

كەپرسیاریشی لێكرا (شتی مزدەدەر چیە) فەرمووی: (خەونێ راستە كە پیاوچاكێ ببینی، یان پێیەوە ببینرێ).[٢]

ئێمە دڵنیا نین لەوەی ئایا ئەو فەرمودانە تا چەندە (صحیح)ن كە بە دەمی پێغەمبەرەوە گێڕدراونەتەوە... دەگونجێ بە درۆش نرابن بەدەمیەوە... چونكە وەكو زانراوە فەرمودەگەلێ زۆر بە درۆ نراون بە دەمی پێغەمبەرەوە (د.خ)... هەر چۆن بێ ئەو فەرمودانە لە نێو موسڵمان دا بڵاون... لای زۆرێك لە موسڵمانان پیرۆزن و ناكرێ گومانیان ئاراستە بكرێ... تەنانەت هەندێكیان گەشتونەتە بڕوایەك كە كوفرانەكردن بە خەون، كوفرانەكردنە بە پێغەمبەرایەتی... چونكە لە دیدی وان دا خەون و پێغەمبەرایەتی لە یەك سەرچاوەوە پەیدا دەبن.

## قورئان و خەون:

لە قورئان دا هەنێ ئایەت هاتوە دەربارەی خەون... بەتایبەت دەربارەی ئەوەی كە بەسەر (ئیبراهیم پێغەمبەر) داهاتووە ئەوە بوو خودا لە خەون دا داوای كرد لە ئیبراهیم تاكو كوڕەكەی سەر بڕێت.. هەروا ئەوەی بەسەر (یوسف) دا هات و لەمیسر دا شۆرەتی پەیدا كرد بە هۆی لێزانێتی لە خەو پەرژێن كردنی خەوندا... هەندێ لە شرۆڤەكارانی قورئان ئەو ئایەتانە بە بەلگەی بەهێز دادەنێن لە سەر ڕاستی خەون...

قورئانیش وەسفی بڕوادارانی كردوە بەوەی (لهم البشرى في الحياة الدنيا و الاخرة)[٣]... (فەخری رازی) ئەو (بشرى = موژدە)یەی بە خەونێكی چاك ڕافە كردوە كە موسڵمانێ دەیبینێ یا خود پێیەوە دەبینرێ... ئەم ڕافەیەش بەنێو موسڵمانان دا بڵاو بویەوە تاكو لە هزریاندا ئەوە چەسپاوە كە قورئان دان بەوە دادەنێت كە خەونی ڕاست سروشێكە لە خوداو .[٤]

## ڕای موعتەزیلە:

لەوەی رابورد باسمان لەوە كرد، كە موعتەزیلەكان لە هەموو موسڵمان جیا بوون بە تایبەتی لەمەسەلەی پیرۆزكردنی خەون دا... ئەمە جگە لەوەی لە زۆرێك مەسەلەیتردا لە موسڵمانان ڕیزپەڕ بوون... موعتەزیلە بە شێوەیەكی گشتی متمانەیان بە لۆژیك و

ئاوەزی ئاگا (العقل الواعي) هەیە... وە بڕوایان وایە خودا لە فەرمان و یاساغ کردنەکانی دا هەرگیز لە راستەڕێی ئاوەزی سەقامگیر دەرناچێ. جا هەر شتێ ئاوەز فەرمانی پێ بکات، خوداش فەرمانی پێ دەکات.

ئەمەش هانی دان گاڵتە و سوکایەتی بەو فەرمودانەی پێغەمبەر (د.خ) بکەن کە لە دیدی ئەوان دا پێچەوانەی ژیری بووە.. ڕاڤەی قورئانیشیان بەگوێرەی ئارەزووەکانی خۆیان کردوە.. هیچ گوێیەکیان بە خەلکە رەشۆکیەکە نەداوە، تەنانەت بە سوکیش سەیریان دەکەن... سلێش ناکەنەوە لە ڕاگەیاندنی هەر ڕایەك، کە ئەقلی خۆیان پێی قایل بێت، ئیدی با ئەو ڕایە پێچەوانەی بیر و باوەڕی زۆرینەی خەلك و فوقەها و واعیزەکانیش بێت.

لە بارەی خەونەوە ڕایان وایە کە بریتییە لە دالغەی تێکەڵ وپێکەڵ و وەهم... بەلگەشیان ئەوەیە، دەرك کردنی راستەقینە لە کاتی بێداری دا نەبێت بۆ مرۆڤ نایەتە دی.. هەروەها دەڵێن دەرك کردن و نوستن پێچەوانەی یەکدین و پێکڤە کۆنابنەوە.[٥] ..بۆیە لایان وایە بەهیچ جۆرێك ناگونجێت لە کاتی نوستن دا ژیری پەی بەرێت بە ڕاستیەکانی گەردون.. بەو پێیە دەرك کردنیش بە ئەندازەی وەئاگا بونە.

## ڕای سۆفیەکان:

سۆفیەکان ڕایان لەم بابەتە دا بە تەواوی پێچەوانەی ڕای موعتەزیلەیە... ئەمان ژیری بە کانگای شتە پڕ و پوچ و وەهمەکان دەزانن.. تەنانەت زۆر جار شێتێتییان پێ باشترە لە ژیرێتی... ئا لێرەشەوە بیرۆکەی بەپیرۆز ڕاگرتنی شێتەکان لە هەندێ وڵاتی ئیسلامی دا تەشەنەی کردوە... تەنانەت (ئیبن عەرەبی) شانازی بەوەوە دەکات کە پتر لە جارێك دوچاری شێت بوون بوە...[٦]

هەندێ لە سۆفیەکان وا دەبینن بێداری خەونە، و خەونیش بێدارییە.. لە کاتی بێداری دا دەروونی مرۆڤ سەرقاڵە بە دیاردە بەرهەستەکان و خواستەکانی جەستەوە... لەم حاڵەتەدا نوستوە و جگە لەو شتانەی لە ڕێگەی هەستەوە پێی دەگات لە هیچی

دیكە تێناگات... وەلێ لە كاتی نوستن دا، پەردە لە ڕوی بینینی لا دەدرێت و بە ئاسمانی بەربلاوی زانین دا دەسوڕێتەوە و، هیچ شتێ سەرقالی ناكات.

(غەزالی) بڕوای وایە، ئەوەی مرۆڤ لە كاتی خەون دا دەی بینێت نزیكترە لە مەعریفەوە وەك ئەو شتانەی لە ڕێگەی هەستەكانەوە پێی دەگات.. خەڵكیش بەهەڵەدا چوون كە وا گومانیان بردوە گوایە مەعریفە لە ساتەوەختی بێداری دا دروست دەبێ... چونكە ئەوەیان لە بیر چوە كە لە كاتی بێداری دا ئاوەزی مرۆڤ سەرقاڵە بە ئەرك و ناڕەحەتیەكانی ژیانی دنیایەوە، بەو پێیە ناتوانێ چ شتێ لە هەقیقەت تێبگات.[7]

(غەزالی) خەون بە شێوازێكی لاوازی پێغەمبەرایەتی دەزانێت.[8] ئەمەش یانی هەموو خەڵكی (بە پلەی جودا جودا) پێغەمبەرن. هەر كاتیش دەرون پاكژ بویەوە لە چڵك و چەپەڵیەكانی دونیا، ئەوجا جیهانی نادیار لە بەردەستی دا واڵا دەبێت و بەو جۆرەش بە پلەكانی پێغەمبەرایەتی و سروش دا سەردەكەوێت.

**پوختەی مەبەست:**

پوختەی مەبەست ئەوەیە: ڕای موسڵمانان لە بارەی خەونەوە ئەوەیە كە پێیان وایە خەونی ڕاست لە هەمان سەرچاوە و چاوگەوە هەڵدەقوڵێت كە پێغەمبەرایەتی لێوە هەڵدەقوڵێت.[9] ئەمەش یانی سروشی خوایی بە سێ پلە دادەبەزێتە سەر مرۆڤەكان... پلەكانیش ئەمانەن:

١- یەكەمین پلەیان: كە پلەی هەرە بەهێزیانە و تیای دا جیهانی نادیار (غەیب) بەتەواوی ڕون دەبێتەوە، ئەم پلەیە تایبەتە بە پێغەمبەران، هەر بەوەشدا پێغەمبەران لە خەڵكی دی جیا دەكرێنەوە.

٢- پلەی دوەمیان تایبەتە بە ئەولیاكان و ئەوانەی دونیانەویست و خاوەنی كەراماتن، ئەمانە لەڕوی نزیكیان لە خوداوە، لە پێغەمبەران خوارترن و لە سەروی خەڵكی ئاساییەوەن

٣- پلەی لاوازی سروش، لە ڕێگەی خەونەوە دێتە سەر موسڵمان... بە گوێرەی بڕوا و پارێزكاری موسوڵمانەكەش، خەونەكەی بەهێز یان لاواز دەبێ... هەر چەندە موسڵمان چاكەكارتر بێت، ئەوەندە خەونەكەی بێخەوش دەبێ.

هەندێ لە موسڵمان پێیان وایە، یەكەمین جار پێغەمبەر (د.خ) لە ڕێگەی خەونی ڕاستەوە نیگای وەرگرتوە.. دواتر پلە بە پلە بە پلەكانی پێغەمبەرێتی دا سەركەوتووە... خاتوو (عایشە) لە بارەی محمد (د.خ)ی هاوسەریەوە دەگێڕێتەوە كە لەسەرەتا دا محمد خەونی دەبینی و وەكو سپێدەی بەیانی بەڕاست و ڕونی دەردەچوو... هەر خەونیش بوو وای لێكرد مانەوەی لە ئەشكەوتی (حەرا) دا لا خۆشەویست بێت، تا ئەوە بوو لە كاتی خەودا نیگا لە ناكاو دابەزیە سەری[١٠].. ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ بانگەوازە گەورەكەی كە جیهانی هەژاند و ڕێڕەوی دیرۆكی گۆڕی.

**ڕای ئیبن عەرەبی:**

(ئیبن عەرەبی) كە سۆفیەكی ناسراوە، لەم بارەیەوە ڕایەكی زۆر مەترسیداری هەیە... ئەو ڕای وایە نیگا لە دەرەوەی خودی پێغەمبەرانەوە دانابەزێتە سەریان، چونكە بە ڕای وی پێغەمبەر پێویستی بە ناوەندگیرێك نیە تاكو سروشتی لە خواوە پێبگەیەنێت.. خودا لە نێو ناخ و دەروونی ئامادەیە، هەروەك چۆن لە هەموو شوێنێك دا ئامادەیە.. وەكو قورئانیش دەڵێت خودا لە مرۆڤەوە لە ڕەگی بناگوێ نزیكترە... بۆیە بێهیچ ناوەند گیر (وسیط)ێك نیگا دەداتە بەندە دڵسۆزەكانی خۆی، بەتایبەت لە كاتی نوستن دا كەهەستەكانی لە كار دەكەون... لەم ڕووەوە لە ژیانی ئیبراهیم پێغەمبەر نمونە وەردەگرێت، ئەو كاتێ لە خەون دا دیتی كوڕەكەی سەر دەبڕێت (یان فەرمانی سەربڕینی كوڕەكەی پێكرا - وەرگێڕ)، ئەوە بوو گوێڕایەڵی فەرمانەكە بوو كە لە خەوندا پێی كرابوو، ئیدی خەریك بوو كوڕەكەی سەر بڕێ ئەگەر خودا لە بری ئەو كوڕە (بەران)ێكی گەورەی بۆ نەناردایە...[١١]

من نازانم (ئیبن عەرەبی) چۆنی وێراوە ئەم بۆچونەی بۆ خەڵكی ئاشكرا بكات... لە كاتێكدا ئێمە لە سەدەی بیستەمیش داین و هێشتر دەترسین ڕایەكی ئاوها بۆ خەڵكی

دەربڕین.. هەروەها پێویستە باس لەوە بكەین كە (ئیبن عەرەبی) باوەڕی تەواوی هەبوە بە مەسەلەی (یەكێتی بوون - وحدةالوجود) ... ئەو باوەڕەشی لای خەڵكی جێگەی قبوڵ نەبووە... چونكە خەڵكی وا ڕاهاتون خوداوەندی خۆیان بێننە بەر ئەندێشەیان كە لە سەر عەرشێكی قەشەنگ لە سەروی ئاسمانەكانەوە دانیشتووە، وەك چۆن سوڵتانەكان دادەنیشن!! هەر بۆیەش دەبینین كە داوای شتێكی لێ‌دەكەن دەستەكانیان بەرەو عاسمان بەرز دەكەنەوە... بە بڕوای وان خودا لە ڕێگەی ناردنی فریشتەیەكیەوە نیگا بۆ سەر پێغەمبەرەكەی ڕەوانە دەكات... (جوبرەئیل) بۆ ئەم ئەركە تایبەت كراوە، دروست وەك ئەو سوڵتانانەی كە نامەبەرێ دەنێرنە سەر والیەكانیان.

وادیارە (ئیبن عەرەبی) و ئەوانەی وەك ئەو بڕوایان بە (یەكێتی بوون) هەیە مل بەم ڕایە نادەن... بەڵكو لایان وایە نیگا لە ناخی دەرونەوە هەڵدەقوڵێت.. ئەوەشی لە فەرمودەكاندا لە باسی (جوبرائیل)ەوە هاتون، دەچنە بواری (بە گوێرەی ئەقڵیان لە گەڵ خەڵكی دا بدوێ).. خوداش فەرمانی كردووە بە پێغەمبەرانی تاكو بە ئەندازەی ئەقڵی خەڵكی قسەیان لە گەڵ دابكەن، جا سەرنج بدە!

**كوژرانی ئیبن عەرەبی:**

پرسێ‌تر كە پەیوەندی بەم بابەتەمانەوە هەیە، ئەوەیە كە خەڵكی (شام) ئیبن عەرەبی‌یان كوشت، كاتێ پێی گوتبوون، خوداكەتان لە ژێر پێمدایە.. بە هۆی ئەو قسەوە بە كافر دایانە قەڵەم.. چۆن دەبێ خوداكەیان لە نێو خۆڵ دا بێت و پێی پیدا بنرێت، ئەمە لە كاتێكدا خوداوەند لە سەر عەرشەكەی دانیشتوە و فریشتەكان لە هەموو لاوە دەوریان داوە.

دەگێڕنەوە: خەڵكی شام لە دوای كوژرانی (ئیبن عەرەبی) ئاڵتونێ زۆریان لە ژێر پێیەوە دۆزیەوە... بۆیە هاتنە سەر ئەوەی كە مەبەستی ئیبن عەرەبی ئاڵتونەكە بوە... دیارە ئاڵتون پەرستراوی هەموانە... بۆیە لە كوشتنەكەی پەشیمان بونەوە و لە سەر گۆڕەكەی گومەزیەكی گەورەیان دروستكرد كە سەری توند دەبوو لە هەورەكان.. ئەوان تا هەنووكەش بڕوایان وایە نابێت خودا لە نێو خۆڵدا بێت، لە بیریان چوە یان لە بیری

خۆیانی دەبەنەوە كە خودا لە هەموو شوێنێكدا ئامادەیە... و جیاوازی نیە لە نێوان شوێنێك و شوێنێكی‌تردا... مەفروزە خودا بەرزتر بێت لەهەر پێودانگێكی كۆمەڵایەتی كە خەڵكی لەسەری ڕاهاتوون... گرفتی خەڵكی ئەوەیە ڕەگ و ڕیشەی بیر و باوەڕكانیان لە نەریتە باوە كۆمەڵایەتیەكانیانەوە وەردەگرن... واوەیلاش بۆ ئەو كەسەی پێچەوانەی خەڵك دەبێت لە خەیاڵات و بیر و باوەڕكانیان دا.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم:

١- بنوارە: ابن خلدون، المقدمة، ل ١٠٣.

٢- بنوارە: الغزالي، احياء العلوم، ج ٤، ل ٤٢٩ ـ ٤٣٠.

٣- بنوارە: قورئان، سورەتي يونس، ئايەتي ٦٤.

٤- بنوارە: توفيق الطويل، التنبؤ بالغيب، ل ٧٩.

٥- بنوارە: ه.س، ل ٨٠ـ ٨١.

٦- بنوارە: Mangoliouth, Mohammedanism, p 176

٧- بنوارە: الغزالي، كيمياء السعادة، ج ٤، ل ١٤.

٨- بنوارە: الغزالي، احياء العلوم، ج ٤، ل ٤٢٨.

٩- بنوارە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ٩٠.

١٠- بنوارە: محمد حسين هيكل، حياة محمد، ل ٩٥.

١١- بنوارە: ابن عربي، نصوص الحكم، ل ١٢٦ ـ ١٢٧.

# بەشی سێیەم:

## ئاسەواری خەون لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا

### زانستی لێكدانەوەی خەون:

وا دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە كە خەونی كردۆتە سێ بەشەوە و فەرمویەتی: (خەون سێ جۆرە، خەونێك لە خوداوە، خەونێك لە شەیتانەوە، خەونێكیش مرۆڤ لە بێداری دا بیری لێدەكاتەوە و ئینجا لە خەون دا دەیبینێت).. وا دیارە موسڵمانەكان لەم سەردەمانەی دوایی دا گوێیان نەداوە بەم پۆلێن كردنە... چونكە وایان زانیوە هەموو خەونێك سروشێكە لە خوداوە... بەم پێودانگە مەسەلەی (دەروون) و (شەیتان)یان لە بیر كردوە.. لە هەر خەونێكیش دا ئاماژەیەكیان دەبینی بۆ ئەوەی سبحەینێ ڕو دەدات.

بەم هۆیەوە لە نێو موسڵمانان بۆیە زانستێكی تایبەت و دان پێدانراو.. (ابن خلدون) لە (مقدمة)كەی خۆی دا بەشێكی تەواوی بۆ زانستە داناوە... بەم وتەیەش دەربارەی زانستی لێكدانەوەی خەون كۆتایی بەو بەشەی (مقدمة)كە دێنێ كە دەڵێت: (ئەو زانستە، زانستێكە بە تیشكی پێغەمبەرایەتی ڕوناك بۆتەوە، بە هۆی ئەو پێوەندیەی لە نێوانیان دا هەیە، وەك لە فەرمودەی "صحیح"یش دا هاتوە، خوداش زاناترە)[1]

### ئیبن سیرین:

گەورەترین كەسێ كە لە نێو موسڵمانان دا بەناوبانگ بێت لە بواری خەوپەرژێن كردن دا (محمد كوڕی سیرین)، فەقیهی ناسراوە.. تەنانەت دەگونجێت نازناوی (ئەرتمیدۆسی عەرەبی) لێبنرێت... لە زانستی خەوپەرژێن دا، چەندین پەرتووك دەدرێنە پاڵ (ابن سیرین)، هەر چەندە گومان وایە هەندێك لەو پەرتوكانە یاخود هەموویان دانراوی ئەو نەبن... ابن سیرین ساڵی (١٠٨ی كۆچی) مردوە... ئەمەش یانی

ئەو لە سەردەمێکدا ژیاوە کە خەڵکی دانانی کتێبیان بەو بەربڵاویەی لە دوایی دا سەری هەڵدا دەست نەدا بوێ .. تەنانەت لەوانەیە ئەو کتێبانەی ناوی (ابن سیرین)یان لەسەرە لە دوای مردنی ئەو دانرابن و ناوی ئەویان بۆیە خراوەتە سەر تاکو لە نێو خەڵکی دا رەواج پەیدا بکات... ئەمەش سەیر نیە، چونکە ناوی ئەو پیاوە بوە ئەفسانەیەکی وا کە ناوبانگێکی فراوانی هەبوو، بە ڕادەیەك خەڵکی دیاردەی نائاساییان دەدایە پاڵی، کت و مت وەك (یوسفی ڕاستگۆ) سڵاوی خوای لێ بێ.

کاتێ ئەم چەند دێڕە دەنوسم، لە پەڕاوگەکەمدا، پەرتوکێکم لە بەردەست دایە، کە دراوەتە پاڵ (ابن سیرین) بە ناوی (کتاب تفسیر المنامات الکبیر)... بە چاپێکی هەرزان چاپکراوە... لە کۆتاییەکەش دا (کتاب المندل) چاپکراوە.. لە دیدی وان دا هەر دوو بابەتەکە لە یەك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵن.. وەك ئاشکرایە ئەم پەرتوکە و هاوشێوەکانی لە ناو خەڵکی دا ڕەواجێکی زۆریان هەیە.

**وەرگێڕانی ئەرتەمیدورس:**

نزیك بە سەد ساڵێك لە دوای کۆچی دوایی (ابن سیرین)، (حنین کوڕی اسحاق) هەستا بە وەرگێڕانی پەرتوکەکەی (ئەرتەمیدۆس) بۆ سەر زمانی عارەوی.. لە نێو موسڵمانان دا ئەو وەرگێڕانە ڕەواجێکی زۆری پەیدا کرد.

سەردەمێك بە سەر موسڵمانان دا تێپەڕی، وایان بیر دەکردەوە. بیری یۆنانی باشترین بەرهەمجامێکە کە ئاوەزی مرۆڤ بەدی هێنابێ... لەوانەیە خۆشحاڵیش بووبن کاتێ بینیویانە لە پەرتوکەکانی (ئەرتەمیدۆس) دا گونجاویەك بەدی دەکرێ لە تەك ئەو فەرموودانەی کە لە پێغەمبەرەوە گوازراونەتەوە.. کەواتە شتە ماقوڵ و شتە گوازراوەکان پێکەوە گونجاون... ئەمەش پەڕی ئەوپەڕی ئەو بیر و بۆچونانەیە کە موسڵمان بتوانێ پێی بگات.

جێگەی سەرنجیشە کە دەبینین لێکچونێکی گەورە هەیە لە نێوان دانراوەکانی (ئەرتەمیدۆس) و ئەو دانراوانەی دراونەتە پاڵ (ابن سیرین). دکتۆر (توفیق الطویل)

ئـەم لێکچوونە دەگێڕێتـەوە بـۆ لێـك نزیکی بیرکردنـەوە و بۆچـونی گـەلان لـە بـارەی خەونەوە.[٢]

ئەز پشتگیری دکتۆر تەویل ناکەم لەو ڕایەدا.. بـەڵکو وا دەبیـنم موسڵمانان چونەتە ژێر کاریگەری بیرکردنەوە و ڕێبازەکەی ئەرتەمیدۆسەوە. بۆیـە ڕێڕەوی ئـەویان گرتـوە لە دانانی پەرتوکەکانیاندا.. ئەوەشیان لە بیر نەچوە کە لە کۆتایی دا ناوی (ابن سیرین) لەسەر پەرتوکەکانیان دابنێن.. لەوانەیە هەر دوو ڕاکەش ڕاست بووبن.

**خەون و ئاگاری ڕۆژانە:**

هەندێ لە خەڵکی گەشتونەتە ڕادەیەك، شەو هەر خـەونێ دەبینن، یەکسەر بـەیانی دەچنە لای ڕاڤەکارێ تاکو پێیان رابگەیەنێت خەونەکە چ هەواڵێکی نادیاری تیایە بۆیان و چ مانایـەکی هەیـە... تەنانـەت لەوانەیە هەنـدێکیان پـەژیوان ببنـەوە لـە سـەفەرێکی گرنگ، یان هاوسەرگیریەکی گونجاو ڕەت بکەنەوە، یاخود ڕێکەوتنێکی بازرگانی پوچەڵ بکەنەوە، ئەگەر لە خەونیدا ئاماژەیەکی مەترسی ببینێ، بە گوێرەی ئەوەی ڕاڤەکارەکە بۆی لێك دەداتەوە.

هەنـدێ لـە ڕاڤـەکاران زۆر بیرتیـژ و کارامـە بـوون لـە دەرهێنـانی ئـامـاژە لـە هـەر خەونێك دا کە کەسێك بیبینێت... ئنجا ئامۆژگاری دەکەن بـۆ کردنـی ئـەوەی پێویستە بۆ خۆدەربازکردن لە خراپەیەك یاخود بۆ دەست کەوتنی خێرێکی چاوەڕوان کراو.

لـە کـاتێکیش دا خـەڵکی ڕاڤـەکارێکی زیرەکیـان دەسـت نەکـەوێ بـۆ لێکدانـەوەی خەونەکانیان پەنا دەبەنە بەر ئەو پەرتوکانەی لە بازار دا هەن. واشیان پێ باشـە هـەر چۆن هەیە ناوی (ابن سیرین) بە سەر ئەو پەرتوکەوە بێ.

پەرتوکەکانیش (ئاسایی) پێك دێن لە چەند بەشی جۆراوجۆر.. بەشێ بـۆ بینـینی خودای گەورە لە خەون دا.. بەشێ بۆ بینینی فریشتە و پێغەمبەران.. بەشێ بۆ بینـینی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان.. بەشێ بۆ بینینی باران و هەورە بروسکە...بەشێ بۆ نهێنی دار و درەخـت و بـەر و بـوم و دانەوێڵـە.. بەشـێ بـۆ بینـینی زێی ئـافرەت.. بەشـێ بـۆ بینینی هێستر و گوێدرێژ و ئەسپ... بەشێ بۆ بینینی ئەندامەکانی مرۆڤ و ...هتد.جا

ئەگەر کەسێك لە خەونی دا شتێ لەو بابەتەی بینی، پەرتوکەکە دەکاتەوە و لە بەشی تایبەت بە خەونەکەیدا دەگەڕێت... و گەر خوا بیەوێت مەرامەکەی دەستگیر دەبێت!

## گرنگی ڕاڤەکاری خەون:

خەڵکی ڕاڤەکاری خەونیان بە لاوە باشترە لە کتێبی تایبەت بەخەون (خەونامە).. چونکە خەونامە تەنها بەشێوەیەکی گشتی مەسەلەکان باس دەکات.. بەڵام کابرای ڕاڤەکار دەتوانێت بە وردی و بە پێی پێویستی ئەو جێگەی تیای دایە خەونەکانی ڕاڤە بکات... بۆ هەر کەسێکیش ڕەچاوی بارودۆخ و ئاکار و ڕەوشتی دەکات.

دەگێڕنەوە: کابرایەك هاتە لای (ابن سيرين)، خەونێکی دی بوو، لە خەونی دا بانگی داوبوو.. (ابن سيرين) پێی دەڵێت: دەستت دەبڕرێت.. ئنجا پیاوێکی‌تر هات کە خەوێکی هاوشێوەی ئەو خەوەی دیبوو... بە وی گوت: حەج دەکەیت.. ئامادەبوان زۆر سەرسام بوون لەو دوو لێکدانەوە جیاوازەی بۆ یەك جۆر خەون کرا.. لەو بارەوە پرسیاریان لە (ابن سيرين) کرد، ئەویش بەمجۆرە وەڵامی دانەوە: یەکەمیان پیاوێکی شەڕانگێز و خراپەکار دیارە، ئەو بانگ دانەش لە خەونی دا دیویەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (دزە)، دیارە دزیش دەستی دەبڕدرێت، ئەمەش بە بەڵگەی ئەم ئایەتە (وأذن مؤذن ايتها العير انكم لسارقون)، بەڵام پیاوی دووەم لە ڕوخساری دا "چاکەکاری" دەبینرێت، بانگ دانەکەشی بەڵگەیە لەسەر ئەم ئایەتە (وأذن في الناس بالحبج).. دوایی لێکدانەوەکەی پێشەوا (ابن سيرين) بۆ هەر دوو کەسەکە هاتە دی[٣]... والله فى خلفه شۆن.

## هەندێ چیرۆکی کۆمەڵایەتی:

دەگێڕنەوە کابرایەك زۆری ژنەکەی خۆش دەویست، جارێك دەچێت بۆ سەفەرێ.. لەخەودا دەبینێت ژنەکەی خەوتوە.. دوو بەران لە سەر زێی ژنەکە شەڕە قۆچ دەکەن.. یەکێکیان ئەویتریانی خوێناوی کرد... ئەم خەونە وای لێکرد لە ژنەکەی دوور بکەوێتەوە هەر چەندە زۆریشی خۆش دەویست.. بەڵام نەیتوانی زیاتر ئارام بگرێ.. ڕۆشتە لای ابن سيرين و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە.. ابن سيرين گوتی: لە ژنەکەت دوور

مەکەوە، چونکە ژنێکی ئازاد و پاکە، هەر کە بیستویەتی تۆ لەسەفەر دەگەڕێیتەوە، ویستویەتی توکی ئەو جێگەیە هەڵبکەنێت... نەشی توانیوە توکەکە هەڵبکەنێت، ئنجا ترساوە لەوەی زوو بگەیتەوە سەری، بۆیە توکەکەی بەگوێزان (دەربڕینی وەرگێڕ) لابردووە، گوێزانەکەش جێگەکەی بریندار کردوە، ئەگەر حەز ئەکەیت مەسەلەکە ڕون بکەیتەوە ، بڕۆ هەر ئێستە سەیری جێگەکەی بکە، دەبینیت بەر موسڵدانی ژنەکەت بریندارە و ئەوەی من پێتی دەڵێم ڕاستە... پیاوەکە ڕۆشت و بینی قسەکەی (ابن سیرین) ڕاست و دروستە.[٤]

هەروەها دەگێڕنەوە پیاوێك لە خەونی دا دەبینێت هێلکە دەشکێنێت و سپێنەکەی دەبات و زەردێنەکەی بڕك دەدات.. هاتە لای (ابن سیرین) و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە... (ابن سیرین) داوای لێکرد سوێند بەخوا بخوات کە بەڕاستی ئەوەی لە خەونی دا بینیوە... کابرا سوێندی خوارد.. لەو کاتە دا (ابن سیرین) فەرمانی کرد کابرا بگرن و بیدەنە دەستی سوڵتان، چونکە ئەو کابرایە قەبر هەڵدەگێڕێتەوە و کفنی مردوەکان دەدزێت... کابرا گوتی: (گەورەم من لە بەر دەستی تۆ دا پەشیمان دەبمەوە و هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ کردنی ئەو کارە).[٥]

بەسەرهاتێکیتر دەگێڕنەوە، کە لەو دوو چیرۆکەی پێشوو دەچێت، دەڵێن: کابرایەك هاتە لای ئیمام (جەعفەری صادق) خەونێکی دیبوو و بۆی گێڕایەوە... پوختەی خەوەکەی ئەوەیە کە لە دەفرێکدا نانی خواردوە و دەفرەکە مێرولەی تیا بووە... ئیمام پرسیاری لێکرد ئایا ژنی هەیە و خزمەتکاریشیان هەیە لە ماڵ دا خزمەتیان بکات... پیاوەکە گوتی: بەڵێ.. ئیمام ئامۆژگاری کرد خزمەتکارەکە دەربکات چونکە خێری تیا نیە... پیاوەکە گوێڕایەڵی لە قسەکەی ئیمام کرد و خزمەتکارەکەی فرۆشت... کە ژنەکەی ئەمەی بیست لە ماڵ دەرچوو، هەڵات.. دواتر لەشاری (حران) بینرابوو کە خزمەتکارەکەی لە گەورە تازەکەی کڕیبویەوە و شوی پێکردبوو...[٦]

بەسەرهات و چیرۆکی ئاوها زۆرن و ئامار ناکرێن.. ئێمە وەك نمونە ئەمانەمان نوسی، لەوانەیە ڕاستیش نەبێ... بەڵام دەکرێنە بەڵگە لەسەر ڕادەی کاریگەربونی خەڵکی بە خەون و ئەو لێکدانانەوەی ڕاڤەکاران بۆیانی دەکەن.

## ئادابی خەون لای پیاوانی شەرعناس:

هەندێ لە زانایانی شەرع پێیان وایە وا چاکترە کەسی بڕوادار خۆی ئامادە بکات بۆ وەرگرتنی سروش لە کاتی خەوتن دا...خۆئامادەکردنەکەش بریتی‌یە لە نینۆك قرتاندن و خۆشتن لە لەش پیسی و دەست نوێژ گرتن.. هۆیەکەشی ئەوەیە گیان کاتی خەوتن کە لە لەش دەچێتە دەرێ، مۆڵەتی پێنادرێ بسوڕێتەوە بە دەوری عەرش دا یا خود کڕنۆش بۆ خودا بەرێ ئەگەر خۆی ئامادە نەکردبێ.

هەر چەندە بڕوادار باشتر خۆی بۆ نوستن ئامادە بکات ئەوەندە خەونەکەی ڕاست دەبێ.. باشترە بۆی ئەگەر و بەدڵێکی پاك و لە سەر ڕاخەری پاکژ بنوێ... نابێ برسی بێت یان زۆر خۆری کردبێت.. هەروەها ئەبێ بەر لە نوستن دور بکەوێتەوە لە خواردنی پیاز و خۆراکە بۆنناخۆشەکان.. چونکە ئەو خواردنانە خەونی پوچەڵی پێ دەبینن.. باشترین خەون ئەوەیە لەسەر پشت بێت.. خراپیش نیە گەر مرۆڤ لە سەر لای ڕاست دا بنوێ، چونکە پێغەمبەر ئارەزوی لەوە بوە هەرچی کردەوەیە بەلای ڕاست بیکات.

ئەگەر مرۆڤ هەر شتێکی زیانبەخشی لە خەو دا بینی، پێویستە لە سەری بڵێت: (استغفر الله من شر رؤيای هذه ان تضرني في دينـاي و آخرتـي) دواتـر سێ جار تف بکات بەلای دەستی چەپی دا.[٧]

## رایەکی نامۆ:

لـە نێـو پیـاوانی شـەرع دا ڕایـەکی نـامۆ بـڵاو بۆتـەوە و ڕاکەشـیان داوەتـە پـاڵ فەرمودەیەکی پێغەمبەر... ڕاکەش ئەوەیە خەون نایەتە دی لە کاتێکدا نـەبێ کـە مـرۆڤ خەونەکەی بۆ کەسێکیتر بگێڕێتەوە.. بۆیە پێویستە لەسەر هەر کەسێ کە خەونێکی زیانبەخش دەبینێت بۆ کەسی باس نەکات و لە ناخی خۆی دا بیشارێتەوە تاکو لە زیانـەکانی بـەدور بێـت... چـونکە هەرکـە گێڕایـەوە بـۆ کەسـێکیتر، وەك چـۆن دەیگێڕێتەوە ئاوها خەونەکە دێتە دی و دەبێتە ڕاستی.

هەندێکیتریان لەم ڕووەوە زۆر توند ڕەون و هەرچی گرنگی هەیە لە خەونیان وەرگرتۆتەوە... بەڵکو گرنگییان داوە بە باسکردنی خەونەکە، ئەم مەسەلەیەشیان ناوناوە (ئادابەکانی گێڕانەوەی خەون)... ئەمەش یانی خەون دەکەوێتە سەر بە ڕاستی یان بە درۆ گێڕانەوەی.. لە بەر ئەوە پێویستە مرۆڤ زۆر بە ئاگا بێت لە گێڕانەوەی خەون دا... تەنانەت نابێ هێندەی تاڵی موو درۆی تێدا بکات (لە کوردەواری دا دەڵێن گوایە هەر کەس بە درۆ خەون بگێڕێتەوە، خودا لە ڕۆژی بەرێ دا فەرمانی پێدەکات کە جۆ بە دیوار دا هەڵبگێڕێت... دیارە ئەم قسەیەش لە ئاوا بیرکردنەوەیەکەوە هاتۆتە نێو کوردان ـ وەرگێڕ)

جا گەر مرۆڤ بە درۆ خەونێکی گێڕایەوە، ئەوا چۆنی بە درۆ گێڕاوەتەوە ئاوا بەڕاست دێتە دی، بە درۆ چ ڕووداوێکی گێڕاوەتەوە گوایە لە خەون دا دیویەتی ئەو ڕوداوەی لێ دێتە دی.. ئنجا سودیشی نیە گەر لە دوایی دا دان بنێت بەوە داکە درۆی کردوە... نمونەی ئەوەش ئەو زیندانیە بوو کە ویستی بە (یۆسفی راستگۆ) رابوێرێت و گاڵتەی پێ بکات.. خەونێکی بۆ گێڕایەوە کە نەی دیبوو.. یوسف خەونەکەی وا بۆ لێك دایەوە کە لە خاچ دەدرێت و پەلەوەر لە پێستی سەری دەخۆن بە دەنوك... ئەوە بوو کابرای هەژار دوای سێ ڕۆژ لە خاچ درا.. هەر چەندە دانیشی نا بەوە دا کە خەونی وای نەدیوە و درۆی کردوە[٨]... ڕەنگە لە دوای خاچ درانیشی بە هۆی درۆکەیەوە چوبێتە دۆزەخەوە.

## فێڵێکی لێزانانە :

مێژوو باسی کابرایەکمان بۆ دەکات لە سەردەمی (مەهدی عەباسی) دا کە لەسەرجەمی خەڵکی ریزپەڕ ببوەوە، و لای وابوو خەون لە ژێر کاریگەری داڵغەکانی مرۆڤ دایە بەر لەوەی بخەوێت ... و هیچ پەیوەندیەکی بەسروشەوە نیە ... ئەم ڕایەشی قۆستەوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی (مەهدی) و وەرگرتنی پۆستێکی باڵای دەوڵەت.

پوختەی بەسەرهاتەکەش ئاوایە: ئەم کابرایە هاتە لای (مەهدی) و پێی راگەیاند: خەلافەتەکەت سی ساڵ درێژە دەکێشێت... مەهدی سەری لەم پێش بینییە سوڕما...

ڕنگە لە ناخی خۆشیەوە پێی خۆش بوبێ... بۆیە داوای لە پیاوەکە کرد بەڵگەی بداتێ لەسەر ڕاستی قسەکەی ... پیاوەکە پێشتر فێڵی خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەم داوایە... بە مەهدی گوت: لە خەونت دا کۆمەڵێ یاقوت دەبینی کە ئەمدیو و ئەودیویان دەکەیت.... کە دەشیان ژمێریت دەبینی ژمارەیان سی یاقوتە، ئنجا ژمارەی یاقوتەکان بریتییە لە ژمارەی ساڵانی خەلافەتەکەت.

شەوی داهاتوو مەهدی هەموو ئەوەی کابرا پێی وتبو لە خەونی دا دیبوی ... بۆیە بەیانی ناردی بە شوێن کابرا دا و زۆری پێ بەخشی و پۆستی (قەزا)یشی پێدا[٩] ... دواتر لە کابرایان پرسی چۆن توانیویەتی ئەو فێڵە سەیرە ڕێك بخات... لە وەڵامدا گوتی: کاتێ باسی یاقوتەکانی بۆ مەهدی کردووە، وای بۆ باسکردوە کە ببێتە ماخۆلانی نێو دڵی و لە ناخیەوە هەمیشە بیری لێبکاتەوە... جا کە (مەهدی) خەوتوە، خەونی بەوەوە دیوە کە لە ناخیدا باسیکردوە و داڵغەی پێوە لێداوە.

### لێکدانەوەی ئیبن خەلدون:

(ئیبن خەلدون) لە بارەی خەونەوە ڕایەکی هەیە کە دروست لە ڕای کابرای فێڵباز دەچێت ... پێدەچێت لە هەندێ پەڕاوی مێژوویی دا چیرۆکی ئەم کابرایەی خوێندبێتەوە، لەم چیرۆکەوە لێکدانەوە جوانەکەی خۆی لەبارەی خەونەوە هەلگۆستبێت.

(ئیبن خەلدون) دەڵێت: مرۆڤ گەر بەر لە نوستن لەڕوی دەرونیەوە خۆی ئامادە کردبێت بۆ شتێکی دیاریکراو، ئەوا لە خەونی دا ئەو شتە دەبینێت و سودی لێ وەردەگرێت ... وا دیارە (ئیبن خەلدون) گوێ نادا بەوەی پیاوانی شەرع لە ڕووی (ئادابەکانی خەونەوە) باسی دەکەن. وەك نینۆك کردن و دەست نوێژگرتن و نوێژکردن ... لای (ئیبن خەلدون) هەر شێوازێك ببێتە هۆی ئامادە باشی دەروونی ئەوا مەبەست دەپێکێت.. ئیدی هیچ جیاوازیی نیە لە نێوان نوێژکردن و خوێندنەوەی تەلیسمی جادوبازەکان دا.

ئەو وا دەزانێت، دەروونی مرۆڤ گەر بەر لە نوستن ئارەزووی هەر شتێكی كرد، لە خەونی دا دەی بینێت... (ئیبن خەلدون) لەم ڕووەوە نمونە و شێوازێك باس دەكات كە دەڵێت لە ماتماتیك زانەكانەوە دیویەتی، خۆشیی تاقی كردۆتەوە و خەونێكی زۆر سەیری دیوە، بەهۆی خەونەكەوە هەندێ شتی دەربارەی خۆی دەستكەوتوە كە زۆری حەز بە زانینیان كردووە.

(ئیبن خەلدون) بەو شێوازە دەڵێت (شێوازی حالومی).. پوختەكەشی ئەوەیە مرۆڤ بەر لە نوستن دەبێ ئەو واژە ئەعجەمیانە بڵێت (تماغس بعدان یسواد و غداس نوفناغادس) ئنجا بنوێت، لەخەونی دا كابرایەك دێت و پێی دەڵێت (من سروشتی تەواوتم) هەر ئەو پیاوە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەداتەوە كە كابرای نوستوو لێی دەكات... لە بارەی ئەو شتە شاراوانەوە كە حەز دەكات بیان زانێت١٠...

(ئیبن خەلدون) هیچ توانایەكی ئەفسووناوی یان نهێنییەكی شاراوە لەو وشانەدا نابینێت، چونكە ئەو وشانە هیچ نین جگە لە كۆمەڵێ واژەی وشك كە بۆ خۆیان هیچ واتایەكیان نیە... بەڵام سودیان لەوەوە پەیدا دەبێ كە كابرای خەوتوو متمانەی پێ پەیدا دەكات. ئەم متمانەش ئامادەباشیەكی دەروونی تێدا دروست دەكات كە بتوانین سروش وەربگرێت یان غەیب ئاشكرا بكات و بخوێنێتەوە.

**كورتە بەرەنجامگیریەكی مێژوویی:**

دەڵێن یەكێك لە بەهێزترین ئەو هۆیانەی هانی (مەئمون)یان دا، تاكو پەرتوكە (یۆنانی)یەكان وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، خەونێك بوو كەبینیی بوی ... شەوێ لە خەونی دا وای زانیوە كە (ئەرستۆ تالیس) لە سەر كورسی لە تەنیشتییەوە دانیشتوە... (مەئمون) ڕێزی زۆری لێدەگرێت... وای هات بە خەیاڵ دا كە لە بارەی هەندێ پرسی فەلسەفیەوە پرسیاری لێبكات.. بۆیە ئەم دیالۆگە دەكەوێتە نێوانیانەوە:

مەئمون: چاكە، چییە؟

ئەرستۆ: ئەو شتەیە كە ئاوەزەكان بە جوان و چاكی بزانن.

مەئمون: ئنجا چیتر؟

ئەرستۆ: ئەوەی یاسا و شەریعەتەکان بە جوان و چاکی بزانن.

مەئمون: ئنجا چیتر؟

ئەرستۆ: ئەوەی جەماوەر بە چاکی بزانن.

مەئمون: ئنجا چیتر؟

ئەرستۆ: ئنجا ... ئنجا هیچ[11]....

زۆرترینی گومان لە سەر ئەوەیە (مەئمون) دوای ئەوە زۆری لەسەر خوێندۆتەوە و زۆریشی لەبارەوە بینیوە ئەوجا خەونەکەی بە (ئەرستۆ)وە دیوە .. وەك زانراویشە (مەئمون) موعتەزیلە بووە... بە شێوەیەکی گشتی موعتەزیلە ڕێز لە ئەرستۆ و فەیلەسوفەکانی‌تری یۆنان دەگرن، هەر وا بە سەرچاوەگەلێ گەورەیان دەبینن بۆ ئاوەزی مرۆڤ... بەندەش وام دێ بە خەیاڵ دا کە (مەئمون) زۆر سەرسام بووە بە ئەرستۆ... تەنانەت ڕەنگە بە پیرۆز و پێغەمبەریشی دانابێ.. ئەمەش سەیر نیە، چونکە موعتەزیلە، کە مەئمونیش یەکێکە لەوان، پێیان وابوو ئاراستەکاریەکانی پێغەمبەران پێویستە هاوتا بێت لە گەڵ تێگەیشتنەکانی ئاوەزی کامڵ دا.

هەر چۆن بیت، ئێمە دەتوانین بڵێین: ئەو خەونەی کە مەئمون دیویەتی، یەکێك بوە لەو هۆکارە بەهێزانەی کە هانیان دا پەرتوکە یۆنانیەکان وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی و پارە و سامانێکی زۆریش لەو پێناوەدا خەرج بکات.

جگە لەوەش دەڵێن گوایە (مەئمون) هەڕەشەی لە پادشای ئەو کاتەی ڕۆم کردوە، بە جەنگێکی بێ‌ئامان، ئەگەر بێت و ئەو پەرتوکانەی بۆ ئەنێرێت کە زانستە کۆنەکانیان تێدایە و لە وڵاتەکەی وی دا هەڵگیراوون.

دەگێڕنەوە: مەئمون جواوی ناردە سەر دەستەڵاتداری (صقلية) و داوای لێکردبوو کتێبخانە بە ناوبانگەکەی (صقلية)ی بۆ بنێرێت... دەستەڵاتداری (سەقەلیە) پیاوانی دەوڵەتەکەی خۆی کۆکردەوە و ئەم داوایەی (مەئمون)ی خستە بەر دەمیان... مەترانی گەورە، لە وەڵامدا پێی گوت: (بۆی بنێرە، دەی بەخوا ئەو زانستانە بچنە نێو هەر نەتەوەیەك، ئەو نەتەوەیە خراپ و بۆگەن دەکەن) ... ئەوە بوو دەستەڵاتدارەکەی گوێڕایەڵی ڕاوێژەکەی بوو، کاری پێکرد.[12]

هەندێ لە موسڵمانە دۆگماکان پێیان وایە (مەتران) ڕاکەی تەواو بووە، لە دیدی ئەواندا فەلسەفە بچێتە نێو هەر کۆمەڵگەیەك گەندەڵ و خراپی دەکات (فمن تمنطق فقد تزندق) ئەگەر ئەو ڕایە پەسەند بێت، ئەوا دروستە بۆمان بڵێین: کۆمەڵگەی ئیسلامی بە هۆی خەونێکەوە ئاوا خراپ بوو، کە مەئمون دیویەتی.. جا سەد بریا ئەو خەونەی نەدیبا و وای نەکردایە.

## پەڕاویزەكانی بەشی سێیەم:

١- بنواڕە: ابن خلدون، المقدمة، ل ٤٧٨.

٢- بنواڕە: توفیق الطویل، الاحلام، ل ١٩٢ ـ ١٩٣.

٣- بنواڕە: ابن سیرین، تفسیر المنامات الكبیر، ٨.

٤- بنواڕە: هـ.س، ل ٣٣.

٥- بنواڕە: هـ.س، ل ٥٦.

٦- بنواڕە: هـ.س، ل ٥٣.

٧- بنواڕە: توفیق الطویل، الاحلام، ل ١٠١ ـ ١٠٤

٨- بنواڕە: ابن اسحاق الثعلبي، قصص الانبیاء، ل ٧٣.

٩- بنواڕە: بۆمان هەیە بڵێین موسڵمانان ڕیشیشیان لە دەست دا لە نێوان ئەم قازیە فێڵبازە و ئەو خەلیفە خەڵەتاوە.

١٠- بنواڕە: ابن خلدون، المقدمة، ل ١٠٥.

١١- بنواڕە: احمد فرید الرفاعی، عصر المأمون، ج ١ ل ٣٧٧.

١٢- بنواڕە: هـ.س، ج ١، ل ٣٧٥ ـ ٣٧٦.

# بەشی چوارەم :

## کاریگەری خەون لە سەر بیر و باوەڕە ئیسلامیەکان

**بینینی پێغەمبەر (د.خ) لە خەون دا:**

لە نێو موسڵمانەکانی چاخەکانی ئەم دواییەدا، بیرۆکەیەك بڵاو بۆتەوە، و کاریگەری زۆری داناوە لە نێو ژیانی فیکری و کۆمەڵایەتی‌یان دا... بیرۆکەکەش ئەوەیە گەر لە خەون دا یەکێکیان پێغەمبەر (د.خ) ببینێ، وەك ئەوە وایە بە ڕاستەقینە بینیبێتی... هەروەها دەست دەکەنە هێنانی ئەو گوتە و فەرموودانەی کە پێغەمبەر لە کاتی خەون دا پێیان دەڵێت، وەك ئەوەی فەرموودەی (صحیح) بن و، ڕەوا نەبێت بۆ موسڵمانان گومانیان لێ بکەن.

گەر بشگەڕێین، دەگمەن نین ئەو موسڵمانانەی کە حوکمە شەرعیەکان دەگۆڕن یا خود ڕاڤەی تایبەت دەکەن بە گوێرەی ئەو گوتانەی پێغەمبەر لە خەون دا پێی گوتون... خوێنەر ڕەنگە سەریشی سوڕ بمێنێت کە دەبینێت لە نێو پەرتوکەکانی فەرموودە دا، هەندێ فەرموودە نوسراون، کە سەرچاوەی گێڕانەوەشیان یەکێك لەو کەسانەیە کە بەخەون پێغەمبەریان دیوە و ئەو قسەیەی پێگوتوە.

لە نێو خەڵکی دا گوتەیە بڵاوە کە دەڵێت: (هەر کەس بمان بینێت بە ڕاستی بینیوینی)... ئەوەش یانی هەر کەس یەکێك لە پێغەمبەران یان ئەولیاکان لە خەون دا ببینێت ئەوە هەر بە ڕاستی بینیویەتی... ئەمەش لە بەر ئەوەیە کە شەیتان ناتوانێ لە خەون دا خۆی بکاتە پێغەمبەرێ یان یەکێك لە ئەولیاکان.

گەر کەسێکی بڕوا پێکراو فەرمودەیەکی پێغەمبەریان بۆ بگێڕێتەوە کە لە خەون دا پێی وتوە، ئەوا کاری پێ دەکەن... هیچ ڕەخنەیەك ئاراستەی فەرمودەکە ناکرێت تەنها لە ڕووی (سەنەد)ەکەی و ڕاستگۆیی ئەو کەسەوە نەبێت کە خەونەکەی گێڕاوەتەوە...جا ئەگەر متمانەیان هەبێت بە سەنەدەکەی و ئەو کەسەی کە خەونەکەی گێڕاوەتەوە، ئەوا فەرموودەکە بە (صحیح) لە قەڵەم دەدەن.

## دەربارەی ئەو كەسەی
## كە دەیەوێت پێغەمبەر لە خەون دا ببینێت:

ئیمام (ابوالحسین الملطی) لە پەرتوكەكەی دا (التنبیة و الرد) بەشێكی تایبەت دادەنێت بۆ باسكردنی ئەو كەسەی دەیەوێت پێغەمبەر لە خەونی دا دەبینێت، ئەو لە محەمەدی كوڕی عوكاشەوە دەگێڕێتەوە كە معاویەی كوڕی حمادی كرمانی لە زوهریەوە بۆی گێڕاوەتەوە و گوتویێتی: (هەر كەس شەوی هەینی خۆی بشوات و دوو ڕكات نوێژ بكات و لە دوو ڕكاتە نوێژەدا هەزار جار سورەتی "قل هو الله احد ..." بخوێنێ، ئەو شەوە پێغەمبەر دێتە خەوی..).

(ئیبن عوكاشە) خۆی ئەم شێوازەی تاقی كردۆتەوە و دوای چەندین نارەحەتی و تەنگ و چەڵمە سەركەوتنی بە دەست هێنا.

ئیبن عوكاشە دەڵێت: (.. شەوێكی ساردم بەسەردا هات، خۆم شۆرد و دوو ڕكات نوێژم كرد، ئنجا چوومە جێگەی خەو، كەمێك نوستم، دوبارە هەستامەوە و خۆم شوشتەوە و دوو ڕكات نوێژی دیكەم كرد، خەریك بوو ڕۆژ دەبویەوە تەواو بووم لە دوو ڕكاتە نوێژە، ئنجا پاڵم دا بەدیوارەكەوە و ڕوم لە قیبلە بوو، بینیم وا پێغەمبەر هاتە ژووریێ ... ڕوی وەكو مانگ وابوو لە شەوی چواردە دا... گەردەنی وەك بلوری زیو وابوو كە بە تولێ زێڕ نەخشێنرابێ بەهەموو بێگەردی و پاكژیەكیەوە... دوو پارچەی یەمەنی پێوە بوو، یەكیانی كرد بوە بەری و یەكێكیتریانی لە خۆیەوە ئالاندبوو ... پێغەمبەر هات و لە سەر قاچی ڕاستی هەڵوەستەیەكی كرد و قاچی چەپی بەرز كردەوە (بۆ هەنگاونان - وەرگێڕ) ویستم بڵێم: سلاوی خوات لێ بێ... ئەو پێش دەستی كرد و گوتی: سلاوی خوات لێ بێ ... حەزم دەكرد ددانە شكاوەكەی ببینم، ئەوە بوو زەردەخەنەیەكی كرد و سەیری ددانە شكاوەكەیم كرد... گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! فوقەها و زاناكان لە سەر من ناكۆكیان تێكەوتووە... من بۆ خۆم چەند "اصولێكی سوننەت"م هەیە بیخەمە بەر دەستت؟ فەرمووی: بەڵێ....)

ئنجا (محمد کوڕی عکاشە) ئەو بیر و بۆچونانەی خۆی دەژمێرێت کە پێغەمبەر ڕەزامەندی لە سەریان دەربڕیوە... ئەمانە هەندێکن لە بیر و باوەڕەکانی: (قایل بوون بە قەزای خودا، خۆدان بە دەستی خواوە، ئارامگرتن لە سەر فەرمانی خودا، بڕوابوون بە قەدەری خوا بە چاك و خراپیەوە، وازهێنان لە رقەبەرێتی دم بە دمە لە ئاین دا، مەسح کردن بە سەر "خوف"دا، جیهادکردن لە گەڵ ئەهلی قیبلەدا... ئارامگرتن لە ژێر بەیداخی سوڵتان بەستەم و دادپەروەریەکانیەوە.. دەرنەچون بە شمشێر بۆ دژایەتی ئەمیرەکان ـ با ستەم کاریش بن ـ دەست کۆتا کردن لە هاوەڵەکانی محمد... باشترین کەسانێك لای خودا لە دوای پێغەمبەر بریتین لە ئەبوبەکر ئنجا عومەر و ئنجا عوسمان و ئنجا عەلی ...).

(ئیبن عکاشە) سێشەو لە سەر یەك، ئەم بیر و باوەڕانەی خۆی دەخستە بەردەمی پێغەمبەر، بەڵام هەستی بە هەندێ دوودڵی کرد کاتێ عوسمانی لە پێش عەلیەوە باس دەکرد، پێغەمبەر هەستی بەوە کرد کە لە دڵیایەتی بۆیە فەرمویەتی (ئنجا عوسمان، ئنجا عەلی) ئەمەی سێ جار دوبارە کردۆتەوە و چاوەکانیشی فرمێسکیان لێ دەباری....

ئیبن عکاشە دەڵێت: هەستم بە شیرینیەك کرد لە نێو دڵ و دەمم دا، تا ماوەی هەشت ڕۆژ هیچ خۆراکێکم نەخوارد... هیچ خوارنەوەیەکم نەخواردەوە، تا وام لێهات لاواز و تەمبەڵ بووم لە جێبەجێکردنی نوێژە فەرزەکانیش دا، کاتێ نانم خوارد ئیدی ئەو شیرینیایەتیە نەما... خودا شاهیدە لە سەرم لەوەی دەیڵێم، وە خوداش بەسە بۆ وەی شاهید و گەواهیدەر بێت.[1]

### خەون و بیر و باوەڕەکان:

بەسەرهاتەکەی (ئیبن عکاشە)م بۆیە بەدرێژی باسکرد، تاکو خوێنەر دەرك بکات بەوەی، چەندە بیر و باوەڕاەکانی خەڵکی لە ژێر کاریگەری خەون دایە... ئاشکرایە (ئیبن عکاشە) لە کاتی بێداری دا باسی لەو بیر و باوەڕانەی کردوە کە خۆی باسیان دەکات ... بۆیە هەر دەبێ پێغەمبەر بە خەو ببینێت و ئەو شتانەی پێ بڵێت ... ئەوانەی (ئیبن عکاشە) باسیان دەکات کۆمەڵێ بیر و باوەڕ بوون کە لە ژینگە و

دەوروبەرەكەیەوە پێی گەشتوە و دەستی كەوتوە... وەك نەریتی هەموو خەڵكی ... پاشتر ئەو بیر و باوەڕانەی ڕاگەیاندووە وەك ئەوەی هەر بە ڕاستی لە زاری پێغەمبەرەوە هاتبنە دەرێ.

دەگونجێت بێژین لەم سەردەمانەی دوایی دا زۆرینەی بیر و باوەڕی موسڵمانان بەم شێوازە لە دەروونیان دا جێگیر بووە... موسڵمانان بیر و بۆچونێكیان هەیە لە دوایی دا پێغەمبەران یا خود ئەولیاكان دێن و پشگیری ڕاكانیان دەكەن.. بەو پێیە بەتەواوی لە دەرون و ناخیان دا بنج دادەكوتێت و ئیتر بە هیچ جۆرێ بواری ئاڵوگۆڕكردن و گۆڕینیان نامێنێ.

## ڕەخنەگرتنی كوپری:

شیاوی ئاماژە پێدانە (محمد زاهد الكوثری) بریكاری مەشیەخەی ئیسلامی لە خەلافەتی عوسمانی پێشودا، ڕەخنە دەگرێت لەم بەسەرهاتەی (ئیبن عوكاشە) كە ئێمە باسمان كرد، هەموو ڕەخنەكانیشی لەوە دا قەتیس دەبێت كە (درۆ)ی داوەتە پاڵ (ئیبن عوكاشە) لە كاتی ئاخافتن دا... ئەمەش یانی (كەوسەری) لە ڕوی سەنەدەوە ڕەخنەی گرتوە لە حەدیسەكە ... وەڵێ لە ڕوی تێكستەوە نەیگەڕاندۆتەوە بۆ ورتەورتی دەرون، بەڵكو گوتویەتی: (ئیبن عكاشە) كابرایەكی درۆزنە و متمانە بە گێڕانەوەكانی ناكرێ... كەواتە ئەگەر ڕاستگۆ بوایە ئەوا خەونەكەیشی بە پێغەمبەرەوە ڕاست دەبوو[٢] ...

خەون و حوكم دان بەسەر پیاوانی مێژوو دا:

هەندێك لە مەسەلەی پیرۆز ڕاگرتنی خەون دا گەشتونەتە ڕادەیەك، ڕای خۆیان لە بەرانبەر زۆردارانی مێژودا دەگۆڕن، تەنها لە بەر خەونێك كە پێیانەوە دیون و بێگوناهی ئەوانی سەلماندوە... (متوكل) یەكێك بوە لە ستەمكارترینی دەستەڵاتداران و زیاد لە هەر هەمووشیان ئیسرافكارتر بوە... كەچی زۆرێك لە (محدثین) لێی خۆش بوون و كردەوە ناشیرینەكانیان فەرامۆش كردوە، چونكە خەونیان دیوە پێیەوە كە خودا لێی خۆش بووە[٣] ... (تەیمووری لەنگی) ستەمكاری خوێنڕێژیش بەسەرهاتێكی ئاوهای هەیە... (ئیبن حەجەری هیتمی) دەگێڕێتەوە: كابرایەكی قورعان خوێن هەر كە

بەلای گۆڕەکەی "تەیمووری لەنگ" دا تێدەپەڕێ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە کە دەفەرمێت "خذه و فغلوه ثم الجحيم صلوه..." ئەم خوەی چەندین جار دوبارە کردەوە... بەڵام شەوێکیان لە خەونی دا وای دەبینێ پێغەمبەر لە جێگەیەکدا دانیشتوە و (تەیموری لەنگ) لە تەنیشتیەوەیە... کابرا زۆر تورە دەبێت لە (تەیمور) و پێی دەڵێت (بۆ ئێرە ئەی دوژمنی خودا) و ئەیەوێت پەلاماری بدات و لە تەنیشتی پێغەمبەر لای بدات... پێغەمبەر (د.خ) پێی دەفەرمێت: وازی لێ بێنە چونکە ئەو وەچەکانمی خۆش دەویست.. پیاوەکە بەترسەوە لە خەون ڕاپەڕی و ئیدی وازی لە خوێندنەوەی ئەو ئایەتی نەفرەتە هێنا کە لە نزیکی گۆڕەکەی تەیمورەوە دەیخوێند.

هەر (ابن حجر) دەگێڕێتەوە: کە تەیمووری لەنگ نەخۆش کەوت، ئەو نەخۆشیەی کە پێی مرد، وەزعی زۆر تێکچوو، ڕەنگی گۆڕا و ڕوخساری ڕەش هەلگەڕا، ئنجا لە هۆش خۆی چوو کە هاتەوە هۆش گوتی: (فریشتەکانی سزا هاتنە سەر سەرم، لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا هات و پێی گوتن: بڕۆن ئەم کابرایە وەچەکانی منی خۆش دەویست و لەگەڵیان دا بەچاکی دەجولایەوە... ئیدی فریشتەکان ڕۆشتن)....

(ابن حجر) لەو بارەیەوە ئاوا توانج دەدات: ئەگەر خۆشەویستی وەچەکانی پێغەمبەر ئەوەندە سود بەخش بێ بۆ ئەو ستەمکارەی کە کەسێك نەبوە بە ئەندازەی ئەو ستەمکار بێت، ئەبێت بۆ غەیری ئەو چۆن بێت؟[٤]

خەون و وەچەکانی پێغەمبەر (د.خ):

لێرەدا دەمەوێت هەندێ لەو خەونانە بگوازمەوە، کە (ابن حجر) لەم ڕووەوە دەیگێڕێتەوە:

١. یەکێك لەو فەقیهە گەورانەی دانیشتووی شاری (مەدینە) بوون، پشتی هەڵکرد لەوەی نوێژی مردوو بکات، لەسەر یەکێك لە وەچەکانی پێغەمبەر کە ناوی (مطير) بوو... هۆکاری ئەو نوێژ لە سەر کردنەشی ئەوە بوو کە (مطير) لە ژیانی دا یاری بە کۆتر کردوە (واتە کۆتر باز بووە - وەرگێڕ) ... ئنجا کابرای فەقیهە لە خەونی دا پێغەمبەر و فاتیمەی زەهرا دەبینێ... فاتیمە ڕوی لێ وەرچەرخاند... فەقیهەکە بەداوای بەزەییەوە، داوای لێکرد ڕووی تێبکات، فاتیمەی ڕوی تێکرد و، دەستی کردە لۆمەکردنی

و پێی گوت: (ئایا خاتری ئێمە هێندە فراوان نەبوە مطیر بگرێتەوە؟) ئیدی لەو كاتەوە فەقیهەكە بەردەوام باسی لە گەورەیی و بەڕێزی وەچەكانی پێغەمبەر دەكرد.

٢ـ فەقیهێكیتریش نوێژی نەكرد لەسەر یەكێكیتر لە وەچەكانی پێغەمبەر. لە خەودا فاتیمە دەبینێ ڕوی لێ وەردەچەرخێنێت... كە پرسیاری ئەوەی لێدەكات، لە وەڵامدا دەڵێت: (كوڕەكەم دەمرێت و نوێژی لەسەر ناكەیت) فەقیهەكە دوای ئەوە پەشیمان بویەوە دانی نا بە ستەم كاری خۆی دا.

٣ـ شێخ عابدی فارسی، ڕقی لەسەیدەكانی مەدینە بوو كە لە نەوەی "حسێن" بوون، چونكە شیعەگەراییان بە ئاشكرا پێوە دیار بوو... پێغەمبەر لە خەون دا دەبینێت و پێی دەڵێت: (ئەوە چیە دەتبینم ڕقت لە منداڵەكانمە) .. (فارسی) لە وەڵامدا دەڵێت: (خوا نەكات ڕقم لێیان نیە، تەنها دەمارگیریەكەیانم پێ قەڵسە كە لە دژی ئەهلی سوننەت هەیانە) پێغەمبەر دەفەرمێت: "ئایا كوڕێكی دڵئازاردەر پەیوەست نابێتەوە بە نەژادی خۆیەوە... ئەوە كوڕێكی دڵئازاردەر و ناتەواوە!"

٤ـ جارێ موحتەسەب (محمود الجمال) لە جڤاتی سوڵتان (برقوق)دا دادەنیشێت، لەو جڤاتە دا سەیدێكی تیا دەبێت كە لە سەری ئەمەوە دانیشتوە.. بە لای موحتەسیبەوە نارەحەتە لەخوار سەیدەكەوە دانیشێ دواتر پێغەمبەر هاتۆتە خەوی و سەركۆنەی كردوە و پێی گوتوە: (ئەی مەحموود! ئایا پێت ناخۆشە لە خواری كوڕەكەمەوە دابنیشیت) موحتەسیب پەشیمان بوەوە و ڕۆشت بۆ ماڵی سەیدەكە و داوای لێبوردنی لێكرد و، هەواڵەكەی پێدا، ئەوانەی لە دەوری بوون هەموویان دەستیان كردە گریان و داوای دۆعای خێریان لێكرد و ڕۆشتن.

٥ـ سەیدێك چوە لای حافیز (ابن فهد) و داوای ژەمە نانێكی ئێوارەی لێكرد، (حافیز) هیچی نەدایە... لە خەون دا پێغەمبەری بینی ڕووی لێوەرچەرخاند بوو، حافیز پێی گوت: "ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن ڕوم لێ وەردەگێڕیت لە كاتێكدا من خزمەتكاری فەرموودەكانتم؟" پێغەمبەر لە وەڵامدا دەڵێت: (چۆن ڕوت لێ وەرنەگێڕم لە كاتێكدا یەكێك لە وەچەكانم دێنە لات و داوای ژەمە نانێكی ئێوارە دەكات، كەچی پێی نادەیت)..

هەر بۆیە کە ڕۆژ بویەوە (حافیز) چوە لای سەییەکە و داوای لێبوردنی لێکرد و بە پێی تواناش چاکەی لەگەڵ کرد.

٦- کابرایەکی یەمەنی، عەزمی جەزمکرد بۆ حەج کردن، خۆیی و منداڵەکانی لە ڕێی دەریاوە هاتن بۆ حەج... کە گەشتنە (جدە)، باجگرەکانی ڕێگە زۆر توند بوون لە گەڵیان دا و تەنانەت ژێر جلی ژنەکانیش دەگەڕان... کابرای یەمەنی بەوە زۆر تورە بوو، دەستی کردە نزاکردن لە گەورەی ئەو کاتەی (مەککە) کە یەکێك بوو لە نەوەکانی پێغەمبەر... لە خەون دا یەمەنیەکە چاوی بە پێغەمبەر کەوت کە ڕوی لێ وەرچەرخاندبوو... کە پرسیاری ئەوەی لێکرد، لە وەڵامیدا پێغەمبەر دەفەرمێت: (ئایا کەسێکت نەدیتوە لەو کوڕەی من ستەمکارتر بێت)! کابرای یەمەنی بە ترسەوە لە خەو راچەنی و پەشیمانی لای خودا دەربڕی لەوەی جارێکیتر توخنی وەچەکانی پێغەمبەر بکەوێت[٦]...

**خەون و حوکمە شەرعیەکان:**

گومانی تێدا نیە ئەو خەونانەی (ابن حجر) دەیانگێڕێتەوە، پێچەوانەی حوکم و بنەما ئیسلامیەکانن... چونکە پێغەمبەر لە ژیانی خۆی دا بانگەوازی بۆ یەکسانی نێوان خەڵك دەکرد... لە لای پێغەمبەر هیچ جیاوازیەك نەبوو لە نێوان گەورەیەکی قورەیشی و کۆیلەیەکی حەبەشی دا... مەفروزە لە دوای مردنیشی پەیگیر بێت بەو بانگەوازەوە (کە هەرواشە)....

وا دەردەکەوێت موسڵمانان لەم دواییانەدا بەتەواوی لەم بنەمایە تێنەگەشتون... چونکە نەوەکانی پێغەمبەر دەخەنە پلەیەك کە لە هەموو خەڵکانی دیکە بەرزترن.. نازناوی (سەیدەکان)یشیان پێ دەبەخشن، ئیدی نازانن کە ئیسلام دان نانێت بە فەزڵ و رێزی نەژاددا.. لە ئیسلامدا سیستەمێ بۆ چینایەتی نەژادەکان بەدی ناکرێ.. هەموو خەڵکی لە دیدی ئیسلامدا یەکسانن وەك دانەکانی شانە... بەڕێزترینیشیان پارێزکارترینیانە.

موسڵمانان لە ژیانیان دا وا ڕاهاتوون کە فەزڵی منداڵەکانی خۆیان دەدەن بەسەر خەڵکیتردا، بۆیە وا گومانیان بردووە کە پێغەمبەریش لەم مەسەلەیەدا لەوان دەچێت.. لە کاتی بێداری دا لەسەر ئەو بڕوایە خۆیان ڕادێنن، پاشان لە خەون دا پێغەمبەر (د.خ) دەبینن کە پشتگیری ڕاکەیان دەکات.

**چیرۆکێکی سەیر:**

(ابن حجر) دەگێڕێتەوە: پیاوێ لەشاری (فاس) تاوانی قەتڵی لەسەرساغ بویەوە و دادوەر بڕیاری دا کە بکوژرێتەوە... ئنجا سوڵتان جوابی نارد بۆ قازی و داوای لێکرد جێبەجێکردنی فەرمان و بڕیارەکەی رابگرێت... هۆکەشی ئەوە بوو کە سوڵتان لە خەونی دا پێغەمبەری دیوە و ڕێگری کردووە لە کوشتنی ئەو کابرا بکوژە... قازی گوێی بە فەرمانەکەی سوڵتان نەدا و گوتی: (لەبەر خەون شەرع ڕاناگرین و وازی لێ ناهێنین، با خەونەکەش چەند بارە بێتەوە)... ئەمە لە کاتێکدا سێشەو لەسەر یەك سوڵتان هەمان خەونی دیبوو.

بەڵام دواتر تەنها لە بەر یەك قسە کە تاوانبارەکە چپاندی بە گوێی دا لێی بورد... هەواڵەکە گەشتەوە بە سوڵتان، ئەوە بوو بانگی کرد تا بزانێ قازی چۆن لێی خۆش بووە... کابرا گوتی: (بەڵێ ڕاستە ئەو کابرامە کوشتوە، بەڵام هۆکەی ئەوە بوو کە من و ئەو پێکەوە دەمانخواردەوە، بەڵام ویستی داوێن پیسی لە گەڵ کچە سەیدێکدا بکات، من ڕێگەم نەدا، بەڵام نەم توانی بەری بگرم تەنها بە کوشتن نەبێ، بۆیە کوشتم و نەم هێڵا زینا لە گەڵ ئەو کچە سەیدە بکات) سوڵتان گوتی: (ڕاست ئەکەیت، ئەگەر وا نەبوایە سێ جاری تەواو پێغەمبەرم لە خەون دا نەدەبینی پێم بڵێت: ئەو پیاوە مەکوژن)[٧]

ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر کاریگەری خەون لە کاروبارەکانی خەڵك دا، بەڕادەیەك ڕێگەیان داوە (شەرع لە بەر خەون پشتگوێ بخرێ) وەك دادوەرە "فاسی"یەکە شەرعی لەبەر خەون پشتگوێ خست.

## خەون لای شیعەکان:

لە مەڕ ئەم پرسە، گروپە ئیسلامیەکان چون یەکن... لەبەردا باسمان لەوە کرد کە (ملطی و ابن حجر) کە دو پیاوی سونین چی لە بارەی خەونەوە دەبێژن... وەلێ پیاوانی شیعەش لەم بابەتە دا زۆر لەوانیتر "لە پیاوانی سوننە" جیاواز نین.[8]

لە ڕاستی دا گرۆهە ئیسلامیەکان لەم سەردەمانەی دوایی دا، لە ڕوی ئەو شێوازە فیکریەوە کە زاڵە بەسەر ئاوەزی تاکەکانیان دا، هاوشێوە و چونیەك بونەتەوە... کۆمەڵێکیان جیاوازیەکانیان لەسەر ئەو کەسایەتیانەیە کە بە پیرۆزیان دەزانن، ئەم گرۆهانە کەسێکیان لا پیرۆزە و گرۆهەکەیتر کەسێکیتر، وەلێ لە ڕوی ڕەوتە ئەقلیەکەیانەوە کۆکن... دروست وەك قەلە ڕەشکە وان، کاتێ یەکیان بە یەکێتریان ئەڵێ: (ڕووڕەش) کە بەداخەوە نازانێت ڕوی خۆشی ڕەشە.

لە نێو شیعە دا نمونەگەلێ لە خەونم دۆزیوەتەوە کە دور نین لەو نمونانەوە کە لە (ملطی و ابن حجر)ەوە وەرمانگرتن.. کابرای شیعەش وەك هەر کەسێکی دیکەی خاوەن ڕێبازی ئاینی، بیر و بۆچونەکانی خۆی لە ژینگە و دەوروبەرەکەیەوە، وەردەگرێت... دواتر لە خەونی دا دەبینێت پشتگیری لە بیر و بۆچونەکانی دەکرێ (لە لایەن زاتێکی گەورەوە - وەرگێڕ).. کە لە خەونیش هەڵدەستێ باوەڕی بەهێزتر دەبێ لە جاران... ئیدی گوێش نادا بەوەی گەر بیر و بۆچونەکانی پێچەوانەی ئاراستەکاریە نمونەییەکانی ئیسلام بن.

یەکێك لە شیعەکان ڕۆژێکیان بە ڕویەکی گەشەوە هەر وەك ئەوەی بە ڕاستی نیگا دابەزیبێتە سەری، بۆمی باسدەکرد کە لە خەونی دا ئیمام عەلی دیوە و ئیمام فەرمانی پێکردوە کە لەسەر ئەو کارەی دەستی پێکردوە بەردەوام بێت... لە کاتێکدا کارەکەشی لەو سروتە هیچ و پوچانە دەچوو، کە لای ئێمە، خەڵکانی ڕەشۆکی خۆیانی پێوە سەرقاڵ دەکەن، دواتر شاشك بەسەرەکان دێن و بە یەکێك لە سروتە خواییەکانی دەدەنە قەڵەم... من دڵنیام لەوەی ئیمام بە کردەوەی ئەو کابرایە قایل نیە، گەر زیندووش بکرایەتەوە، دژایەتی کردەوەی ئەو کابرایەی دەکرد، هەر وەك چۆن دژایەتی

ئەو سروتانەی كرد كە ستەمكاران كردبویانە دەست پێچكە بۆ سەپاندنی دەستەڵاتی خۆیان بەسەر خەڵكی دا، لەو سەردەمەدا... بەڵام ئەم هاوڕێیەمان بڕوای بە كارەكەی خۆی هەیە، چونكە ئیمامەكەی لە خەون دا فەرمانی پێكردوە.

## چیرۆكێكی بەربڵاو:

لە نێو شیعەكان دا چیرۆكێك بڵاوە، دەڵێن گوایە: چەتەیەكی ڕێگر، جارێكیان بەر دەگرێت بە سەردانكەرانی (حسەین)، بەتەواوی ڕوتی كردنەوە و پارە و پولەكانیانی برد و ئازاریشی دان.. ئنجا شەوێ لە خەونی دا دەبینێت قیامەت هەستاوە و خەڵكی بۆ حەشر مۆڵ دراون، حەزرەتی حسەین لە ناوەڕاستی خەڵكەكەدا ڕاوەستاوە، تۆمارێكی بە دەستەوەیە كە ناوی هەموو ئەو كەسانەی تیایە كە سەردانی مەزارەكەیان كردوە.. ئنجا كاتێ سەرە هاتە سەر دزەكە، حسەین سەیری تۆمارەكەی كرد و ناوی دزەكەی تێدا دۆزیەوە... دزەكە زۆر بەوە سەرسام بوو.

دواتر دزەكە زانی فریشتەكان ناویان لە لیستی سەردانكەران دا تۆمار كردوە. چونكە هەندێ لە تەپ و تۆزی ئەو سەردانكەرانە لەسەر دزەكە نیشتوە لە كاتێكدا ڕێی لێ بڕیون... بەو هۆیەشەوە ڕێگرەكە چوە بە هەشتەوە.

كابرای دزە، لە خەو بێدار بویەوە و ئەم هۆنراوەی دەگوت:

| | |
|---|---|
| إذا رمت النجاة فزر حسيناً | لكى تلقي الإ له قرير عين |
| فاءن النار ليس تمس جسماً | عليه غبار زوار الحســـين |

یانی (ئەگەر ئەتەوێت سەرفراز بیت سەردانی حسەین بكە، تاكو بگەیتە لای خودا بە دڵنیاییەوە، چونكە ئاگر توخنی لەشێك ناكەوێت، كە تەپ و تۆزی سەردانكەرانی حوسەینی لێ نیشتبێ).

منیش بۆم هەیە بڵێم: ئەو حسەینەی كە لە ژیانی خۆی دا ڕاپەڕینی بەرپا كرد لە دژی ئەوانەی خەڵكی بە كۆیلە دەكەن و ماڵ و سامانیان بە تاڵان دەبەن، لە دوای مردنی

هەرگیز شفاعەت ناکات بۆ دز و ڕێگران، تەنانەت ئەگەر لە نوکی پێیانەوە تا تەوقی سەریشیان لە نێو تەپ و تۆزی پیرۆزیش دا نقوم بوبێت.

**خەون و نوسەری ئەم دێڕانە:**

سەبارەت بە خەون، لە دوای بڵاوکردنەوەی پەرتوکی (واعیزەکانی سوڵتان) لە ساڵی ١٩٥٤ دا روداوێ سەیر لێی ڕودام، پوختەی ڕوداوەکەش ئاوها بوو:

ئەز لەو پەڕاوە دا( عەلی)م وەسفکردوە بەوەی ڕوخێنەری ستەم بوە و شۆڕشی بەسەر ستەمدا کردوە،[٩] بەلای خۆمەوە ئەو پێناسەکردنە، ستایش کردنە بۆ ئیمام عەلی، بەلای خەڵکانی‌تری وەك منیشەوە هەر وایە... گرفت لەوە دایە کەلای ئێمە خەڵکی لە ڕوی بیرکردنەوەیانەوە لە سەردەمە رابردوەکاندا دەژین.

بەراستی هەنوکە چەمکەکان ئاڵ و گۆڕیان بەسەر دا هاتوە، کەچی ئەمان هێشتر دەستیان گرتوە بەو بەهایانەوە کە لە دێرزەمانەوە واعیزەکانی سوڵتان ڕایان هێناون لە سەری.

بۆیە دەمبینی خەڵکی بە لاتیری چاویان و بەرقەوە سەیریان دەکردم و تەنانەت خەریك بوو دەیانکردم بە چاوەوە. وایان گومان دەبرد کە من جنێوم بە ئیمام دابێ.. تەنانەت زۆرێکیان لە خەونیان دا ئیمامیان دیوە کە جنێوی بە من داوە و فەرمانی کوشتنمی داوە بە بڕواداران.

یەکێك لەو بڕوادارانە پیاوێکی خەڵکی گوندی (فەیصەلیە)یە، بانگەشەی ئەوەش بۆ خۆی دەکات گوایە نوسەرە... ئەو پیاوە کتێبێکی نوسیوە و تیای دا باسی ئەوە دەکات کە خەوێکی دیوە و تیای دا (محمد و علی) بینیوە کە فەرمانیان بە فریشتە داوە تاکو من بخەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە... ئەو کابرایە بە وردی خەونەکەی گێڕاوەتەوە و زۆرینەی لاپەڕەکانی کتێوەکەی بۆ تەرخان کردووە.. خەونەکە زۆر بەلایەوە قورس بوگە...تیای دا قیامەت هەستاوە.. خەڵکی لە هەموو لاوە بۆ لێپرسینەوە کۆبونەتەوە... لە نێو جەرگەی مەحشەر دا بەیداخێ گەورە بەرپا کراوە و (محمد) لە ژێری دا دانیشتوە و عەلی بە تەنیشتیەوە... سڵاوی خودا لە هەردوکیان.

خۆر لەوکاتە دا تیشک و تینی گەورە و ترسێنەری دەنارده سەر زەوی، زەوی دەکولا.. با نەدەبزوا... خەڵکی وەك سەرخۆش بوون، کەچی سەرخۆشیش نەبون...

لە بەر دەستی پێغەمبەر دا کۆمەڵێ فریشتەی مەزن ڕاوەستاون، هەمیشە چاویان بڕیوەتە لێوەکانی تاکو هەر چیەکی لە دەم دەرچوو جێبەجێی بکەن.. خەڵکی سەر بەهەموو ئاینەکان بە بەردەستی دا دەڕۆن، پاش ئەوەی تاك تاك بەناوی خۆیانەوە بانگیان دەکات.

هەندێکیان بە زنجیرێ گەورە دەبەسترێنەوە و دەخرێنە دۆزەخ، هەندێکیتریان وشترێکیان پێ دەدرێ کەسواری پشتیان دەبن وەکو تیشکێ بەرەو بەهەشت دەیان بەن و جلکێ لە ئاوریشمیان لە بەردایە.

ئنجا سەرە هاتە سەر ئەم هاوڕێ فەیسەلیەمان، گوناهەکانی زۆر بوون، بە جۆرێ خەریك بوو بیبەن بەرەو ئاگر، ئەگەر خۆشەویستی ئەم بۆ ئەهل و بەیت بە فریای نەکەوتایە و تای تەرازەوەکەی سەنگین نەکردایە... بەوە ڕوی پێغەمبەر گەشایەوە و فریشتەکان ئەڵڵاهو ئەکبەریان کرد و هاوڕێکەشمان ڕزگاری بوو.

هێندەی نەبرد، جارچییەك هاواری کرد: (عەلی وەردی، عەلی وەردی، بێتە پێشێ بۆ لێپرسینەوە)... عەلی وەردی دەستی کرد بە پاڕانەوە و لالانەوە و دەیگوت گوایە لە ژیانی دا دەستی گرتوە بە پەڕاوەکەی خوداو، خۆشەویستی وەچەکانی پێغەمبەرەکەیەوە.... ئەم قسەیە هیچ سودێکی نەگەیاندە عەلی وەردی... دواتر پێغەمبەر بە زەردەخەنەوە ڕویکردە ئیمام عەلی و ئنجا بە تورەییەوە ڕویکردەوە بە لای عەلی وەردی دا... دەستی کردە لێپرسینەوەی لە سەر قسەکانی ڕابردوی و زۆر توند بوو لە لێپرسینەوەی دا... لە دوایی دا گوتوێتی: (کردەوەکانی بکێشن، چونکە بەکردەوەکانی ڕزگار دەبێت یان نغرۆ دەبێ، ئەو هیچ دۆستایەتیەکی ئێمەی نەکردووە، بە توندی لێپرسینەوەی لێ بکەن).

(عەلی وەردی) لەم کاتە دا هاوارێکی کرد کە هەموو ئەهلی حەشری گریاند. هاوڕێکەشمان کە (وەردی) بەو حاڵەوە دەبینێ زۆری دڵ پێ دەسوتێ... ئنجا بەدەم ترس و گریانەوە لە خەونەکەی ڕادەپەڕێت.... بەڵام من سەر لەوە دەر ناکەم کە بۆچی

ئەم هاوڕێیەمان دەترسێت و دەگری، لە كاتێك گریان و لەرز و ترسەكەی نێو خەونەكەی هەموو بۆتە بەشی نوسەرە هەزارەكەی ئەم چەند دێڕە؟

**خەون لە مەدینەی پیرۆز دا:**

ئێستاكە لە مەدینەی پیرۆز دا پیاوێك دەژی ناوی (شێخ ئەحمەد)ە و، خۆیی ناو ناوە (خادەمی پێغەمبەر= خزمەتكاری پێغەمبەر)، وا دیارە یەكێك بێت لە خزمەتچیەكانی مزگەوتی پێغەمبەر... گرفتی ئەو پیاوە ئەوەیە هەرجار نا جارێ پێغەمبەر دێتە خەوی... و هەندێ ئامۆژگاری دەكات... ئەم شێخەش ئەركی بڵاوكردنەوەی ئامۆژگاریەكان بە رۆژهەڵات و رۆژئاوای دنیا دا لە ئەستۆ دەگرێ.

ئەو شێوازەش كە شێخ بۆ بڵاوكردنەوەی ئامۆژگاریەكان پەیڕەوی دەكات، شێوازێكی سەیرە و سەردەمی بەر لە دۆزینەوەی چاپخانە و چاپەمەنیمان وەبیر دێنێتەوە، چونكە ئەو داوا دەكات هەر كەس ئامۆژگاریەكانی پێ دەگات، بینوسێتەوە و بیداتە كەسێكی‌تر... هەر ئەم كابرایە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە گوایە لە خەونی دا بەو كابرایەی گوتوە: هەر كەس وا بكات (واتە ئامۆژگاریەكان بنوسێتەوە و بیداتە كەسێكی‌تر - وەرگێڕ) كۆشكێكی لە بەهەشتدا بۆ دەنوسرێت، ئەوەش بەوەی كەسێك بەكرێ بگرێت تاكو بۆی بنوسێتەوە، یا شێخ (دەربڕینی وەرگێڕە) كرێ نوسینەكەش بە سێ درهەم دیاری دەكات... تەنها سێ درهەم نە زیاد نەكەم.

لەم ڕۆژانە دا تازەترین ڕونوسی ئەو ئامۆژگاریانەم دەستكەوت كە ئەم شێخ ئەحمەدە بەناو موسڵمانان دا بڵاویان دەكاتەوە... ئەم ڕونوسە چاپ كراوە و (سید علی سەرتاش) لە بەغداد هەستا بە ئەركی دابەش كردنی بەسەر خەڵك دا... وا دیارە ئەم (سید عەلی)یە ویستویەتی ببێتە خاوەنی چەندین كۆشك لە بەهەشتدا. چونكە لەسەر ئەركی خۆی هەزاران رونوسی لێ چاپكرد و دابەشی كرد بە سەر خەڵكی دا.

تێكستی تەواوی ئەو ڕونوسە لە چاپدراوە بەم شێوەی خوارەوەیە:

بسم الله الرحمن الرحيم

و به نستعين على القوم الكافرين.. و صلى الله على سيدنا خاتم الانبيا و المرسلين و صحيبه و سلم.

ئامۆژگارییەك لە مەدینەی پیرۆزەوە:

(شێخ ئەحمەدی (خزمەتكاری پێغەمبەر) زانای بەڕێز دەگێڕێتەوە... دەڵێت: شەوی هەینی بێدار بووم لە دوای خوێندنی ناوە جوانەكانی خودا، قورئانی پیرۆزم دەخوێند، دوای تەواوبونم خۆم ئامادەكرد بۆ خەوتن... خەوەنوچكەیەك بردمیەوە... كە بینیم مانگی تابان (پێغەمبەری خودا) دانیشتوە.. فەرموی: ئەی شێخ ئەحمەد... گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی بەڕێزترین دروستكراوی خودا... فەرموی: من بێزارم لە كردەوە ناشیرینەكانی خەڵكی، ناتوانم بچمە حزوری خودا یاخود فریشتەكان ببینم، چونكە لەو هەینی‌یەوە بۆ ئەم هەینی سەد و شەست هەزار كەس مردوون كە لە سەر ئاینی ئیسلام نەبوون... پەنا بە خودا دەگرین لەو خراپەیە، ئەو خەڵكە وایان لێهاتوە، دەوڵەمەندەكانیان لە هەژارەكانیان ناپرسن، هەر كەس تەنها خەمی خۆیی هەیە... گوناهی گەورە و زینا و هەڵەی زۆر و بوتران و فێڵی (رسیز)[10] دەكەن، مەی دەخۆنەوە و نوێژیان تەرك كردوە و زەكات یاساغ دەكەن... ئەی شێخ ئەحمەد هەواڵیان بدەرێ و ئاگاداریان بكەرەوە، بەر لەوەی خودای گەورە سزایان بدات و دەرگاكانی بەزەیی دابخات.. جا پەنا بە خودا دەگرین لە خراپەی ئەو حاڵە... ئەمە چونكە خەڵكی لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە و كوفرانە بە خودا دەكەن و وازیان لە ئاینی ڕێك و ڕەوان هێناوە و ملەجەڕێی ئایەتەكانی خودا دەكەن... ڕۆژی بەرێ نزیك بۆتەوە.. بەم نزیكانە ئافرەتان بە بێ‌مۆڵەتی مێردەكانیان دەچنە دەرێ... نیشانەیەكی وەك هێلكەی مامر لە ئاسمان دا دەردەكەوێ، كەیەكێكە لە نیشانەكانی قیامەت... سێ ڕۆژ خۆر دەرناكەوێت... دوای ئەوە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا دەبێت و ئەو كاتە دەروازەی پەشیمان بونەوە دادەخرێت... قورئانی مەزنیش لە نێو سنگی پیاواندا بەرز دەگرێتەوە... ئنجا مەسیحی دەجال پەیدا دەبێ كە ژن و پیاو لێی دەترسن و ئیسلام

وەك پێشوی لێدێتەوە... ئەی شێخ ئەحمەد ئەم ئامۆژگاریەیان پێبگەیەنە، پێشیان رابگەیەنە كە لە ڕوتەختی قەدەرەوە گوازراوەتەوە).

شێخ ئەحمەد كۆتایی ئەم ئامۆژگاریانە بەوە دێنێ كە سوێند دەخوات بە خودای گەورە قسەكانی ڕاستن... گەر درۆ بن ئەوا شێخ بە بێباوەڕی لە دنیا دەردەچێت.. دواتر ئاوڕیش بەلای ئەوە دا دەداتەوە كە ڕای دەگەیەنێت هەر كەس بڕوا بەم وتەی شێخ و ئامۆژگاریەكانی بكات لە ئاگر قوتار دەبێت و هەر كەسیش بە درۆی بخاتەوە، كوفری كردوە.

بەر لەوەی كۆتایی بەم بەشە بێنم، حەز دەكەم بڵێم: موسڵمانان هەموویان لەو جۆرە پیاوانە نین كە باسكردن.. بەڵكو چەندین پیاوی ئاینی و زانا هەن كە هەرگیز خەون ناكەنە یەكێك لە سەرچاوەكانی بیر و باوەڕ و تێگەشتنیان... بەڵكو دەگەڕێنەوە بۆ لای قورئان و فەرمودە ڕاستەكانی پێغەمبەر و بەرژەوەندی گشتی خەڵكی... وەلێ زور بە داخەوە ئەم پیاوانەی ئاماژەم پێدا ژمارەیان كەمە.

لەوانەیە زیادەڕەویم نەكردبێ گەر بڵێم: زۆرینەی پیاوانی ئاینی لە بیر و باوەڕ و بۆچونەكانیان دا بەو ئاراستە دا دەچن كە جەماوەر ڕوی تێدەكات، بە هەموو شێوە و ڕێگەیەك هەوڵی دڵ ڕاگرتنی جەماوەر دەدەن... هەر لەبەر ئەوەشە كە خەون بۆتە یەكێك لە بنەما سەرەكیەكانی بیر و باوەڕ.

لەوانەیە باسكردنی ئەو ڕەواجەی كتێبی كابرا (فەیصەلیەكە) لێرەدا شتێكی گونجاو بێت.. خەڵكانی نەخوێندەوار و هەندێ لە پیاوانی ئاینی هەر بە پەلە ئەو پەرتوكەیان قۆستەوە، وەك ئەوەی نیگای خودایان تیا ببینیبێ.. لەوانەش هەموو سەیرتر، ئەوەیە كە ڕەخنەگری پەرتوك لە (دەزگای رادیۆی عێراق) دێت و دەڵێت: ئەو پەرتوكە لە ماوەی ئەو مانگەدا (كە تیای دا دەرچوە) باشترین پەرتوك بوە.

تا ئەمڕۆكە نەتەوەیەكیترم پێ شك نایەت كە هێندەی ئەم نەتەوەیە بڕوای بە خەون هەبێت و تیای دا ڕۆچوبێت... خودا چاوپۆشی لێبكات.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم:

١ـ بنواڕە: ابوالحسین الملطی، التنبیه و الرد، ل ٢٣ ـ ٢٥.

٢ـ بنواڕە: هـ.س (پەراوێز)، ل ٢٤ ـ ٢٥.

٣ـ بنواڕە: احمد أمین، صنحي الاسلام، ج ٣، ل ١٩٩.

٤ـ بنواڕە: ابن الحجر، الصواعق المحرقة، ل ٢٤٤.

٥ـ وا دیارە ئەوانەی یاری بەکۆتر دەکەن، واتە کۆتربازەکان، لەو سەردەمە دا بەسوك سەیر کراون، وەك ئێستەش کە هەر بە سوك سەیر دەکرێن.

٦ـ بنواڕە: هـ.س، ل ٢٤٠ ـ ٢٤٣.

٧ـ بنواڕە: هـ.س، ل ٢٤٣ ـ ٢٤٤.

٨ـ بنواڕە: الشیخ المفید، فصول من کتاب العیون و المحاسن، ل ٩٢ ـ ٩٣.

٩ـ هەندێ ڕەخنەی ئەوەیان لێگرتم کە من نەزعەی شۆڕش و روخاندنم داوەتە پاڵ ئیمام، بێئەوەی ستەمکاریەکانی پشتی شۆڕشەکە باس بکەم، دیارە ئەوان لە بیریان چوە کە لە ناواخنی پەرتوکەکەدا، دەربارەی عەلی گوتومە: ئەو وەکو گەورەکەی (وەك محمد) شۆڕشی کردوە بەسەر ستەم و ستەمکاران دا.

١٠ـ ئەو دەستەواژە سەیرانە، هەر بەو شێوەیە لە دەقە عەرەبیەکەدا نوسراون، بەندە پێم وایە ئەو شێخ ئەحمەدەی مامۆستا وەردی باسی دەکات، بۆیە ئەو وشە ناوازانەی کردۆتە نێو ئەو ئامۆژگاریانەوە تاکو خەڵکی بڕوا بکەن بەڕاستی ئەو خەونە و قسەکانی شێخ ... خوداش زاناترە ـ وەرگێڕ ـ

# دەروازەی دووەم

# بۆچونە نوێیەكان لە مەڕ خەون

# بەشی پێنجەم:

# پەرچەکردار

**مادەچێتی "مادەگەرایی":**

لەسەردەمە دێرینەکاندا نەزعەی رۆحی "گیانگەرایی" بەسەر ئاوەزی خەڵکی دا زاڵ بوو... خەڵکی وایان دەزانی گەردون بە هەموو دیاردەکانیەوە پێکهاتوە لەگیان و مادە... لە پشتی هەر مادەیەکیشەوە ڕۆحێك هەیە کە زاڵە بەسەری دا، رۆحی هەرە گەورەش لە گەردوندا بریتی‌یە لە خودا.

ئەم پۆلێن کاریە دوو جەمسەریەی گەردوون، وایکردووە لە مرۆڤانی کۆن کە جیاوازی بکەن لە نێوان بێداری و نوستن دا. مرۆ لە ساتی بێداری دا دەکەوێتە ژێر کاریگەری خواستەکانی جەستەوە.. وەڵێ لە کاتی نوستن دا رۆحی لە کۆتی مادە ڕەها دەبێت و لە جیهانێکی باڵادا دەژی کە ئاسەواری مادەی تێدا نیە.

لە چەرخی نوێ دا بیریاران شۆڕشیان بەرپا کرد بەسەر ئەو گیانگەراییە کۆنەدا.. بەڵکو گەردون بەگشتی و مرۆڤیان بە تایبەت دارنی لە هەر شوێنەوارێکی کاریگەری (گیان) بە سەریەوە... لە دیدی وان دا گەردون مادەیە لە نێو مادە دا و بەگوێرەی کۆمەڵێ رێسا و یاسای میکانیکی بەرێوە دەچێت.[1]

بۆیە دەتوانین ئەو مادەگەراییە نوێیە بە پەرچەکرداری گیانگەراییە کۆنەکە لە قەڵەم بدەین... وەك چۆن مرۆڤانی کۆن زیادەڕەوییان کرد لە بڕوایاندا بە گیان، بە هەمان تەرز بیریارانی نوێش زیادەڕەوی‌یان کرد لە بڕوابونیاندا بە مادە.

تیۆری هیگڵ و خەون:

(هیگڵ) بڕوای وایە، پێشفەچوونی بیری مرۆ بەشێوەیەکی گشتی لەسەر بناغەی هاودژێتی ڕێ دەکات، هەر بیرێك کە لە نێو خەڵکی دا بلاو دەبێتەوە، دەبێ بیرێکی دژی بەدوا دا بێت... پاش ئەوەش کە لە نێو بیرەکە و دژەکەی دا دژایەتی و کارلێك کردن رو

دەدات، بیرێکی مام ناوەند سەرهەڵئەدات، ئەمیش بە ڕۆڵی خۆی دەبێتە هۆی دروست بونی بیرێکی دیکە کە دژە لە گەڵی دا، و هەروەها[٢] ....

هیگڵ ئەم بیردۆزەی خۆی ناو ناوە (دیالیکتیک) گەر ئەو دەستەواژەیە بکەینە عارەبی ئەوا دروستە ناوی بنێین بیردۆزی (دوالیکی= گۆڕانی جار لەدوای جار). چوون واژەی (دوالیک) لە زمانی عەرەبی دا مانایەکی زۆر نزیک دەدات لە مەبەستەکەی هیگڵەوە.. ئەوانەی لە زمانی عارەبی دا باسکیان هەبێ یان دەمی لێ وەردەن، ئەم ڕاستیە لایان شاراوە نیە.

لە ئەنجامی توێژینەوەی ئەو ڕا و بۆچونانەی لە بارەی خەونەوە لە کۆن و نوێ دا نوسراون، گەشتمە ئەو بەرەنجامەی کە تیۆری (دوالیکی) تا ڕادەیەکی زۆر بەسەری دا دەچەسپێ.. دوای ئەوەی مرۆڤانی کۆن دەوری خەونیان گرتبوو بە هالەیەکی ڕۆحی، تەنانەت نیگا و سروشی خواییشیان دەدایە پاڵ خەون.. دوای ئەوان بیریارانی تازە هاتن و پێچەوانەی ئەوان یان کرد... خەونیان بەتەواوی دارنی لە هەر ڕواڵەتێکی ڕۆحی و پیرۆزیتی... لە بەشی سێیەمی ئەم پەرتوکەشدا دێینە سەر باسکردنی ئەو ڕا و بۆچونە مام ناوەندەی کە لە نێو توێژەران دا بەم دواییە بلاو بۆتەوە.

**زیندوکردنەوەی بیردۆزەکەی ئەرستۆ:**

لەبەشی یەکەمدا ئاماژەمان دا بەبیردۆزەکەی ئەرستۆ، گوتمان ئەو بیردۆزە یەکەمین تیۆری کۆنە کە خەون دادەڕنێت لە بەرگە ڕۆحیەکەی و هەوڵ دەدات لە ڕویەکی مادیەوە ڕاڤەی بکات.

ئەو بیردۆزە لە سەردەمە کۆنەکاندا مرد، هیچ کەس کاری پێ نەکرد و پەسەندی نەکرد، جگە لە کەمێك زەندیق و یاخی و ئەوانەی خاوەنی تێڕوانینی عەقلانین... وەلێ زۆرینەی بیریاران دەستیان بە بیردۆزە ڕۆحیە پێچەوانەکەی ئەم بیردۆزەوە گرت.

لەسەردەمی نوێ دا تیۆرەکەی ئەرستۆ سەر لەنوێ بوژایەوە، و زۆربەی توێژەران بڕوایان پێکرد... تەنانەت لە ڕاستی دوور نەکەوتوینەتەوە گەر بڵێین ئەم بیردۆزە بەربلاوترین بیردۆز بوو لە نێو ڕۆشنبیران دا، بەر لە دەرکەوتنی تیۆرەکەی فرۆید.[٣]

بیردۆزەکە بەبیردۆزی (هاندەری هەستی) ناسرا بە واتای ئەوەی خەون بەهۆی هەستکردنی مادیەوە کە کتوپڕ بەسەر کەسی خەوتوو دادێ پەیدا دەبێ.. ئەم هەستکردنە مادیەش لەوانەیە لە نێو خۆی لەش دا یاخود لە دەرەوەی لەش دا ڕو بدات.

**کۆوتارەکەی برجسون:**

یەکێک لەو کەسانەی بەشداریان کرد لە بەرقەراربونی ئەم بیردۆزە و پشتگیری کردنی دا، فەیلەسوفی ناسراوی فەرەنسی ناسراو (هنری برجسون) بوو، ئەم فەیلەسوفە لە (پەیمانگای سایکۆلۆژی گشتی) دا لە ساڵی ١٩٠١، کۆوتارێکی پێشکەش کرد... یەک لەو قسانەی لە کۆڕەکەی دا کردبوی، ئەم وتەیە بوو کە دەڵێت: هەستەکان لە کاتی نوستن دا لە کار ناکەون، هەر کاریگەریەك بکەوێتە سەر هەستەکان (لە کاتی خەودا) دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی خەوتوو خەونێکی لەو جۆرەی کاریگەریە کە ببینێت، بۆ نمونە گەر قاچەکانی لە جێگەیەکی سەقامگیر دا نەبن لە کاتی نوستن دا، ئەوا خەونێك دەبینێ گەوا دەزانێ بە ئاسماندا دەفڕێ... یاخود گەر لە نزیکی چاویەوە مۆمێك دابگیرسێنرێت، لە خەونی دا وەك ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورەی دەبینێ، بەدوایدا هاوار و قڕەقڕ دەبیستێ ئینجا پیاوانی ئاگر کوژێنەوە و فریاکەوتنیش لە خەونەکەی دا دەبینێ... یاخود گەر دەنگە دەنگێکی لە نزیکەوە بکرێ، ئەو لە خەونی دا لێی دەبێتە خۆپیشاندان و پێکدادان لە گەڵ پیاوانی پۆلیس دا.[٤]

**بەکاربردنی ئەزمون:**

هەندێ لە توێژەران دەستیان کردە بەکارهێنانی تاقی کردنەوە بۆ پشتگیری کردنی ئەم تیۆرە... دیاریترین کەسێ کە ئەم ڕێگەیەی هەڵبژارد مامۆستا (موری) بوو.. ئەو جارێکیان ئەزمونێکی لەسەر خۆی بە ئەنجام گەیاند... ئەوە بوو داوای کرد لە یاریدەدەرەکەی تاکو لە کاتی نوستن دا (مقاشێك و مقەستێ) بهێنێت و لە نزیکی یەکترەوە بیان کێشێت بەیەکتر دا... کە بێداریش بویەوە، (موری) گوتی گوایە دەنگی (مقاش و مقەستەکە) بونەتە هۆی ئەوەی خەونێك ببینێت کە تیای دا دەنگی زەنگ و ئاژێری بیستوە و ئنجا هەر لە خەونەکەی دا روداوێکی هێندە ناخۆشی بەسەر دا هاتوە

كە لە هەمان ئەو ڕوداوە ترسێنەرە دەچوو كە لە حوزەیرانی ساڵی (١٨٤٨ز) دا بەسەری داهاتبوو.[٥]

رەخنەگرتن لە بیردۆزەكە :

سەرەڕای ئەو تاقیكردنەوە زانستی‌یانەی كە پشتگیری دەكەن، كەچی بیردۆزەكە لە ڕەخنە و ڕەخنەكاری بێبەش نەبووە... یەكێك لەوانەی كە زۆر بە توندی ڕەخنەیان ئاراستە كردوە زانای بەناوبانگی نەمسایی (سیگموند فرۆید)ە... ئەم لای وایە هاندەری هەستی، ڕەنگە هاوكار و بەشدار بێت لە دروست كردنی خەون دا، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا نێوەڕۆكی خەونەكە دیاری ناكات و هیچ سوودێكیشی نیە بۆ ڕاڤەكردنی خەونەكە.

گەر لە نزیك گوێچكەی چەند مرۆڤێكی خەوتوەوە زەنگێك لێبدەین، ئەمە وا لە هەموویان دەكات كە هەر یەكەیان خەونێكی پەیوەندی دار بە لێدانی زەنگەوە ببینن.. بەڵام هەر یەكێ لەو خەوتوانە خەونێك دەبینێ كە بگونجێ لە گەڵ بیرەوەری و ئارەزوە شاردراوەكانیشی دا.

دەگونجێت بڵێین: هاندەری هەستی، خەون دەبزوێنێت، بەڵام ئەو ڕێگەیە دیاری ناكات كە لەسەری دەڕوات... دەگرێ خەون بە گۆیەكی خڕ بچوێنین كە لەسەر جێگەیەكی قوچ و لێژ دانراوە، ئەم گۆیە لاوازترین هێز پاڵی پێوە بنێت بەرەو خوار لە لێژیەكەوە گلێر دەبێتەوە... كەواتە پاڵنەرەكەی تەنها بەرەو گلێر بونەوە دەیجوڵێنێت، بەڵام چارەنوس و (شێوازی گلێر بونەوەكەی) دیاری ناكات.

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم:

١ـ بنواڕە: Jeans,Mysteriouse, Universe, P.19

٢ـ بنواڕە: Eliot and Merrill, social Disorganization, p. 6

٣ـ بنواڕە: Dalbiez, psychoanaly Tical Method, vol, p 30

٤ـ بنواڕە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ٧١ ـ ٧٢.

٥ـ بنواڕە: Dalbiez, op.cit,Vol 1, p 30

# بەشی شەشەم:

# مەزنێتی فرۆید

### بۆمبەكەی فرۆید:

فرۆید ڕەخنەی ئاراستەی بیردۆزی (هاندەری هەستی) كرد لە لێكدانەوەی خەون دا، لە هەمانكاتدا بیردۆزێكی ورد و گشتگیری‌تری هێنایە كایەوە. تیۆرەكەشی ناوبانگێكی زۆر گەورە و بێ‌هاوتای پەیدا كرد لە نێوەندە زانستی‌یەكان دا.

هەنوكە فرۆید لە هەمو لایەكی جیهانەوە شوێنكە و توانی هەس، ئەمان دەمارگیرن لە شوێنكەوتنی فرۆید دا وەك هەر كەسێكی دیكەی شوێنكەوتەی پێغەمبەرێ كە چۆن دەمارگیرە لە شوێن كەوتنی پێغەمبەرەكەی دا... لە بەرانبەریش دا، دژانێكی سەرسەختیان هەیە... وەك زانراوە لە هەموو كایە مێژووییەكان دا هەر مەزنێ هەم لایەنگر و هەم دوژمنیشی بۆ پەیدا دەبێ.

### بلیمەتی فرۆید:

بەر لە هەر شتێ پێویستە دان بەوە دابنێین كە فرۆید توێژەرێكی داهێنەر بووە. لە نێو زانست دا پلە و پایەیەكی دیاری هەیە، سەرەڕای ئەوەی چەندین هەڵەشی كردوە، بەڵام ڕاژەیەكی گەورەی پێشكەشی توێژینەوەی زانستی كردوە.. هەر چەندە مرۆڤ زۆریش بلیمەت و داهێنەر بێت ناتوانێت بێ‌هەڵە و كەم و كوڕی بێت.

فرۆید تاوتوێی ئەو بۆچونانەی كردوە كە بەر لەو لە بارەی خەونەوە نوسراون و گوتراون، هەر هەموشیانی پوچەڵ كردەوە... خۆی لەم ڕووەوە دەڵێت: سەرەڕای ئەو چەند هەزارساڵەی كە بە سەر توێژەراندا تێ‌پەڕیوە، كەچی نەیان توانیوە لە توێژینەوەی خەوندا سەركەوتنی گەورە بە دەست بهێنن یان بە شێوازێكی زانستی لێی تێ‌بگەن[1] ...

شوێنکەوتوانی فرۆید لە بارەی تیۆرەکەیەوە دەڵێن، تاکە تیۆرێکە کە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ڕاڤەی خەونی کردوە.

وەلێ دوژمنەکانی سوکایەتیان بە خۆیشی و بیردۆزەکەیشی کرد، بە ڕای ئەوان فرۆید هیچی تازەی پێ نەبوە، بەر لەو خەڵکانێکی زۆر ئەو بۆچونەیان هەبوە.[٢]

حاڵ و باڵی داهێنەرە مەزنەکان:

وا دەردەکەوێ ئەمە حاڵ و باڵی هەموو داهێنەرە مەزنەکان بێت... هەر کە تیۆرەکەیان بڵاو دەکەنەوە، دەست بەجێ ڕەخنەگری لێ پەیدا دەبێ و زمانی لێ دەردەکێشن... بە سوك سەیری دەکەن و نکۆڵی لە فەزڵ و پلە و پایەی دەکەن.

هەڵوێستی ئاوها ڕوبەڕوی هەموو پێغەمبەران و کەسایەتیە بلیمەتەکان لە هەموو کات و شوێنێکدا بۆتەوە... هەر کە دەشمرن، و ڕۆژگار دوریان دەخاتەوە، خەڵکی بەبەرزی یادیان دەکەنەوە و زۆریش لە ڕێز گرتنیان دا توند دەبن، بە پێچەوانەی ئەو هەڵوێستەیانەوە کە لەسەرەتاوە لە گەڵیان دا نواندویانە.

**فرۆید و کولومبس :**

دەکرێ فرۆید بە کۆلۆمبس بچوێنین کە کیشوەری ئەمریکای دۆزیەوە[٣] کاتێ کۆلۆمبس ئەو کیشوەرە گەورەیەی دۆزیەوە، دژەکانی گاڵتەیان پێکرد و دۆزینەوەکەیان لە هەر بایەخێ داڕنی... گوتیان: کیشوەری ئەمریکا هەر هەبووە... ئەگەر کۆلۆمبیش نەی دیتایەوە، ئەو باندە دزیکەرانەی دەریا دەیان دۆزیەوە کە لە دەریا نێزیکەکان دا دێن و دەچن.

ئیدی هەموو ئەو هەوڵە زۆر و زەوەندانەیان لە بیر چوو، کە کۆلۆمبس لە پێناوی دۆزینەوەکەی دا بەگەڕی خستوە، و ماوەیەکی دور و درێژ کە بیرۆکەکە چوەتە کەللەیەوە ئیدی نەیتوانیوە بنوێت و لە چێژی نوستن بێبەش بوە، و لەو پێناوەشدا کۆششی زۆر گەورەی بە گەڕ خستوە.

لە کاتێك دا کۆلۆمبس لە خەباتەکەی دا شەونخونی و ناڕەحەتی دەچەشت، لەو لاوە دەبەنگەکان لەو پەڕی خۆشی ژیاندا بون... هەر کە کۆلۆمبس گەشتە مەرامەکەی خۆی، بەڕوی دا ڕاچەنین و هاواریان کرد: تۆ هیچی نوێت نەهێناوە.

دەگێڕنەوە یەکێك لەوانەی ڕژدیان بە کۆلۆمبس دەبرد، لە بەردەم پادشادا زۆری ڕەخنە گرت لە کۆلۆمبس... ئنجا کۆلۆمبس هێلکەیەکی گرت بە دەستیەوە و شانەخرەی کرد ئەگەر هەر کامێکیان بتوانن لەسەر باری شاقولی (لە سەر سەر) هێلکەکە بوەستێنێ... ئەوە بوو هیچیان نەیانتوانی ... لەم کاتە دا کۆلۆمبس هێلکەکەی هەلگرت و کەمێکی لەسەرەکەی شکاند و ئنجا وەستاندی. لەم کاتە دا ئامادەبوان بەربونە پێکەنین و گاڵتە کردن.

## گرفتی ئەفراندن:

لە راستی دا هەر دۆزینەوەیەکی مەزن، لە خودی خۆیدا سادە و ساکارە وەك سادەیی ڕاوەستاندنی هێلکەکە لەسەر باری شاقولی... وەلێ گرفتەکەی لەوە دایە کە خەلکی پەی بە سادەییەکەی نابەن، دوای ئەوە نەبێ کە کەسێ پێی هەڵدەستێ... ئیدی لەو کاتەدا دەست دەگەنە سوك سەیرکردنی ئەفراندنەکە و خاوەنەکەیشی.

زانایانی کۆمەڵناسی دەڵێن: داهێنەر هیچ شتێکی نوێ ناهێنێتە ئارا، بەڵکو ئەو شتە کۆنەکان پەیوەست دەکات... ئەمەش یانی هەر بیرۆکەیەکی نوێ لە بنەڕەتەوە لە بیرۆکەیەکی کۆنەوە سەرچاوەی گرتوە... کەواتە لە ئاسمانەوە دانابەزێتە سەر خاوەنەکەی، بەڵکو لەو زەویەوە بۆی دێتە دەر کە لە سەری دەژی.

لە ڕاستی دا دوور نەکەوتوینەوە گەر بڵێین: پلە و پایە و بایەخی داهێنەر لە چوارچێوەی پەیوەست کردن و دانان تێناپەڕێ... ئەمەش یانی ئەوە نا کە بایەخی داهێنەر کەم و سادەیە... چونکە پەیوەست کردن پێویستی بە ئاگابوون و لێکۆڵینەوەی ورد و بێپسانەوە هەیە... تا چەندە مرۆڤ ڕۆبچێت بە نێو لێکۆڵینەوەدا ئەوەندەش زیاتر بیر و بۆچونی لا گەلاڵە دەبێت... تاکو ساتەوەختێکی بەسەردا تێدەپەڕێ کە

دەتوانێت دوو بیرۆکەی پێشوی تێدا پەیوەست بکات... بە پەیوەست کردنی دوو بیرۆکەکەش داهێنانی مەزن پەیدا دەبێ.

جیاوازی نێوان (داهێنەر) و (دەبەنگ)یش ئەوەیە کە یەکەمیان دەزانێت چۆن و کەی هەنگاوی یەکلاییکەرەوە دەنێت، بەڵام ئەمیتریان لەم دنیایەیدا جگە لە ڕژدی هیچیتر نازانێت.

خۆش بەختیش بۆ دەبەنگەکان، ئەوان لە ژیان دا خۆشنودن و ڕەنج و ناڕەحەتی ناچێژن، بەڵام هەر ئەوەندەی هاوڕێیەکی خۆیان دەبینن کە بە بیرۆکەیەک یا خود بە دۆزینەوەیەکی گرنگ لێیان جودا دەبێتەوە، خێرا دەست دەکەن بە ڕەخنە لێگرتن و گاڵتەپێکردنی... ڕەنگە لە ناو ناخیشیان دا ڕژدی پێبەرن، دەشیانەوێت بەشدار بن لە بەرهەمی ماندووبون و زەحمەتەکەی دا.

### گەڕانەوەیەك بۆ سەرەتا :

کاتێ دەگەڕێینەوە سەر باسی فرۆید، دەبینین لەو داهێنەرە مەزنانەیە کە بیرۆکەی نوێیان بەرهەم هێناوە.

نکۆڵی لەوە ناکەین کە فرۆید پشتی بەستوە بە زۆرێك لەو بیریارانەی کە بەر لە خۆی دەرکەوتوون، دەشگونجێت بڵێین: تیۆرەکەی فرۆید پێك هاتوە لە پاشماوەی تیۆرەکانی پێش خۆی، بەڵام ئەو لەو پاشماوە بەکار نەهاتوانە ئامێرێکی بەرهەم هێنا کە سود بە خەڵکی دەگەیەنێت... ئەمە لە کاتێکدا بیریارانی پێش وی لە نێو خەو دا پرخەیان دەهات (دەربڕینی وەرگێڕ).

### تەوەرەی تیۆرەکە :

تیۆرەکەی فرۆید بە تیۆری (هاندەری دەرونی) ناوزەد دەکرێ، بەم پێودانگەش هاوشانە لە گەڵ تیۆری (هاندەری هەستی دا)، ئەو تیۆرەی لە بەردا ئاماژەمان پێدا... فرۆید بە دوو وشە تیۆرەکەی کورت دەکاتەوە کە دەڵێت: خەون هیچ نیە جگە لە "بەدەست هێنانی ئارەزوو".

جێگەی ئاماژەپێدانە، ئێمە دەتوانین تۆوی ئەم بیرۆکەیە لە نێو تیۆرەکەی ئەرستۆ دا بدۆزینەوە، هەروا لە نێو فەرموودەی پێغەمبەر و، زۆربەی ئەو بۆچون و ڕایانەش دا کە لە کۆن دا لە بارەی خەونەوە گوتراون. وەلێ (تۆوێکی) بزربوو بوو، هیچ کەس گرنگی تەواوی پێنەدەدا...

فرۆید (بەدەست هێنانی ئارەزوو)ی کردە ئەو بنەڕەتەی کە خەونی لەسەر دروست دەبێ، هەوڵیشی داوە هەموو ئەو دیاردە سەیرانە بە پێی ئەو بنەمایە لێك بداتەوە کە مرۆڤ لە خەونی دا دەی بینێت.

فرۆید جگە لەوەی گوترا دوو خاڵیتریشی باسکردوە:

١- بەدەست هێنانی ئارەزوو، ڕەنگە لە خەون دا بە شێوەی ڕاشکاو و ئاشکرا نەبێت، بەڵکو زۆربەی کات بە شاردراوەیی و جەفەنگ ئاسا دەبێت.

٢- خەون هەموو ئەو ئارەزووانە بەدی ناهێنێت کە مرۆڤ حەزی پێدەکات، تەنها ئەو ئارەزووانە بەدی دێنێت کە مرۆڤ لە ساتی بێداری دا خەفەی کردوون و لە بەر هەر هۆیەك نەیتوانیوە تێریان بکات.

بۆیە دەکرێ تیۆرەکەی فرۆید بەم دێرە کورت بکەینەوە:

(خەون بەدیهێنانێکی شاردراوەی ئارەزووە خەفەکراوەکان یاخود پەستێنراوەکانە)(٤)

**هۆکارێ بۆ پشکنین:**

فرۆید دواتر هەستی کرد، کە ڕەنگە ئەم بیردۆزەی، یارمەتی بدات لە پشکنینی ئەو نەخۆشینە سایکۆلۆژیانەی کە هەندێ خەڵك پێیەوە دەناڵێنن.

هەندێ جار نەخۆشینی دەروونی بەرەنجامی ئارەزوویەکی خەفەکراوی نێو قوڵاییەکانی دەرونە... نەخۆشەکەش حەز ناکات ئەو ئارەزوەی ئاشکرا بکات، یان لەوانەیە پێی نەزانێت، لێرەوە فرۆید پەنا دەباتە بەر شیکردنەوەی خەونەکانی نەخۆشەکە... چونکە لەوانەیە لە نێو ئەو خەونانە دا پەی بەرێت بەو ئارەزوە شاردراوەیەی لە ژێر پەردە و دەمامکێ جەفەنگ ئاساوەیە... هەر کە نەخۆشەکەش هەستی کرد بە بێئەرزشی ئەو هۆکارەی نەخۆشینەکەی لێ پەیدا بووە، ئیدی بەسەر ڕێگەی چاك بونەوەدا دەکەوێتە ڕێکردن.

## پەراوێزەكانی بەشی شەشەم:

١. بنواڕە: Freud Interpretation Dreams,P.183

٢. بنوارە: Dalbiez, Psychoaly tical Methad. Vol.1, p38

٣. بنواڕە: جوزيف جاسترو، الاحلام و الجنس، ل ٢٩.

٤. بنواڕە: Dalbiez, Op, Cit, Vol, p 55

## بەشی حەوتەم:

# خەون و سروشتی مرۆیی

**ململانێی دەروونی:**

هەمیشە مرۆڤ لە نێو قوڵاییەكانی دەرونی دا بەدەست ململانێیەكی توندەوە
گیرۆدەیە... ئارەزووی زۆر شت دەكات. وەلێ ژیانی كۆمەڵایەتی ناچاری دەكات حەز و
ئارەزووەكانی خۆی بشارێتەوە و خەفەیان بكات... ئەمەش یانی مرۆڤ كەوتۆتە نێوان
دوو بەرداشەوە... رێسا كۆمەڵایەتیەكان جۆرە ڕەفتارێكی بەسەردا دەسەپێنن، لەو
لاشەوە غەریزە و ئارەزووەكانی پاڵی پێوە دەنێت بۆ ڕەفتارێكی تەواو پێچەوانەی ئەو
ڕەفتارەی كە ئادابە كۆمەڵایەتیەكان (خوازیارین - وەرگێڕ)، بەم پێودانگەش مرۆڤ
سەراسیمە دەمێنێتەوە و دو چاری ململانێیەكی بەئازاری دەروونی دەبێت.

ئەمە لە كاتێكدا سروشت دەرچەیەكی بۆ مرۆڤ ساز كردوە تاكو لە ڕادەی توند و
تیژی ئەو ململانێیە دابەزێنێت.... ئەم سوك كردنەش چەندین جۆر و وێنەی هەیە...
گرنگترینیان خەونە... كەواتە خەون لەو (سەرقاپ)ە دەچێت كە دەیخەنە سەر مەنجەڵە
هەڵمیەكان تاكو بیان پارێزێت لە تەقینەوە.

سروشتی مرۆڤ:

لێرەدا نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت كە مرۆڤ لە بنەڕەتی سروشتی دا ئاژەڵە، مرۆڤ
برای مەیمون و ئامۆزای گوێدرێژە... بۆیە كاتێكیش بەرگە مرۆییەكەی بە بەردا
دەكرێ، ئارەزووە ئاژەڵیەكان لە ناخیدا دەمێنێتەوە... ئەو وای دەردەخات كە نەرم و
نیان و دڵ پاك و خێرخۆشەویستە ... كەچی سروشتە ئاژەڵیەكەی بۆ ماوەیەكی درێژ
ناتوانێت مل كەچی ئەو دووڕوییە بێت... بەڵكو بە ئاوەزی وشیاری خۆی لە گەڵ دا
دەگونجێنێت... بۆیە كاتێ ئەو ئاوەزە دەنوێت یاخود بێهۆش دەبێت، ئاژەڵێ لە ناخی
مرۆڤەوە دەردەكەوێ.

مرۆڤ کە دەچێتە سەر نوێنەکەی، وەك منداڵێکی سادەی بێگوناه دەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستی دا لەنێو ناخی دا کۆمەڵێ ئارەزووی خەفەکراو و حەزی پیس هەیە کە حەز ناکات ئاشکرایان بکات، ئیدی دەنوێت، لەو کاتی نوستنە دا بەشێوەیەك لە شێوەکان دەست دەکات بە بەدیهێنانی ئەو حەز و ئارەزوانەی..

**خەڵاتی خودا:**

فرۆید دەڵێ خەون دیاری خودایە... خەون پرۆسەی دزەپێکردنی ئارەزوە یاساغاکانە... لەو پێناوەشدا پەنا دەباتە بەر ئەوەی بەتوند و تۆڵی کەل و پەلە یاساغەکانی بپێچێتەوە، تاکو لەبەرچاوی باج گر و چاودێرەکان بیان شارێتەوە...[1]

ئەم ڕایە گوتەی یەکێك لە پیاوە زاهید (دنیانەویست)ەکانی موسڵمانانم وە بیر دێنێتەوە.. ئەو کابرایە رۆژێکیان دیتیان زۆری سوپاسی خودا دەکرد... کاتێ لەو بارەوە پرسیاری لێ کرا بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: ئەو توانیویەتی لەخەون دا هەر چی گوناهی گەورە و تاوانە بیکات بەبێ ئەوەی خودا لێی بپرسێتەوە... لە خەون دا زینا دەکات و مەی دەخواتەوە و ماڵ و سامان تالان دەکات و لە دوژمنەکانی تۆڵە دەکاتەوە، ئنجا وە ئاگا دێتەوە، دەوینێ لاپەڕەکەی سپی و پاکژە و هیچ خراپە و چڵك و چەپەڵی تێدا تۆمار نەکراوە.. بۆیە سوپاسی خودا دەکات لەسەر ئەو فەرەی کە بە بێهیچ نرخێ پێی بەخشیوە.

دەگونجێت بێژین: خەوتن لە یەك کاتدا پشودانێکی جەستەیی و دەرونیشە، گەر نوستن نەبوایە مرۆڤ لە ناو دەچوو، ئەوەتا مرۆڤ بە هۆی خەونەوە پشو بە جەستەی ماندوی دەدات، هەربە هۆی خەویشەوە ئارەزووە خەفەکراوەکانی تێر دەکات یاخود دەرچەیەکی هەناسەدانیان لێ دەخاتە سەرپشت.

خۆشحاڵترین خەڵك لەم دنیا دا شێتەکانن... چونکە شێت لە خەونێکی بەردەوامدا دەژی... بە ئارەزووی خۆی وێنای دنیا دەکات.. گەر بینیشی خەڵکی لێی حاڵی نابن، ئەوا بە لۆمەکردن بەسەریاندا دەشکێتەوە و خۆی بە یەکەمین ژیری دنیا دەزانێ.

ژێری پێگەشتوش گرفتەکەی ئەوەیە کە هەست بە بونی خەڵکی دەکات لە دەوری خۆی دا، ئنجا دەشچێتە ژێر کاریگەری ئەو چاودێریە شاردراوەیەی کە لە لایەن ئەوانەوە سەپاوە بەسەری دا... بۆیە لەترسی ئەوەی نەکا خەڵکی سزای بدەن یان پێی پێبکەنن ڕێگەی ئارەزوو و بیرۆکە تایبەتەکانی خۆی ناگرێتە بەر... چاودێری کۆمەڵایەتی ڕێگەی لێدەگرێ هەر کارێ بکات کە کۆمەڵگە لێی قایل نەبێ.

لەبەر ئەوەیە مرۆڤ پەنا دەباتە بەر خەون تاکو ئەو دونیایە بخولقێنێ کە خۆی کەم یان زۆر ئارەزوێ دەکات... لێرەوە ئەو گوتەیە هاتوە کە دەڵێت: هەموو مرۆڤێك لە کاتی خەوتن دا شێتە!

**چیرۆکێ لەم ڕووەوە:**

لە یەکێك لە کتێبەکانم دا باسی ئەوەم کردوە، من کاتێ دەستەوسان دەبم لەوەی لە بێداری دا تۆڵە لە دژەکانم بسەنم، پەنا دەبەمە بەر خەون بۆ ئەوەی تۆڵەیەکی سەختیان لێ بکەمەوە... ئەمەم بەو پێودانگە گوتوە کە منیش وەکو هەر کەسێکیتر مرۆڤم... بۆیە زۆر سەرسام بووم کە دیتم یەکێك لە ڕەخنەگران گاڵتەم پێدەکات و دوای ئەوەش نازناوێکی ناشیرینی لێناوم.

گرفتی بیریارەکانی لای ئێمە ئەوەیە کە تا ئێستاش سوورن لە سەر ڕوپامایيە کۆنەکانیان... ڕەنگە داوا لە مرۆڤ بکەن تاکو لە کاتی نوستن و بێداریش دا وەك یەك پیاو چاك بێت... سەیریش لەوە دایە هەر خەونێکی خراپ دەبینن لە خەڵکی دەشارنەوە، وای نیشان دەدەن گوایە لەو قوڕە شێلراون کە فریشتەکانی لێ دروستکراوە[٢].. گەر خودا بیەوێت ڕیسوایان بکات و بەرگی ڕوپاماییان لێبکاتەوە، ئەوا وەکو مەیمون یان وەکو (کەر) دەردەکەون کە هەندێکیان بەسەر هەندێکیتریاندا بە بێشەرم رادەبوێرن.

**گرنگی بیردۆزەکەی فرۆید:**

لەم ڕووەوە بیردۆزەکەی فرۆید گرنگییەکی گەورەی پێدەبڕێ، ئەو دەمامکەی ڕوی مرۆڤی لادا و ڕوتی کردەوە (خودایە! وەك چۆن دروستت کردم)! هەندێ وا دەبینن گرنگی فرۆید بۆ دەروونناسی، هاوشانە لە گەڵ گرنگی (داروین) دا بۆ زیندەوەرزانی[٣] ئەوە بوو (داروین) مرۆڤی لە قوللە بڵندەکانیەوە داگرتە خوارێ و کردیەوە بە ئاژەڵێك وەك هەر ئاژەڵێکیتری ئاسایی... دواتر فرۆید هات و پلەیەکی دیکە مرۆڤی دابەزاندە خوار....

باسکردنی تیۆرەکەی فرۆید پەلکێشمان دەکات بۆ وەی بڵێین: ئاژەڵ لە هەندێ ڕووەوە لە مرۆڤ باشترە... ئاژەڵ ڕوپامایی و درۆکردن نازانێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانی پەل دەکوتێ، وەڵێ مرۆڤ فێڵ و فرێ تێدا دەکات، کە لێشی پرسیار دەکەیت، چی دەوێ؟ کەپۆی بەرز دەکاتەوە و بەفیزەوە دەڵێت: گوایە بەرزەوەندی نەتەوە و نزیك بونەوەی لە خواوە دەوێت!! بەڵام لە ڕاستی دا ئەو دەیەوێت بت پلیشێنێتەوە هەر ئاژەڵێك کە ئاژەڵێکیتر دەپلیشێنێتەوە... ئنجا وای بە حاڵی کەسێ بە تەنها و لاوازی دەکەوێتە بەر دەستی ئەو مرۆڤە!!

**خەونەکانی بێداری:**

فرۆید پێی وایە مرۆڤ هەندێ جار لە ساتی بێداریش دا دەتوانێت ئارەزووەکانی تێر بکات... ئەوەش لەو ڕێیەوە کە بە (خەونەکانی بێداری) ناوزەد کراوە.

هەندێ جار وا دەبێ فشاری ئارەزوو لە سەر کەسێك زۆر زیاد دەکات بە ڕادەیەك ناتوانێت ئارامی لەسەر بگرێت، دەیەوێت هەر هەمان کات و سات ئەو ئارەزوە تێر بکات، یان لەوانەیە حەز نەکات چاوەڕوان بکات تا کاتی نوستن، یاخود زۆر پشت بە خەونەکانی ساتی نوستن نابەستێ، بۆیە پەنا دەباتە بەر (خەونەکانی بێداری) تاکو ئاوات و سەرقاڵیەکانی دەرونی لەو دەرچەیەوە هەناسە پێ بدات.

ئنجا لەو کاتە دا دەبینین، خەیاڵی ئەو شتە دەکات کە خۆی حەزی پێ دەکات و لە بەر خۆیەوە بە دەنگی بەرز هەر قسە دەکات، دەستی ئەجولێنێت و ڕایان ئەوەشێنێت و هەڕەشە و گوڕەشە دەکات، وەك ئەوەی شتەکان بەڕونی لەبەر دەستی خۆی دا ببینێت... لەوانەیە زۆر جار خەونەکانی بێداری بەسەری دا زاڵ بن و تورە دیار بێت یان لە ڕواڵەتی دا تێکچونێ دیار بێت، هەر چەندە خەڵکیش لە دەوری دا بن.

**نمونەگەلێ واقیعی:**

ڕۆژێکیان بەشەقامێکی چۆل دا دەڕۆیشتم.. کابرایەك لە دوورەوە کەوتە بەر نیگام کە هاوار و هەڕەشەی دەکرد، وامزانی هەڕەشە لە من دەکات، خەریك بوو قاچەکانم بۆ ڕاکردن بدەم بە دەم باوە، پیاوەکە لێم نزیك کەوتەوە بینیم هیچ ئاگای لە من نیە، بەلامدا تێپەڕی بێئەوەی ئاگای لێم بێ، هەر جنێوی دەدا و بۆڵە بۆڵی دەکرد... ئەو ڕۆچوو بوو بە نێو خەونەکانی دا، بۆیە شتێکی دەبینی کەمن نەم دەبینی و لە دنیای تایبەتی خۆی دا دەژیا.

لە خوێنەری ناشارمەوە کە خۆشم چەند جارێك وەکو ئەو پیاوەم بەسەر هاتوە.. لە ژورە تایبەتەکەی خۆمەوە هەر مشت و مڕ و هەڕەشە و گوڕەشەم کردوە بێئەوەی کەسێك گوێی لێم بێت... ماوەیەك لە ژیانمدا تێپەڕی کە زۆر بە توندی دوچاری خەونەکانی بێداری ببوم، لەو ماوەیە دا کاتێ بە ڕێگە چۆلەکانیش دا دەڕۆشتم لە بەر خۆمەوە لە گەڵ "با"دا شەڕم دەکرد و بە توندی زللەم پێدا دەکێشا، تفم لە با دەکرد، بەو هۆیەوە خەریك بوو دەکەوتمە نێو بەڵایەکەوە.

گومانم وایە هەموو خەڵکی، کەم تا زۆر بە دەست ئەم بەڵایەوە دەناڵێنن، وەلێ هەندێ کەس هەیە نکولی لێ دەکەن، کەچی بە جۆرێ کە خۆی هەستی پێناکات پێویەوە ئالودە بووە... بۆیە جاری وا هەیە لە گەڵی دەدوێیت پێت وایە گوێی بۆ تۆ گرتووە، بە ڕواڵەتیش سەیری تۆ دەکات، کەچی خەیاڵی لە شوێنێکیتر مەلە دەکات، ئەو خەون دەبینێ، ئارەزوە خەفەکراوەکانی لە نێو جیهانێکی بێسنوری خەون دا پاڵپاڵێنی پێ دەکەن. هەندێ جار وا دەبێ مامۆستایەك وانەیەك بە قوتابیەکانی دەڵێت: بەلام

هەندێکیان لێ حاڵی نابن، چونکە لە نێو خەونە بەتامەکانیان دا ڕۆچون، لە خەونیان دا ژوان لە گەڵ خۆشەویستە جوانەکەیاندا دەگرن و ماچیان دەکەن، یان چاویان بە دوژمنەکەیان دەکەوێت و زللەی لێ دەدەن و جنێوی پێدەدەن... کاتێکیش مامۆستا لێیان دەپرسێ چی تێگەشتون، وەڵامی دەدەنەوە گوایە زۆری لێ تێگەشتون، کەچی درۆش دەکەن، بەڵکو لەوانەیە لەکاتی وانەکەدا خەونیان دیبێ بە لێدانی مامۆستاکەوە لە بری ئەوەی گوێی بۆ بگرن...

**خەونی سادی و خەونی ماسۆشی:**

(سادیەت) خەسڵەتێکە مرۆڤ ڕوت دەکاتەوە و وای لێدەکات چێژ وەرگرێ لە ئازاردانی کەسانی دیکە و دەست درێژی کردنە سەریان.

بەڵام (ماسۆشیەت) بە پێچەوانەیە،مرۆڤ چێژ لەوە وەردەگرێت ئازار بدرێت و دەست درێژی بکرێتە سەر.

هەر دوو خەسڵەتەکە بە پلەی جیاواز لە نێو خەونەکانی بێداری دا دەردەکەون، من خۆم لە خانەی مامۆستایانی باڵادا، لەو ڕووەوە لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر قوتابیان ئەنجام دا، بەرەنجام بۆم دەرکەوت، خەونەکانیان دوو جۆرە: سادی و ماسۆشی.

یەکێکیان لە خەونەکانی بێداری دا ڕۆڵی دەست درێژکەر وەردەگرێت، وای دێتە بەر ئەندێشە کە دوژمنەکەی لەبەر دەمیدا ڕاوەستاوە، و ئەم تۆڵەی لێدەکاتەوە، دەست دەخاتە بینە قاقای، یاخود جنێوێکی توند و بریندارکەری پێدەدات، یان بە قورسی دەکێشێت بە تەوقی سەری دا.

یەکێکیتر، لە خەونەکانی بێداری دا ڕۆڵی دەست درێژی لەسەر کراو وەردەگرێ، خۆی بە سەرشۆڕ و لێدراو و سوکایەتیپێکراو دێتە بەر نیگا... خەڵکیش کۆبونەتەوە بۆ سوکایەتی پێکردن و نابودکردنی... بۆیە لەو ئەندێشەیەی دا چێژێکی دەرونی قوڵ وەردەگرن، و دەگری و خۆی دەلاوێنێتەوە.

هەندێکیتریان هەردوو ڕۆڵەکە پێکەوە وەردەگرێ، جارێ سادی دەبن و جارێکیتر ماسۆشی... هەر چۆن بێت ئەو دەیەوێت ئارەزوە خەفەکراوەکانی خۆی تێر بکات... هەر

کات نائومێدی باڵی بەسەردا کێشا دەبێتە ماسۆشی، هەر کاتیش تورە بوون تەنگی پێهەڵچنی دەبێتە سادی... (ولله في خلقه شون!!)

## خەونەکانی گەلان:

لای خوێنەر شاراوە نیە، کە گەلانیش خەون دەبینن وەکو چۆن تاکەکان خەون دەبینن.. بۆ نمونە کتێوی (الف لیلة و لیلة) هیچ نیە جگە لە کۆمەڵێ خەونی میللی... بە تایبەت خەونی ئەو هەژارانەی کە برسین بۆ ژنی جوان و کۆشکی قەشەنگ و خۆراکی بەتام[٤].

گومانم وایە بیر و باوەڕی (ڕزگارکەری خوایی) هیچ نیە جگە لە خەونێك کە گەلانی کۆن لە هەندێ قۆناغی مێژوویاندا بە ئەندێشەیاندا هاتوە (دەربڕینی وەرگێڕ) گەلان هەر کات ئازاریان چەشت بە دەست ستەمی دەستەڵات دارەکانیانەوە، دواتر هەستیان بە دەستەوسانی کرد لە ڕامالینی ئەو ستەمەی کە لەسەریانە، ئیدی (هیچیان لە بەردەم نامێنێ - وەرگێڕ) ئەوە نەبێت دەست بگرن بە بیر و باوەڕی (ڕزگارکەری خوایی)ەوە، لەو کاتەش دا خەیاڵ بەو ڕۆژەوە دەکەن کە تیای دا خودا یەکێك دەنێرێت ڕزگاریان بکات و تۆڵەیان بۆ بکاتەوە لە دوژمنەکانیان، ئەو دەمەش زەوی پڕ بکەن لە دادگەری وەك چۆن پڕ کراوە لە ستەم و نادادگەری.

بەراستی ئەو کەسەش ڕاستی کردوە کە دەڵێت: (ئەفسانەکان ڕەنگ دانەوەی خەونەکانی گەلانن)[٥].

## پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم:

١ـ بنوارە: جوزيف جاسترو، الاحلام و الجنس، ل ٨٨ ـ ٩٣.

٢ـ ئەم دەربڕینە تەنها جوانکاریەکی وێژەییە دەنا هەموان و مامۆستا وەردیش لە سەروی هەموانەوە دەزانین کە فریشتەکان بە گوێرەی دەقە پیرۆزەکان وا باس دەکرێ کە لە نور دروستکراون، نەك لەقوڕ. (وەرگێڕ)

٣ـ بنوارە: هـ.س، ل ٩٢.

٤ـ بنوارە: سلامة موسي، اسرار النفس، ل ٥٨.

٥ـ بنوارە: جوزيف جاسترو، الاحلام و الجنس، ل ١١٥.

# بەشی هەشتەم:

## ئاوەزی ناوەکی

### بەر لە فرۆید:

خەڵکی بەر لە فرۆید، بڕوایان وابوو مرۆڤ تاکە ئاوەزێکی هەیە، ئەویش ئەو ئاوەزەیە کە زاڵە بەسەر کردەوەی مرۆڤ دا و ڕەفتاری وی ئاراستە دەکات. جا گەر هەر کەسێکیان بدیایە لە ڕاستە شەقامی ڕاستی لای بدایە، هانایان دەبردە لای ئەقڵی و داوایان لێدەکرد تاکو بگەڕێتەوە سەر ڕاستە شەقام و پەند وەرگرێ، کاتێ دەیان بینی گوێیان بۆ ناگرێ و ئامۆژگاریەکانیان فەرامۆش دەکات، لێی تووڕە دەبون و بەشایستەی سزای توندیان دادەنا.

گومانیان وابوو مرۆڤ هەر بە سروشت ژیرە، دروشمیان ئەوە بوو: (مرۆڤ کە لە چاکەتێ گەیی کاری پێ دەکات)... سیستەمی پەروەردەی کۆن لەسەر پڕکردنی مێشکی منداڵ لە ئامۆژگاری چاك و قسەی جوان دامەزرابوو، منداڵی داماویش دەبوا گوێی بۆ بگرتنایە و واشی نیشان بدایە کە گوێڕایەڵیانە، گەر نا کوتەك بەسەریەوە ئامادەیە، بۆیە ناچار بوو پێیان بڵێت: (بەڵێ، وا دەکەم کە ئێوە دەیڵێن).

ئەو لە نێو قوڵاییەکانی دەرونی دا ئارەزووەکانی خۆی خەفە دەکات. بۆیە هەر کە ئامۆژگاری کەرانی لێوە دیار نەمێنێ، هەر خێرا دەست دەکاتە هەڵقونینەوە و هات و هاوار کردن و دەیەوێت بە هەر هۆکارێك دەلوێت ئەو شتە بە دەست بخات کە لێی یاساغ کراوە، وەك لە پەندە کۆنەکەش دا هاتووە:﴿ مرۆڤ پێداگرە لە سەر ئەوەی لێی یاساغ کراوە.﴾

پیاوی پێگەیشتوش لەم ڕووەوە زۆر لە منداڵ دەچێت، کاتێ گەورە دەبێت، دەبینێ چوار دەوری گیراوە بە ئامۆژگاریکەرانێ بە هەمان شێوەی ئەوانەی لە ڕۆژگارەکانی منداڵی دا دەوریان دابوو. لەوانەیە خۆیشی وەك ئەوان ببێتە ئامۆژگاری کەری یەکێکی‌تر کە لەخۆی کەم ئەقڵ تر بێ... هەر ئەو کەسەی چنگ کەوت دەست بەجێ

ڕێژنەیەك ئامۆژگاری بەسەردا دەبارێنێ... لەو ئامۆژگاریانەی کە هەر بە زار و گوفتار دەری دەبڕێت و بە کردەوە و کرداریش پێچەوانەیان دەجولێتەوە.

دروستە گەر بڵێین: خەڵکی هەندێکیان هەندێکیتریانیان خەڵەتاندوە، گەر پیاوێ لە هەسارەی مەریخەوە بێت و گوێ بگرێ بۆ ئەو گوتانەی کە ڕوبەڕووی یەکتری دەکەین.. وای دێ بە خەیاڵ دا کە لەنێو برایەتی و فەرێکی نەبڕاوە دا دەژین... بەڵام هێشتر چەند کاتژمێرێك بە سەر مانەوەی لە ناوماندا تێناپەڕێ کە دەبینێ ئێمە بە کردەوە پێچەوانەی گوفتارمان جوڵاوینەتەوە، و هەر هەموشمان دوو ڕووین.

**لادەری دەمامکەکە :**

ئنجا فرۆید هات و هەوڵی دا ئەو دەمامکە لادا کە لەسەر ڕوی ئەو دوڕووییە گشتی‌یەی نێو ئادەمیزاد دانراوە... فرۆید یەکەمین کەس بوو ئاوەزێکی‌تری لە ئادەمیزاد دا دۆزیەوە جگە لەو ئاوەزە وشیارەی کە هەمیشە پێیەوە شانازی کردوە... ئاوەزی دووەمیشی بە "ئاوەزی ناوەکی" یاخود بە (نەست) ناوزەد کرد.(١)

شیاوی گوتنە، بیرۆکەی (نەست) بەر لە فرۆیدیش ناسراوبوو، وەلێ لە زۆرینەی بارەکانی دا بیرۆکەیەکی تەم و مژدار بوو، ئەدگارەکانیش ڕوون نەبوو.(٢) ئنجا فەزڵی هەرە گەورە لە ڕونکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە و دروستکردنی ئەپارتمانی قەشەنگی تیۆری لەسەری، بۆ فرۆید دەگەڕێتەوە.

سەرەڕای بەهەڵەدا چونی فرۆید لە هەندێ وردەکاری بیرۆکەکەدا، کەچی ئەو پەیکەرە گشتی‌یەی لە دەوری دروستی کردوە تا هەنوکەش سەقامگیرە، ئێستاکە ئەوەی فرۆید دروستی کردوە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە سروشتی مرۆڤ.

پوختەی ئەوەی فرۆید لەم ڕوەوە گوتویەتی ئەمەیە کە (ئاوەزی وشیار ئاسەواری لاوازە لە ئاراستە کردنی ڕەفتاری مرۆڤ دا، بەڵکو لە زۆربەی بارەکان دا ئاوەزی ناوەکی مرۆڤ ئاراستە دەکات، بۆیە پێویستە توێژەران ئاوڕ بەلای ئەم ئاوەزە ناوەکیە دا بدەنەوە، کاتێ لە کەسێتی مرۆ دەکۆڵنەوە).

### فرەخودی:

لە کۆن دا بڕوا وا بوو کە مرۆڤ تەنها یەك خودی هەیە، ئەم خودەیشە هانی دەدات بێژێ (من). کەچی ئێستا دەرکەوتوە ئەم ڕایە هەڵە بووە.. چونکە زۆر جار دەبینین مرۆڤ لە گەڵ خۆی دا دەئاخفێ، هەندێ جار سەرزەنشتی خۆی دەکات و سزای خۆی دەدات.. جا ئەگە مرۆڤ هەر یەك خودی هەیە، ئەدی چۆن دەتوانێت قسان لە تەك خۆیدا بکات یان خۆی سزا بدات.. هەر دەبێ لە قوڵاییەکانی دەروون دا پتر لە خودێکی هەبێ.. تاکو پێکڤە ئاخافتن و پێکەوە گونجان لە نێوان یەکێك و یەکێکیتریان دا دروست بێت. لێرەدا فرۆید هات و گوتی: مرۆڤ سێ خودی هەس، خودەکانیش بریتین لە: خودێکی ئاژەڵی، خودێکی مرۆیی، خودێکی نمونەیی.

### خراپە و چاکە لە مرۆڤ دا:

ئەو چەمکە نوێیەی فرۆید هێنایە ئاراوە .. دەمانگەیەنێتە ئەوەی بڵێین: مرۆڤ چاکەخوازی تەواو نیە و خراپەکاری تەواویش نیە، بەڵکو لە یەك کاتدا چاکەخواز و خراپەکاریشە... وە خوداش مرۆڤێکی نەخوڵقاندوە کە لە ئارەزوە چاکە و خراپەکان دوور بێ.

مرۆڤ جگە لە خودی (مرۆیی) خۆی، دوو خودی کەشی هەیە... یەکەمیان هەوڵ دەدات مرۆڤەکە دابەزێنێت بۆ ئاستی ئاژەڵ، ئەویتریان دەیەوێت بەرزی کاتەوە بۆ ئاستی فریشتەکان... مرۆڤیش سەراسیمەیە لە نێو ئەو دوە دا، جارێ بەم لا دا دەڕوا و جارێك بەو لادا... ململانێی دەرونیش لە هەموو کاتێك داد دەستی لە قورقوڕاگەی گیر کردوە.

**مەغزای لۆژیکی:**

تیۆرەکەی فرۆید ئەو پرەنسیبە لۆژییکە دێرینەی هەڵوەشاندەوە کە مرۆڤی دەپۆلاند بۆ دوو گروپی پێچەوانە، کە سێ‌هەمیان نەبوو، یەکیان چاکە خوازێ کە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە... دوەمیشیان خراپەکارێ کە هیچ چاکەی تێدا نیە.

وەلێ بیریارانی لای ئێمە تا ئێستاکەش کە باسی پیاوانی مێژوو دەکەن، هەندێکیان بە چاکە کاری هەمیشەیی دادەنێن و هەندێکی‌تریان بەخراپەکاری هەمیشەیی... ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و لەگەڵ ئەو سروشتە دا ناگونجێ کە لە هەموو کات و ساتێك دا مرۆڤی لە سەر دروست کراوە.. هەر دەبێ لە پیاوێکی چاکەکار دا هەندێ خوی خراپە ببینین و هەستی پێ بکەین، هەروەها لە هەر خراپەکارێکیش دا هەندێ ئارەزوی چاکەکاری لێوە دەردەکەوێ...

ئارەزووی چاکەکاری لە هەموو مرۆڤێك دا هەیە، مادەم مرۆڤ لە کۆمەلگەدا دەژی، ئەوا هەر دەبێ لەو کۆمەلگەیەوە کۆمەڵێ بەربەستی ناوەکی وەربگرێت، کە بەهەر جۆرێ لە جۆرەکان رێ لێ دەگرن لەوەی کاری خراپ ئەنجام بدات.. هێز و پێزی ئەم بەربەستەش بە گوێرەی کەسەکان دەگۆڕێت.. هیچ مرۆڤێ نیە (هەر چەندە زۆر بە ستەم کار و ناچیزە بەناوبانگ بێت) لەم بەربەستە ناوەکیە خاڵی و بێ‌بەش بێت.

دەکرێ هەمان قسەش لە بارەی ئارەزوی خراپەکاری لە مرۆڤدا بکەین، چونکە مادەم مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا ئاژەڵە، ئەوا هەر دەبێ لە هەندێ کاتدا ئاسەواری یاخی بون و پاڵنەری ولاخێتی‌یەکەی لەسەر دەربکەوێت، ئیدی بە خۆی بزانێت یان نەزانێت.

**هەست و نەست:**

گوتمان مرۆڤ سێ خودی هەیە، ئاژەڵێك و مرۆییەك و نمونەییەك، فرۆید پێی وایە (خودی ئاژەڵی) نەستیە و هەر دوو پاڵنەری چێژ و ئازاریش بەسەری دا زاڵن... ئەم خودە (حەرام و حەلاڵ) ناناسێت، بەڵکو دەیەوێ بە بێ هیچ پێودانگێ چێژ وەرگرێ، لە هەموو کاتێکیش دا مرۆڤ پاڵدەنێ بەرەو مەبەستە هیچ و پوچەکانی.

خودی مرۆیش، خودێکی ئاگا و هەستی‌یە، وەلێ نمونەیی نیە، ئەم خودە هەست بە پێودانگەکانی کۆمەلگە دەکات و هەولْ دەدات ڕەچاویان بکات، فڕ و فێلْ و دووڕوویی بەسەر ئەم خودە دا زالْن... ئەم خودە حەز لە دزی کردن یان پیاوکوشتن ناکات چونکە دەترسێ لە بەسوك سەیرکردنی لە کۆمەلگەدا و هەروەها لە سزای پۆلیسیش دەترسێ... ئەم خودە هەر کە هەلێکی لەباری دەست کەوت کە تیای دا دلْنیا بێت توشی سزا و بەسوك سەیرگردن نابێ، ئەوا زۆر بە پەلە بەدوی خودی ئاژەلْیی دا پەلکێش دەکرێت.

خودی مرۆیی پتر لە لێپرسینەوە و سزا تێ‌دەگات وەك لە نمونە بالآکان، بۆیە ئەگەر ئەو خودە نمونەییە چاودێری نەکردایە، ئەوا دەبوە مل کەچی سروشتە ئاژەلْیە پەنگ خواردوەکەی قولآیی ناخی.

**خودی نمونەیی:**

خودی نمونەیی، ئەو خودەیە کە خەلْکی بە (ویژدان) ناوزەدی دەکەن، لەم خودەشەوە ئەو بەربەستە ناوەکیە سەر هەلْئەدات کە لەبەردا ئاماژەمان پێدا.

لەکۆن دا ویژدانیان بە (دەنگی خودایی لە مرۆڤدا) ناوزەد دەکرد، ئەمەش ناوزەدکردنێکی هەلْەیە... چونکە ویژدان ڕەگ و ڕیشەی خۆی لەو بیر و باوەڕ و نەریت و بەها کۆمەلآیەتیانەوە وەردەگرێ کە مرۆڤ لە نێویاندا پێ‌دەگات و گەشە دەکات.

کەوابێ ویژدان شتێکی ڕێژەییە، بە ڕەنگی کۆمەلگەش سیواق دەدرێ، تەنانەت زۆر جار مرۆڤ بەرەو توند و تیژی و ستەم پالْ دەنێ، ئەگەر بەها کۆمەلآیەتیەکان پشتگیری بن، بەزۆری ئەم پشتگیری کردنەش لە جەنگ و دەمارگیری ئاینی و نەتەوەیی و هۆزایەتی دا دروست دەبێ.

بەڕاستی ویژدان دەنگی کۆمەلگەیە نەك دەنگی خودا، جیاوازیش زۆر و فرەیە لە نێوان ئەو دوو دەنگە دا، خودا پەروەردگاری هەموو خەلْکە، بەبێ جیاوازی بەسۆزە بۆ هەموو خەلْکی، بەلآم کۆمەلگە، فەزلْی ڕۆلْەکانی خۆی دەدات بەسەر خەلْکانی‌تر دا... گوێش ناداتە تالآن و بڕۆ و خوێن ڕشتن، ئەگەر ئەو تالآنکاری و خوێنڕشتنە لە بەرانبەر دوژمناندا پەیڕەو کرابێ.[٤]

**ویژدان و نەست:**

لەوەی رابورد زانیمان خودی مرۆیی، خودێكی هەستی‌یە، ئەمە لە كاتێكدا خودی ئاژەڵی خودێكی نەستی‌یە... ئالێرەدا فرۆید دێت و دەڵێت: خودی نمونەیی لە نێوەندی ئەم دوو خودە دایە، لە لایەكەوە هەستی‌یە و لە لایەكی‌تریشەوە نەستی‌یە..(٥)

دەگرێ خودی نمونەیی بەپاسەوانێك بچوێنین كە لەسەر رۆخی نەست ڕادەوەستێت و ڕێگە نادات پاڵنەرە خراپەكان لێیەوە (واتە لە نەستەوە) بێنە ناو هەست... بەڵام ڕێگە دەدات پاڵنەرەكانی تر هاتوچۆ بكەن...

گرفتی خودی نمونەیش لەوە دایە كە پاسەوانێكی توند و تۆڵ و بەهێز نیە، بەڵكو پاسەوانێكی لاوازە و زۆر بە سانایی دەخەڵەتێنرێ... تەنانەت دەگونجێ بەرتیل بخوات، زۆر جار فشاری نەست لەسەری توند و بەهێز دەبێ و ئەم تا ئەوپەڕی سنور چاوپۆشی دەكات.

بەزۆری ئەم حاڵەتە لە نێو ئەو كۆمەڵگایانە دا ڕوو دەدات كە ئامۆژگاری فرەباڵای تێدا زۆرە.

یەكێك لە ناتەواوی و كەم و كوڕیەكانی ئامۆژگاریە فرەباڵاكان ئەوەیە كە هەوڵ دەدەن مرۆڤ بگەیەننەسەروو ئاستی مرۆڤ... دەیەوێت مرۆڤ خۆی لەبیر بكات و چێژ و ئازارەكانی خۆی فەرامۆش بكات... لەم كاتە دا ئیدی نەست دەكەوێتە ژێر قورسایی خەفەكردنێكی زۆرەوە... بۆیە ئەمیش بەڕۆڵی خۆی گوشار دەخاتە سەر خودی نمونەیی.

لێرەش دا، ئەو ئارەزوە دەردەكەوێت كە فرۆید بە ئارەزوی (پاساودان) ناوزەدی كردوە.... ئەم ئارەزوەش ڕێگە دەدات بە مرۆڤ تا لە دوی هەوەسەكانی بڕوات و دواتر پاساوێك یاخود دەمامكێكی بریسكەداری بۆ دەدۆزێتەوە تاكو هەڵپەكردنە دزێوەكەی پێ‌بشارێتەوە.

ئامۆژگاریە باڵاكان، هەموو ئەو دەرچانە لە مرۆڤ كلۆم دەدەن كە لێیانەوە هەناسەیەكی بە خودە ئاژەڵیەكەی دەدا... لە بەر ئەوە مرۆ ناچار دەبێت یاخی بێت لەو

ئامۆژگاریانە و دواتر پاساوێكیش بدۆزێتەوە كە بەرەڤانی لە خۆی پێبكات، نەخاسمە كە دەش بینێ ئامۆژگاری كەران خۆیان شەو و ڕۆژ پێچەوانەی ئامۆژگاریەكانی خۆیان دەجولێنەوە و ڕەفتار دەكەن.

## پێكهاتەكانی نەست:

لەوەی رابورد ڕون دەبێتەوە كە نەست فاكتەرێكی كارایە لە ئاراستەكردنی ڕەفتاری مرۆڤ دا، بینیشمان كە لە چەند بەشێ جودا جودا، پێك هاتوە، بەش و پێكهاتەكانی نەست بەم تەرزە كورت دەكەینەوە:

١ـ بەشی یەكەمیان پێكهاتوە لە ئارەزوە ئاژەڵیە ڕەسەنەكانی مرۆڤ، ئەم ئارەزوە ئاژەڵیانەش لە گەڵ لەدایك بونی مرۆڤ دا لە دایك دەبن، فرۆید بە (لیبیدو) ناوزەدی ئەم ئارەزوەی كردوە.

٢ـ بەشی دووەمی نەست بریتییە لەو ئارەزوانەی مرۆڤ نەیتوانیوە تێریان بكات و لە قولاییەكانی دەرونی دا خەفەی كردون... ئەو ئارەزوانە لەوێدا بە شاردراوەیی دەمێننەوە و لە چاوەڕوانیدا دەبن، ئەم بەشەیە زۆر جاربە (گرێ دەرونیەكان) تەعبیری لێ دەكرێ.[٦]

٣ـ بەشی سێیەمیان لایەنە نەستیەكەی ویژدانە، ئەم بەشە گرنگیەكی تایبەتی هەیە بۆ ئەم بابەتەی ئێمە مەبەستمانە، بابەتی خەون.

## ویژدان و خەون:

لەوەی رابورد باسمان لە تیۆرەكەی فرۆید لە خەوندا كرد.. پوختەكەشی ئەوە بوو كە خەون هۆكارێكە بۆ تێركردنی ئەو ئارەزوانەی كە مرۆڤ لەساتەوەختی بێداری دا نەیتوانیوە تێریان بكات... لێرەدا فرۆید دەڵێت: لە خەون دا تێركردنی ئارەزوەكان بەدەگمەن نەبێت بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ و ڕون و ئاشكرا نابێت.. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ وەی بەشێك لە ویژدان لە كاتی نوستن دا بێدارە، ئەم بەشە بێدارەی ویژدان ڕێ دەگرێت لەوەی مرۆڤ بەبێ سنور ئارەزوە یاساغەكانی تێربكات.

ئەگەر هەموو (ویژدان) هەستی بوایە، ئەو جا لە کاتی نوستن دا لە کۆڵی مرۆڤ دەبوەوە. بەڵام وەکو گوتمان لە نێوان هەست و نەست دا ڕاوەستاوە، بەو پێیە لە کاتی نوستن و بێداریش دا هەر چاودێری مرۆڤ دەکات...

بەڕاستی حاڵ و باڵی مرۆڤ سەیرە، ئەوەتانێ چاودێری کۆمەڵایەتی (کە خۆی لە ویژداندا دەبینێتەوە) لە هەموو کاتێك دا بەدوایەوەیە... مرۆڤ بۆیە پەنا دەباتە بەر خەوتن تاکو هەندێ پشوی دەرونی دەست بکەوێ، کەچی ویژدان لێی ناگەڕێت بە تەواوی بحەوێتەوە، لە بۆتە دایە بۆی و هەر کە بینی بەرەو ئارەزوەکانی دوور ڕۆشتوە، تێی دەخوڕێ (هاتم بۆت) !.

فرۆید پێی وایە ئەو جەفەنگانە لە خەوندا هەیە، هۆکەی ئەو ترسەیە کە مرۆڤ لە ویژدانی هەیە... فرۆید لەو بارانە دا ویژدان ناو دەنێت (چاودێر)... (خەون) لە بەرانبەر ئەم چاودێرە سەرسەختە دا ناچارە ڕێگەی فڕ و فێڵ بگرێتە بەر، هەمیشە لەوەش دەترسێ (چاودێر)ەکە دەستی لێ بەرز بکاتەوە و پێی بڵێت (یاساغە).

خەونەکانی منداڵی:

ئاشکرایە خەونەکانی منداڵ ڕاشکاو و بێدار نین... هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی گەشەی ویژدان لە زارۆ دا...

فرۆید باسی کچە تەمەن نۆزدە مانگیەکەی خۆیمان بۆ دەکات... ئەو کچەی فرۆید بەیانیەکیان توشی ڕشانەوە بوو، بۆیە بە درێژایی ئەو ڕۆژە خواردنی لێ یاساغ کرا، کاتێکیش نوست ، ماڵەوەیان گوێیان لێ بوو کە (وڕاوەی دەکرد) و ناوی ئەو خواردنانەی دەبرد کە حەزی لێکردبوو.[٧]

وا دیار بوو لە کاتی (وڕاوە) کردنەکەی دا چێژی لەوە وەرگرتوە کە بەبێ سنور لەو خواردنانە بخوات.

دەکرێت بڵێین: لەگەڵ گەورەبوونی منداڵ و تەواو دروست بوونی ویژدان لە نێو قوڵایی دەرونی دا، خەونەکانیشی ڕو دەکەنە دەمامك پۆشین... کە گەورەش دەبێ، دەکەوێتە ژێر کۆڵی قورسی ئەو ویژدانەی کە بەزەیی نیە...

## خەونی گەورەکان:

مامۆستا ( سلامە موسی) ئامۆژگاری خوێنەر دەکات کە هەرگیز خەون نەگێڕێتەوە، هەر چەندە خەونێکی ئاسایش بێت، بۆ کەسێك نەبێ کە متمانەی بە خو و ڕەوشتی هەبێت[8] چونکە خەونەکە لەوانەیە ئارەزوەیەکی پیسی لە نێو خۆی دا شاردبێتەوە. هەر چەندە بەڕواڵەت خەونێکی پاك بێت... لەوانەیە تۆ لە خەوندا ژنی برادەرێکت ببینی کە کۆمەڵێ کەسی سەرسەری دەیانەوێت دەست درێژی بکەنە سەری، ئەو هاوار لە تۆ دەکات و پەنات بۆ دێنێ، تۆش لە خەونەکەتدا غیرەت لە کەللەت دا دەبزوێت و دەمانچەکەت ڕادەکێشیت و ژنە جوانەکە بەرەو ڕوت دێت و سوپاست دەکات و لە نیگاکانی دا واتای سەرسوڕمان و گەورە سەیرکردنی تۆ دەبینرێ.

لەڕواڵەت دا ئەم خەونە، مانای ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ پیاوێکی بەغیرەتی و حەزت لەوەیە بەرگری لە ئابڕوی هاوڕێکەت بکەیت، بەڵام تۆ لە ڕاستی دا حەز دەکەیت ئابڕوی هاوڕێکەت بەری، نەك بەرگری لێ بکەیت، لەوانەیە ژنی هاوڕێکەت دیبێ لە بێداریتدا و حەزت لێی کردبێ، ئاواتت خواستبێ لە گەڵی ڕابوێری، ئەم ئارەزوەش بەخەفەکراوی لە نێو ئاوەزی ناوەکیت دا مابێتەوە.

بۆیە لەکاتی خەوتن دا ئەو ئاواتەت بەشێوەیەکی دەمامك دار دەرکەوتوە، چاودێرەکە ڕێگە نادات ڕاستەوخۆ لە گەڵ ژنی هاوڕێکەتدا دەست تێکەڵ بکەیت و بەئاشکرا لە گەڵی دا ڕابوێریت.. بەو هۆیەوە پەنا دەبەیتە بەر شێوازێکیتر... لەو کاتە دا دەبیتە قارەمانێك کە فیشەك دەنێت بە دەست درێژکارانەوە و بەبێسڵەمینەوە ڕاوەدویان دەنێت.. ئەمە لە کاتێکدا لە بێداریت دا ترسنۆکیت و هەرگیز دەمانچەشت هەڵنەگرتوە و ڕاوەدوی کەسیشت نەناوە... کەچی ئارەزوە خەفەکراوەکەت لە خەونەکەتدا دەتکاتە سوارچاکێکی بەهیمەت.

ئەگەر تاکۆتایی لە گەڵ فرۆید دا هاوڕابین لە تیۆرەکەیدا، ئەوا ڕەوایە بۆمان کە بڵێین: ئەو دەمانچەیەی کە لە خەونەکەتدا خۆتت پێیەوە بادەدا جەفەنگ و ئاماژەیەکە بۆ ئەندامی زاوزێ (چوک)ت...

ئەمەش یانی دەمانچەی نێو خەونەکەت ئاماژە نیە بۆ غیرەتمەندی و پیاوەتی و سوارچاکیت... بە ئەندازەی ئەوەی ئاماژەیەکە بۆ ئارەزوە یاساغەکەت بەرانبەر ژنی هاوڕێ هەژارەکەت... و خواش زاناترە.

### جەفەنگی خەونەکان:

فرۆید دەڵێت: خەونەکان ،پەنا دەبەنە بەر جەفەنگ بۆ شاردنەوەی ئەو مەبەستانەی کە کۆمەڵگە یاساغی دەکات[٩].. ئەو جگە لەوەش پێی وایە زۆرینەی جەفەنگەکانی نێو خەون ئاماژەی (سێکسی)یان هەیە... وەك ئەوەی پێی وابێ تاکە ئارەزویەك کە مرۆڤ هەیەتی و کۆمەڵگە لێی یاساغ دەکات، ئارەزوی (سێکسیە).

لێرەدا واباشە، هەندێ گوتەی فرۆید بخەینە بەرچاو،لەبارەی ئەو جەفەنگە سێکسیانەی کە هەموو گەلان تیای دا هاوبەشن... ئەو پێی وایە هەر شتێکی لاکێشەیی (ولولەکی - وەرگێڕ) وەکو دار و، گۆچان و، رەگی درەخت و، چەقۆ و، خنجێر و، نێزە و، بۆینباخی مل و .... هتد، ئاماژەن بۆ (چوك)ی نێرینە... ئەمە لە کاتێکدا قوتوی بچوك و، سندوق و، کڵاو و ... هتد، ئاماژەن بۆ (زێ)ی مێینە..[١٠]

یەکێك لە قوتابیەکانی فرۆید، وا دەبینێ: ئەو کەسانەی کە زۆریان حەز بە هاتوچۆکردنە بە نێو دارستان و درەختە (بەرزوو هەڵچوە)کاندا ئارەزویەکی بەهێزی سێکسییان هەیە... بۆیە کاتێ لە خەونیاندا ئەو دار و درەختە دەبینن، ئەوا دەرەچەیەك لە ئارەزوە خەفەکراوەکانیان دەخەنە سەر پشت.

### خەونەکان و شیکردنەوەی دەرون:

لە دوێنێ دا ئەو کەسانەی داهاتویان بۆ خەڵکی دەخوێندەوە، دەیانگوت: (خەونەکانتمان بۆ باس بکە، داهاتوت دەست نیشان دەکەین)، ئەمڕۆش پزیشکانی دەرونی دەڵێن: (خەونەکانمان بۆ باس بکە، گرفتەکانت بۆ دەست نیشان دەکەین)[١١]

لە ڕابردوو دا خەڵکی بۆیە لە خەون دەکۆڵینەوە، بۆ وەی بزانن داهاتوی نادیاریان چ سود یان زیانێکی بۆ هەلگرتون... بەڵام ئێستە لە خەون دەکۆڵنەوە ، تاکو پەی بەرن بەو گرێ و ئارەزوە خەفەکراوانەی لە نێو قوڵایی ناخیاندا خۆیان حەشار داوە.

ئەوان لە نێو خەونەکانیاندا بە دووی داهاتو دا دەگەڕێن، ئەمانیش بە دوی ڕابردو دا... مرۆڤ دەتوانێت نەخۆشیە دەرونیەکانی بدۆزێتەوە ئەگەر لە خەونەکانی کۆڵیەوە و ئاماژەکانی ناویانی شیکردەوە...

فرۆید دەڵێت: خەونەکان ، زمانی سروشتی دەرونن، ئێمە لەو زمانە تێناگەین چونکە ڕاهاتوین لەسەر زمانی بیرکردنەوەی لۆژیکی لە ژیانی وشیار و ئاگایمان دا.[٢] . لە ڕاستی دا زمانی خەونەکان نمونەیەکی ڕەسەنی پرۆسەی بیرکردنەوەی سەرەتایین، شیکردنەوەشی پێویستی بە زیرەکی و پسپۆڕی هەیە.

**پشیلە و مشك:**

پەندێك هەیە دەڵێ: (ئەگەر گوربە نوست، مشك یاری دەکات) ـ (کوردیش دەڵێ پشیلە لە ماڵێ نیە، مشکان تلی لیانە ـ وەرگێڕ) ئەم پەندە بەسەر ئێمە دا دەچەسپێ... ئێمە لە دەرونمان دا مشکیشمان هەیە و گوربەش... مەبەستمان لە پشیلە ئەو ئاوەزە وشیارەیە کە لەساتی بێداری دا کۆنترۆڵی کردوین... هەر کە نوستیش مشك دەردەکەوێت و گەمان دەکات.

(دکتۆر کابریو) ئەم واتایەی لە دەستەواژەیەکی قەشەنگ دا دەربڕیوە، ئەو دەڵێت: (ئێمە هەر هەمومان وە دیهێنراوی دوو جەمسەرین، لە نێو ناخماندا هەر یەك لە دکتۆر جیکل و بەڕێز هاید ئامادەن)[١٣] مەبەستی لەوەیە کە هەر یەکێك لە ئێمە لە یەك کاتدا مرۆڤیشە و دڕندەشە... هەر کە لایەنە مرۆییەکەمان نوست یاخود بێ ئاگابوو ،لایەنە دڕندەییەکەمان بەدەر دەکەوێت و گەرەکیەتی هەموو ئەو ئارەزوە سەرەتاییانەی تێر بکات کە کۆمەڵگە لێی قەدەغە کردوە.

## پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم:

١. مامۆستا (سلامە موسی) ڕای بە لای ئەوە دایە، ئەم ئاوەزە بە (ئاوەزی شاردراوە) ناو بنرێ، بەڵام وا دیارە ئەم ناونانە ڕەواجی نەبوە لە نێو وڵاتە عەرەبیەکاندا... خەڵکی هەر (ئاوەزی ناوەکی)یان بەکار هێناوە.. ئەوەی جێگەی سەرنجیشە هەر ئەم (سلامە موسی)یە بوو یەکەمجار ئەم ناوەیشی بەکارهێناوە، بەڵام بەم دواییە وازی لێ هێناوە، ئێستا پێی وایە (ئاوەزی شاردراوە) گونجاوترە لە (ئاوەزی ناوەکی)... ئێمەش بۆمان هەیە بڵێین: هەڵەیە زۆر بەکار بهێنرێ باشترە لە ڕاستێ کە وازی لێ هینرابێ.

٢. بنوارە: محمد عثمان نجاتی،الذات و الغرائز، ل ١.

٣ـ ئەو کەسانەی تیۆرەکەی فرۆیدیان کردۆتە عەرەبی، ئەو سێ خودەیان بە (خودایی و من و بەرزە من) ناو ناوە، ئەمانەش وەرگێڕانی حەرفی واژەکانی فرۆیدن، وەك خوێنەریش دەزانێ مەبەست نادەن بە دەستەوە، من خۆم بەو شێوەی لەسەرەوە دانراوە وەرگێڕانیان بە باش دەزانم.

٤ـ بنوارە: Landis, social control. P.56

٥ـ بنوارە: Berg, clinical psychology. P.437

٦ـ بنوارە: محمد خليفة بركات، تحليل الشخصية، ل ١٤١.

٧ـ بنوارە: Dalbiez, psychanaly tical Method. Vol.1,P.50

٨ـ بنوارە: سلامة موسي، عقلي و عقلك،ل٦٣.

٩ـ بنوارە: جوزيف جاسترو، الاحلام و الجنس، ل ١١٥.

١٠ـ بنوارە: هـ.س، ل ١١٩ ـ ١٢٠.

١١ـ بنوارە: فرانك كابريو، تفسير السلوك، ل ٢٧٩.

١٢ـ بنوارە: جوزيف جاسترو، الاحلام و الجنس، ل ٢٧٩.

١٣ـ بنوارە: فرانك كابريو، تفسير السلوك، ل ٢٨٠.

# بەشی نۆیەم:

## فرۆید و ئارەزووە مرۆییەكان

### هەڵە و ڕاست:

لە كۆن دا بڕوا وابوو، ئاوەزی مرۆڤ ئەگەر باش بیر بكاتەوە و لۆژیكی ساغ بەكار بێنێ دەتوانێ لە ڕاستی تەواو تێ بگات... ئەمەش یانی (ئاوەزی وشیار)دەتوانێت ڕاستەوخۆ لەهەڵە دوور بكەوێتەوە و بگاتە ڕاستی.

دەكرێت منیش بڵێم: ئەم بۆچونە ئەمڕۆكە كۆن بووە و هیچ كەس گرنگی پێ نادات، ئاوەز هەرچەندە هەوڵ بدات ناتوانێ پەی بەرێ بە هەقیقەتی تەواو، سروشتی ئاوەز وایە ، تەنها سەیری یەك لایەنی هەقیقەتی دەكات و لایەنەكانیتر پشت گوێ دەخات. كەواتە دەبێ هەڵەش بكات و ڕاستیش بپێكێ لە یەك كاتدا...

(ولیەم جیمس) دەڵێ: "ئاوەزی مرۆڤ بەسروشتی خۆی لایەنگر و جوزئیە"[1] بەدەربڕینێكیتر: ئەقڵ ناتوانێ لە شتێ تێبگات، مەگەر لایەنگری ئەو شتە بێت و شتەكانیتر پشت گوێ بخات.

لێرەوە ئەو دەمبەدەمە نەزۆكانە سەریان هەڵدا كەبیریارانی كۆن پێیەوە ئالودە ببون... هەر گروپێكیان دەمارگیرن بۆ ڕاكەی خۆیان و پێیان وایە (هەموو هەقیقەت) لە نێو ڕاگەی ئەواندا قەتیس ماوە... ئەمە لەكاتێكدا كەسەرنجی تاقەبەشێكی هەقیان داوە... بۆیە ئەگەر سەری بسوڕێنێت بەرەو بەشەكانیتر، ئەوا خۆیی بۆ دەردەكەوێ كە هەم هەڵەی كردوە و هەم ڕاستی پێكاوە، دژەكانیشی وەك ئەو وان، پاكی و بێهەڵەیی تەنها بۆ خوایە.

بەم پێودانگە پێویستە لەسەر توێژەری نوێ، لەهەموو ڕویەكەوە لە (هەڵە و ڕاست) بكۆڵینەوە، چونكە هەر چەندە تیۆرەكەی لەخۆی دا مەزن بێت، لەناواخنی دا ناتەواویەكی هەر تێدایە.

جگە لەوەش هەر تیۆرێك (سەڕای ناتەواویەكانیش) بە ئەندازەی خۆی بەشداری دەكات لە گەشەپێدانی (بیری مرۆ) دا... تیۆر هاریكاری ئاوەزی مرۆڤ دەكات لە گەشەكردن دا، وەك چۆن پلەكانی پەیژەیەك یارمەتی دەرن لە چونەسەر (بەرەو سەر بەرزبوونەوە) دا... هەر پلەیەك بەرزترە لەوەی پێشوتر... لەهەمان كاتیشدا نزمترە لە وی دادێ ئەگەر واش نەبا، مرۆ نەی دەتوانی لەبیرێكی نزمەوە بۆ بیرێكی بەرز بگوازێتەوە.

**هەندێ لە ناتەواویەكانی فرۆید:**

كە لە ژێر تیشكی ئەم ڕوناكیەدا، لە تیۆرەكەی فرۆید رادەمێنین، دەبینین ڕاژەیە زۆری بەبیری مرۆ كردوە، راژەیەكە گاڵتەی پێ ناكرێ... چونكە ڕووی سەرنجەكانی كردە ئەو ئارەزوە بەهێزانەی لە ناخی دەروون دان و مرۆڤ پاڵ دەنێن بەرەو رێگا جودا جوداكان، بێوەی بە خۆیشی بزانێ.

وەلێ ئەوەی لەم ڕووەوە بەناتەواوی لە سەر فرۆید دەژمێردرێن، ئەوەیەكە گرنگی خۆی چڕ كردەوە لەسەر ئارەزووی سێكسی و بەگرنگترین ئارەزووی مرۆڤی دایە قەڵەم... بەوەش دەستی هەڵنەگرت، بەڵكو زۆرینەی هەرە زۆری نەخۆشیە دەرونیەكانی دەدایە پاڵ هۆكاری سێكسی، ئەمەش یانی فرۆید لەیەك كاتدا هەم راستی پێكاوە و هەم هەڵەیشی كردووە، ئەو توانی رۆبچێت بە نێو قوڵاییەكانی دەروونی مرۆڤ دا، كەچی هیچی تێدا نەدۆزیەوە جگە لە پاڵنەری سێكسی.

وادیارە ئەم لایەنگریەی لە تیۆرەكەی (فرۆید)دا دەبینرێ، دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو بارودۆخەی دەوری (فرۆید)یان دابوو لەكاتی دروست بوون و پێكهاتنی بیرۆكەكانی و، جۆری ئەو نەخۆشانەش كە فرۆید چارەسەری دەكردن...

ئاشكرایە فرۆید لەشاری (ڤیەننا) دا پێگەشتوە، ئەو شارەش بەر لە جەنگی گەردونی یەكەم پایتەختی ئیمپراتۆریەتێكی قەشەنگ بوو، چینی فەرمانڕەواش نغرۆ ببوون لە نێو نەریتە كۆنەكانیان دا... تێبینی دەكرا، ژنانی ئەو چینە فەرمانڕەوایە لە ڕووی پۆشاك و خۆراكەوە تێر بوون و لەڕوی سێكسیەوە برسی بوون. تا ڕادەیەك بەو هۆیەوە

دوچاری چەندین نەخۆشی دەروونی بوون، فرۆید ئەوەی پێ بڕا کە ژمارەیەکی زۆر لەو ئافرەتە برسیانە لە ڕووی سێکسی‌یەوە چارەسەر بکات. بۆیە وای بە ئەندێشە دا هاتوە کە هەموو خەڵکی وەك ئەوان وان... جا گەر بهاتبا (فرۆید) لە ژینگەیەکی دیکەدا بژیایە، لەوانەیە تیۆرەکەی بەشێوازێکی‌تر بهاتایە بوون.

## زارۆ لە دیدی فرۆید دا:

توندڕەوی لای فرۆید ، کاتێ بەڕونی دەردەکەوێ کە توێژینەوەی ڕەفتاری منداڵ دەکات... فرۆید جموجوڵە ساکارەکانی منداڵ بەوە لێك دەداتەوە گوایە مەرامێکی سێکسیان لەپیشتەوە... بۆ نمونە گەر منداڵ یاری بە ئەندامی سێکسی خۆی کرد، فرۆید وای لێك دەداتەوە کە ئەو منداڵە ئەیەوێت چێژی سێکسی وەرگرێ، یاخود گەر منداڵ مەمکی دایکی یان پەنجەی خۆی بمژێ، فرۆید بەئاماژەی سێکسی لەو منداڵەدا لە قەڵەمی دەدات.

بەناوبانگ ترین گرێیەك لەم ڕووەوە فرۆید هێنابێتیە کایەوە (گرێی ئۆدیب)ە، ئەو پێی وایە منداڵی نێرینە بەهۆی ئەو گرێیەوە هەم باوکی خۆش دەوێت و هەم ڕقیشی لێیەتی... ویژدانی (خلقی) منداڵەکە هانی دەدات باوکی خۆش بوێت، بەڵام ئارەزووە سێکسی‌یەکەی هانی دەدات کێبەرکێی بابی بکات لە چێژوەرگرتن لە دایکی دا... بەدەربڕینی‌تر منداڵەکە غیرەی هەیە لەبەرانبەر بابی دا.

هەمان شێوە لە منداڵی مێینەدا بەدی دەکرێ، ئەمیش لەیەك کاتدا رقی لە دایکێتی و خۆشیشی دەوێ، ئەوەتا دایکی لەلایەکەوە شیری دەداتێ و دڵسۆزیەتی، لە لایەکی‌ترەوە کێبەرکێ دەکات لەسەر بابی... کەوابێ بەدەربڕینی فرۆید منداڵە مێینەکە دوچاری (گرێی ئەلکترا) بووە، ئەم گرێیەش هاوتایە لەگەڵ گرێی (ئۆدیب) دا لای منداڵی نێرینە[٢]

کە مرۆڤ گەورەش دەبێ بەردەوام ئالودەیە بە دەست ئەو گرێیانەوە کە لەمنداڵیەوە دوچاری بووە.. هەر ئەمەش هۆکاری ئەو خەونە دزێوانەیە کە پیاو هەندێ جار دەی

بینێت و خۆی لە دۆخێکی خراپ دا دەبینێت لەگەڵ دایکی دا، یاخود ژنێ بەخۆیەوە دەبینێ لە تەك بابی دا.

### فرۆید دەرك دەكات:

وادەردەکەوێ فرۆید لە دوا دواییەکانی دا، پاشگەز بووەوە لەو بۆچونەی کە لەمەڕ ئارەزووی سێکسی هەی بوو، نەخاسمە لە بارەی ڕاڤەکردنی خەونەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە دانی نا بەو ڕاستی‌یەدا کە خەون پێك دێ لە هەندێ ڕەگەزی دیکەی جگە لە ئارەزووی سێکسی، وەك تینوێتی و برسێتی.

فرۆید هەست بەکەمێ تاڵی دەکات بەرانبەر رەخنەگر و دژەکانی دا... پێی وایە کە بەهەڵە لە تیۆرەکەی گەشتون و بەناهەق تۆمەتباریان کردوە.. لەو ڕووەوە دەڵێت: "هەرگیز نەم گوتوە هەموو خەونێك ئاماژە بە ئارەزووی سێکسی دەدات، زۆر جار هەبووە پێچەوانەی ئەو ڕایە بڕیارم داوە، بەڵام سودی چی‌یە.؟"[٣]

هەر چۆن بێ، ئێمە ناتوانین (فرۆید) بێتاوان نیشان بدەین لە تۆمەتی پێداگری کردنی لەسەر فاکتەری سێکسی لە ڕاڤەکردنی خەون دا... رەنگە ئەم پێداگریەش بێ، هانی لایەنگرانی ویان داوە تا لەو پرسە دا توندڕەوی بنوێنن... زۆرجاریش دەبێ، قوتابیەکان دەمارگیرترن بۆ بیردۆز و بۆچونێکی مامۆستاکەیان لەخودی مامۆستاکە، چەندین جار ئەمە لەمێژوودا ڕوی داوە.

### شۆڕشەکەی ئەدلەر:

لەبەرانبەر فرۆیددا، شۆڕشگێڕێکی بەتوانا دەرکەوت، ئەویش (ئەلفرد ئەدلەر) بوو... ئەدلەر یەکێ بوو لە قوتابیەکانی فرۆید، دواتر لێی جیا بویەوە و تیۆرێکی گرنگی نوێی هێنایە کایەوە کە ئەمرۆ لایەنگرانێ زۆری هەیە... (ئەدلەر) پێی وایە بیردۆزەکەی فرۆید ئاڵۆز و تەم و مژدارە.. ئارەزووی سێکسیش ئەو گرنکی‌یە زۆرەی نیە کە مامۆستا گەورەکەی وای بۆ دەچێ.

(ئەدلەر) دەڵێت: منداڵ ئارەزووی سێکسی ناناسێت و، هیچ هەستێکیش بە ئارەزوی سێکسی ناکات... بەڵکو شتێکیتر دەناسێت، شتەکەش، ئەو هەستەیە کە منداڵ دەیکات کاتێ خۆی بە بچوکی دەبینێتەوە لە نێو خەڵکانی لەخۆی گەورەتردا... (ئەدلەر) ئەم هەستە ناو دەنێت (هەست بەناتەواوی کردن).

زارۆ هەست دەکات کە لاواز و دەستەوسانە لە ئاقار زۆر شت دا، هەروەها ئەندامانی خێزانەکەی دەبینێ زاڵن بەسەری دا، فەرمانی پێ دەکەن و ڕێگری لێدەکەن، تواناشیان هەیە پاداشتی بکەن یان سزای بدەن، ئەگەر کارێکی کرد ئەوان پێی قایل بوون، زەردەخەنەی بۆ دەکەن و دەست دەکێشن بەناو شانی دا و شتێکی بەتامیشی دەدەنێ.... بەڵام ئەگەر تورەیان بکات. ئەوا سزای دەدەن و ئەو خۆشیانەی لێ قەدەغە دەکەن کە حەزیان لێ دەکات.

کاتێکیش گەورە دەبێت و دێتە کۆڕی ژیانەوە، دەبینێت خەڵکی بەهەمان ئەو شێوەیە هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکەن کە ئەندامەکانی خێزانەکەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد... خەڵکی بەها و پێوەرگەلێ تایبەت بەخۆیان هەیە و مرۆڤی پێ دەپێون و بەو گوێرەیە ڕێزی بۆ دادەنێن.. جا ئەگەر مرۆڤ بەدەم پێوەرەکانیانەوە بێت و مافی خۆیان بداتێ، ئەوا خەڵکی ڕێزی دەگرن، ئەگەر لێشیان لابدات ، ڕقیان لێی دەبێتەوە و ڕەخنەی لێدەگرن و جنێویشی پێدەدەن.. ئەوەش یانی مرۆڤی پێگەیشتو، منداڵێکی گەورەیە.. چونکە ئەمیش هەست بەوە دەکات کە ناتەواوە لەبەرانبەر کۆمەڵگەکەیدا، بۆیە بەوپەڕی توانایەوە هەوڵ دەدات ئەم ناتەواویە پڕ بکاتەوە و لای خەڵکی پلەیەکی شایستە و بەرز بەدەست بێنێ، بەدەربڕینێکیتر ، مرۆڤ لەناخی خۆیدا ناکۆکیەکی مەترسیداری هەڵگرتوە، ئەوەتا لە لایەکەوە هەست بەناتەواوی دەکات، لەلایەکیترەوە هەست دەکات کە حەزی لە ناوبانگ و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیە.

هەموو کاتێ حەزی لەوەیە بەڕێز بێت و بەئەنگوست ئاماژەی بۆ بکرێ، جا ئەگەر دەستەوسان بوو لەوە، پەنا دەباتە بەر خەون، یان وەهم، تاکو خۆی پێ بەرز بکاتەوە بۆ ئەو پلەیەی خۆی دەیەوێت، ئەگەر وەهمیش بەسەر هزری مرۆڤ دا زاڵ بوو ،پاڵی پێوە دەنێت، بەرەو شێتی یا خود نەخۆشیی دەمار(عەساب)... بۆیە (ئەدلەر) رای وایە

زۆربەی دوچاربوانی نەخۆشیە دەروونیەکان بەزۆری لە قوربانیانی (گرێی ناتەواوی)ن... لەبەرهەمان هۆکاریشە کەدەبینین زۆرێك لە شێت و تێك چوەکان، خۆیان وا دێتە بەر چاو کە میر یان عەبقەری بن، یاخود خاوەن جوانیەکی وان کە ئافرەتانی شەنگ و شۆخ لە بەر پێیاندا کڕنۆش دەبەن (دەربڕینی وەرگێڕ)

کەوابێ ڕەوا نیە گاڵتەبەشێت بکەین یاخود بەسووك سەیری بکەین و بیچەوسێنینەوە.. شێت پێویستی بە نەرم و نیانی و گرنگی پێدانە... چونکە بارودۆخە سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەکەی ڕێگر بوون لەوەی ئارەزووەکانی تێر بکات... کەواتە ئەرکی سەرشانمانە چاودێری بکەین بە نەرم و نیانی و دانایی‌ش ڕێنمونی بکەین.. هەموشمان کەم تا زۆر لەو دەچین (واتە لەشێت دەچین - وەرگێڕ)، بەڵام بارودۆخ یارمەتی داوین و لەو بەتواناتر بووین لەتێگەیشتنی بەها کۆمەڵایەتیەکان و بەدەنگەوە چونیاندا.

### خەون لای ئەدلەر:

(ئەدلەر) لەبەر ڕوناکی تیۆری (هەستکردن بەناتەواوی) دا ڕاڤەی خەون دەکات، لای وی خەون هیچ نیە، جگە لە بەدەست هێنانی ئەو ئارەزوانەی کە مرۆڤ لەساتی بێداری دا حەزی پێدەکات وەك زاڵ بوون و بەرزبونەوە... لەوانەیە یەکێکمان لەخەوندا ببینین کە وەك باڵندە بەسەر خەڵکی دا دەفڕین، ئەم خەونە یانی ئەو کەسە حەزی لەوەیە ببێتە خاوەنی پلە و پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی، یاخود دەیەوێت خەڵکی ئاوڕی بەلا دا بدەنەوە. یان ئاوڕ بدەنەوە بە لای توانا نائاساییەکانی دا.

(ئەدلەر) لای وایە ئەو کردەوە سێکسیانەی مرۆڤ لەخەونی دا دەیانکات. ئاماژەیە بەوەی حەزی لە زاڵ بوونە بەسەر خەڵکانیتردا... ئەمە تەنها بەسەر پیاو دا ناچەسپێ، بەڵکو بەسەر ئافرەتیش دا دەچەسپێ، ئەو حەزی لەوەیە لەخەونی دا لە ژێر پیاوەوە بێت... بەوەش دەتوانێ وای لێ بکات پیاوەکە گوێ ڕایەڵی بێت و بەدەم ئارەزووەکانیەوە بێت، بە دەربڕینێکیتر: مل کەچی پیاو دەبێت لە پێناوی ئەوەی پیاوەکە مل کەچی بێت.[٤]

**ڕەخنەگرتن لە تیۆرەکەی ئەدلەر:**

بیردۆزەکەی (ئەدلەر) لە ڕەخنەکاری بەدوور نەبوو... هەر چەندە بەڕاستی تیۆرێکی گەورەیە، بەڵام هەر وەکو تیۆرەکەی فرۆید توندڕەوە، سەرنجی تەنها ڕویەکی ڕاستی دەدات، و ڕوەکانی دیکەی ڕاستی پشتگوێ دەخات.

(ئەدلەر)یش زیاد ڕۆدەچێت لە پێداگری کردنی دا لەسەر هۆکاری (هەست بە ناتەواو کردن)، وەك چۆن فرۆید زیادەڕەوی دەکات لەسەر پێداگری کردنی لەسەر هۆکاری (پاڵنەری سێکسی )

ئایا ناگونجێت بڵێین ئەو ڕایانە هەموویان ڕاستن؟ و لەوانەیە جگە لەو ڕایانە بۆچونی ڕاستی دیکەش هەبن، ئایا ناگونجێ مرۆڤ هەست بە ناتەواوی بکات؟ و هەست بە ئارەزووی سێکسیش بکات؟ هەروەها هەستیش بەئارەزووی دیکە بکات.

دەگونجێت بڵێین ئارەزووەکانی مرۆڤ، هەمەڕەنگن، بەڵامکاتێك یەکێکیان کە دەکەوێتە ژێر گوشار و خەفەکردنێکی زۆرەوە، زاڵ دەبێ بەسەر ئەوانیتر دا یاخود کاتێ مرۆڤ هەست بە بێبەش بوونی ئەو هەستە دەکات، لێرەوە ئیدی جیاوازی خەڵکی لە ئارەزو و حەزەکانیان دا سەر هەڵئەدات.

**سروشتی مرۆڤ:**

مرۆڤ بەر لەهەر شتێك ئاژەڵێکەو دەیەوێت بژی، هەر کەپێداویستییەکانی لە خۆراك و پۆشاك و جێگەی حەوانەوە دەست کەوت، ڕوو دەکاتە تێرکردنی پێداویستییە سێکسییەکانی، کە ئەویشی تێر کرد، هەوڵ ئەدات بۆ پلە وپایەی کۆمەڵایەتی، کە دەگاتە قۆناغێ ملەقوتە دەکات بۆ قۆناغێکیتر... هیچ شتێ دەمی ئادەمیزاد پڕ ناکات جگە لە خۆڵ، وەك پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێ) دەفەرمێت.

هەر مرۆڤێ گرێیەکی سایکۆلۆژی هەیە کە دەستی لە بینەقاقای گیر کردوە و ڕەفتارەکانی ئاراستە دەکات، هەندێ لە خەڵکی گرێی بژێویان هەیە و تیای دا ڕۆچون، جگە لەو گرێیە ئیدی شتیتر ناناسێ مەگەر بەکەمی... هەندێکیتریان گرێی

سێکسی بەسەریاندا زاڵە... هەندێکیتر بە دووی بەرزێتی دا وێڵە، هەر کەسیش لە ڕێی دا بوەستێ بە قاچاکانی دەی شێلێت.

هەر کەسایەتیەکی مرۆیی کلیلێ تایبەت بەخۆی هەیە، هەر کەس گەرەکیە لە مامەڵەکردنی خەڵکی دا سەرکەوتن بەدەست بێنێ، هیچی لەسەر نیە ئەوە نەبێ لەو سروشتە ئاڵۆزەیان بگات، هەر یەکێکیشیان بەکلیلی نهێنی خۆی چارەسەری بکات.

### هەڵەی هزرڤانانی لای ئێمە :

ئەوانەی لای ئێمە جڵەوی هزریان گرتوە، تا هەنوکەش لە نێو تاریکی‌یەکانی لۆژیکی کۆن دا دەژین، وادەزانن هەموو خەڵکی یەك سروشت و ئەقڵێکی وێکچویان هەیە، گەر یەکێکیان گرێیەك یاخود بیرۆکەیەك بەسەریاندا زاڵ بێت ،وادەزانن هەموو خەڵکی ئارەزوەکانیان بەو جۆرە تێر کەن کە ئەمان دەیانەوێت، کەچی کەسێك نابینینن گوێیان بۆ بگرێ یاخود وەڵامیان بداتەوە.

ئەم هەڵەیە بەئاشکرا بە وێژەوانەکانیشمانەوە دیارە، هەندێ جار وادەبێ یەکێکیان هۆنراوەیەك دەهۆنێتەوە یان وتارێك دەنوسێت، خۆی زۆر سەرسام دەبێت پێی و واش دەزانێت هەموو خەڵکی پێی سەرسام دەبن. دواتر کە نیگاکانی هەڵدێنێ، دەوینێ خەڵکی گوێ بە وتارەکەی نادەن و فەرامۆشیان کردوە و سەرقاڵی کار و بارە تایبەتەکانیانن.. لەم کاتەدا ئیتر هاوڕێکەماندەستەکانی بە یەکتردا دەکێشێ‌بۆ بەفیڕۆ چوونی بلیمەتیەکەی لەنێو ئەو دەبەنگانەدا، وەك ئەوەی خودا جگەلەو بلیمەتێ دیکەی دروست نەکردبێ.

ئەگەر هۆنراوەیەکی دڵداری بۆ دڵداری وەخوێنێ، دەبینی دەکەوێتە لەرزە بۆی، وەلێ گەر هەمان هۆنراوە بۆ چەوساوەیەکی برسی بخوێنیتەوە دەبینیددانە کیرت لێدەکات ، لەوانەیە حەز بکات ئەو هۆنراوەیە بەسەر پارچەنانێکدا بڵێی لەبری ژنی جوان... ئنجا هەمان هۆنراوە بۆ کابرایەکی سیاسەتمەدار بخوێنیتەوە سەیردەکەیت تۆیش و هۆنراوەکەیشی فەرامۆش کردوە، خەیاڵی لای هەڵبژاردن و پاڵاوتنە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران.

**خەون و ئارەزووە هەمەڕەنگەکان:**

لەبەر دا ئاماژەمان بەوە دا کە خەون سروشتی مرۆڤ و ئارەزوە شاردراوەکانی دەردەخەن، خەڵکی لەبێداری دا ڕەنگە وا نیشان بدەن کە وەك پێغەمبەران وان لە خۆش ویستنی هەق و ڕاستی دا، و هیچ ئامانجێکیشیان لە ژیاندا نیە جگە لەخزمەت کردنی خەڵکی و نزیك بوونەوە لە خودا، وەلێ گەر لە خەونەکانیان بکۆڵینەوە دوڕوییەکەیان بە ئاشکرا دەبینی.

لەڕاستی دا ئەوان جگە لەخۆیان کەسیان خۆش ناوێت... ئەگەر هەر کەسێکیان سوکایەتیەکی پێکرا یان ئازارێ درا و نەیتوانی لە بەرانبەردا وەڵام بداتەوە، ئەوجا دەست دەکات بە ستایش کردنی خۆی کە ئارامگر و لێبوردەیە لە کاتی تواناداری دا یان خاوەنی پارێزکاری وترسە لە خودا... کەچی لە ڕاستی دا درۆزنە... بۆیە کاتێك دەنوێ، دەچێتە سەر ئەو کەسەی دەست درێژیەکەی کردۆتە سەری و بە (کوتەکێکی ئەستوور) دا دەبارێتە سەر سەری، هێندەی بەسەردا دادەبارێنێ تاکو دڵی ئاو دەخواتەوە.

وەلێ گەر ئەم هاوڕێیەمان لەو ستەمکارانە بێت کە لەکاتی بێداری دا دەتوانێ تۆڵە بکەنەوە، ئەوا خەونەکانی بەجۆرێکی تر دەبن، ڕەنگە لەخەونی دا لە باتی (کوتەك) ئەندامە سێکسیەکەی بەکار بێنێ!!

ئەو کەسانەش قەدەر چروك بوە لەگەڵیان دا و هۆکارەکانی تەرەفیان نیە، هەمان قسەیان بەسەردا دەبڕێ، ئەوانیش دەڵێن لەم دنیا فانیە دا دنیانەویستن... کەچی لە کاتی نوستنیش دا خەون بەکۆشك و تەلاری قەشەنگەوە دەبینن کە باخچە لە هەر چوار دەورێتی و لەناویشی دا قاقای کەنیزەکان بڵند دەبێتەوە... و لەو کۆشکە دا چێشتی چەور و ڕانی مامریشیان بۆ دێنن، لە دوای ئەویش ، سینی شیرینی و پاقلاوەیان دەرخوارد دەدەن... ئەوانیش خۆراکەکان دەخۆن و قامکی خۆشیانی پێوە دەخۆن.. نۆشی گیانیان بێ.

# پەراوێزەکانی بەشی نۆیەم:

١- بنوارە: ولیم جیمس، ارادة الاعتقاد، ل ٤٠.

٢- بنوارە: Dalbiez, Psychoananqlytical Method. Vol, P166

٣- بنوارە: 1 bid, Vol. 1, p 57

٤- بنوارە: Haddfield, Dreamsdnd Nightmares. P 37

# بەشی دەیەم:

# فرۆید و خەونە ئازاربەخشەكان

## ناتەواویەكی تری فرۆید

لەبەشی پێشوو داباسمان لە ناتەواویەكی فرۆید كرد، ئەویش بریتی بوو لە پێداگری وی لەسەر فاكتەری سێكسی لە ڕاڤەكردنی ڕەفتاری مرۆ بەگشتی، و ڕاڤەكردنی خەون بەشێوەیەكی تایبەت... لێرەدا دەمانەوێت هەڵەیەكیتری فرۆید (یان ناتەواویەكیتری) باس بكەین، ئەویش تایبەتە بە خەونە ئازاربەخشەكان،یان ئەو خەونانەی هەندێ جار بە مۆتەكە (كابوس) ناوزەد دەكرێن.

فرۆید وەها ڕاڤەی خەونی كرد كە هەوڵێكە بۆ گەشتن بە ئارەزوە خەفەكراوەكانی مرۆڤ ... لێرەدا ڕەخنەگران بەڕوی دا هەڵشاخان و پرسیاریان كرد: ئەی بە چی ڕاڤەی ئەو خەونانە دەكەیت كە مرۆڤ لە خەو ڕادەچەنێت بەترس و لەرزەوە؟ ئایا ئەو خەونانەش، هەوڵێكن بۆ گەشتن بە ئارەزوە خەفەكراوەكان؟!

مرۆڤ هەندێ جار خەون دەبینێ بە ریسواییەكەوە كە لە دەورێتی، یان دەبینێ لە بەرزیەكی هەزار بە هەزارەوە دەكەوێتە خوارێ یان ... هتد، جا ئەگەر خەون بریتی بێت لە (هەوڵێ بۆ بەدەست هێنانی ئارەزوو) چۆن مرۆڤ هەوڵ دەدات بەو شێوە ئازاربەخشە ئارەزوەكانی بەدی بێنێت؟ ئایا حەزی لەوەیە دڕندەیەك بیكاتە نێچیری خۆی "بۆ نمونە"؟ یان دەخوازێ لە بڵندیەكەوە بكەوێتە خوارێ و سەری تێك و پێك بشكێ؟

ئەگەر خەونە ئازاربەخشەكان لە چاو خەونەكانیتر دا كەمتر بونایە ئەوا مەسەلەكە ئاسان بوو؟ بەڵام مەسەلەكە پێچەوانەیە... دەڵێن: خەونەكانی توڕەیی و دڵتەنگی و ترس، چەند قاتی خەونەكانی شادومانی و دڵشادین... وا دیارە خەونە ئازار بەخشەكان بە پتربوونی تەمەنی مرۆڤ زیاتر دەبن.[1]

جا ئایا فرۆید لە ئاقار ئەم ڕەخنە بەجێیە دا چی دەڵێت؟

لێکدانەوەی فرۆید:

فرۆید لێرەدا وبۆ بەرهەڤانی کردن لە تیۆرەکەی،چەکێکی لێ نەچۆتە قاتی... ئەو دەڵێ: مرۆڤ لە کاتی نوستن دا، هەر وەك ساتەوەختی بێداری، لە ژێرکاریگەری دوو هۆکاری پێچەوانە و هاودژ دایە... هۆکاری ئارەزووەبێ ئامانەکانی لە لایەك، لە لایەکیترەوە هۆکاری چاودێرە ڕەوشتییەکەی.

مرۆڤ دەخوازێ ئارەزوە خەفەکراوەکانی بەرجەستە بکات، لە بەرانبەر ئەمەش دا،هەست بەتاوان و خەفەکردنێك دەکات لە لایەن ویژدانەوە، کاتێکیش دەنوێت، ناتوانێ تا ئەوپەڕی سنور پەل بهاوێ بۆ تێرکردنی ئارەزوەکانی، چونکە ویژدانی دەترسێنێت و دەسلەمێنێتەوە، تاکو بەرەنجامی ڕۆچونی بە دوی ئارەزوە قەدەغەکانی دا نیشان بدات.

بەڕای فرۆید (مۆتەکە) وێنەیەکە لە وێنەکانی (سزا) و ویژدان لە کاتی نوستن دا دەی سەپێنێ بەسەر مرۆڤ دا... بەو پێیە ویژدان ئارەزووی خودە نمونەییەکەی مرۆڤ دێنێتە دی... جا مادەم کەسایەتی مرۆڤ پێکهاتوە لە خودێکی ئاژەڵی و خودێکی نمونەیی، بۆیە خەونەکانیشی ئەبێ دوو جۆر بن، بەتام و ئازاربەخش.[٢]

**بۆچونی دکتۆر ئەلکسەندەر:**

دکتۆر (ئەلکسەندەر) یەکێکە لە شوێنکەوتوانی فرۆید، بەڕێوەبەری پەیمانگای شیکردنەوەی دەرونی بوو لەشاری (شیکاگۆ)، بەبۆچوونی ئەم،خەون لە بەرەنجامی دوو هێزی هاودژەوە دروست دەبێت: یەکێکیان دەیەوێت ئارەزوەکان بەدەست بێنێ، ئەوی تریان بەپێچەوانەوە،دەیەوێت ئارەزوەکان سەرکوت بکات.

ئەلکسەندەر دەڵێت: (خەونی ئازاربەخش هەوڵێکە بۆ سوك کردنی ئەو هەڵچون و شپرزەبونەی کە بەرەنجامی،سەرکوت کردنی ویژدانە، ویژدانیش بەئازار چەشتن نەبی ناحەوێتەوە)[٢]

شەوێك، کیژێ خەونی بینی، لای وابوو فیلێکی زەبەلاح بەلوتە درێژەکەی هێرشی کردە سەر، کیژەکە بەدەم ترسەوە لەخەون ڕاچەنی... لوت (کەپۆ)ش لە زمانی خەون دا

ئاماژەیە بۆ ئەندامی نێرینە(چوك) ... لەوانەیە ئەو كیژە لەبێداری دا ئاواتی خواستبێ ئەو ئەندامەی دەست بكەوێ، لە هەمان كاتدا لێشی ترساوە... چونكە یاساغە لێی و ڕەنگە ببێتە هۆی ئەنگی و بەدناوی بۆی، كیژەكە لە هەمانكاتدا حەز لە (چوك) دەكات و لێشی دەترسێ... بۆیە خەونەكەی لە یەك كاتدا پێك هاتوە لە لوتە درێژە بەتامەكە و فیلە ترسناكەكەش پێكەوە.

هەموو ژیانی مرۆڤ بەم جۆرە دەڕوات بەڕێوە، پێویستە ئازار و چێژ تیای دا كۆ ببنەوە... زۆر ئەستەمە ئازارێك بە تەنها یان چێژێك بە تەنهای تێدا ببینین... وەك هۆزانڤانە عارەبەكەش دەڵێ پێویستە جگە لە هەنگوین، چزوی هەنگەكەش هەبێ.

**ئارەزووی ماسۆشی :**

لە پاڵ ئەو شیكردنەوە و لێكدانەوەی پێشوودا فرۆید، باس لەشتێكی دیكەش دەكات... ئەو دەڵێت هەندێ لە خەڵكی حەز لە ئازار چەشتن دەكەن،وەك چۆن هەندێكی دیكەیان حەز لە چێژچەشتن دەكەن... لە ژیان دا هەندێ خەڵك دەبینین حەز بەوە دەكەن دەست درێژی و سووكایەتیان بكرێتە سەر، لەو كاتەش دا لەو پەڕی ڕەزامەندی و خۆشحاڵی دا دەبن... ئەو جۆرە كەسانە هەندێ جار پەنا دەبەنە بەر (خەونەكانی بێداری) تاكو هەناسەیەك بدەن بەو ئارەزوە ڕیزپەڕەیان... خەیاڵ دەكەن كە لە دۆخێكی پڕلە داماوی و ئازارچەشتن دان ،ئیدی دەگرن.

تاكو خەڵكی زیاتر ئازاریان بدەن، ئەمان خۆشحاڵ تر دەبن... فرۆید هەروەها لای وایە ئارەزووی (ماسۆشی) هۆكارێكی‌تری خەونە ئازاربەخشەكانە [٤] ئەوەی لە بێداری دا هەستی پێ دەكات لەوانەیە حەز نەكات لە ناو خەڵكی دا ئاشكرای بكات، هەر بۆیە لە كاتی خەوتن دا بەدەستی دێنێ.

**بۆچونی كۆتایی :**

وا دیارە شیكردنەوەكەی فرۆید بۆ خەونە ئازابەخشەكان بەتەواوی ئامانج نادا بەدەستەوە، تەنانەت ڕەنگە لە توندڕەوی و زۆر لە خۆكردنیش خاڵی نەبێت، بەڵكو بە یەكێك لە خاڵە لاوازەكانی تیۆرەكەی فرۆید دەژمێردرێت.

فرۆید تیۆرەکەی خۆی لە چوارچێوەیەکی زۆر بەرتەسك دا گەمارۆ دا، ئەو دەیەوێت هەموو خەونەکان ئامرازێ بن بۆ بەدەست هێنانی ئارەزوە سەرکوتکراوەکان... جا ئەگەر هەندێك خەونی دی لەو ڕێسایە لا دەن، پەنا دەباتە بەر پاساوهێنانەوە و ڕاڤەکاری،تاکو بیگەڕێنێتەوە سەر ڕێساکە، لێرەش دا بەئاشکرا زۆر لەخۆکردنی پێوە دەبینرێ.

وا دەردەکەوێ خەون بەتەنها بەدەست هێنانی ئارەزو نیە وەك بە ئەندێشەی فرۆید دا هاتوە، بەلکو ڕاسترە گەر بلێین: گرفتێکی دەروونیە و لەو ئارەزوەوە سەری هەلداوە..[5]

ئێمە نکولیناکەین لە ڕاستێتی ئەو شیکردنەوەیەی ، فرۆید لەمەڕ زۆرینەی خەونەکان هێناویەتی... بەلام لەگەلێ ئەوەشدا خەون پێویستی بە شیکردنەوەیەکی تریش هەیە. ئەمەش کاتێ بە ڕونی دەردەکەوێ کە لە دەروونی مرۆڤمان کۆلیەوە بەشێوەیەکی گشتی و پەیمان برد بەوگرێ و گرفتانەی لە دەروونداندا.

### نوستن و بێداری:

لێردا پێویستە باس لەوەش بکەین کە خەون و بێداری دوو ڕوی یەك ڕاستین، ئەو ڕاستیەش بریتیە لە سروشتی مرۆڤ، تێبینی ئەوەش کراوە کە سنورێکی جیاکار نیە لە نێوان نوستن و ئاگا بون دا لای مرۆڤ... چونکە مرۆڤ لەکاتی بێداری دا لە خەوتن خالی نیە، لەکاتی نوستنیش دا لەبێداری خالی نیە.. ئەو خەونەش مرۆڤ لەساتەوەختی نوستنی دا دەی بینێ، هیچ نیە جگە لە وێنەیەکی گەورەکراوی ئەو وەهم و ئەندێشە سەیرانەی لەبێداری دا دێن و دەچن... هەر یەکێ لە ئێمە دەتوانێ لەبێخ و بنەوانی خەون تێبگا، کاتی لەسەر نوێنەکەی دا ڕادەکشێت و دەیەوێت بنوێت. لەو کاتەدا هەست دەکات ئەو ئەندێشانە بەمێشکی دا دەهاتن و دەچوون، هێدی هێدی بەرجەستە دەبن، تا پتر ڕۆبچێت بە نێو قولایی خەودا زیاتر ئەو ئەندێشانە لە هزری دا ڕۆشن دەبنەوە، تا وای لێ دێ، لێی دەبێتە ڕاستی و خەریکە دەستی لێ بدات، لەو کاتەش دا دەتوانین بلێین وا خەریکە خەون دەبینێ.

(سینل) دەڵێت: (خەون هیچ نیە بیركردنەوە نەبێ، تاكە جیاوازیەك كە هەبێ لە نێوان خەون و بیركردنەوەی بێداری دا، ئەوەیە هەردوو هەستی بیستن و بینین لە كاتی خەوتن دا وازیان لەئەركی خۆیان هێناوە، بۆیە ئامرازی بیركردنەوە تێك چوە و هەنگاوی شلێت و پلێت دەنێ، هەروەك چۆن كاتژمێری دیواری گەر زەمبەلەكەی لێ بكەیتەوە تێك دەچێت، .. هتد) (٦)

یەكێك لە توێژەران هەوڵی داوە ئەو تێكەڵاو بوون و "جەنجاڵی "یەی لە خەون دا دەبینرێ لێك بداتەوە، ئەمەیشی گەڕاندۆتە بۆ تێكەڵاوبوونی زنجیرەی لۆژیكی... بۆ نمونە: تۆ ڕەنگە لە خەون دا ببینی "پلایس یان گاز "ێكت گرتوە بەدەستەوە، دواتر دەبینی " پلایس یان گاز " ە كە ڕاستەوخۆ دەگۆڕێت و دەبێتە مەیمونێك.. هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ وەی "پلایس"ەكە، بلیت بڕینی شەمەندە فەرەكەی وەبیر هێناویتەوە، ئینجا گەشتی شەمەندەفەر، و پاشان باخچەی ئاژەڵان و دواتر كولانەی مەیمون و پاشتر خودی مەیمونەكەی بیر هێناویتەوە، بەڵام ئەم زنجیرە ئاڵ و گۆڕە لە هزری تۆ دا بە خێراییەكی سەیر ڕوی داوە، بە جۆرێ مەیمون و "پلایس"ەكەی لكاندوە بەیەكەوە، ئەمیان لە دوای ئەویان، بێئەوەی ئەڵقەكانی دیكەی نێوانیان دەربكەوێ، كاتێكیش وە ئاگا دێیتەوە، هەست دەكەیت خەونێكی پوچ و ناماقوڵت دیوە، ئەمە لەكاتێكدا خەونەكەت بەگوێرەی كۆمەڵێ هەنگای، بیركردنەوەی لۆژیكی ماقوڵ بەڕێوەچوە... (٧)

**جیاوازی نوستن و بێداری:**

ئێمە لە كاتێكدا دانمان نا بە بونی لێكچونێك دا لەنێوان نوستن و بێداری دا، لە هەمان كاتدا نابێ چاو داخەین لە بونی جیاوازی لە نێوان ئەو دووەدا، ئەم جیاوازیەش لە زۆری ئەو جەفەنگانە دا دەردەكەوێ كە خەون پەنای بۆ دەبات كاتێ وێنای بیرۆكەكانی دەكات... وا دەردەكەوێ كەسێكی نوستوو ئاسان نیە بۆی خەیاڵی بیرۆكەی ئەبستراكت بكات، مەگەر بیخاتە نێو چوارچێوەیەكی بەرهەست... تۆ كاتێ لەخەون دا "پلایس"ە كەت بینی، مەبەستت بوە ڕق و كینەی خۆت لە دوژمنێكت وێنا بكەیت...

ئنجا ئەو مەیمونەی لەپاشان دیوتە ، ڕەمزێکە بۆئەو دوژمنەت کە لەکاتی باسکردنی دا بە (مەیموون) ناوت بردوە لەبێداری دا.

خەون مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە سەر شێوازە سەرەتاییە یەکەمینەکانی، مامۆستا (یونگ) و شوێنکەوتوانی قوتابخانەکەشی وای بۆ دەچن...٨ (یونگ)یش یەکێکە لە شۆڕشکاران بەسەر (فرۆید) دا و هەوڵیشی دا ریفۆرم لە تیۆردکەی فرۆید دا بکات.

(سلامە موسی) دەڵێت: (ئێمە لە خەو دا لار دەبینەوە تا پلەی ئاژەڵێتی، بەڕادەیەك لەخەون دا دەبینین بیرکردنەوەکان بەشێوازی وێنەی یەك لە دوای یەك کە زۆر گەم ئەبێ قسەی تێدا نیە، ئەمەش چونکە "زمان" مۆدێلی تازە و قەشەنگی مرۆڤە، خەونیش گەڕانەوەیەکە بۆ لای ئەو عاتیفانەی کە بۆ دەربڕین پێویستی بە زمان نیە... هەر بۆیە خەون بە زۆری خاڵیە لە قسان و بەئاماژە و جەفەنگ بەڕێوە دەچن... لێرەوەش ئەو قورسیە سەرهەڵئەدا کە لە راڤەکردنی خەون دایە...).[٩]

## شیکاری خەونە ئازاربەخشەکان:

کاتێ لەبەر ئەو رۆشناییە دا لەخەونە ئازاربەخشەکان دەکۆڵینەوە، هیچ نهێنی و تەم و مژێکی تیا دا نابینین، تەنانەت پێویستمان بەو شیکردنەوە زۆر لەخۆ کردوانەش نیە کە فرۆید پەنای بۆ بردوە. خەونە ئازاربەخشەکان لەهەندێ روەوە لەو ئەندێشە ئازاربەخشانە دەچن کە لەکاتی بێداری دا بەسەر مرۆڤ دا زاڵ دەبن و، وەك ئەوە وایە کۆڵێکی قورسی هەڵگرتبێ، هەر چەندە هەوڵ بدات ئەو کۆڵە لەسەر شانی لابەرێ، کۆڵەکە پتر لێی قورس دەبێ.

لەڕاستی دا هەرکەسێکی خەفەت دار لە ناخی دا دوچاری ململانێیەکی توند و تیژ بووە، لەلایەکەوە بەدەست قورسایی خەفەتەکەوە دەناڵێنێ، لە لایەکیترەوە بیر لە لادانی خەفەتەکە دەکاتەوە، کە نوست و دەنگی (ئاوەزی وشیار) لە بەرگوێ دا سووك بوو، ئیدی خەفەتەکە هەلی خۆیی دەست دەکەوێت و بەچەکە ڕەمزیەکەیەوە دێت و دەڕوات و هەندێ جار دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە بەدەم ترس و لەرزەوە لەخەو ڕاچەنێت.

## لەبەر ڕوناکی خەواندنی موگناتیسی دا "هیپنۆتیزم":

لەڕوی زانستی‌یەوە سەلمێنراوە کە خەواندن لە ڕوی نائامادەگی هەستەوە لەخەوی ئاسایی دەچێت، تەنها لەو ڕووەوە لێك جودان، کە لە هیپنۆتیزم دا کەسی خەوتوو دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ئاماژە و ئیحائەوە کە خەوێنەرەکە ئاراستەی دەکات.[10]

ئەگەر خەوێنەرێ کەسێك بخەوێنێت و ئاماژەی بداتێ کە مەترسی‌یەك دەوری داوە، کابرای خەوتوو دەست بەجێ هەست بە مەترسیەکە دەکات و دەست دەکات بە هات و هاوار.

یەکێ لەو تاقیکردنەوە زانستی‌یانەی لەم ڕودوە ئەنجام درا، ئەم تاقی‌کردنەوەیە بوو: توێژەرێ کابرایەکی خەواند و دواتر پارچەکوتاڵێکی بۆ فڕێ دا و وای تێگەیاند کە ئەو پارچە کوتاڵە سەگە، کابرای خەوتوو بڕوای بەو قسەیە کرد و کوتاڵەکەی لێ بویە سەگ و تەنانەت لە دوای لەخەوهەستانیش هەر بڕوای وابوو، ئەو کوتاڵە سەگە...[11]

ئەم ئەزمونە یارمەتیمان دەدات لە تێگەیشتنی خەونە بەئازارەکاندا... چونکە مرۆڤ لە ساتەکانی بێدرای دا چەندین ئاماژەی کۆمەلایەتی وەردەگرێ کە لە ئاماژەکانی خەواندنی موگناتیسی دەچن...[12] بۆ نمونە خەلکی پێی دەلێن لە تاقی‌کردنەوەکانی قوتابخانەی دا دەکەوێت، یان لە بازرگانیەکەی دا زیان دەکات و پارە و پولی لە دەست دانامێنێ، یاخود لە ژێر چەرخەکانی ئۆتەرێك دا دەمرێت، یاخود لە فەرمانگەکەی دەردەکرێت... ئەم جۆرە قسانە لە ئاوەزی ناوەوەی دا قەتیس دەبن، خۆیشی هەوڵ دەدات لە هزرو مێشکی دا بیان کاتە دەردوە، بەلام بێ‌سوودە... زۆر جاریش مرۆڤ ئاماژەی خراپتر بەخۆی دەدات، وا دێنێتە ئەندێشەی خۆی کە کوڕەکەی یاخود باوکی مردوون، یان خەیاڵ دەکات خانودکەی ڕوخاوە بەسەر خوێشی و ماڵ و منداڵیشی دا... بە (بیرکردنەوەی وشیار)ی تاوتوێی ئەم ئەندێشە مەترسی‌دارانە دەکات... بۆیە کە دەنوێت لە خەونی دا وەکو ڕاستی دێنەبەر چاوی... ئنجا لەخەو ڕادەچلەکێت و لەتاوی ئەوەی زۆر ترساوە، گەروی وشك هەلاتوە.

**ڕوداوێكی شەخسی:**

ئەم ڕوداوە لە ڕۆژگارەكانی منداڵیمدا ڕوی داوە و خۆیشم پاڵەوانە بەشان و باهۆكەی بووم، پوختەی ڕوداوەكەش ئەمەیە: جارێكیان قەدەر منداڵێك لە خۆم بچوكتری خستەبەر دەستم، ویستم پێی ڕابوێرم و پێی پێبكەنم، دەستم كردە باسكردنی جنۆكە و دێو و درنج بۆ منداڵەكە، هەستم كرد ترس بە ڕوخساریەوە دەركەوت، ئەمەش وای لێكردم لە وتە ترسناكەكانم بەردەوام بم.. پێم گوت: لە خەوی دا (دێوەكان) دێنەسەری و دەست لە قوڕقوڕاگەی گیر دەكەن و بە چڕنوكەكانیان لەت و پەتی دەكەن.

منداڵەكە ڕۆی بە ڕێی خۆیەوە، منیش قسەكانم لەبیر چوو، واشم دەزانی منداڵەكەش قسەكان لەبیر دەكات... بۆیە زۆر سەرسام بووم كە بەیانی ڕۆژی داهاتوو كەس و كاری منداڵەكە هاتنەسەرم، چاویان غەزەبی لێ دەباری (دەربڕینی ودرگێڕ)، دواتر بۆم دەركەوت منداڵەكە باسی دێو و درنجی بۆ كردوون، و قسەكانی منی بۆ گێڕاونەتەوە، دواتر لە خەوی دا دیویەتی دێوەكان لە هەموو لاوە هێرش دەكەنە سەری و هەتاكو بەیانی نەیتوانیوە بنوێت و جار لەدوای جار دەستی كردۆتە و ڕاوە و هاواركردن... ئیتر مەپرسە ئەو بەیانییە كەس و كاری منداڵەكە چییان پێكردم، تۆڵەی منداڵەكەیان لێكردمەوە، بەڕادەیەك دێوەكانی ڕۆژیان لە بری دێوەكانی شەو پێ نیشان دام.

**پەندێك:**

لەیەكێك لە پەندە میسرییەكان دا هاتوە و دەڵێت: (هەر كەس لە دێو بترسێ دێوی بۆ دەردەپەڕێ)، (هەروەها لە پەندێكی كوردیش دا هاتوە و دەڵێ: ئەوی بترسێ ناخەلسێ - ودرگێڕ) ... شاراوە نیە چ حیكمەتێكی دروونی گەورە لە نێو ئەو پەندە دا هەیە... ئێمە دەتوانین ڕاستی ئەم پەندە لەو كەسە ترسنۆكانە دا بدۆزینەوە كە لە كۆڵانەكانە تاریك و كەلاوە كۆنەكاندا دێو و جنۆكەیان لێ پەیدا ددبێت و ئەمانیش دەقیژێنن و لاقیان بە هەوا دا ڕدها دەكەن بۆ ڕاكردن.

لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ترس سروشتێ پەیوەست بە مرۆڤە، لە دنیا دا مرۆڤێ نیە کە نەترسێ... خەڵکی تەنها لە ڕادە و پلەی ئەو ترسە دا جیاوازن کە لەکاتی مەترسیدا دایان دەگرێ... مرۆڤ هەر چەندە جەربەزە و ئازا بێت، هەر دەبێت هەست بەترس بکات، بەڵام حەز ناکات ترسەکە پێیەوە دەربکەوێ... بۆیە هەر کە دەنوێ، ترسە سەرکوتکراوەکە بۆی دێتە دەرێ لەخەونی دا و، بەتەواوی ناڕەحەتی دەکات و خەودگەی لێ تێك دەدات.

**یاساکەی (کویە):**

مامۆستا (کویە) لێکۆڵیاری بەناوبانگی فەڕەنسی، لە قوڵاییەکانی دەروونی مرۆڤەوە یاسایەکی دۆزیەوە، ئەم یاسایە یاریدەی ئێمە دەدات لە تێگەیشتنی ئەم بابەتەی ئێستە پێی دەدوێین.

(کویە) دەڵێت: (ئەگەر بیرۆکەیەك زاڵ بوو بەسەر مرۆڤ دا، بەجۆرێ چوە نێو ناوەزی ناودکی مرۆڤەکەوە، ئەوا هەر چی هەوڵێکی وشیاری ئەو مرۆڤە هەیە کە دەیخاتە کار بۆ قەڵاچۆکردنی ئەو بیرۆکەیە، بەرەنجامی پێچەوانەیان دەبێت) [١٣]... بۆ شیکردنەوەی ئەم یاسایە دەکرێ نمونەی ئەو پاسکیل سوارە بهێنینەوە، کە تازەگی فێری پاسکیل لێخوڕین دەبێ، ئەم تازە پاسکیل سوارە هەر کە لە ڕێگەی دا شوشە شکاوێك دەبینێ، ئیتر هەر ئەوەندە بە خۆی دەزانێ کە خۆیشی و پاسکیلەکەیشی ڕوەو شوشە شکاوەکە پەلکێش دەبن.. هەر چەند دەیەوێت خۆی لە شوشەکە لابدات، زیاتر بەرەو ڕووی دەڕوات، دواتر دەبینێ چەرخەی پاسکیلەکە دەڕوات بەسەر شوشەشکاوەکەدا، بەدیار چاوی ئەمەوە... زۆریش سەرسام دەبێ کە چۆن دەستەکانی توانیان پاسکیلەکە بەرەو ئەو شوشە نەفرەتیە لێ بخوڕن، کە ئەگەر لە کاتێکدا خۆی بیەوێت ناتوانێ بەئەندازەی تاڵەمویەك پاسکیلەکە ئاراستە بکات.

شیکردنەوەی ئەم ڕووداوەش ئاوەهایە: پاسکیل سوارە تازە دەست پێکردوە کە کاتێ شوشە شکاوەکە لەسەرە ڕێگەی دا دەبینێ، دەترسێ لەوەی چوپی چەرخەی پاسکیلەکەی بتەقێنێ، ئەم ترسەش دەچێتە نێو ئاوەزی ناوەکیەوەی و بەسەری دا زاڵ

دەبێت، ئیدی ڕەوو شوشەکە پاڵی پێوە دەنێت... ویست و خواستە ئاگاکەیشی، ئەو ویستەی دەیەوێت خۆی لە شووشەکە دەرباز بکات، زیانی پێ دەگەیەنێت، چونکە ڕادەی توند و تیژی ئەو بیرۆکەیە زیاد دەکات کە کۆنترۆڵی ئاوەزی ناوەکی پاسکیل سوارەکەیان کردوە... بۆیە تا زیاتر پێداگری بکات لەوەی خۆی لە شووشەکە لابدات، هێندە زیاتر بەرەو شوشەکە پاڵی پێوە دەنرێ.

کەسێکیش بەسەر لێواری دیوارێکی بڵنددا بڕوات هەمان شتی بەسەردا دێت.. زۆرترینی گومانەکان وایە کە دەکەوێتە خوارێ... هۆکەشی ئەوەیە کابرا سەیری زەوی دەکات لە ژێریەوە، و زۆر دەترسێ لەوەی بکەوێتە خوارەوە، بەڵام خۆی هان دەدات و وا نیشان دەدات گوایە بوێر و خاوەن توانای پاڵەوانێتە، بۆیە ترس لە کەوتن زیاتر تیای دا بەهێز دەبێت، هەر ئەوەش وای لێ دەکات بەڕاستی بکەوێتە خوارێ.

### گرفتی خواستی مرۆڤ:

لە راستی دا مرۆڤ ناتوانێ ئەو بیرۆکەیە قەڵاچۆ بکات کە دزە دەکاتە نێو ئاوەزی ناوەکیەوەی، بەڵکو هەر چەندە مرۆڤ هەوڵی قەڵاچۆکردنی بدات لە بەرانبەر دا ئەو بەهێز دەبێ.. لە زۆربەی کار و بارەکانی ژیانمان دا نمونەی راستی ئەو گرتەیە دەبینین.... هەندێ جار دەمانەوێت (ناو)ێکمان بیر بێتەوە، کەچی سەیر دەکەین لە بیرمان نەماوە، ئنجا تاکو زیاتر هەوڵ بدەین بیرمان بکەوێتەوە، زیاتر و زیاتر لەیادمان دەچێت، بەڵام ئەگەر وازمان لێ هێنا و بێئومێد بووین لەوەی بیرمان بکەوێتەوە، لەناکاو دێتەوە بیرمان.

یان وا دەبێت لەکۆڕێکی ماتەمینی دا، یەکێك لە ئێمە دیمەنێکی کۆمیدی ددبینێ، جا هەوڵ ددات پێکەنینەکەی بشارێتەوە، تاکو خەڵکی لێی تورە نەبن، بەڵام پێکەنین زۆری بۆ دێنێت و خەریکە دەداتە قاقا، بەڵام کتێك لە کۆڕی ماتەمینەکە هاتە ددرێ و ترسی نەما لە پێکەنین، پێکەنینەکەشی نامێنێت.

مرۆڤ هەندێ جار دەیەوێت بنوێت، وەلێ خەوی لێ دەزڕێت، بەردەوام تەپاوتل دەکات لەسەر نوێنەکەی وەك ئەوەی داوای ئەستەم بکات... ئەمە لەکاتێکدا لەناو ئۆتۆمبیل دا یاخود لەناو قاوەخانەدا، کاتێ نایەوێت بنوێت، بە ئاسانی ئەنوێت.

## دەروونی پیس:

ئەم دەرونی مرۆڤە سەیرە، زۆر جار دەبینین کە داوای یارمەتی لێ دەکەین دەبێتە دوژمنێکی سەرسەخت لێمان، بەمەش ئەو پەندەی بەسەر دا دەچەسپێ کە دەڵێت: "ویستمان یارمەتیدەر بێ، کەچی بوە فێرعەون".

ئێمە هەر کەترساین لە شتێك و ویستمان خۆمانی لێ دوور بخەینەوە، دەبینین ئەو ترسە دەبێتە پاڵنەرێ بەرەو ئەو شتەی کە گەردکمان بوو خۆمانی لێ لادەین. کەواتە ڕەوایە بۆمان بڵێین: هەر کات (ویست و خواستی وشیار) ترسی چەپاند و سەرکوتی کرد، ترسەکە دەبێتە ئارەزوو... بۆیەکا ویستی وشیار لەکاتی خەودا لاواز بوو، ترس و سڵەمینەوەکان وەکو ئارەزووی قەتیس ماو بەدەر دەکەون، پێدەچێت کە (فرۆید) پەیی بەم راستییە نەبردبێت ، چونکە گەر پەیی پێ بردایە، دەیتوانی بەشێوەیەکی جوانتر و ڕێك وپێك تر خەو پەرژێنی خەونە ئازار بەخشەکانی بکردایە، بێئەوەی پەنا بەرێتە بەر زۆر لەخۆکردن و شیکردنەوەی دروستکراو.

## خەونە شەرمەزارکارەکان:

هەندێ جار مرۆڤ خەونی شەرمەزار کار دەبینێ، وەك چۆن خەونی تۆقێنەر دەبینێ... شەوی وا هەس، لەخەونی دا دەبینێ لە بەردەمی خەڵکێ زۆر دا لەسەر شەقامێ دانیشتوە و پیسایی دەکات، یان لە نێو قەرەباڵغییەکی زۆردا، دانیشتوە و "عەورەت"ی دیارە، ئنجا بەشەرمەزاریەوە لە خەو ڕادەپەڕێت.

دەگونجێت ڕاڤەی ئەو خەونانە بەوە بکەین کە ئەو کەسەی خەونەکەی دیوە، لە ڕۆژگارەکانی رابردووی دا توشی ڕیسواییەك بوە کە شەرمەزاری کردوە، لەکاتی بێداریشی دا جار لە دوای جار بیری دەکەوێتەوە، بەردەوام هەوڵیش دەدا لەبیری خۆی

بەرێتەوە، بەڵام بێسوودە، هەر چەندە ئەو بیەوێت لەبیری خۆی بەرێتەوە، ڕوداوەكە پتر بەهێز دەبێت تیای دا.

ڕەنگە ئەم ڕیسواییە لە خەونی دا بەشێوەیەكی جەفەنگ ئاسا دەربكەوێت، چونكە چاودێرە ڕەوشتیەكەی ڕێگرە لەوەی ریسواییەكە چۆن بووە بەهەمان شێوە دووبارەی بكاتەوە، لەبەرئەوە بەشێوەیەكی سەرەتایی دێنێتەوە یاد، لەوكاتەش دا وەك منداڵی لێ دێ، شەرم ناكا لەوەی لەسەر شەقام دا پیسایی بكات یاخود لەبەر چاوی خەڵكی دا عەورەتی دەربخات...

## پەراوێزەکانی بەشی دەیەم:

١- بنوارە: Eyessenek, sense, and nonasence Psychology, P 144

٢- بنوارە: Hadfield, Dreams and Nightmares, P 32

٣- بنوارە: Elexander, fundamentals of Psychoanalysis, p 150

٤- بنوارە: Hadfield, Op.cit. P32 - 33

٥- بنوارە: Ibid, P.30

٦- بنوارِة: سينل، الحاسه السادسه، ل ٧١ ـ ٧٢.

٧- بنوارە: هـ.س، ل ٧٢.

٨- بنوارە: Hadfield, op.cit. p 88

٩- بنوارە: سلامة موسي، عقلي و عقلك، ل ٥٩.

١٠- بنوارە: Woodworth, study of Mental Life

١١- بنوارە: Humphrey, story of Mind, p 269

١٢- بنوارە: علي الوردي، شخصية الفرد العراقي، ل ٢٤.

١٣- بنوارە: Baudsuin, suggostion and Autosuuggestion, p 116.

# بەشی یانزدەیەم:
# خەواندنی كۆمەڵایەتی

**ئەزموونێكی دەروونی:**

لەساڵی (١٩٤٨)دا، ئـەزمونێكی زانسـتیم لەخەوانـدنی موگناتیسـی دا بـینی كـە دەلالـەتێكی دەروونـی گـەورەی هەیـە... ئـەم ئەزمونـە لـە زانكـۆی تەكساسـی ئـەمریكی بەڕێوەبرا، هەزاران قوتابی و چەندان تەماشاكار ئامادەی بوون، وەك لە یادیشم بێت، ئەو كەسەی بەو ئەزموونە هەستا خەوێنەرێكی بەناوبانگ بوو بەناوی (بۆلكا).

پوختەی ئەزمونەكەش ئاوەها بوو: خەوێنەرەكە، لەنێوان قوتابیەكانـدا قوتابیـەكی هەڵبژارد كە ئامادەباشیەكی گـەورەی هـەبوو بۆ خـەواندن... ئـەو خوێنـدكاردی هێنایـە سەر تەختـەی شانۆ و لەبـەردەم ئامادەبوانـدا خـەوانـدی، ئنجا وای ئامـاژدی پـێدا كەلـە دوای لەخەو هەستانی، وتارێك بدات لەبارەی (دیدەوانی)یەوە، بەڵام ڕاستە و خۆ دەست ناكات بە وتارەكە، دوای ئەوە نەبێ كە خەوێنەرەكە پەنجە دەدات لە سەریەوە.

دوای ئـەوەی لەخەوەكـەی هەسـتا، ئێمـە وامـان هەسـت كـرد كـە ئیحائەكـەی لـەبیر چۆتەوە، بـەڵام هـەر ئەوەنـدەی خەوێنەرەكـە دەسـتێكی دا لەسـەریەوە، دەسـت بـەجێ ئەدگارەكانی ڕوخساری گۆڕا و وادەركەوت كە خۆی ئامادە دەكات بۆ وتاردان... ئنجا ڕوی كردە جەماوەرەكە و دەستی كردە دەربڕینی ڕستەگەلێلەستایش كردنی بزاڤی دیـدەوانی و بانگەشەكردن بۆی... هەرچەنـدە خەوێنـەرەكە هەوڵی دەدا بێدەنگی بكات، قوتابیەكـە زیاتر پێداگری دەكرد لە زیاتر وتاردان.

ئامـادەبوان دەسـتیان بـە پێكـەنین و غەڵبەغـەڵب كـرد، هـاواری بێـدەنگ بونیـان لـێ دەكرد، ئەو گوێی نەدا بەهات و هاواریان، وەك ئەوەی بەهاندەرێكی نەستی بەهێز پاڵی پێوە بنرێ، بەردەوام بوو لەسەر وتاردان.... بەراستی ئەو لە جیهانێك دابوو جیاواز لـەو جیهانەی ئێمەی تێدا بـوین... ئۆقرەیشی نـەگرت تـاكو ئـەو ئەركـەی بـەجێگەیانـد كـە لەساتی خەواندنەكەی دا پێی سپێردرابوو.. ئەم دیاردەیەی من دیتم، لە دەروونناسی دا

بە (ئاماژەی پێدانی دوای خەواندن) ناوزەد دەکرێ... فرۆید ئاگای لەم دیاردەیە هەبووە، هەر ئەمەش پاڵی پێوە نا بۆ دۆزینەوەی ئاوەزی ناوەکی لە مرۆڤدا... دەڵێن ڕۆژێك کابرایەکی بینیوە کە خراوەتە ژێر کاریگەری خەواندنی موگناتیسی و دواتر ئاماژەی پێ دراوە کە لەدوای ئەوەی لە خەوە موگناتیسییەکەی وە ئاگا دێتەوە، هەر کە گوێی لە (کۆکە)ی ئەو کەسەوە بێت کە خەواندویەتی، دەست بەجێ پەنجەرەکە دەکاتەوە...

ئەو کابرای خەوێنرابوو، وە ئاگا هاتەوە و هیچ ئاگاداری ئەو ئاماژەیەش نەبووە کە لەکاتی خەواندنەکەی دا پێی دراوە، بەڵام هەر ئەوەندەی گوێی لە (قۆزەی خەوێنەرەکە) بوو دەست بەجێ پەنجەرەکەی کردەوە، بێئەوەی خۆیشی بزانێت بۆچی ئەو کارەی کرد.(٢)

لەڕاستی دا، کاریگەری ئاماژە پێدانی خەواندن، تەنها لەساتە ڕاستەوخۆکانی دوای هەستان لەخەوە موگناتیسییەکە کورت هەڵناهێرێ... بەڵکو ئەو کاریگەریە بۆ ماوەیەکی درێژتر دەمێنێتەوە ، کە لەوانەیە بگاتە چەندین مانگ و تەنانەت چەندین ساڵ.

گریمان کەسێکمان خەواند و، ئاماژەی ئەوەمان پێدا کەساڵێك دوای ئەوەی لەم خەواندنە هەڵدەسێتەوە، لەسەر شەقام و لەبەر چاوی مەردوم دا سەما بکات،لەپاش ئەوەی کاتژمێرە گەورەکەی شار دوانزەجار لێدەدات ... بۆیە کاتێك ساڵەکە تێدە پەڕێ و کاتژمێرەکە دوانزە جاران لێدەدات ،و وادەی سەما کردنەکە هاتە پێشەوە دەبینین ئەو هاوڕێیەمان هەست بە حەزێکی زۆر دەکات لەسەماکردن ،لە هەر جێیەکدا بێت.

هەر چەندە لەوانەیە ئەو هەست و ئارەزوەی لەبەر خەڵکی بشارێتەوە، بەڵام هەر چۆن بێت هەست دەکات حەزی لەسەماکردنە، ناش حەوێتەوە تاکو بەهەر شێوەیەك بێ ئەو ئارەزوەی بەدی دێنێت... ڕەنگە هەر هەڵێك بقۆزێتەوە تاکو بەر بەرەڵا بکات بۆ شان و ملی، یان بۆ ورگ و کەمەری، تا بە ئارەزوو بلەرزێن و سەما بکەن... ئنجا دوای ئەوەش هیچ دودڵ نیە لەوەی بەڵگە و پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەو سەما و جوڵەیە پوچ و بێتامەی.

**مەغزای ئەم دیاردەیە :**

لەراستی دا زۆر سەیرە،کاتێك مرۆڤێکی ژیری بەئاگا دەبینین، ڕولەکردنی کارێك دەکات بەجۆرێکی خۆنەویست و بێئەوەی هۆکەیشی بزانین... لێرەدا (فرۆید) دێت و دەڵێت مەسەلەکە هیچ سەیر نیە.. بەڕای (فرۆید) زۆربەی کارەکانمان بەو جۆرە بەڕێوە دەچێت، بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین بیشارینەوە یاخود پاساوی ماقوڵی بۆ بدۆزینەوە، بۆیە لای خەڵکیش وا دەردەکەون کە کاری ژیرەکان بن، ئەمە لە کاتێك دا ئەو کارانە لە کاری شێتەکانەوە نزیك ترن.

ئێمە هەندێ جار،کەسێك بۆیەکەمجار دەبینین و هەست دەکەین زۆر ڕقمان لێیەتی، حەز ئەکەین بچین یەخەی بگرین و تێری بکەین لە شەق و شەپازلە (دەربڕینی وەرگێڕ)، ئەمە لەکاتێکدا پێشتر نەمان ناسیوە، هیچ دوژمنایەتیەکی پێشوەختیشمان لەگەڵی دا نەبوە، دەی کەواتە بۆچی ڕقمان لێیەتی؟!

(فرۆید) لای وایە بۆیە ڕقمان لێیەتی چونکە ئەو کەسە کەسێکی تری بەیادماندا هێناوەتەوە کەئێمە ڕقمان لێیەتی ئەم یاد خستنەوەیەش نەستیە و لە ئاوەزی ناوەکیەوە هەڵدەقوڵێت و هیچ پێوەندیەکی نیە بە بیرکردنەوەی لۆژیکی یاخود بە خۆشەویستی هەقەوە... وەك هەندێ جار وا پڕوپاگەندە دەکەین. دەتوانین ڕقە کۆنە شاردراوەکانی نێو ئاوەزی ناوەکی بە ئاماژەدانی دوای خەواندن بچوێنین، گەر کەسێك ئازارت بدات و نەتوانیت تۆڵەی لێ بکەیتەوە، ئارەزوی تۆڵەکردنەوە لە قوڵایی دەرونت دا قەتیس دەبێت، بۆیە هەر ئەوەندەی کەسێکت بینی لە هەر ڕویەکەوە لەو کەسە بچێت کە ئازاری داویت، ئەوا بێ ئەوەی بەخۆت بزانیت ئارەزوووی تۆڵەکردنەوەت پێوە دەردەکەوێت.

خەڵکی جۆراوجۆرن و جیاجیان لە ڕادەی بەدەنگەوە چوونی پاڵنەرە نەستیەکانیان دا، هەندێکیان بێشەرمانە بەدوی دا دەچن، بەڵام هەندێکیتریان تاکو قایل مەندی خەڵکی وەرنەگرێت بەدوی پاڵنەرە نەستەیەکەی دا ناچێت.

هەروەها خەڵكی لەشێوازی كاركردنیش دا جیاوازن، هەندێكیان پەنا ددبەنە بەر دەست، تاكو زللەی پێ بوەشێنێت یاخود قاچ تاكو شەقی پێ بوەشێنێت. ئەمانەش خەڵكی هیچ و پوچن... بەڵام روناكبیرەكان پەنا دەبەنە بەر بەلگە (ئەقڵی و نەقڵی‌یەكان) و لەوێوە هێرش دەكەنە سەر ئەوانەی ڕقیان لێیانە، و لەوانەشە زیاتر مەترسی‌دار و لەسنور دەرچوو ناچیزەش بن،

لەوانەیە یاسای سزای لێدان بە دەست بدات ، یان خەڵكی ناڕەزایی لێ دەرببڕن، بەڵام لە لێدان بە بەلگە ئەقڵی و نەقڵی‌یەكان دا یاسا و ناڕەزایی كۆمەڵایەتی سوودی نیە. لەبەر ئەوەشە دەبینین ، رۆشنبیری ناچیزە دەست درێژی دەكاتە سەر خەڵكی، بێ‌ئەوەی كەسێك لە ڕێگەی دا بوەستێ... ئنجا دوای ئەوەش شەرمناكات گەر بڵێ لە كارەكانی‌دا بەگوێرەی داخوازی خودا و پێغەمبەرەكەی ، یاخود بەگوێرەی داخوازی بەرژەوەندی نەتەوە و نیشتمان بەڕێوە دەچێت.

### ئاوەز و ڕەفتار:

(فرۆید) دەڵێت: ئاوەزی مرۆ، وەك ئەو كێوە بەفرینانە وایە كە لە ئاوە جەمسەریەكانی زەویدا لەنگەریان گرتود، ئەو شاخەبەفرینانە (نۆ لەسەر دە)ی بەشەكانی لە ژێرئاو دا دەشارێنەوە، تەنها (یەك لەدە)ی بەچاو دەبینرێت و دەردەكەوێت... ئەوەش یانی بەشە شاردراوەكانی ئاوەز كە بڕیار لە سەر ڕەفتاری مرۆڤ دەدەن.... بەشە دیاردكەیشی تەنها ڕوكارێكە مرۆڤ هەوڵ دەدات ڕەفتارە ڕیزپەڕەكەی خۆیی پێدابپۆشێ.

توێژەرانی ئەمڕۆ جیاوازیەكی بنچینەیی نابینن لە نێوان (ژیر و شێت) دا، ئێمەی هۆشمەند و ژیرانیش كە دەمدرێژی دەكەین بە گوتەی بریقەدارەوە، لەگەڵ شێتەكانی شێتخانەكاندا هیچ جیاوازیەكی جەوهەریمان نیە، بەڵكو بەتەنها لە پلە دا جیاوازین [٢]

هەموومان مل كەچ و گوێڕایەڵی ئەو هاندەرانە دەبین كە لە ئاوەزی ناوەكیمانەوە هەڵدەقوڵێن، ئەوەندە هەیە پاساویان دەدەین و دایان دەپۆشین، بەڵام شێت ئەو توانای

پاساودان و داپۆشینەی نیە، بەڵكو بەبێ پێچ و پەنا بەدوی هاندەرە نەستیەكانی دا دەچێت..[٤]

خەڵكیش پێی پێدەكەنن و بەردی بۆ دەهاوێژن... ئەگەر خەڵكی بیانزانیایە ئاوەزی ژیرەكانیش چی تێدا حەشار دراوە، بەوانیش پێ دەكەنین....

كەواتە هۆزانڤانە عارەوەكەش ڕاستی كردوە كە دەڵێت:

وكل الناس مجنون و لكن    علي قدر الهوي اختلف الجنون

یانی (هەموو خەڵكی شێتن، بەڵام بەڕادەی ئارەزووەكانیان لەشێتی‌یەكەیاندا جیاوازن).

**ئاوەز و كۆمەڵگە:**

جێگەی ئاماژەپێدانیشە كە بڵێین، ئەو سنوردەی لە نێوان ژیرێتی و شێتی دایە، كەوشەنێ ئیعتباریە و بەگۆڕانی بەها كۆمەڵایەتیەكان ئەویش دەگۆڕێت... لەوانەیە كەسێكی بەڕێزی لای ئێمە لە دیدی كەسانی‌تر دا بەشێت حساو بكرێ... ئەگەر یەكێ لەو خۆبەشێخ كردوە سمێڵ بادراوانەی لای خۆمان بچنە نێو كۆمەڵگەیەكی شارستانی و پێشكەوتووەوە، ئەوا خەڵكی دەیخەنە بەر خۆیانەوە و دەیبەن بۆ شێتخانە و خۆیانی لێ رزگار دەكەن.

تایبەتمەندی (ژیر) ئەوەیە لە بەها كۆمەڵایەتیەكان تێ دەگات و دەزانێت چۆن خۆی لادەدات لەوەی پێكدا بدەن... یاخود بەدەربڕینێكی‌تر: شێتە بەڵام حەز ناكات شێتی‌یەكەی دەربخات[٥].

كۆنترۆڵی پاڵنەرە نەستیەكانی خۆی كردووە بەڵام هەركە هەلی دەستكەوت، وەكو شێت پەل دەهاوێ بۆ تێركردنی ئارەزووەكانی.

ڕۆژێكیان بەبازاڕی كوتاڵ فرۆشەكاندا گوزەرم دەكرد، شەڕێكی زۆر سەختم تێدا بینی، هەندێ لە كوتاڵ فرۆشەكان مقەستە ئاسنینەكانیان بەدەستەوە گرتبوو، دەیاندا

لە تەوقی سەری هاوڕێكانیان... لە ڕاستی دا شەڕێكی شێتانە بوو، هیچ بەربەستێكی ئەقڵی ئامادەگی نەبوو تیای دا، ئێمەكاتێك لەو جەنگە و هاوشێوەكانی دەكۆڵینەوە كە ئەمڕۆ لە بازاڕەكانماندا ڕوو لە زیاد بوونن، پێویستە لە سروشتی ئەو بەها كۆمەڵایەتیانەش بكۆڵینەوە كەلە كاتی جەنگ دا بەسەر ئاوەزی خەڵكیدا زاڵن... ئەو بەهایە ڕێزی پیاوێ ناگرێت ئارامگرێت و وەڵامی سووكایەتی بە سووكایەتیەكی هاوشێوە و خراپتر نەداتەوە، هەر لەبەر ئەوەش دەبینین، شەڕ بە وشەیەكی سادە یاخود بە جوڵەیەكی نائەنقەست دەست پێ دەكات، ئنجا هێدی هێدی سەخت دەبێت، تاكو دەگاتە ئەوەی هەندێ جار بەرەنجام و چارەنوسەكەی نەزانرێ "دەربڕینی وەرگێڕ".

كە شەڕەكەش تەواو دەبێ ،خەڵكی دەست دەكەنە باسكردنی شەڕەكە و قارەمانەكانی، یەكێك بە ترسنۆك و (بێغیرەت) دەدەنە قەڵەم و كەسێكیتریش بە (شێر) و ئازا ناو دەبەن، جا كەسی یەكەم بێئەرزش و دووەم بە ڕێز سەیر دەكەن... بەو جۆرە خەڵكی هان دەدەن تاكو لە هەر شەڕێك داكە دەیكات ببێتە شێرێكی دڕندە.... كابراش بێئەوەی هەست بكات، دەبینێ بەشێوەیەكی نەستی بەرەو ئەو ڕێگەیە پاڵ دەنرێ...

**هەندێ لە ڕووەكانی ململانێی دەروونی:**

مرۆڤ هەست بە دڵخۆشی و شادومانی ددكات، كاتێ ئارەزوە خەفەكراوەكانی و بەها كۆمەڵایەتیەكان پێكەوە دەگونجێنێ... ئەگەر ڕقی لە یەكێك بێت و پاشتر ببینێ بەها كۆمەڵایەتیەكانیش پشتگیری دەكەن لە ئازاردانی ئەو كەسە دا، ئیدی بە دڵنیاییەوە ڕوو لە ئازاردانی ئەو كەسە دەكات، وەك ئەوەی كارێكی خێرخوازی بكات.

ئەمەیە هۆكاری ئەو ستەم و زوڵمە ترسناكانەی لەنێو خەڵكی دا دەی بینن، چونكە كاتێك، ستەم دەكەن ،نەویژدان دەیان گێڕیتەوە و نەترسان لە خودا.

ویژدان لەمرۆڤ دا بێدار نابێتەوە، لەكاتێك دانەبێ كە ئارەزوەكانی كەسەكە و بەها كۆمەڵایەتیەكان پێچەوانەی یەكتر ددبن، لەو كاتەدا ئیدی مرۆڤ تاڵاوی پەشیمانی

دەچێژێ، ئەمە ڕویەكە لە ڕووەكانی ململانێی دەروونی. ڕویەكی دیكەی ململانێی دەرونی لەو كاتەدا دەبێ كە خودی بەها كۆمەڵایەتیەكان پێچەوانەی یەكدی دەبن.

تێبینی دەكرێ ،بەها كۆمەڵایەتیەكان لەیەك كۆمەڵگەدا هەموویان بەیەك شێواز نین، جاری وا هەیە مرۆڤ لە ماڵەوە جۆرە بەهایەك دەبینێ، كەچی لەبازاڕ یان قاوەخانە یان قوتابخانە و هتد...، جۆرەبەهایەكیتر دەبینێ، لەو كاتەدا دەكەوێتە ژێر كاریگەری چەندین جۆر ئیحائی جیاوازەوە، لەوانەشە (ئاوەزی ناوەكی) ئەو كەسە جمە بكات لە ئارەزووی جۆراوجۆر، نەزانێت كام لایەنەیان بگرێ.

بۆ نمونە ئەو پیاوە وەربگرە كەلەماڵەوە بەلوت بەرزیەوە دێتە دەرێ، تۆ وادەزانیت یەكێكە لەو كەسە خاوەن ئەقڵانەی، كە لەدوای بیركردنەوەیەكی هاوسەنگ ولۆژیكی ساغ نەبێ هیچ كارێ ناكەن.. تۆ نازانیت ئەو كەوتۆتە ژێر ركێفی ئەو ئامۆژدانە نەستیەی كە لەماڵەوە دایكی یاخود ژنەكەی یا خود یەكێك لە ئەندامانی خێزانەكەی سەپاندوویانە بەسەری دا... كەواتە ئەو بەرەو ئەو ئامانجە دەچێت كە لە ماڵەوە بۆی دانراوە، لە دنیاشدا جگە لەو ئامانجە هیچیتر ناناسێت.

لەو كاتەدا دووچاری ململانێی دەروونی دەبێت، كۆمەڵگەی دەرەكی داوای شتێكی لێ دەكەن و، كۆمەڵگەی ماڵەكیش داوای شتێكیتری لێ دەكەن، زۆر جار لە ئەنجامی ئەم ململانێیەوە دەكەوێتە نێو جوداكاری كۆمیدیەوە، ڕەنگە بە ڕوانگەیەكی جیاواز لە ڕوانگەی خەڵكیتر سەرنجی مەسەلەكان بدات، هەوڵیش دەدات ئەو دوو ڕوانگەیە پێكەوە بگونجێنێ ـ ئنجا جارێ سەركەوتو دەبێت و جارێكیتر شكست دێنێ، لە هەوڵەكەی دا.

### دەیەوێت ببێتە وەزیر:

باوای دابنێین ، كابرایەك ژنێكی هێناوە كە لەخۆی بەرزترە لە پلە وپایەدا، هەمیشە ئەم ژنە بەسوك سەیری دەكات و بچوكی دەكاتەوە و پێی دەڵێ: (ئەم گەمژەییە چیە لەتۆدا؟ ئایا فلان یان فیسار نابینی بووتە وەزیر، تۆش هەر لە سەر وەزیفە هیچ و پوچەكەت ماویتەوە).

ئەم ژنە، شەو و ڕۆژ ئەو قسەیە بۆ مێردەکەی دووپات دەکاتەوە... کابراش لە وەڵامیدا دەڵێت: (دواتردە زانیت من کێم، کەمێك ئارام بگرە!) کە لەماڵیش دەردەچێت مێشکی پڕ بوە لەو ئیحائە بۆگەنە... بۆیە دەبینی لە دنیا دا هیچ نازانێ جگە لە هەڵپەکردن بۆ پۆستی وەزاری، بۆیە هەمیشە خۆی لەم گەورە دەستەڵاتدار و ئەو گەورە دەستەڵاتدار نزیك دەکاتەوە، ئامادەشە هەموو دنیا هەڵگێڕێتەوە بەسەر خەڵك دا، لەپێناوی بەدەست هێنانی ئەوەی دڵی دەیخوازێ، یان ئەوەی ژنە بەڕێزەکەی بۆی هان دەدا.

بەو جۆرە ،بیرکردنەوەی ئەو پیاوە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك دا گەمارۆ دەدرێ، لە هەموو کردار و گوفتاری دا تەنها یەك ئامانجی هەیە، ئەویش ئەوەی ژنەکەی وا لێبکات پێی قایل بێ، گرفتی ژنەکەیشی لەوە دایە کە ئەگەر نەبێتە وەزیر پێی ڕازی نابێ، چونکە ئەم دەیەوێت لەبەردەم هاوڕێکانیدا شانازی بکات بەمێردە مەزنەکەیەوە، دەخوازێت مێردەکەی فەرمانکار و قەدەغەکار بێ، بەئارەزووی خۆی و ئارەزووی ژنەکەیشی لەپێشیەوە ،خەلکی لەکار بخات و پۆست بەهەندێ خەلکیتر بدات!!.

**هەندێ نمونەیتر:**

تکا دەکەم لە خوێنەر بەو کابرایە پێنەکەنێت، چونکە گەر خوێنەر دەروونی خۆی شی بکاتەوە، دەبینێ زۆر جیاواز نیە لەو پیاوە، لەوانەیە حەزی لەوە نەبێت ببێتە وەزیر، بەڵام هەر چۆن بێ لە تەماح خالی نیە، لەوانەیە لەبری ئەوە حەز بکات ببێتە پۆلیس، پۆلیس لای هەندێ خەڵك پلەیەکی بەرزی هەیە.

هەندێ جار مرۆڤ لە گوندێ بچکەلەدا پێدەگات، لەو گوندە دا خەلکی بەو چاوەوە سەیری پۆلیس دەکەن، کەئێمە سەیری وەزیری پێ دەکەین، لەوێ پۆلیس فەرمانکارە و قەدەغەکارە، سزادەر ولێبوردەیە، بێئەوەی چاودێری بەسەرەوە بێ... کەسێ لەگوندێکی ئاوها دا پێگەشتبێ، باوکی یان دایکی یان هەندێ لە ئەندامانی هۆزەکەی، لەوانەیە داوای لێ بکەن هەوڵی پلە و پایەی بەرز بدات... جا هەر کەس داوای بەرزێتی بکات ئەبێ شەونخونی بچێژێ!

هەر تەماحێکی مرۆیی پێویستە لە پشتی ئیحایەکی نەستیەوە خۆی بشارێتەوە، ئەم ئیحایەش بەسروشت کۆمەڵایەتیە... مرۆڤ حەز دەکات لە دیدی کەسێکدا یاخود کۆمەڵە خەڵکێکدا بەرز بێت، چونکە بەرزێتی هیچ سودی نیە ئەگەر کەسانێك بۆی نەڕوانن و پێی سەرسام نەبن.

## جادوی وشە ڕەفتەنیەکان:

لەوانەیە وشەیەکی ڕەفتەنی کەسێك بیکات و لە ئاوەزی مرۆڤ دا ببێتە ئاماژەیەکی بەهێز، دەبینی مرۆڤ ئەو وشەیە هەڵدەگرێ و کاری پێ دەکات، هەموو ژیانیشی دەبێتە زنجیرەیەك هەوڵ دان بۆ بەدی هێنانی ئەو مەبەستەی لەو وشە ڕەفتەنیە دا هاتوە.

پیاوێك بەلای قەسابێکدا تێدەپەڕێت و دەبیستێ سەرزەنشتی هەندێ ئەو کەسانە دەکات کە گۆشتی لێ دەکرن، ئەو کەسانەی گۆشتی کەم دەکرن بۆ ماڵەوەیان، ئەمەش لە دیدی قەسابەکەدا چروکیە و خوداش و پیاوەتیش پێی رازی نین.... ئەم قسەیەی کابرای قەساب کاری کردە سەر ئەقڵی ئەم پیاوە... بۆیە هەر جارێ گۆشتی دەکڕی خووی گرتبوو بە کڕینی گۆشتی زۆرەوە.

بەمەش فشاری خستبوە سەرخۆی، چونکە خێزانەکەی پێویستیان بەو ڕێژە زۆرەی گۆشت نیە، بەڵام دەیەوێت لای خەڵکی بەدەست گوشاد و سەخی بناسرێ، ئیتر گوێ نادا بەوەی، ڕۆزیە کەمەکەی، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەو پێناوەدا بەهەدەر بدات.

یەکێکی دیکە لەوبەسەرهاتانەی لەبیرم ناچنەوە، چیرۆکی بێوەژنێکی بەساڵاچوو بوو کە لە گەڕەکە کۆنەکەماندا دەژیا، ڕۆژێ یەکێك لە دراوسێکانی جنێوی بەم بێوەژنە پیرە دابوو، بەوەش تۆمەتباری کردبوو کە ماڵی ئەو بێوەژنە نازانن چێشت لێنان چیە و، مەنجەڵی تێدا نەخراوەتە سەر ئاهر.

ئەم تەشەرە خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی بێوەژنەکەدا، بۆیە زۆرینەی وتووێژەکانی بوە باسکردنی چێشت لێنان، ئەو دەیەویست بۆ خەڵکی بسەلمێنێت کە ئەویش وەك خەڵکی چێشت لێ دەنێت و ئەوەی ژنەدراوسێ دەست درێژی کارەکە گوتی درۆی درۆ بوو... من خۆم هەموو بەیانیەك دەمبینی زەمبیلەیەکی بەدەستەوە بوو

دەچوە بازاڕ، جا کە دەگەڕایەوە دەستی دەکردە باسکردنی گرانی نرخی گۆشت و سەوزە بۆ دراوسێکانی. زۆر جار قسەکانی خۆی دەبڕی و بەپەلە ڕوی دەکردە ماڵەوە و وای نیشان دەدا کە دەیەوێ چێشت ساز بکات... ماوەیەکی درێژ ئەم بێوەژنە بەو شێوەیە بوو، تاکو وای لێهات لە دنیادا هیچ مەبەستێکی نەبوو جگەلە بەدرۆخستنەوەی تەشەری دراوسێکەی.

**لەنهێنی‌یەکانی سروشتی مرۆڤ:**

چیرۆکی ئەم پیرەژنە نهێنی‌یەکی گەورەمان بۆ دەردەخات، لە نهێنی‌یەکانی سروشتی مرۆڤ... تۆ کە مرۆڤێکت بە لەکە و تۆمەتێکی ناشیرین تۆمەتبار کرد، دەبینی بە توڕەیی دەخرۆشێت و هەوڵ دەدات لە هەموو ڕێگەیەکەوە خۆی پاك و بێبەری بکات لەو تۆمەتە، تەنانەت ڕەنگە بەو هۆیەوە سەراپای ژیانی بگۆڕێت...

لەوانەیە پیاوێ هاوڕێیەکی لە جڤاتێك دا و لەبەردەمی خەڵکی دا پێی گوتبێ تۆ ترسنۆکیت... دەبینی ئەو کابرایە هەموو شتێ لە دنیا دا لەبیر دەکات ، جگە لەوەی پێچەوانەی ئەو قسەیە بسەلمێنێ، هەموو هەوڵێکیش دەقۆزێتەوە تاکو ڕادەی ئازایەتی و دلێر و بەهێزی شان و باهۆی خۆی تیادا دەربخات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناتوانین نکۆڵی لە جیاوازی خەڵکی بکەین لەم ڕووەوە، هەندێ کەس هەیە کەمتر لەکەسانی تر دەکەوێتە ژێر کاریگەری وشە ڕەفتەنیەکانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وشە ڕەفتەنیەکان بەسووك نازانێ و بەهەر جۆرێ لەجۆرەکان لەیادەوەری دا دەمێنێ ... دەگونجێت بڵێین هەر چەندە مرۆڤ کاملتر و پێگەیشتووتر بێت و داناتر بێت، کەمتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئاماژەدانی کۆمەڵایەتییەوە... خوداش هەرگیز مرۆڤێکی دروست نەکردوە پێگەیشتن و دانایی کامڵ بێ.

**خود و کەسانی‌دی:**

توێژینەوە کۆمەڵایەتیە تازەکان لایەنگری ئەم قسەیەن کە دەڵێ: خودی مرۆ لە بۆشایی دا هەڵنەواسراوە، بەڵکو پێوەندیە بە تینی هەیە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی

كەسانی دیكە دەربارەی هەیانە... تۆ هەست دەكەیت خەڵكی سەرنجت دەدەن، بۆیە بەو بەهایانە خۆت ڕوگەش دەكەیت كە خەڵكی تۆی پێ دەپێون، جا ئەگەر خەڵكی بەچاوی سەرسامی سەیریان كردیت، یاخود خۆت پێت وابوو بەو چاوە سەیرت دەكەن، لووتت بەرز دەكەیتەوە و، وادەزانی بوویتە مەزنە پیاوێكی بەڕێز...

خود و كەسانی دیكە، وەكو مامۆستا (كولی) دەڵێت: "دووڕووی یەك ڕاستین و پێكڤە لەدایك دەبن، كەواتە خودبوونی نابێ، بێ بوونی وێنەیەكی كەسانیتر كە سەرنجی خودەكە بدات"(٦)

كەواتە ئەو كەسە هەڵەی كردوە كە پێی وایە هەرگیز خود گرنگی بەكەسانیتر نادات... چونكە گرنگیدان بە كەسانیتر مەرجێكی پەیوەستە بۆ دەركەوتنی خود لەمرۆڤ دا.. وەلێ ئەم گرنگی پێدانە لە نێو نەست دا حەشار دەدرێت، ئیدی خاوەنەكەیشی بەهەڵە، واگومان دەبات كە بوونی نیە.

لەوانەیە كەسێك دەمدرێژی بكات و بڵێ تەنها لەبەر خودا هەقیقەتی خۆش دەوێ و هەق بەسەر خودی خۆیشی دا هەڵدەبژێرێت... ئەمەش درۆ و ڕوپامایییە لە زۆربەی كاتدا... هەر ئەو كەسە بەر لە هەموو شتێ خۆی خۆش دەوێ، وەلێ ئەو خودەی ئەم خۆشی دەوێت لە سەر بنەمای تێڕوانینی خەڵك بۆی دروست بوە... كاورای دەشتەكی ڕەنگە لەسەر یەك فلس بتكوژێ.. ئەمەش لەكاتێكدا فلسەكەی بەتۆپزی لێ بسەنی، چونكە لەو كاتەدا پێی وایە لە دیدی خەڵكی دا لاوازە... كەچی هەندێ جاریتر هەمان كابرای دەشتەكی هەموو ماڵ و سامانی خۆی لەپێناوت دا خەرج دەكات یاخود لەپێناوت دا خۆی بەكوشت دەدات... نهێنی ئەمەش لەوە دایە، كە كابراكە شانازیەك لەو پارە و پول سەرف كردن و خۆبەكوشت دانە دا بەدی دەكات و پێی وایە هۆزەكەی بەستایش و سەرسوڕمانەوە باسی دەكەن.

هەر مرۆڤێكیتریش بگری هەر وایە، هەندێ جار گوێبیستی گوفتار و پڕوپاگەندەكانی دەبیت و پێت وایە لە ڕەفتارەكانی دا لۆژیكیە، كەچی لەراستی دا كەوتۆتە ژێر كۆنترۆڵی ئەو ئامازەدانەی كە لەماڵەوە یاخود لە دیوان یان قاوەخانە و بازاڕ دا بەسەری دا سەپێنراوە...ئەو خەوتوە و تۆیكە بەبێداری دەژمێریت...تەنانەت

زۆر جیاواز نیە لەو کابرا داماوەی کە ئاماژەمان پێدا لەکاتی خەواندنەکەی دا تا لەکاتێکی دیاری کراو دا سەما بکات... ئنجا کاتێ ساتەوەختی دیاریکراوی سەماکەی هاتە پێشێ دەستی کردە لەرزاندنی شان و کەمەری بێوەی شەرمێ بکات!!.

## بێهودەیی ئامۆژگاریە بالاکان:

لەدێرزەمانەوە واعیزەکان راهاتوون لەسەر رۆکردنی ئامۆژگاری گەلێ بەنرخ و بالا بەسەر گوێگرە بەرێزەکاندا... گوێگرەکانیش بەتامەزرۆییەوە گوێیان بۆ دەگرن، ڕەنگە لەدوای تەواوبونیشی بە واعیزەکە بێژن: (ئافەرین، خودا بە فەرت کات)... بەلام هەر کە لە جێگەی ئامۆژگاریەکە چونە دەرێ دەگەڕێنەوە سەر ئاینە کۆنەکەیان... و زۆر جاریش خودی واعیزەکەش لەگەلیاندا دەگەڕێتەوە سەر ئاینە کۆنەکە!!

هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە مرۆڤ لەڕەفتاری دا شوێن ئەو ئاماژانە دەکەوێت کە بەها کۆمەلایەتیەکان ئاراستەی دەکەن. بە دەربڕینێکی‌تر: کارێ دەکات کە خەلکی لێیان دەوێت... جا گەر واعیزەکان ئامۆژگاری و ئاراستەکاریەکانی پێغەمبەران و ئەولیاکانی بدەنێ، لەبەریان دەکات، لەوانەیە لەکاتی پێویست دا ئەو ئامۆژگاریانە بگوێزێتەوە بۆ کەسانی‌تر، بەلام هیچ سلێ ناکاتەوە لەوەی پێشێلی ئاراستەکاریەکان بکات، هەر کات هەستی کرد لە مل کەچ بونی دا بۆ ئەو ئاراستەکاریانە سوکایەتی تێدایە.

لەمێژە عارەو گوتویانە (ئاگر باشترە لە ناتەواوی و لەکە)، تا ئەمڕۆکەش زۆربەیان هەر وا دەلێن.

کابرایەك ئاشنامە، یەکێکە لەو کەسانەی زۆرترین ڕەخنە لە مارەیی زۆر و گران دەگرن ئەو وا دەبینێ مارەیی گران زیان لەکۆمەلگە دەدات وسیستەمی خێزان دەڕمێنێ... زۆربەی جار باسی شووکردنی (فاتیمەی کچی پێغەمبەر)ی دەکرد کە چۆن مارەییەکەی زۆر کەم بووە... وا دیارە ئەم قسانەی لەوتاربێژانی سەربلندگۆکانەوە بیستبوو، وەکو توتی دەیگوتەوە.

ئنجا سەرە هاتە سەر مارەکردنی کچەکەی خۆی، کەچی هەر ئەو کابرایە داوای مارەیی گرانی کرد، تەنانەت بەڕادەیەکی زۆر سەیر، سەرنجی وردەکاریەکانی

تەدارەكەكەی دەدا... ئەو ئیشەشی هیچ جێگەی لۆمە نیە... چونكە لەو كاتەدا لە ژێر كاریگەری ئەو ئاماژەدانە بەهێزە دابووە كە لەلایەن ژنە بەڕێزەكەیەوە لە ماڵەوە سەپێنرابوو بەسەری دا.

ژنەكەی گەرەكیەتی بەتەدارەك و شوكردنی كچەكەیەوە شانازی بكات لای هاوەڵ و هاودەمەكانی، كچەكەیشی بەڕۆڵی خۆی حەز ناكات لە هاوشانەكانی خۆی كەمتر بێت لەمەسەلەی مارەیی دا... برادەرەكەشمان ناتوانێ دەرباز بێ لەو چوارچێوە فیكریەی كە ژینگە تایبەتەكەی پێیەوە پابەندیان كردوە.

### پوختەی قسان:

لەوەی رابورد ئەوەمان دێتە چنگ، كە مرۆڤ لە ژیانی كۆمەڵایەتی دا وەك كەسێك وایە لە ژێر كاریگەری خەواندنی موگناتیسی دابێت... خەوێنەری سەرەكیش كۆمەڵگەیە، بە هەموو ئەو بەها و نەریت و ئاماژە هەمەڕەنگانەوە، كە تیای دان.

كەواتە پێغەمبەری خودا ڕاستی فەرموە كە دەڵێت:

(خەڵكی نوستون، كە مردن وە ئاگا دێنەوە).

## پەراوێزەکانی بەشی یانزدە:

١ـ ئـەم بەشـە و بەشـی دواتـر، لەدەسـت نوسـێکی نوسـەرەوە وەرگـیراوە بـە نـاوی (الشخصية البشرية).

٢ـ بنوارە: Life Magazine, Vol 22. No.6, p 69

٣ـ بنوارە: سلامة موسي، عقلي و عقلك، ل ١٣٤.

٤ـ بنوارە: Lewis, psychiatric Movement, p 167

٥ـ بنوارە: Young, Personality, P 765

٦ـ بنوارە: Dawsonand Getty, Sociology. P 85

# بەشی دوانزدەیەم:

# خەونە کیشۆتیەکان

## خۆش ویستنی خود:

لەبەشی پێشوودا، باسمان لەوە کرد کەمرۆڤ خۆیی خۆش دەوێت و دەخوازێت لەدیدی خەڵکی دا پلە و پایەی بەرز بێت... خوداوەند بەدەگمەن نەوێ مرۆڤێکی دروست نەکردوە کە خۆیی خۆش نەوێت و هەوڵی بەرز بونەوەی خۆی نەدا.

خەڵکی لە ئاقار سروشتی ئەم حەزی بەرز بونەوە کۆمەڵایەتیەدا جیاوازن. هەیانە دەخوازن لە ڕوی پاڵەوانێتی جەنگیەوە لە دیدی خەڵکی دا بەرز و گەورە بن... هەشیانە ئارەزووی ناوبانگی زانستی یان پلە وپایە یان ناوبانگی ماڵ و سامان و ... هتد دەکەن. هۆکاری ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ئەو بەها و پێوەرانەی کە ژینگە کۆمەڵایەتیەکان لە هزری تاك دا دەیچێنن... بەمەش گرێیەکی دەروونی لەو تاکەدا دروست دەبێت، ئیدی بەهەموو شێوەیەك هەوڵی بەدەست هێنانی ئەو بەهایانە دەدات.

ئەگەر ویستت کلیلی کەسێتی هەر کەسێ بدۆزیتەوە، ئەوا بگەڕێ بە دووی ئەو گرێیە دا کە بەسەر دەروونی دا زاڵە.. ئیدی کەم و زۆر سەرکەوتوو دەبێت لە مامەڵەکردن لەگەڵی دا یان لە ئاراستەکردن و قەناعەت پێکردنی دا.

## ئاژەڵی کۆمەڵایەتی:

لەبەردا مرۆڤ ناونرابوو (ئاژەڵی کۆمەڵایەتی) [1]

گومانیان وا بوو، ئەقڵ کردارە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ ئاراستە دەکات... کەچی بەم دواییانە ناراستێتی ئەم بۆچونە دەرکەوت.

راسترە گەر مرۆڤ ناو بنێین (ئاژەڵی کۆمەڵایەتی) لەبری (ئاژەڵی ژیر)... چونکە مرۆڤ تەنها بە چاویلکەی ئەقڵ سەرنجی مەسەلەکان نادات... بەڵکو بە چاویلکەی بەها

کۆمەڵایەتیەکان و گرێدەرونیەکانی نێو قوڵایی ئاوەزی ناوەکی لەئاقار ئەو بەهایانەدا، سەرنجی مەسەلەکان دەدەن.

رۆژێکیان تاقیکردنەوەی یەکێك لەو پۆلانەم کرد کەخۆم وانەی تێدا دەڵێمەوە... ئەم پرسیارەم ئاراستە کردن: (ئەگەر بەلگەیەکی بەهێزت بینی پێچەوانەی بۆچوونی خۆت بوو، ئایا قەناعەتی پێ دەکەیت یان نا؟ و بۆچی؟) وەڵامی زۆربەشیان ئەوەیە کە دەست بەجێ قەناعەت دەکەن بەبەلگەی بەهێزە بەرەنجامی تاقیکردنەوەکەش ئەوە بوو کە بەداخەوە هەموویان کەوتن.

گرفتی ئەوانیش وەك زۆربەی خەڵك، ئەوەیە کە وا دەزانن ئەگەر هەر بەلگەیەکی بەهێزیان بینی قەناعەتی پێ دەکەن، ئیتر لەبیریان چوە کە بەهێزی بەلگە شتێکی رێژەییە، ئەو بەلگەیەی کە دەگونجێت لەگەڵ بەها کۆمەڵایەتی و گرێ دەرونیەکانیان دا، لەدیدی ئەواندا بەهێز و ماقوڵە و دودڵیەکی تێدا نیە.وەلێ گەر بەپێچەوانەشەوە بوو ئەوا هیچ و پوچ و ناماقوڵە و تەنانەت ئەگەر (جوبرائیل)یش هێنابێتیە خوارەوە.

## دۆن کیشۆت:

بەسەرهاتەکەی دۆن کیشۆت بەناوبانگە... چیرۆکەکە لێهاتوویی و بلیمەتی نوسەری ئیسپانی (سرفانتس) دای هێناوە... ئنجا خەڵکی لە نێو یەکدا گواستیانەوە تاکو لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای دنیا دابوونی پەیدا کرد و وەرگێڕدرایە سەر زۆرینەی زمانەکان.

بەراستی ئەو بەسەرهاتە چیرۆکێکی بەکەڵکە و وێنەیەکی جوانی سروشتی مرۆڤمان دەداتێ. لە زیادەرۆیش بەدەر نیە... بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا وێنای وەهم و خەونەکانی نێو ناخمان دەکات... ڕەنگە هەر ئەمەش نهێنی بڵاوبونەوەی بێت لەنێو زۆربەی نەتەوەکان دا.

بە پێی رۆمانەکەی (سرفانتس)، دۆن کیشۆت بەر لە (٣٥٠) ساڵ لە ئیسپانیا دا ژیاوە، کۆمەڵگەی ئیسپانی لەو کاتەدا شەیدای ئەو سوارچاکە زرێپۆشانە بوون کە جەنگی دوژمن دەکەن و بەرەڤانی لە لاواز و ئافرەتەکان دەکەن... ئەو سوارچاکانە بونە جێی

سەرنج و پێشڕەوی ئەو کەسانەی دەیانویست ببنە خاوەنی پلە و پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی.

دۆن کیشۆت بەخت یاوەری بوو، کە ببێتە یەکێك لەو کەسانەی حەزیان لە سوارچاکی‌یە، لەبارەی سوارچاکانەوە دەیخوێندەوە و حەزی دەکرد یەکێك بێت لەوان... لەو ژیانە پەست و فەرامۆش کراوەی کە هەی‌بوو بێزار ببوو، بۆیە حەزی دەکرد بچێە سارا و شمشێرەکەی هەڵکێشێت و کارگەلێ مەزن جێبەجێ بکات، لەو کارانەی کە سوارچاکە شمشێر بەدەست زرێ پۆشەکان دەیکەن ،دۆنکیشۆت کەسێکی لاوازوو بێتوانابوو ، ئەسپێکی لاتۆکەیشی هەبوو ، ئینجا لەسوچێکی ماڵە کەیدا زرێیەکی کۆنی بێ فەڕی دۆزیەوە، وەلێ هەموو ئەمانە نەبونە ڕێگری لەوەی بە کاری پڕلە سەروەڕۆیی هەستێ.

دەستی برد زرێکەی چاك کردەوە، ئنجا سواری ئەسپەکەی بوو و دەپەڕیە دەرێ و داوای کرد لە خەڵکی بێن لە بەرانبەری دا بجەنگێن.. لێرەوە چیرۆکە مەزنەکەی دەست پێ دەکات، بەو جۆرە ئەو برادەرە هەژارەمان بوو بە یەکێك لە گەورەترین سوارچاکانی سەر ڕووی زەمین.

ژیانی گۆڕا و بوە خەونێکی قەشەنگی مەزن، هەرچی بویستایە بە خەیاڵ بۆ خۆی دروست دەکرد (دەربڕینی وەرگێڕ) چۆنی پێخۆشبوایە وەهای ڕاڤەی دیاردەکان دەکرد... ئەگەر شڤانێ فووی بەشمشاڵەکەی دا بکردایە تاکو پەزەکانی بانگ بکاتەوە... ئەو برادەرەمان وای دەزانی گەڕەنای سەربازێکە و لە قەڵایەکەوە بەخێرهاتنی ئەم دەکات... یان گەر مێگەلێکی بدیبا، وای دەزانی لەشکرێ زەبەلاحە و بەرەو ئەم ڕێ دەبڕن... بۆیە دودڵیش نەدەبوو لەوەی داباریێتە سەر ئەو لەشکرە و بە ڕاست و چەپدا قەتڵ و عامیان بکات.

جارێکیان وا ڕێکەوت (ئاشی هەوایی) بینیبوو، ئەم وای هەست کرد خێوە زەبەلاحەکانن (دەربڕینی وەرگێڕ) و داوای ڕووبەڕووبونەوەی لێدەکەن ، ئەوە بوو هێرشی کردە سەر یەکێکیان و دەستی کرد بە شەڕ لەگەڵی دا، تاکو لەسەر ئەسپەکەی بە خوێناو لێ کەوتە خوارێ.

بەو جۆرە (دۆن کیشۆت) خەریکی کارە پڕ لەسەرەڕۆییەکانی بوو، هەندێ جار سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا و هەندێ جاری دیکەش شکستی دەخوارد... هەر دەبێ وابێ ... سوارچاکی دەرهاتوو، شکستیشی لەبەرە، وەك چۆن سەرکەوتنی لەبەرە... وەك عەرەب دەڵێ (یوم لەو یوم علیە)... کوردیش دەڵێ: (سوار تا نەگلێ نابێ بەسوار ـ دەربڕینی وەرگێڕ).

بەهەر حاڵ ئەو شادومان بوو بەو توانا و هێز و پیاوتیەی خودا پێی دابوو، واشی گومان دەبرد کە ئازایەتی و کارە دلێرانەکانی وی بونەتە بنێشتە خۆشەی سەرزاری خەڵکی ... ئەمە لەکاتێکدا خەڵکی پێی پێ دەکەنین.

**دۆن کیشۆتی بەغدادی:**

ئیسپانیا تاکە وڵات نەبوو لە هەبوونی (دۆن کیشۆت) دا، بەڵکو هاوشێوەی ئەو لە زۆربەی وڵاتەکاندا هەبوو.

لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی دا لە (بەغداد) پیاوێك بە دەرکەوت کە زۆر ئاشکرایە و تا ئێستەش خەڵکی (بەغداد) باس و خواسەکانی دەگێڕنەوە.. ئەو پیاوە گرگنێکی ڕیوەڵە بوو... کەچی دەشی ویست یەکێك بێت لەو دز و جەردە بەهێز و بازوانەی کە کۆمەڵگەی عێراق ڕێزیان دەگرن.. ڕەنگە کت و مت ئەم پەندەی بەسەر دا بچەسپێت کە دەڵێت: (اضربونی میە و احسبونی من الحرامیە) واتە ( سەد دارم لێ بدەن و بەدز حسابم بکەن). ئەوپیاوە بەوە ناسرابوو کە دوو دەمانچەی گەورەی لەبەر پشتێنەکەی دا هەڵدەگرت، هەر کات قسەیشی بکردایە، وتەکانی خاڵی نەبوو لە باسی کوشتن و بڕین و دەست درێژی کردنە سەر خەڵك و تاڵان و بڕۆی ماڵان... ئەو کردەوانەشی بەجێگەی شانازی دەزانی... هەر جارێ ڕوداوێکی کوشتن یا خود دزیەکی گەورە ڕوی بدایە، ئەو کابرایە دەچوە بنکەی پۆلیس و لەخەڵکی دەپرسی: ئایا ناوی لە ڕیزی دز و پیاوکوژەکاندا هاتوە؟

یەکێك لەو کەسانەی جێگەی متمانەن، باسی ئەو پیاوەی بۆ کردم کە چەندە حەزی لەوە کردوە لە (قلعة) دا زیندانی بکرێ. بۆ ئەوەی کە هاتە دەرێ لە زیندان، خەڵکی

نازناوی (قلعلي ـ قەڵایی) پێ ببەخشن، وا دیارە ئەو نازناوە لەو ڕۆژگارەی بەغدا دا، هاوشانی نازناوی (سوارچاك) بووە لەڕۆژگارەکانی (دۆن کیشۆت)دا... ئەم برادەرە بەغدادیەشمان چەندین جار چوەتە دادگا و لەبەردەم دادوەردا دانیناوە بەوەدا کە لە فلان کێشەدا ئەو بکوژەکەیە یان دزەکەیە، بەڵام دادوەر تەنها یەك ڕۆژیش سزای زیندانیکردنی بەسەردا نەئەدا، بۆیە برادەرەکەشمان بەنائومێدی دەگەڕایەوە دواوە.

خەڵکی دەڵێن: "زیندان بۆ پیاوانە"، بۆیە ئەویش خوازیاری ئەوە بوو پیاوی بێ لەنێو پیاوان دا، بەڵام دادوەر هەموو جارێك سوور بوو لەسەر ئەوەی بە بێتاوان لە قەڵەمی بدات، هەروەك ئەوەی نەیەوێت برادەرەکەمان ئەو نازناوەی دەست بکەوێ.

بۆ بەدبەختیشی کەسێکی زۆر ترسنۆك و نەوێر بوو، بەڕادەیەك هەر هاوار و قیژ و هوڕێکی ببیستایە کە ئاماژەی بونی دز بوایە لەگەڕەکەکەیاندا، ئەم لە کونجی ژوورەوە خۆی حەشار دەدا، تاکو یان دزەکە ڕای دەکرد یاخود دەستگیر دەکرا، ئیدی ئەم هەر دوو دەمانچەکەی هەڵدەگرت و ئەهاتە ناو خەڵکەکە و هاواری دەکرد: کوا دزەکە؟ پێم بڵێن بەرەو کوێ ڕۆشت؟ ... هتد.

ئەو برادەرەشمان وەکو (دۆن کیشۆت) بەدرێژایی تەمەنی لەخەو بینین دادەژیا، وای بە خەیاڵ دا دەهات کە لەدیدی خەڵکی دا بەیەکێك لەو پاڵەوانانە دەژمێردرێت کە بە ئەنگوست ئاماژەیان بۆ دەگرێ، ئەوە لەکاتێکدا خەڵکی گاڵتەیان پێدەکرد، بێئەوەی بەخۆی بزانێ.

ئیستا لە (کازمیە) پیاوێك دەژی کە لەهەمان مۆدێلی (دۆن کیشۆتی بەغدادیە)، بەڵام ئەم ڕێگەیەکیتری گرتۆتە بەر بۆ دەست کەوتنی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی... ئەمیش کابرایەکی ناشیرین و زۆر ڕەشە... هەمیشە بەپێخاوسی بەبازاڕ دا دەگەڕێت و (کوتەك ) ێکی گرتوە بەدەستییەوە، زۆریش سەردانی بنکەی پۆلیس دەکات، خۆی بەدەمڕاستی لای میری دەزانێت... هەر ڕوداوێ لەو شارۆچکەیە ڕو بدات ئەم کابرایە لەگەڵ خەڵکەکەدا دەچێتە بنکەی پۆلیس، تا بزانێ مەسەلەکە چیە و چۆن چارەسەری بکرێ.

ئەو خۆی بەیەکێك لەپایەکانی وڵات دەزانێ، کە ئەگەر ئەو نەبێت کوشت و کوشتار و دوژمنایەتی لەنێو خەڵك دا زۆر دەبێت... زۆرجار بیرتیژی و لێزانی ئەم ، خەڵکی لەگیروگرفت و بەڵا و نارەحەتی رزگار دەکەن... گەورەترین گرێی ئەم کابرایە ئەوەیە کە خۆی بەیەکێك لە رێبەرانی (مەهدی ئاخرزەمان) دەزانێ ،هەر لەبەر ئەوەشە هەڕەشەی زۆر توند و تیژ دەکات لەناپاك و فاسق و ستەمکارەکان، بەوەی لەبەدەرکەوتنی مەهدی دا سزای سەختیان دەدات... لەو رۆژەدا کۆت وپێوەند دەکاتە دەستیان و بەرەو سێدارە و زیندانەکان ڕاپێچیان دەکات.

کاتێبە بازاڕ دا دەڕوات یان لە چاخانەیەکدا دادەنیشێت، وادەزانێ خەڵکی بەچاوی سەرسوڕمان و ڕێزەوە سەیری دەکەن... ئنجا دودڵیش نیە لەوەی (کوتەك) بەرز بکاتەوە و هەڕەشەی پێ بکات. لەهەر کەسێك کە پێی پێ دەکەنێت ، یان گومان دەکات لە گەورەیی ئێستا یان داهاتووی.

**ماهیەیەتی خەونە کیشۆتیەکان:**

ئەو حاڵەتەی کە لەهاوڕێ کازمیەکەمان و، برادەرە بەغدادیەکەی دا بینیمان دروستە بە جۆرێك لەخەون لەقەڵەمی بدەین... ئەم جۆرەی خەون، ئەز ناوم ناوە (خەونە کیشۆتیەکان)... تابە ناوی دۆن کیشۆتی ڕەحمەتیەوە بناسرێت.

ئەم خەونانە، بەوەدا لەخەونەکانی بێداری جیا دەبنەوە، کە ئەمی یەکەمیان کۆنترۆڵی هەموو ژیانی مرۆڤ دەکەن و، وا دەکەن ئەو مرۆڤە ئەو جیهانە بۆ خۆی دروست بکات کە حەز دەکات تیای دا بژی.. بەو جۆرە هەموو تەمەنی دەبێتە خەونێکی بەردەوامی بێبچڕان.

ڕەنگە ڕاستیش بێ ئەم خەونانە جۆرێك بن لەشێتی، بەڵام خاوەنەکەی لە تاکە ڕویەکەوە لەشێتەکانیتر جیاوازە.. ئەویش لەو ڕووەوە کە ئەم دەتوانێ رۆزی خۆی و ماڵ و منداڵی پەیدا بکات.. وەکو هەر ئاقڵێکیتر... زۆربەی جار لە کاروبارە خێزانی و بژێویەکانیدا ڕێڕەوی خەڵکانیتر دەگرێ... لەو ڕووەوە کەمێ نەبێ ئیتر (شزوز)ی تێدا نابینرێ... بەهەر حاڵ ئەو (شزوز)ەش زیانی کۆمەڵایەتی گەورەی لێناکەوێتەوە.

**هەمومان دۆن کیشۆتین:**

کاتێ چیرۆکی دۆن کیشۆت یان هاوشێوەیەکی دەخوێنینەوە، پڕ بەدەممان پێدەکەنین، وادەزانین خۆمان وا نین، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی بابەتی لەخۆمان بکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێ ئەو ڕایەمان هەڵە بووە.

چیرۆکەکەی (دۆن کیشۆت) هیچ نیە، جگە لەوێنەیەکی قەبەکراوی هەر مرۆڤێ، هەر یەکێ لەئێمە لەناخی خۆیدا وێنەیەکی ئەندێشەیی بۆ خۆی داناوە ، وێنە یەك گەورەتر لەوەی لە واقع دا هەیە، بەڵام لە ناخی دەروونی دا دەیشارێتەوە و حەز ناکات خەڵکی زانیاری زۆریان لەبارەیەوە هەبێ... ئەو وێنە ئەندێشەییەش بەگۆڕانی گرێی دەروونی نێوناخی هەر کەس دەگۆڕێت... گەنجێکی هەرزەکار وادەزانێت بەپێکەوتویی و جوانیەکەی بوەتە خواوەندی ژنان... مامۆستای زانکۆش وا دەزانێت لە زانست و زانیاری دا گەشتۆتە پلەیەك کە هیچ کەس شان نادات لە شانی... کابرای فەقیهیش خۆی وا دەبینێ کە لەدنیانەویستی و ئیجتهاد دا لەپێشی هەموانەوەیە، وەزیریش وا دەزانێ مەزنترین سیاسەتمەداری دونیایە لە لێزانین و دڵسۆزی دا، نوێنەری پەرلەمانیش خۆی بەنوێنەری گەل و کۆڵەکەی رای گشتی دەزانێ، نوسەریش وا دەزانێ خوێنەران دەتوێنەوە بۆی...هەر یەکێکیش بگری کە باسمان کردن ئەو وتانەیان لەبەر کردوە کە لە ستایش کردنی دا، گوتراون.. ئەگەر خەڵکی دواندیان و بەمەزنیان ناوزەد کرد، ئەوا دەڵێ ئەو خەڵکە بەڕێزن و دان بەهەق دا دەنێن و لەهەقیش دا لەلۆمەی لۆمەکاران ناترسن... بەڵام گەر بەرەخنەگرتنی تاڵ بەرەو ڕوی بونەوە، ئەوا پێیان دەڵێ ئەو خەڵکە ناچیزە و ڕژدن، نەفرەتی خوایان لێبێت.

هەر مرۆڤێ بێژنگێ دەرونی تایبەتی هەیە و دیاردەکانی دەوروبەری خۆی پێ لە بێژنگ دەدات، تەنها ئەو ڕوانەی لێ وەردەگرێت کە پێی چاکە و چێژی لێ وەردەگرێ... بەوەش لەخەونێکی بەتام و چێژدا دەژی و حەز ناکات هیچ کەسێکیش لەو خەونە وەئاگای بێنێتەوە.

**ئەوانەی گرێی ناتەواوییان هەیە :**

هەندێ خەڵکیتر بێژنگەکەیان پێچەوانەیە، تەنها ئەو دیاردانە وەردەگرن کە خراپە بۆیان و زیانیان لێ دەدات، ئەو جۆرە کەسانە نەخۆشن، کۆمەڵگە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەکەم سەیری کردون و ئازاری داون، بۆیە ڕاهاتون لەسەر ئەوەی جگە لەئازار و سوکایەتی هیچ لە کۆمەڵگەوە وەنەگرن... لەڕاستی دا ئەمانیش سەرسامن بەخۆیان و حەز دەکەن زانست و پلەوپایەیان هەبێ... بەڵام پێیان وایە بۆ غەیری سەردەمی گونجاوی خۆیان دروست کراون و خەڵکیش ڕێزی تەواوی خۆیان لێناگرن... ئەم باوەڕەشیان وایان لێ دەکات لەژیانی واقعی دابڕێن و لەخەونە کیشۆتەکانیان دا زۆر بە بڵندیەوە بفڕن.

**ژیرەکان بەدبەخت دەبن :**

لەگەڵ ئەوەشدا نکولی ناکرێ لەبوونی کەسانێك، کە ئەزمونەکانی ژیان پەندی داداون، بڕێکی زۆری بیرتیژی و زیرەکیان پێدراوە، بۆیە لەو خەونەی تێیدا بوون وەئاگا هاتونەتەوە، هەر چەندە بەژمارە کەمن.

ئەو کەسانە دنیا بەڕوت و قوتی دەبینن، و پێی پێ دەکەنن، لەنێو ئەو پێکەنینەش دا هەندێ تازێ باریشیان هەیە، وەلێ لەوە بەدەر بێ ئیدی بەدبەختن. دەبینین یەکێ لەو (بەدبەختانە) زۆر باش دەزانێ نوکتە لەسەر خۆی و خەڵکیش بێنێتەوە، کەسەرنجی ژیانیش دەدا، دەبینێ زنجیرەیەك ناچوینەکیە... ئاواتە خوازیشە وەك هەر کەسێکیتر خەوتوو و فێڵ لێکراو بێ.. چونکە خەون زۆر بەسودترە بۆ مرۆڤ لە هەقیقەتی تاڵ.

لەوانەیە مرۆڤ وای پێ باش بێ کە لەهەمان تەرزی (دۆن کیشۆت) بێ و لەگەڵ (ئاشە هەواییەکان)دا بجەنگێ، نەك لەتەرزی ئەو ژیرە بیرتیژانە بێت کە نهێنی خۆی و نهێنی ئاشەهەواییەکان دەزانێ.

## پۆخڵەواتی مرۆیی:

مرۆڤ وا ڕاهاتوە ، تێبینی ئەو كردارە چەوت و پوخڵەواتانە بكات كە لە غەیری خۆیەوە دەردەكەون و ڕەخنەیان لێ بگرێ و گاڵتەشیان پێ بكات... ئیدی نازانێت خۆشیی دووچاری هەمان دەردە... هەرچەندە خۆیی خۆش دەوێت و دەخوازێت بەهەر بەڵگە و پاساوێك بوە ، كردەوە ناشیرینەكانی خۆی و خۆشەویستەكانی پاساو بدات... بەڵام ناحەز و دوژمنەكانی لەدیدی وی دا لەهەرەخەڵكە هیچ و پوچ و پۆخڵەواتەكانن.

پێ دەچێ یەكێك لەئێمە لەئاهەنگێك دا وتارێك دەدات، دەستی بەهەوادا بەرز دەكاتەوە و ملی دەلەرزێنێ و دەنگی خۆی دەنەخشێنێ و بەرز و نزمی دەكات، خەڵكیش بەسەر سامیەوە سەرنجی دەدەن، ئەمیش لای خۆیەوە وا گومان دەبات ئەو خەڵكە خەریكە دەتوێنەوە لەسەر سامیاندا بەم و بەو نیگایەی دادەبەزێتە سەری.

كەئاهەنگەكە تەواو دەبێ، برادەرەكانی لێی كۆ دەبنەوە بۆ پیرۆزبایی لێكردنی ، دەربارەی ئەو وتارە سازگارەی پێشكەشی كرد، ئینجا بەدڵخۆشیەوە دەگەڕێتە ماڵەوە، زۆر شادومانە بەو پلە بەرزەی خودا پێی داوە... ئیتر هیچ ئاگای لەوە نیە ڕكابەر و ناحەزەكانی لە كاتی نائامادەیی ئەمدا چی دەربارەی دەڵێن... ئەگەر بزانێ چی پێ دەڵێن ، چێژی خەوی لێ هەڵدەگیرا.

ئەو واسەرنج لەخۆی دەدا، وەك چۆن دڵدارێ سەرنجی خۆشەویستەكەی دەدات، بەڵام ناحەزەكانی لەگۆشەنیگایەكیترەوە سەیری دەكەن، ناحەزەكانی ڕقیان لێیەتی و ئارەزوویەكی شاردراوەشیان هەیە بۆ وەی تۆڵەی لێ بكەنەوە و لە پلەوپایەی دابەزێنن... هەر لەبەر ئەوەش ، هەر جموجوڵێك لەكاتی وتاردانەكەی دا دەیكات، ئەوان ڕاڤەیەكی نەشیاوی دەكەن.

ناحەزەكانی ئەو بەهیچ و پوچ ناوزەد دەكەن.. گەر ئەمیش لە جێگەی ئەواندا بوایە و یەكێك لەوان وتاردەر بوایە هەر وای دەكرد... ئەم خەون دەبینێت و ئەوانیش وەك ئەم خەون دەبینن... زۆر جاریش بەو هۆیەوە لەنێو خەڵكی دا ڕاستی بزر دەبێت...

**ئەرکی موجامەلە کۆمەڵایەتییەکان:**

خەڵکی لەژیانی کۆمەڵایەتییان دا ڕاهاتون لەسەر ئەوەی موجامەلەی یەکتری بکەن و... ئیدی دوای ئەوەش گرنگ نیە گەر باسی یەکێکیان بکەن بەجۆرێکی پێچەوانەی ئەوەی لە ئامادەیی خۆی دا پێی دەڵێن... ئەم دیاردەیەش لای خەڵکی بە (لەپاشملەباسکردن... غەیبەت) ناسراوە...

شیاوی ئاماژەپێدانە کەبڵێین: لەپاشملە باسکردن، لەهەر کوێ مرۆڤ بونی هەبێت ئەویش بونی هەیە، بەڵام بەگوێرەی ئاڵۆزی شارستانیەت ئەویش کەم و زیاد دەکات، تاچەندە شارستانیەت ئاڵۆز بێت ، هێندەش خەڵکی بەکاروباری خۆیانەوە سەرقاڵ دەبن نەك کاروباری خەڵکیتر، وەڵێ هەر چۆن بێ، غەیبەت هەر هەیە و هیچ جێگەیەکی لێ خاڵی نیە.

هەر مرۆڤێ بگری کەم تا زۆرێ غەیبەت دەکات، بەڵام سەیر لەوەدایە مرۆڤ کە غەیبەت دەکات پێی وایە خەڵکی لەپاشملە باسی خۆی ناکەن، لای وایە خۆی لەهەموو ڕویەکەوە تەواوە، خەڵکی هیچ ناتەواویەکی تێدا نابینن تاکو لەپاشملە باسی بکەن، بۆیە زۆر تورە دەبێ کاتێ فیتنەیەك باسی ئەوەی بۆ دەکات کە لە بێئاگایی ئەمدا خەڵکی چۆن بەخراپە باسیان کردوە... بەڵام ئەو ئەگەر دادگەر بوایە دەبوا لە فیتنەکە تورە بوایە.

کاتێ دەبینێ خەڵکی موجامەلەی دەکەن، وا دەزانێ لە نائامادەیی خۆیشی دا هەر وان، ئەمە لەکاتێکدا خۆیشی وا دەبێ موجامەلەی یەکێك دەکات و لەپاشملەش باسی بەخراپ دەکات و هیچ شەرمەندەش نابێ.

هەر چۆن بێ، موجامەلە کۆمەڵایەتیەکان سودبەخشن بۆ مرۆڤ، چونکە وێنەیەکی جوانی خۆیی دەدەنێ، بەمەش وای لێ دەکەن توانای چەشتنی تاڵیەکانی ژیانی هەبێ.

لەبەرژەوەندی مرۆڤە وێنەیەکی جوانی خۆی وەرگرێ تاکو خۆویستانە بەرەو ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی پاڵ بنرێ، هەروەها لەبەرژەوەندیشیەتی ئەو وێنەیە لە خەڵکی بشارێتەوە، تاکو ڕژدی کەسانیتر نەبزوێنێ، چونکە هەر یەکێکیتریش بگری وەك ئەم

وێنەیەكی جوانی خۆیی بۆ خۆی وێنا كردوە و نایەوێت هیچ كەسێ ڕكابەری بێت لەسەر ئەو وێنەجوانە.

ئەگەر بیەوێت خەڵكی ڕوی پێبدەن پێویستە لەسەری موجامەلەیان بكات... هیچ چاكە و خێرێك نیە لە ژیانێك دا خەڵكی تیای دا ڕاشكاو بن و بەبێ پەردە ڕاستیە تاڵەكان بدەن بەڕوی یەكتردا.

**مەی و خەونە كیشۆتیەكان:**

هەندێ جار، مرۆڤ بۆ ئەوەی فڕینی بەدوای خەونە كیشۆتیەكان دا پتر بێت، پەنا بۆ مەی دەبات... تایبەتمەندیەكی (مەی) ئەوەیە ، هەستی گرنگی دان بەكەسانیتر لەمرۆڤ دا لاواز دەكات، بەوەش دەتوانێت لەخەیاڵدا هەڵفڕێت و، بەو فڕینەش ئەو جیهانە دروست دەكات كە خۆی دەیەوێت.

ئەمەش لەو مەیخانە نزم و بێئەرزشانەدا ڕون دەبێتەوە كە خەڵكانی هیچ و پوچ و فەرتەنەچیەكان ڕوی تێدەكەن، بەتایبەتی لەم وڵاتە ئەمینەدا... زۆر جار توێژەر لەو مەیخانانەدا نمونەگەلێ ڕوت و قوتی سروشتی مرۆڤی دەست دەكەوێ.

هەر كات یەكێكیان لە مەیخانە دادەنیشت و كەمێك مەی دەخواتەوە، ئیتر لوتی بەرز دەكاتەوە، وەك ئەوەی بوبێتە ئەمیر، ڕەنگە بەگۆرانی گوتن دەست پێبكات، ئنجا واوەیلا بۆ ئەو كەسەی گۆرانیەكەی بەخۆش نەزانێ.

پاشان ئەو برادەرە هەرزەكارەمان دەچێتە دەرێ و هاوار دەكاتە خاوەن دوكانەكان: (خەڵكینە دوكانەكانتان دابخەن!) دەیەوێت ئەو خەڵكە مل كەچی فەرمانەكانی بن و دوكانەكانیان دابخەن، بۆ ئەوەی ئەمیش كە گەڕایەوە باسی نەبەردی و پاڵەوانێتی خۆیان بۆ بكات.

هەندێ جار لەو مەیخانانەدا كەسانێكی بێدەنگ دەبینین، بەڵام ئەم بێدەنگیەیان پڕە لەگومان، چونكە لە ژێر بێدەنگیەكەیانەوە خەون گەلێ كیشۆتی گەورە شاردراونەتەوە، یان ڕەنگە لەو كەسانە بن كە میزاژی داخراویان هەیە، وایان پێ باشە

تەنها خۆیان چێژ وەرگرن لەخەونەکانیان بێئەوەی هیچ کام لەو (دەبەنگە ڕیسوا)یانەی لە لایاندان، بەشداری ئەو چێژ وەرگرتنەیان لەگەڵ دا بکەن.

**خەونەکانی لاوان:**

خەونە کیشۆتیەکان لای لاوان توندتر و سەختترن، نەخاسمە لەنێو لاوە هەرزەکارەکاندا، زۆرینەی خەونەکانیشیان لەدەوری هەوەس و ئارەزووی سێکسی دا دەخولێنەوە، مێشکیان پڕ دەبێ لە ئەندێشە (ڕۆمانسی)یەکان، ئەو گەنجانە دەخوازن لەو کەسە زۆر قۆزانە بن کەدڵی کیژان لەبەردەم جوانیەکەیاندا تێك وپێك دەشکێ.

هەردەمێ کەیەکێکیان ئافرەتێ یان پۆلە ئافرەتێکی لەنزیکی خۆیەوە بینی، خێرا دەست دەکات بە توانج وەشاندن و کۆمەڵە جموجۆڵێکی "هیچ و پوچ" کەخۆی بەنیشانەی پیاوەتیان دەزانێ، ئەو هەم بوونی خۆی لەبیر دەکات و هەم بوونی ئەو پیاوانەی دیکەش کە لەدەوری دان... ئیدی وەك خەوتوویەکی لێ دێ کەلەم دنیایەدا هەست بە هیچ ناکات جگەلە خەونە بەتامەکەی خۆی. کە سەرنجی دەدەیت وادەزانی بوەتە مرۆڤێ‌تر. ئەدی ، ئەوبەر لەساتێ مرۆڤێکی ئاسایی بوو، بەسانایی و دوور لە زۆر لەخۆکردن، لەگەڵتدا دەپەیقی.. ئنجا هەر هەست بەبوونی ژنێ بکات یەکسەر دەگۆڕێت، کەسایەتیەکی نوێی لێ دەردەکەوێت کە زۆر لەکەسایەتی (دۆن کیشۆت) دەچێت (یادی بەخێر).

ئەمەی گوتمان زۆر بەروونی لەسروتە ئاینی‌یەکاندا دەردەکەوێ، کاتێ ژنان لەنزیکی گۆڕستان یان مەزارگە پیرۆزەکاندا گرد دەبنەوە..لەم کاتەدا گەنجەکان دەست دەکەنە سوڕانەوە بەدەوری ژنەکان دا، بەوپەڕی مۆدیلیش خۆیان ڕازاندۆتەوە... وا دەبێ یەکێکیان بە غەمزە و نازو فیزەوە بەڕێ دا دەڕوات و واش دەزانێ ژنەکان هەموویان سەیری دەکەن و سەرسامن بەجوانیە سەرنج ڕاکێشەکەی.

ئەو گەنجانە خشتەیەکی ڕێك و پێکیان هەیەو، بەهۆی خشتەکەیانەوە دەزانن بۆنەو وادەی کۆبونەوەکانی ژنان کەیە و لە کوێندەرێش کۆ دەبنەوە... ئەم گەنجانە سوورن لەسەر ئەوەی ئامادەی ئەو گردبونەوانەی ژنان بن... ڕەنگە کاروباری زۆر پێویستیشیان

لەو پێناوەدا فەرامۆش بكەن... دەی نۆشیان بێ، بەڕاستی ژیان بەبێ خەونی ئاوەها هیچ چێژێكی نیە.

**لەزەماوەند و ڕێ و ڕەسمەكاندا:**

لەشایی و ڕێ و ڕەسمە ئاینییە ناسراوەكانی لای ئێمەدا خەونە كیشۆتیەكان دەردەكەون... خەڵكی بەئارامگەیەكی زۆرەوە چاوەڕوانی ئەو ڕێوڕەسمانە دەكەن تاكو بتوانن هەناسەیەك بدەن بە ئارەزوە خەفەكراوەكانیان لەو ڕێوڕەسمانەدا ... هەستیش بەشانازیەكی زۆر دەكەن كە دەبینن ژنان سەیریان دەكەن و تلیلیان بۆ دەكێشن(دەربڕینی وەرگێڕ).

شەوێك بەر لەزەماوەند و گوێزانەوەی بوكێ، كەبەشەوی خەنە ناسراوە (نوسەر باس لەكۆمەلگەی عەرەبی و زەماوەند لای عەرەبەكانی كۆمەلگەی خۆی دەكات ـ وەرگێڕ) دۆست و برادەرانی زاوا لە ماڵی زاوا داكۆ دەبنەوە بۆ هەڵپەڕكێ و گۆرانی گوتن، ژنانیش لەقاتی دووەمدا دادەنیشن تاكو لە پشتی پەردە سەیری ئاهەنگەكە بكەن.

لەم كاتەدا گەنجەكان كەسایەتیەكی كیشۆتی وەردەگرن كە بگونجێ لەگەڵ كەش و هەوای ئەو ماڵەدا، هەر یەكێكیان وا گومان دەبات كە بۆتە جێگەی سەرنجی ئافرەتەكان، بۆیە دەست دەكات بەگۆرانی گوتن یان هەڵپەڕكێ یان شۆخی كردن بۆ وەی بیسەلمێنێت كەشایستەی ئەوەیە توخمی نەرم و نۆڵ (مێینە ـ وەرگێڕ) ڕێزی بگرن.

تێبینیم كردوە، مەراسیمە ناسراوەكانی شیعە لەمانگی (موحەڕەم) دا لەم دیاردەیە بەتاڵ نین... زۆربەی ئەوانەی لەو ڕێ وڕەسمانە دا بەشداری دەكەن هەست بەجۆرێ لە خەونی كیشۆتی دەكەن، نەخاسمە كە دەبینن ژنان لەسەر شۆستەی شەقامەكان یاخود لەبەرزاییەكانەوە سەیریان دەكەن... بۆیە دەبینین هەندێكیان لەخۆیان دەدەن، گوایە لەبەر خاتری "حسێن" بەخۆیاندا دەكێشن... كەچی لەڕاستیدا لەپێناوی دڵی دا بەخۆیدا دەكێشێت... تەنانەت هەر هاوارێك لە ژنەكانەوە بەرز دەبێتەوە، ئەم وا دەزانێ هوتاف بۆ ئەم دەكێشن.

## خەونی فێرخوازان:

چینی فێرخوازان و خوێندەواران لەخەونە کیشۆتیەکانیاندا، لاوازترن لە نەخوێندەوار و خەڵکە ڕەشۆکیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن خۆیانی بەتەواوی لێ دارنن... ئەمەش لای ئەو قوتابیانە دەردەکەوێ کە بۆ یەکەمجار دەچنە زانکۆ تێکەڵاوەکان...

هەندێکیان لە شارۆچکەیەکەوە دێن کە دیاردەی سفوری و تێکەڵاوی نێوان نێر و مێی تێدا نابینرێ... کەچی لەناکاو خۆی دەبینێتەوە کە لەپۆل دا لەتەنیشتی کچێکی سفورەوە دانیشتوە.

لەو کاتەدا ئیدی دەست دەکات بە نیشان دانی بلیمەتی زانستی خۆی تاکو سەرنجی کچەکە بەلای خۆی دا ڕاکێشێت، زۆر جار بێمەبەست پرسیار و وتوویژ دەکات تاکو بڵێت: (ها ئەوە منم)... بەڵام ساڵ لەدوای ساڵ و بەشێوەیەکی پلەبەپلە، خوێندکارەکان لەم خەونانە دەرباز دەبن، هێدی هێدی ڕادێن لەسەر تێکەڵاوبون لەگەڵ کچان دا، کەمتر گرنگیان پێ دەدەن، لەوانەشە لەکۆتا ساڵیان دا ، دابەزنە جیهانی واقیع کە هیچ ڕوپامایی تێدا نیە.

من بۆ خۆم، ئەو بوارەم بۆ ڕەخسا کە بەراورد بکەم لەنێوان قوتابیانی زانکۆ ڕۆژئاواییەکان و زانکۆکانی خۆماندا، جیاوازیەکی زۆم بەدی کرد، خوێندکاری ڕۆژئاوایی هەر لەمنداڵیەوە ڕاهاتوە لەسەر تێکەڵاوبوون لەگەڵ کچان دا، بۆیە کەدەچێتە زانکۆ وەك چۆن سەیری هاوڕێ کوڕەکانی دەکات، ئاواش سەیری هاوڕێ کچەکانی دەکات، بۆیە خەونەکانی هەرزەکاریی دایناگرن وەك قوتابیانی لای ئێمە.

## جوان و ناشیرین:

گەنج تاکو ناشیرین تر بێ خەونەکانی زیاتر دەبن، وەك ئاشکراشە خەون قەرەبووە... ئەمەش یانی کەسێ ناشرین بێ زیاتر پێویستی بەخەونە وەك لەکەسێکی جوان و کەشخە.ئەم قسەیە زیاتر لەبارەی ژنەوە ڕاستە، جوانی سەرمایەی ئافرەتە، زۆر

جاران بەهۆی جوانیەوە بەرز دەبێتەوە یاخود نزم دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە ژنی ناشیرین پەنا دەباتە بەر خەونە کیشۆتیەکان، تاکو وابزانێ خۆی یەکێکە لەجوانترین ژنان... کە سەیری قوودیکیش دەکات سەرنجی کەپوی و دەم و چاوی خۆی دەدات و وادەزانێ جوانی وی پێوەر گەلێ بەرز و بڵندە بۆ جوان ناسی.

ئافرەتی ناشیرین سەیری جوانی ئافرەتی تر دەکات و لچیان لێ هەڵدەقرچێنێ و بەکەمیان دەزانێ ... تۆ بڵێی بگونجێ کەسێکیتر ئەو جوانیە زۆرەی هەبێت کە سوپاس بۆ خودا ئەم هەیەتی؟ ئەگەر بینیشی خەڵکی دان بە جوانیەکەی دانانێن، دەست دەکات بەلۆمەکردنیان و بەزەوق سز ناویان دەبات.

پیاویش ئەگەر ناشیرین بێت و ئارەزویەکی زۆریشی لەژن بێت، دوچاری غروری کیشۆتی دەبێت، گەر زانی ناگاتەوە بەهاوشانەکانی، لەجیهانی دڵداری دا، ئەوا جیهانێکی تایبەت بەخۆی دروست دەکات، کەتیای دا خۆی دەکاتە خواوەندی ژنان... پەنا بەخودا.

پیاوێکی زۆر ڕەش و کەپۆزل دەناسم، بۆ بەدبەختیش لەسەرەتای لاوێتی دا چوەتە یەکێك لە سەماخانە رۆژهەڵاتیەکان... لەو سەماخانە دا سەرسام بوە لەو هەموو گیرفانە پرس و ورگەقورسانەی لەوێ بوون، پێشی ناخۆش بوو سەماکەرەکان لەگەڵ پیاوانیتر دا دادەنیشتن بێئەوەی ئەم بتوانێ لەگەڵیان دا دابنیشێ یاخود لانی کەم سەرنجیان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ... ئیتر لەوکاتەوە تا ئێستە خەون دەبینێ کە بوەتە دڵدار و خۆشەویستی کچە سەماکەرەکان.

ئەم پیاوە زیاتر لەخەونەکانی دا قوڵ بویەوە تاکو گەیاندیانە (هۆلیوٚد)، وای هاتوە بەخەیاڵدا کە ژنە ئەکتەر بەناوبانگەکان هەر لەدوورەوە عاشقی بوون، چونکە (بەخەیاڵی خۆی) ناو و شۆرەت و ناوبانگی گەشتۆتە ئەو ژنە ئەکتەرانەو ئیتر توانای ئارامگرتنیان نەماوە، بۆیە دەستیان کردۆتە دابارانـدنی دیاری قورس و سەنگین بەسەری دا... بەڵام زۆر پەست و تورە بوو کاتێ بەوەی زانی حکومەتی عێراق ئەو دیاریانە لای خۆی گل دەداتەوە و ڕێگە نادات بگەنە ئەم، بۆیە بەردەوام هاوار و هەڕەشەی لە حکومەت دەکرد.

ئەو پیاوە، ئێستاکە لەنەخۆشخانەی شێتەکان دایە.

**سەماخانە رۆژهەڵاتیەكان:**

بەبۆنەی ئەوەی باسمان لەسەماخانە رۆژهەڵاتیەكان كرد، ئەمەوێ ئاماژە بدەم بەوەی كە ئەو شوێنە جەنجاڵترین جێگەیە لەخەونە كێشۆتیەكان دا.

زۆرینەی قارەمانەكانی ئەم سەماخانانە بریتین لە مەی خۆر و دەوڵەمەندەكانی جەنگ و سەرۆك هۆزەكان.. ئەمانە هەست بە برسێتی سێكسی دەكەن، بۆیە پەنا دەبەنە بەر ئەو سەماخانانە تاكو ئەو برسێتی‌یە بۆگەنەیان تێر بكەن.

هەر یەكێكیان بگریت، دوای ئەوەی ڕومەتی هەڵدەگرێت و سمێڵی بادەدات و جوانترین بەرگ و گۆرەوی و كەوش لەپێ دەكات، ڕو دەكاتە سەماخانە، كە داشدەنیشێ وادەزانێ دەبێتە مۆمی نێو ئاهەنگەكە، سەماكەرەكانیش دێر یان زوو دەكەونە داوی خۆشەویستی‌یەوە.

ئافرەتی سەماكەری رۆژهەڵاتی شارەزاییەكی زۆری هەیە لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە... كە دەچێتە سەر تەختی شانۆ، دەست دەكات بە دابەش كردنی غەمزە و ناز و خەندەكانی بەملاولادا بەبێ‌حساب كردن.. ئەوەش هەر دانیشتویەك وادەزانێ خەندەكە بە تەنها ئاراستەی خۆی كراوە، گوایە ئەو تاكە قۆز و پێكەوتوی ناو دانیشتوانە.

ئەنوارێتە دانیشتوانی دەوروپشتی، دەبینێ لەڕوی جوانی و كەشخەییەوە لەخۆی زۆر كەمترن! بۆیە ناتوانێ بڕوا بەوە بكات كە سەماكەرەكە دەكەوێتە داوی خۆشەویستی هیچ كامیانەوە، ئەو وادەبینێ هەموو دانیشتوەكان لەسەر مودێلێ‌تر دروست كراون و بەهەڵە ناوی ئادەمیزادیان لێنراوە، لای وایە ئەوان زیاتر لەمەیمون دەچن وەك لەمرۆڤ... ئیتر نازانێ‌خۆیشی مەیمونێكە وەكو ئەوان.

**سەماخانەكان و خەونی هەژاران:**

هەژارەكان هەست بە دەستەوسانی دەكەن لە وەی بتوانن وەك دەوڵەمەند و سەرۆك هۆزەكان دڵی سەماكەرەكە بەلای خۆیاندا رابكێشن... ئەوان دەتوانن بەپارە و پوڵی زۆر

و زەوەندیان لەشی نەرم و نۆڵی سەماکەرەکە بکرن، بەڵام کابرای هەژار ناتوانێ، بۆیە ناچار دەبێ لەجیهانی خەونەکاندا بفرێت، لەوانەشە کابرای هەژار لەو جیهانی خەونەدا زیاتر چێژ بنۆشێ وەك لەدەوڵەمەندەکان لەجیهانی گۆشت وبەز دا.

ڕەنگە کابرای نەدار پەنا بەرێتە بەر مەی، تاکو یارمەتی بدات لەفڕینی دا بەنێو خەونە کیشۆتییەکان دا... بەر لەسەماخانە دەچێتە مەی خانە... ئەمەیە نهێنی ئەو قەرەباڵغییەی کەلە مەیخانەکاندا دەی بینین کاتژمێرێك بەر لە کردنەوەی سەماخانەکان.

زۆر جار پیاو لە سەماخانەکە دا مەیەکەی تەواو دەکات، لەوێش کەمێ دەخواتەوە، تاکو بەردەوامی بدات بە فڕینی لەنێو ئەندێشە جوانەکانیدا. ئەگەر لە کاتی فڕینەکەی دا قەدەر ناپاکی لە بەرانبەر دا بنوێنێ و سوکایەتیەکی ئاراستە بکات کە بیهێنێتەوە سەر زەوی، زۆر ئازار دەچێژێت و لەوانەیە وەکو گای بریندار بخرۆشێت... بەو هۆیەشەوە سەماخانەکە دەبێتە مەیدانی جەنگ... و ئیدی ئەسکەملەکان تیای دا جێگەی شمشێر دەگرنەوە.

### شێوازەکانی سەرنج ڕاکێشان:

ئەو هەژارەی روو دەکاتە سەماخانە ڕۆژهەڵاتیەکان زۆر پەست و دڕدۆنگ دەبێ کە دەبینێ فەرامۆش کراوە و هیچ کەس هەست بەبوونی ناکات، دڕدۆنگیەکەشی پتر زیاد دەکات کاتێ سەماکەرەکان بەملاولایدا دەڕۆن و ئاوڕی بەلادا نادەنەوە.

کاتێ مەیەکە لەسەری دەدات، حەز دەکات کارێ بکات تاکو سەرنجی یەکێك لەسەماکەرەکان بەلای خۆی دا ڕاکێشێت... ئەو متمانەی بەجوانی و توانای ڕاکێشانی سێکسی خۆی هەیە، بۆیە ئەگەر ئەو سەماکەرە سەرقاڵ نەبایە بەو هیچ و پوچانەی وەك دەوڵەمەندەکانی جەنگ و سەرۆك هۆزەکان، ئەوا بێگومان دەکەوتە دوای خۆشەویستی ئەمەوە... کەواتە پێویستی بەهۆکارێکی بەهێز هەیە تاکو سەماکەرەکە والێ بکات هەست بەبوونی بکات. پاشان واز لە سروشتی دێنێ تا بە ڕێی حەتمی خۆی دا بڕوات.

چەند شێوازێ هەیە کە ئەو جۆرە کەسانە پەنای بۆ دەبەن تاکو سەرنجی ژنە سەماکەرەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن... ئەو شێوازانە زۆر و زەوەندن و لێرەدا بوار نیە گردیان بکەینەوە، بۆیە وا باشترە هەندێکیان بەنمونە باس بکەین.

١- شێوازی بەشداری کردن لەسەمادا: ئەم شێوازە، شێوازێکی ریزپەڕە و بەلگەیە لەسەر دەبەنگی و شێتێتی. پوختەی ئەم شێوازە، ئەوەیە کە کابرا هەوڵ دەدات دەمەلاسکێی سەماکەرەکە بکاتەوە لەسەما کردنی دا... لەسەر پێیەکانی ڕادەوەستێت و کەمەر و ملی دەلەرزێنێ، ئامادەبوانیش پێی پێدەکەنن، لەوانەشە سەماکەرەکەش لەگەڵ ئامادەبواندا پێ پێ بکەنێ، ئەم لای خۆیەوە وا دەزانێ ژنە سەماکەرەکە لەبەر سەرسامی پێی پێ دەکەنێ، بۆیە ڕێی تێ دەچێ دوای کۆتایی هاتنی سەماکە لەبەر دەرگا ڕابوەستێ و چاوەڕوان بکات ژنە سەماکەرەکە بانگی بکات بۆ ماڵی خۆیی.

٢- شێوازی بەشەرمەکان: ئەم کەسانە بە بێدەنگی لەسەر کورسییەکانیان دادەنیشن، هەوڵ دەدەن جێگەکانیان نزیك بێت لەتەختی شانۆکەوە، تاکو ڕوناکییەکەی بدات لەڕوخساری جوانیان ... ئەوەشیان بەسە.

ئەمان وای بۆ دەچن ژنە سەماکەرەکان پیاوی پێکەوتوو و دامەزراویان پێ باشترە لە دەبەنگێ کە خۆی کردۆتە جێگە پێکەنینی خەلکی... لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە هەر کەسێکیان نەسڵەمێتەوە لەوەی لەبەر دەرگاکەدا ڕابوەستێ و چاوەڕوان بکات سەماکەرەکە بیباتەوە ماڵێ!

٣- شێوازی خۆلێکچواندن بەدەوڵەمەندە دەست بڵاوەکان: ئەو کەسەی پەیرەوی ئەم شێوازە دەکات، لە بژیوی و ڕۆژی کەمی ڕۆژانەی چەند دینارێ پاشکەوت دەکات و دواتر دەچێتە سەماخانەو داوەتی سەماکەرێ دەکات تا لەگەڵی دا لەسەر خوانێك دانیشێ... ئەو بڕوای وایە گەر جارێك سەماکەرەکە لەگەڵی دا دانیشت، ئەوا چەندین جاریتر لە گەڵی دا دادەنیشێت.. پێی وایە سەماکەرەکە لەیەکەم جار دا عاشقی دەبێت، بۆیە بەناچاری چەندین جاری تر لەژێر گوشاری پاڵنەری عاشق بوونی دا دێت ولە گەڵی دادەنیشێت... دەیەوێت یەکەمجار خۆراکی بەتامی بداتێ، تاکو بەو هۆیەوە بیکاتە نێچیر و ئیتر چەندین جار چێژ لەگۆشتە بەتامەکەی وەرگرێ!!.

٤. شێوازی مام ڕێوی (دەربڕینی وەرگێڕ): بەسەرهاتی ڕێوی ئاشکرایە... کاتێ دەمی نەگەییە ترێکە بەناهەق تۆمەتی ترشێتی دایە پاڵی... زۆرینەی ئەوانەی ڕوو دەکەنە سەماخانە ڕۆژهەڵاتیەکان ئەم شێوازەی ڕێوی بەکار دێنن... دەبینن خوانی دەوڵەمەندەکان رازاوەیە و سەماکەرەکان لەدەوری دانیشتون، زۆر ئازار دەچێژن... دواتر بەهەمان شێوازی ڕێوی دڵخۆشی خۆیان دەدەنەوە.... خۆیان بەخۆیان دەڵێن: زۆر لەوە بەرزترین بکەوینە ئەو پلە خوارەوەی کە دەوڵەوەمەندەکانی جەنگ تێی کەوتوون... بەڵام زۆرینەی گومانەکان ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی، ئەو کەسانەش ئاواتە خوازن کەوەك ئەوان گەمژە و دەوڵەمەند بونایە.

٥ـ شێوازی وێژەوانەکان: ئەم شێوازە بەم دواییە لەسەماخانەکانی (بەغداد)دا تەشەنەی کردوە و شوێنکەوتوانی فرە بوون.... ڕەنگە نوسەری ئەم چەند دێرەش لەو شوێنکەوتوە بەرێزانە بێت.

کابرای ئەدیب کەدەچێ بۆ سەماخانە، گیرفانی خاڵیە، تەنها لە بەزەیی خودا نەبێ، ئەوەندە هەیە لوتی بەرزە و، وەك چۆن فەیلەسوێ سەیری (گەجەروو گوجەرەکان) دەکات ئەمیش بەو شێوەیە سەیری دەوروبەری دەکات..بۆیە هەر ئەوەندەی دەگاتە ئەو شوێنە خێرا ڕای دەگەیەنێت و ئەڵێت: "ئەمە منم لێرە . ئیدی بڕوای وایە سەماکەرەکانیش لەدەوری کۆدەبنەوە هیچ سەیریش نیە، چونکە ئەدیب مۆمێکە و دەسوتێ "وەك خۆیان دەڵێن"، ئنجا واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی بڕوا بەو قسەیەیان ناکەن چ سەماکەر بن یان کەسانیتر بن. من پروپاگەندەی ئەوە ناکەم ئەمەی دەیڵێم حاڵ و باڵی هەموو ئەو کەسانە بێت کە ڕوو دەکەنە سەماخانە ڕۆژهەڵاتیەکان.... بەڵام متمانەم پتەوە بەوەی، بەسەر زۆرێکیان دا دەچەسپێت... بەوەی کاتێ دەروونی خۆیان دەپشکنن ڕەنگە هیچکام لەو قسانەی من کردومە لەخۆیاندا نەدۆزنەوە... هەقیشیانە وا بن... چونکە هەستی پاساوهێنانەوە زاڵ بوە بەسەریاندا و وای لێکردون نکولی لە ڕاستی بکەن.ئنجا نۆشی گیانیان بێت... چەند بەدبەختە ئەو ژیرە بیرتیژەی کە لەژیانی دا چێژ لەخەونەکانی وەرناگرێت.. چونکە ئەو چێژ لە ژیانیشی ناکات وەك ئەوانەی وا خەون دەبینن..

## کورت کردنەوە و بەرەنجام گیری:

لەبەشەکانی ڕابردوودا ئەو ڕاوبۆچونە هەمەجۆرانەمان نمایش کرد کەلە بارەی سروشتی خەونەوە دەدوێن... منیش لێرەدا بۆم هەیە بڵێم: ئەو بیردۆز و بۆچوونانە لەوانەیە لە هەندێ ڕووەوە لایەنگیر یاخود هەڵە بن... بەڵام بەشێوەیەکی گشتی مەغزایەکی کۆمەڵایەتی بەسوودیان هەیە، چونکە ئاماژە دەکەن بە ڕادەی ئەو هەڵەیەی کە پێشینیان پێی گەیشتوون لە پیرۆزکردنی هەندێ لە خەونەکانیان و بڕواپێکردنیان دا.

ئەمرۆکە لەوانەیە توێژەران جیاوازیان هەبێ لە شیتەڵ کردنی سروشتی خەونەکاندا، بەڵام ڕەنگە سەرجەمیان یەکڕا بن لەسەر ئەوەی "خەون" نابێتە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی هیچ کام لە بیر و باوەڕ و ئایدیۆلۆژیاکان... چونکە بۆ توێژەران ڕون بۆتەوە کە خەون بەشێوەیەکی گشتی هیچ نیە جگە لە هۆکارێك کە مرۆڤ دەتوانێ بەهۆیەوە هەناسەیەك بدات بەخولیاکانی ناخی و، یارمەتی مرۆڤیش دەدات لە ڕووبەڕووبونەوەی سەختیەکانی ژیان دا... خەون وەك (زانایەك) دەڵێت: دیاری خودایە بۆ مرۆڤ، چونکە ئەگەر خەون نەبوایە ئەوا خودی مرۆیی لەسەر تاشەبەردی واقعە تاڵەکە دا تێك و پێك دەشکا.

مرۆڤ لەدنیا دا ئارەزووی زۆر شتان دەکات. زۆربەی کات ستەم لێکراو و بێبەشە، دەش بینێ توانای نیە ئەو شتە بەدەست بێنێ کە لێی یاساغ کراوە یاخود تۆڵە لەستەمکارەکەی بکاتەوە، بۆیە لەو کاتەدا بەناچاری پەنا دەباتە بەر خەون. و لە خەونیدا ئەو ژیانە دێنێتە بەر نیگای خۆی کە بەشێوەیەك لەشێوەکان ئارەزووی دەکات.

دەگونجێت بڵێین: تاچەندە بارودۆخ قورسایی بخەنە سەری، ئەوەندەش مرۆڤ زیاتر ڕۆدەچێ بەناو خەونەکانیدا... ئەگەر بەراوردێ بکەین لەنێوان دوو کەس دا، یەکێکیان خۆشگوزەران، ئەوی دیکەیان نەدار و بێنەوا ، دەبینین ئەوی یەکەمیان کەمتر پەنا دەباتە بەر خەون و زیاتر پەیوەستە بە بویەرەوە ولێشی تێدەگات، بەڵام هەر کە

چەردەیەك تاڵاوی ژیانی بەرکەوت، دەست بەجێ وەکو برادەرە بێنەواکەی نقوم دەبێ لەنێو دەریای خەون دا.

لەوەی رابورد بینیمان چۆن خەونەکان دابەش دەبن بۆ چەندین جۆری جودا جودا، لێرەدا بەو بۆنەیەوە دەڵێم: هەموو ئەو جۆرانەی خەون بەیەکسانی کۆنتڕۆڵی تاکەکەسێك ناکەن، بەڵکو هێدی هێدی دێنە سەری، جۆرێ لەدوای جۆرێکیتر، بەئەندازەی قورسایی بارودۆخەکەی دەوروبەری.

بەگونجاوی دەزانم لێرەدا جۆرەکانی خەون و ڕادەی کاریگەربوونیان لەمرۆڤ دا بەم تەرزە کورت بکەمەوە.

١ـ خەونەکانی نوستن: ئەم جۆرەی خەون گشتییە و هەموو خەڵکی بەجۆرێکی وێکچوو تیای دا هاوبەشن، بەهۆی ئەم خەونەوە مرۆڤ دەتوانێ هەندێ لە ئارەزووەکانی تێر بکات، خۆشەویستەکەی لە ژێرخۆی دا ڕادەخات، یاخود سەری دوژمنەکەی دەشکێنێ، یان بەدیار چاوی ڕژدەکانەوە بەهەوا دا دەفڕێ... بەڵام ناتوانێ لەوەدا تا ئەوپەڕی سنور پەل بهاوێ، چونکە لە ناکاو خەونەکەی لێ هەڵدەگەڕێتەوە، لەبری ئەوەی سەرکەوتو بێت خۆی بەشکست خواردوو دەبینێ، یان خۆی بە کەوتوو دەبینێ لەبری ئەوەی بفڕێ، یاخود دوژمنەکەی سەری دەشکێنێ لەکاتێکدا ئەم دەیەوێت سەری دوژمنەکەی بشکێنێ.. ئەم جۆرەی خەون ئێمە ناومان ناوە (مۆتەکە) یاخود (خەونە تۆقێنەرەکان).

٢ـ خەونەکانی بێداری: پێدەچێت ئەم جۆرەی خەون بەتواناتر بێت لە خەونەکانی نوستن بۆ تێرکردنی ئارەزووە یاساغەکان. چونکە مرۆڤ هەندێ جار دەتوانێ بەپێی ویستی خۆی ئاراستەی بکات.. مرۆڤ لەو بارە دا هیچی لەسەر نیە ئەوەندە نەبێت بەسەر خۆی دا بشکێتەوە و لەخەڵکی دابڕێت... ئیدی بەئارەزووی خۆی خەونەکانی دەخاتە کار، هەر کەسێکی خۆش بوێ لە باوەشی دەگرێت و پارەی بێشوماریش لە چنگی خۆی دەنێ... وەلێ هەر بە خەون (دەربڕینی وەرگێڕ).

٣ـ خەونە کیشۆتیەکان: ئەم خەونانە پێویستیان بەدابڕان نیە لەخەڵکی، وەك خەونەکانی بێداری گەرەکیانە..بەڵکو ئەم خەونانە لە ئامادەگی خەڵکی دا باڵا دەکەن،

خاوەنی ئەو خەونە دەبێتە جوانخاسێ ژنان حەزی لێ بکەن یان بە ناوبانگێ بەئەنگوست ئاماژەی بۆ بکرێ... هەر ئاماژەیەك لەخەلكی دەربکەوێ ئەم وای لێك دەداتەوە كە ئاراستەی خۆی كراوە و پڕە لە سەرسامی و بەگەورە زانینی جەنابی.

٤. خەونەكانی شێتی: ئەم جۆرەی خەون كۆتا پەناگەیەكە، مرۆڤ پەنای بۆ دەبات، كاتێ جۆرەكانی دیكەی خەون دەستەوسان دەبن لە پڕكردنەوەی پێداویستییەكانی مرۆڤ... ئەم خەونانە بەلگەشن لەسەر ئەوەی خاوەنەكەی بێئومێد بووە لەخەلكی و دەركی بەوە كردووە كە خەلكی بەو جۆرەی خۆی دەیەوێت ڕێزی ناگرن... ئا لەو كاتەدا هێلێ دێنێ بەسەر هەموویان و بۆچونەكانیشیاندا، دواتر كە شێك بۆ خۆی هەلدەبژێرێ كە لەگەلی دا بگونجێ ... ئیتر گوێ نادات بەوەی خەلكی چی پێ دەلێن مادامێك خۆی لە خۆی ڕازیە... هەر كات گالتەپێكردنێ یان ئازارێكی لە لایەنی خەلكەوە بەركەوت، ئەوا قەناعەت بەخۆی دەكات كە هەموو ئەو خەلكە شێتن و خۆی تاكە ژیری ناویانە. دەی پیرۆزی بێت... بەڕاستی بوەتە خۆشحالترین دروستكراوی خودا.

*** *** ***

پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێ كە میللەتانیش پەنا دەبەنە بەر خەون بۆ ئەوەی هەناسەیەك بدەنە خولیاكانیان، دروست وەك تاكەكان... هەندێ جار لەنێو گەلان دا خەونی بیداری سەر هەلئەدات لەسەر هەمان شێوازی (الف لیلة و لیلة)، كەتیای دا قارەمانەكە بەئارەزووی خۆی ژنی شەنگ و شۆخ و كۆشك و تەلاری جوان و قەشەنگ و خۆراكی چەور و قەلەوی دەست دەكەوێت و، هەزاران ئەم بەسەرهاتانە بەتام و چێژەوە دەگێڕنەوە.. خۆیان دەخەنە جێگەی قارەمانەكە و وادەزانن نیعمەتەكان لەهەموو لایەكەوە دەوری داون، هەندێ جاریتر،خەونی كیشۆتی لەنێو گەلاندا دەردەكەوێ وەك ئەوەی لە هەندێ گروپی ئاینی دا دەبینرێ.

ڕەنگە هەندێ لەو گروپە ئاینییانە هەلگری كۆمەلێ بیر و باوەڕی پوچیش بن، كەچی بەتاك و تەنها خۆیان بەگروپی ڕزگاربووی نێو هەموو خەلكی دەزانن.. گروپەكە لەخەونە كیشۆتیەكانی دا دوورتر دەڕوات و وای دێ بە ئەندێشە دا كە هەموو ژیرانی

سەر زەوی دان دەنێن بە هەقیانەتی وی دا و بە سەرسامیەوە سەرنجی دەدەن... لەم خوەیشی دا گروپە ئاینیەکە زۆر جیاواز نیە لە دۆن کیشۆتی ڕەحمەتی.

جۆرێکیتری خەونی میللی هەیە، ئێمە ناومان ناوە (بیر و باوەڕی ڕزگارکەری خودایی).. مێژوو باسی هەندێ نەتەوەی کۆنمان بۆ دەکات، کاتێ کەوتونەتە ژێرستەم و چەوساندنەوەی چینایەتی‌یەوە و بێئومێد بوون لەوەی لە ڕێگەی بویەرەوە خۆیان ڕزگار بکەن، بۆیە پەنای بردۆتە بەر ڕێگەی خەون و وای خەیاڵ کردوە کە خودا ڕزگارکەرێکی بۆ دەنێرێت و تۆڵەیان لەستەمکار دەسێنێت و سەرزەوی پڕدەکات لە دادگەری پاش ئەوەی پڕکرابوو لە ستەم و نادادپەروەری!

کاتێ لەو ئەفسانانە دەکۆڵینەوە ، کە تا ئێستەش بڵاون لەنێو هەندێ لە گەلاندا دەربارەی (رزگارکەری خودایی) دەبینین پڕن لە ئاوات و خۆزگە و ئەندێشەی کۆمەڵایەتی جوان و ئاماژەشن بۆ ئەو ئازارەی خەڵکی هەستی پێ دەکەن لە بەرانبەر بارودۆخە سەختەکانیان دا. ئنجا خەونەکە، دێت و وێنای ئەو خۆشحاڵیە دەکات کەلە سەر دەستی ڕزگارکەرەکە دا ڕوو لە خەڵکی دەکات و باسی ئەوە دەکات کە چۆن تا ئەو پەڕی سنور خەڵکی تێر و پڕ و بێگرفت دەبن.

هەر چۆن بێ ، دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی چیمان گوتوە دەربارەی خەونە فەردیەکان هەمان شت بڵێین دەربارەی خەونە میللیەکان... ئەم خەونانەش تاکو ئاستی بژیوی خەڵکی بەرز بێت و بارودۆخیان باش بێت بەرەو کەمی دەچن.

جا ئەگەر بێت و بەراوردێ بکەین لە نێوان ئەفسانەی میللەتە ئازادە مۆدێرنەکان و ئەو ئەفسانانەدا کە لە نێو گەلە کۆیلەکراوە کۆنەکاندا بڵاو بوون، جیاوازیەکی مەزن دەبینین... لێرەدا نابێ کاریگەری ڕۆشنبیری گشتی لەیاد بکەین لە کەمکردنەوەی پلە و پایەی ئەفسانە و خەونە میللیەکان لەنێو مەردوم دا... ئەوەتە ئێمە دەبینین گەلانی مۆدێرن دەسیتان کردۆتە بێداربونەوە، لە ژیانیان دا ڕێگەی وشیاری ڕاست دەگرنە بەر... بۆ ئەو مەبەستە پەیتا پەیتا دەست بەرداری خەونە دێرینەکان دەبن و بەجۆرێکی واقعی بیر لە پرس و مەسەلەکانی خۆیان دەکەنەوە ، ئەندێشە لەو بیرکردنەوەیە دا کەمتر هەستی پێ دەکرێ (دەربڕینی وەرگێڕ).

# پەراوێزەکانی بەشی دوازدەیەم

١-نوسەر لەو دوو جێگە دا دەستەواژەی (الحیوان الاجتماعی ) دووبارە دەکاتەوە ، من بۆخۆم پێم وابوو ، ئەوی یەکەمیان هەڵەی چاپ بێت ، بەڵام بەو حاڵە شەوە ڕێگەم بەخۆم نەدا بیگۆڕم و دەستەواژەی (الحیوان العاقل ) ەکە بخەمە جێگەیەوە کەدوو دێر دواتر مامۆستا ئاماژەی پێدەدات....... وەرگێڕ

# بەشی سیازدەهەم

## هەواڵدانەکانی خەون:

بەهەر لایەك دا بڕۆیت ، دەبینی خەڵکی باس لە (هەواڵدان)ەکانی خەون دەکەن، لە جڤاتێکدا دانانشیت و باسی خەونی تێدا بکرێ، یەکسەر دەبینی یەکێك لە دانیشتوان دەست دەکات بەباسکردنی خەونێکی سەیری کە هەواڵی بەداهاتوو داوە... برادەرێك دەناسم توانایەکی زۆری لەم ڕووەوە هەیە، جارێکیان باسی خۆی بۆ کردم و گوتی سەرسامم ، نازانم چۆن خەونەکانم لێك بدەمەوە.

زۆر جار شەو خەونێ دەبینێ کەچی بەیانی بەشێوەیەك لە شێوەکان خەونەکە دێتە دی... چەند جار ئەمە لێی ڕوداوە و تاکو مەسەلەکە لای ئەو برادەرە ئاسایی بۆتەوە.

برادەرێکیتر، باسی خەونێکی سەیری بۆ کردم کە پاش چل خولەك خەونەکە هاتۆتە دی... پوختەی چیرۆکەکەیشی ئاوایە: بەیانی زوو هەستاوە لەخەو، دەستی کردۆتە خوێندنەوەی پەرتوکێ، پاشان خەوەنوچکە گرتویێتی و بەسەر پەڕاوەکەدا خەوی لێکەوتۆتەوە، لە خەویدا دیویەتی، ماڵەکەی پڕ بوە لە ئاو و کوڕە هەشت ساڵانەکەیشی دەکەوێتە ناو ئاوەکە، ئەمیش ڕادەکات لە خنکان ڕزگاری بکات، بەڵام کە دەری دێنێتەوە دەبینێ مردوە... بۆیە کە لەو خەوەنوچکەیە بێدار دەبێتەوە زۆر دەشڵەژێت و دەست بەجێ دەگەڕێ بەشوێنی کوڕەکەی دا، دەبینێ لەگەڵ دایکی دا منداڵەکە لە باخچەی ماڵەکەیاندا دانیشتون و بەر چایی بەیانی دەکەن ،بێئەوەی هیچ دیاردەیەکی نائاسایی پێوە ببینرێت.

دوای ئەوەی منداڵەکە بەر چایی بەیانی دەخوات، باوکی دەستی دەگرێت و دەیبات بۆ قوتابخانە، وەلێ هەر ئەوەندەی لە دەروازەی ماڵەکەیان دوور دەکەونەوە منداڵەکە شۆڕ دەبێتەوە و دەکەوێتە سەر زەوی، باوکی هەڵی دەگرێت و دەیبات بۆ خەستەخانە،

لەدوای پشکنین دەردەکەوێت کە توشی نەخۆشی بوە، ئنجا دوای چەند رۆژێکی کەم منداڵەکە بەو نەخۆشینە دەمرێت.

**چیرۆکێکی‌تر:**

قوتابیەك، لە قوتابیە کۆنەکانی خۆم لە ساڵی (١٩٥٣)دا نامەیەکی بۆ ناردم ئەم بەسەرهاتەی تێدا نوسیبوو:

قوتابیەکە دەڵێت: (شەوێك لە خەونم دا وامزانی خانوەکە ڕوخاوە بەسەرم دا. بۆیە بەپەشۆکاوی لە خەو ڕادەچەنیم، سەیری دەورووپشتی خۆخۆم کردهیچ شتێکم نەبینی جێگەی سەرنج بێت... بۆ جاری دووەم نوستمەوە و هەمان خەونم بینیەوە، ئنجا هەستامەوە و بۆ جاری سێیەم نوستمەوەوە و لە ناکاوبە ئاگاهاتمەوە و ژنەکەم بێدار کردەوە و پێم گوت :خانوەکە دەڕوخێت دەنگی نائاسایی دەبیستم لە دیوار و بانەکەیەوە، بەپەلە پەنجەرەکانمکردەوە و سەیری دەرەوە م کرد هیچ شتێکی نائاسایی نەبوو، سەرنجی دیوارەکانیشم بەباشی دا و درز و قلێشی تێدا نەبوو ... پاشان کە دڵنیا بوومەوەنوستم و وەك هەمیشە بەیانی بێدار بومەوە..) وەلێ ئەوەندەی نەبرد زرم و تەپەیەکی گەورەی ڕوخاڵی خانویەکی دراوسێیانی گوێ لێ بوە کە زۆر نزیك بوە لە خانوەکەی ئەمەوە... بۆ بەدبەختیش لە ژێر داروپەردوی خانوە ڕوخاوەکە دا دوو کەس مردوون.

**ڕوداوێ کە لە خۆم ڕوی داوە:**

ئەو چیرۆکانەی لەمەوبەر ئاماژەمان پێدان، بەشێکی زۆر کەمن لەو بەسەرهاتە سەیرانەی خەڵکی لەبارەی خەونەوە دەیگێڕنەوە، بەڕادەیەك ئەگەر بمانەوێ ئاماریان بکەین هەرگیز ناتوانین....

من بۆ خۆم، لەسەرەتاوە گاڵتەم بەو ڕوداوانە دەکرد و بە ئەفسانە و ترۆهاتم دەدانە قەڵەم، ماوەیەکی زۆر هەر وابووم، تاکو شەوێك خەونێکی سەیرم بینی، ئەو خەونە وای لێکردم بەشێوەیەکی جیدی سەرنج لە مەسەلەی هەواڵدانەکانی خەون بدەم.

حەز ناكەم بەوردی باسی ئەو خەونەم بكەم، چونكە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە هەندێ لەبرادەرانم و هەندێكی‌تر لە ناحەزەكانیشمەوە، ئەوەندە بەسە كە لێرەدا بڵێم: لەخەونم دا كۆمەڵێ پیاوم بینی كە تاكو ناوقەدیان لە مادەیەكی بەهێز دا چەقی بوو (نەم دەزانی مادەكە چیە)... بەهەموو هێز و توانایانەوە هەوڵیان دەدا خۆیانی لێ قوتار بكەن و ڕق و تووڕەییش بەڕونی بەڕوخساریانەوە دیار بوو... بەیانی لەخەو هەستام، خەونەكەم لەبیر چویەوە و بەمێشكی سافەوە ڕوم كردە كارەكەم... ئنجا زۆر سەرسام بووم كاتێ پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە كێشەیەكی شەرمەزاركەرم بو بە توشەوە، لەگەڵ كەسێكدا كە زۆر لە پیاوەكانی نێو خەونەكەم دەچوو... كێشەكەش ئەوە نەبوو كە من چاوەڕوانم دەكرد... بەڵكو گومانم وایە كە بەڕێكەوت ڕوی دا.

**هەندێ گێڕانەوەی باوەڕپێكراو:**

ئێمە دەتوانین گاڵتە بكەین بەو ڕوداوانەی خەڵكی ڕەشۆكی و ئاسایی لەبارەی هەواڵدانەكانی خەونەوە دەیگێڕنەوە... بەڵام سەختە، گاڵتە بەو مەسەلەیە بكەین كاتێ كەسێكی بڕواپێكراو یان ئەو توێژەرانە بیگێڕنەوە كە قورسایی خۆیان هەیە لە نێوەندە زانستی‌یەكاندا.

مامۆستا (راین) هەندێ ڕوداو دەگێڕێتەوە، یەك لەو ڕوداوانە ئەم چیرۆكەیە كە هەنوكە دەیگوازینەوە، مامۆستا (راین) بەخۆی چوە بەدوای ئەم چیرۆكە دا و دڵنیا بوە لە راستی‌یەكەی و، متمانە داری گێڕەرەوەكەی... پوختەی چیرۆكەكەش ئاوایە: گەنجێك شەوێ لە خەونی دا، وا دەزانێت لە ژوورێكی سپی دایە و ژوورەكە گڵۆپێك بەسەقفەكەی دا شۆڕ بۆتەوە و ژورەكەی ڕوناك كردۆتەوە، ژوورەكەمێزێكی حیزێكی تیایە، مێزەكە تەرمێكی لەسەرە و هەر دوو ئەژنۆی تەرمەكە بەرز بۆتەوە، تەرمەكە داپۆشراوە و تەنها ڕوخساری دیارە، ڕوخساریشی بەجۆرێ تێك و پێك شكاوە، تەرمەكە ناناسرێتەوە... گەنجەكە لەخەو ڕادەچڵەكێت... ڕۆژی داهاتوو گەنجەكە بانگ كرا بۆ نەخۆشخانە، و لەوێوە برایە ژووری نەشتەرگەری، گەنجەكە زۆر سەرسام دەبێت كە دەبینێ ژوورەكە لەو ژووره دەچێ كە شەوی رابردوو لە خەونیدا دیویەتی، تەرمی

مامیشی لەسەر مێزێ لە ژوورەکەدا دانرابوو و، هەر دوو ئەژنۆی لە ژێر ئەو چەفتەوە بەرز بونەتەوە کە تەرمەکەی پێ داپۆشراوە... ئنجا بۆی ڕون بۆتەوە کەمامی کاتێ سەر لەبەیانی لەماڵ دەچێتە دەرێ، ئۆتۆمبیلێ لێی دەدات و، دواتر بەهۆی برینەکانی لەو نەخۆشخانەیە دەمرێت.[١]

هەروەها مامۆستا (راین) چیرۆکی پیاوێکیترمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خۆی ناسیویەتی: ئەو کابرایە لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی لاوێتی دا دەیەوێت سەفەر بکات... بەڵام لەخەونی دا دەبینێ سواری شەمەندەفەر بوە و، شەمەندەفەرەکە ڕوداوی پێکدادانی لێ دەقەومێ، لەو پێکدادانەدا کۆندێشنی فارگۆنەکە دەکەوێت بەسەری دا و ئازارێکی زۆری دەدات... بەدەم لەرزەوە لەخەو ڕادەچڵەکێت و ئەم خەونە وای لێدەکات سەفەرەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.... ڕۆژی دواتر هەواڵ دەزانێ کە هەر بەڕاستی شەمەندەفەرەکە پێکدادانی توش هاتوە و، کۆندێشنی فارگۆنێکیش کەوتوە بەسەر پیاوێکدا و کوشتوێتی.[٢]

یەکێکیتر لەوانەی گرنگیان بەمەسەلەی خەون داوە، توێژەرێکە بەناوی (تیرل) ئەم توێژەرە لەیەکێك لە پەرتوکەکانی دا ژمارەیەکی زۆر چیرۆك و بەسەرهاتی لەبارەی هەواڵدانی خەونەوە کۆ کردۆتەوە... ئێمە بەنمونە تەنها دووان لەو نمونانەی (تیرل) دەگوازینەوە:

یەکەم: پیاوێکی بەریتانی کە ناوی (ئۆکرنر) بووە، لەساڵی (١٩١٢) دا دەیەوێت بە کەشتی بەناوبانگی (تایتانیك) گەشت بکات بۆ ئەمریکا... بەڵام لەخەونی دا دەبینێ کەشتیەکە خەریکە نقوم دەبێت و سەرنشینەکانیشی لە دەوروبەری دان و مەلە دەکەن لە ئاوی دەریاکەدا... شەوی داهاتووش (ئوکونر) جارێکیتر هەمان خەون دەبینێتەوە، بێئەوەی هیچ گرنگی بەم خەونە بدات هەر سور بوو لەسەر سەفەر کردن.. کەچی هەفتەیەك بەر لە وادەی سەفەرەکەیان، لەئەمریکاوە بروسکەیەك کرا بۆ (ئوکونر) و فەرمانی پێدرابوو گەشتەکەی دوا بخات، بۆیە ئەویش بلیتەکەی پوچەڵ کردەوە، و لە ئینگەلتەرا مایەوە چاوەڕوانی بروسکەیەکی دیکەی دەکرد... زۆر سەری سوڕما کاتێ هەواڵی نقومبوونی کەشتیەکەی پێ گەیی. ئەوە بوو کەشتیەکە خۆی کێشا بە چیایەکی

زەبەلاحی بەفرین دا و نقوم بوو و کەمێك لەسەرنشینەکانی دەرباز بوون[٣] (و بەشیهەرە زۆریان خنکان ـ وەرگێڕ).

لە چیرۆکی دووەمدا ئەم ڕووداوە باس کراوە: ژنێك شەوێ لە خەونی دا دەبینێ مامی مردووە و تەرمەکەیشی لەو ڕێگەیەدا فڕێ دراوە کە هەمیشە لێیەوە دەڕوات بۆ ڕاو... خەونەکە زۆر ڕوون بووە، بەڕادەیەك ئەو پۆشاکەی لەبەر دا بینیوە کە مامی لەبەری کردوە و هەروەها چۆن تەرمەکەی بە گالیسکەیەك کە دوو ئەسپ ڕایان کێشاوە هێنراوەتەوە بەر دەرگای ماڵەوەی، گالیسکەکە هەندێ "پوش وپەلاش " یشی تێدا بووە، دوو پیاو تەرمەکەیان بە پلەکانەکاندا سەر خستوە، هەر دوو دەستی تەرمەکە شۆڕ بونەتەوە و خشاون لە دیوار و پلەکانەکە... ژنەکە هەموو ئەوانەی لەخەونی دا دیوە ،پاشان لە خەون بەدەم ترسەوە ڕاچڵەکیوە... سەیریش لەوە دایە دوای دوو ساڵ خەونەکەی بەهەموو وردەکاریەکانیەوە دیوەتەوە، شەش ساڵیش دوای دووەمجار بۆ سێیەمین جار هەمان خەونی دیوەتەوە... لەکۆتایی دا خەونەکەی هاتۆتە دی ومامی لەهەمان ئەو شوێنەدا کە ئەم لە خەونەکەی دا دەیبینێ دەمرێت و تەرمەکەشی هەنگاو بەهەنگاو وەك لە خەونەکە دا دیویەتی هەڵدەگیرێت و دەهێنرێتەوە ماڵێ...[٤]

## نهێنییەکە چییە :؟

ئەو چیرۆکە سەیرە و هاوشێوەکانی بەچی لێك بدەینەوە؟ ئایا دەگونجێت پەلە بکەین لە بەدرۆخستنەوەیان دا ؟ وەك هەندێ لە خوێندەوارە غەراکان دەیکەن و ئیدی بۆ خۆمان وەحەسێین؟ یاخود دەبێ هەوڵ بدەین ئەوەندەی دەگونجێ بیخەینە سەر ڕوپەڕی لێکۆڵینەوەی بابەتی؟!

ئەوەی ڕاستی بێت ،کۆمەڵێ توێژەری زۆر هەن خۆیان سەرقاڵ کردوە بە پرسی هەواڵدانەکانی خەونەوە، لەلێکدانەوە و شیتەڵ کردنەوەی ئەو هەواڵدانانەش دا بوونەتە دوو گرووپ.... بەندە پێم باشە بەجۆرێکی بێلایەنانە ڕاو بۆچوونی هەر یەك لەو دوو گروپە لێرەدا نمایش بکەم. ئنجا ئەوە بەجێ دێڵم بۆ خوێنەر کەلایەنگری کام لەو دوو گروپەیە.

گروپی یەكەم، ئەم گروپە ( زۆرینەی) توێژەرانی خەون لەبواری دەروونناسی دا لەخۆ دەگرێت، ئەمانە هەوڵ دەدەن هەواڵدانەكانی خەون لێك بدەنەوە بەپێی ئەو هۆكارەی كە ناویان ناوە (هۆكاری ڕێكەوتن و ڕێكەوت)... یەكێك لەوانەی ئەم ڕێبازەی هەیە لە لێكدانەوەی هەواڵدانەكاندا بریتییە لە (دكتور ملاك جرجيس) پسپۆڕی دەروونناسی میسری..

لە خوارەوە دەقی ڕای ئەو دەگوازمەوە لەو بارەیەوە، كە لە یەكێك لە گۆڤارە میسریەكان دا چەند ساڵێ بەر لەئێستا بڵاوی كردۆتەوە... (دكتۆر جرجيس) دەڵێت: "ڕێژەی ئەو خەونانەی خەڵكی دەیان بینن و نایەنە دی زۆر لەو خەونانە زیاترە كە دێنەدی... هیچ بنەمایەكی زانستیش نیە كە كەسی سادە پەنای بۆ ببات لە ڕاڤەكردنی خەونەكانی خۆی دا... ئەو ڕێژەیەش كە دێننە دی (ئاسایی) بەهۆكاری ڕێكەوت دەبێ یان بۆ وە دەگەڕێتەوە كە ئەوەی خەوەكەی بینیوە بۆچونێكی وای هەبوە، یا بە شێوازێكی ناشیاوانەش بۆچون و پێش بینی‌یەكەی هەبوبێ، هیچ هەواڵدانێكیش لەو خەونانە دا نیە وەكو خەڵكی بەهەڵە وا گومان دەبەن... چونكە هەر كەسێ دڵەراوكێ و ترسی خۆی دەربارەی مەسەلەیەك لەبێداری دا بوروژێنێت و بترسێ لەوەی ڕوبدات ئەوا خەونەكانیشی پڕ دەبن لەو هەستانە، هەندێ جار وا ڕێ دەكەوێ بەشێ لەوەی بەخەون دیتویەتی دێتە دی، یاخود تەنانەت هەموو خەونەكەی دێتە دی، نەك بەهۆی خەونەكەوە، بەڵكو چونكە ئەوەی پێشبینی كردوە، دوا سەرەنجامێكی لۆژیكی بارودۆخەكانی دەوروبەری بووە . هیچ شتێ لەو ڕاستی‌یەش باشتر نیە بۆ سەلماندنی ئەم ڕایە ئەویش ئەوەیە كە زۆرینەی خەونەكان نایەنە دی، ئیدی چ بەڵگە بن لەسەر خێر یان بەڵگە بن لەسەر خراپەیەك".

**نمونەیەك بۆ ڕونكردنەوەی مەبەست:**

بۆ ڕونكردنەوەی ئەو لێكدانەوەیەی (دكتۆر جەرجیس) روداوێكی ڕاستەقینە باس دەكەین كە مامۆستا (سلامة موسي) لە پەرتوكەكەی خۆیدا (العقل الباطن) باسی كردوە... روداوەكەش بەم شێوەیەیە:

پیاوێ لە دەریاوە بەهۆی پاپۆڕەوە سەفەرێك دەکات، ڕۆژێك گێژەلۆکەیەکی بەهێز لە پاپۆڕەکە تاین دەبێت، پاپۆڕەکەش ،کۆنەو بەئاسانی بەرگەی ئەو گێژەلۆکە ناگرێت، بۆیە دەستی کردە لەنجە و لار کردن (دەربڕینی وەرگێڕ) لە دەریاکەدا... سەرنشینەکانی ترسیان لێ نیشت، ئەوەیان کە زۆر دەترسا، ئەم برادەرەمان بوو کە وای گومان دەبرد پاپۆڕەکە نقوم دەبێ... لەو کاتەدا دەنوێت و لەخەونی دا دەبینێ پاپۆڕەکە نقوم بووە، بۆیە ڕادەچڵەکێت و هێندەیتر ترسی لێ دەنیشێت و بڕیار دەدات هەر کە گەشتنە یەکەمین بەندەر پاپۆڕەکە بەجێ بهێڵێت.. بۆیە کاتێك گەیشتنە یەکەمین بەندەر وادەکەی خۆی بردە سەر و وارێکەوت دوای ئەوەیپاپۆڕەکەی بەجێ هێڵا نقوم بوو... دواتر بەسەرهاتی ئەم پیاوە بەناو خەڵکی دا بڵاو بویەوە و، کردیانە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی هەواڵدانەکانی خەون.. کەچی ڕاستی پێچەوانەی ئەوەیە... چونکە ترس وای لە کابرا کرد خەون بە نقوم بوونی پاپۆڕەکە ببینێ، دواتر بەرێکەوت پاپۆڕەکە نقوم بوو...

لە ڕاستی دا زۆرێك لە سەرنشینی ئەو پاپۆڕانەی گێژەلۆکە ڕویان تێدەکات خەون دەبینن بەنقوم بوونی کەشتیەکەیانەوە، بەڵام دوای ئەوەی بە بێوەی دەگەنە کۆتایی سەفەرەکەیان ،خەونەکانیان لەبیر دەچێتەوە، بۆ کەسی ناگێڕنەوە و گرنگیشی پێنادەن، بەڵام هەر کە خەونێکیان دێتە دی ، یەکسەر سەرسامی دایان دەگرێت و دەیکەنە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی هەواڵدانەکانی هەموو خەونێك.

### سروشتی زیاد ڕۆچون:

دەکرێت بەگشتی دەربارەی خەون ئاوها بڵێین... خەڵکی ژمارەیە بێکۆتایی خەون دەبینن، کەچی ڕاهاتوون لەسەر لەبیرکردنی خەونەکانیان و فەراموش کردنی، زۆر جاران کەسێك لە خەونی دا دەبینێ خۆشەویستێکی دەمرێت ،یان زیانێکی لێ دەکەوێت، بەڵام دوای ئەوەی دەزانێت خەونەکەی نەهاتەدی و بەبا دا چوو، لەبیری دەچێتەوە.. ئنجا گەر جارێك لە جاران بەهۆی ڕێکەوتێکی دەگمەنەوە، تاکە خەونێك لە هەموو خەونەکانی بێتە دی، کە ڕەنگە خەونێکی سادە و ساکاریش بێ، وەلێ کە دێتەدی دەست

دەکات بە زیادڕۆچون لەو خەونە و باسکردنی دا... خەڵکیش دەم بەدەم باس و خواسی ئەو خەونە دەگێڕنەوە و لەلای خۆشیانەوە بەگوێرەی حەز و ئارەزووەکانیان زیادەی دەخەنە سەر. چونکە نەریتیان وایە هەر هەواڵێکی سەیر ببیستن زیادەی دەخەنە سەر... بەوەش دەنکۆڵەیەکی بچکۆلە دەبێتە گۆمەزێك لەبەر دەستیان دا و خەونێکی ساکاریش دەبێتە ئایەتێك لە ئایەتەکان(ی خودا - دەربڕینی وەرگێڕ -).

ئەمەی گوتمان ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەمان بە یاد دێنێتەوە کە زۆر زیادەڕەوییان تێدا دەکرێت... وا ڕێ دەکەوێ کەسێك لەدوای قوربانیکردنێك لەمەترسییەك قوتار دەبێت یاخود لە نەخۆشیێك چاك دەبێتەوە... ئیدی خەڵکی وا گومان دەبەن قوربانیەکە هۆکاری چاك بونەوە یاخود دەربازبوونی بوو لەمەترسی... هەموو ئەو قوربانیە زۆر و زەوەندانە لەبیر دەکەن کە هیچ سودیان بەخاوەنەکانیان نەگەیاندوە... دەگێڕنەوە کابرایەك دەچێتە پەرستگەیەك، خزمەتکارانی پەرستگەکە لە چەند ڕوپەڕێکدا ناوی ئەو کەسانەی دەخەنە بەر دەست کە خودا بەهۆی قوربانی و نزای ئەمانەوە لە خنکان ڕزگاری کردون... دواتر پرسیار کرا لەپیاوەکە: ئایا لەدوای ئەو هەمووە بەڵگەیە، دان نانێن بە سوود و کەڵکی قوربانی و نزاکردن دا؟

کابرا لەوەڵامدا دەڵێت: بەڵام ڕوپەڕی ناوی ئەو کەسانە لە کوێیە، کە سەرەڕای قوربانی کردن و پاڕانەوەش هەر لەدەریا دا نقوم بوون و خنکان؟[5]

ئەو وەڵامەی کابرا، ڕاستەوڕاست دەگونجێ بەسەر خەونیش دا، ئەگەر هەندێك خەون بێنە دی و بکرێنە بەڵگە لەسەر دروستیی هەواڵدانی خەون، ئەی چی بکەین لەو هەندە خەونەیتر کە زۆر زۆریشن و ناشیەنە دی و وەڕاست ناگەڕێن؟!

لێکدانەوەی گروپی دووەم: ئەو لێکدانەوەی لەبەر دا شرۆڤەم کرد و وەی دی هاتنی خەونی دەدایە پاڵ هۆکاری ڕێکەوت، لێکدانەوەیەکە لای زۆرێك لە زانا دەروون ناسەکان قبوڵ کراوە... بەڵام ژمارەیەکیتر لە توێژەران پێی قایل نین... ئەو توێژەرانەمان ناو ناوە (گرووپی دووەم) . ئەمان لایان وایە دەکرێت هۆکاری "ڕێکەوت" بکرێتە لێکدەرەوەی زۆرێك لە هەواڵدانەکانی خەون، بەڵام بۆ هەموو هەواڵدانێکی خەونەکان ناگونجێت... چونکە هەواڵدانەکان هەندێ جار لایەنی تەم و مژداری وایان تێدایە

کەئاسان نیە بەو شێوەیە لێك بدرێتەوە کە لەمەسەلەی قوربانیەکاندا کردمان... ئەو لایەنانەش زۆرن و ئێمەلێرەدا دوو لایەنیان کورت دەکەینەوە:

یەکەم: هەندێ جار مرۆڤ لەخەونی دا ڕوداوێکی دوور و درێژ دەبینێت و، دواتر بەهەموو وردەکاریەکانیەوە دێتە دی، وەك ئەوەی لەسەر کاسێتێکی سینەمایی تۆمار کرابێ... لەو بارەدا خەونەکە هەواڵێکی سادە نەبووە، بەڵکو وردەکاری زۆری لەخۆ گرتوە... کەوایە ئاسان نیە بڵێین ئەو هەموو وردەکاریە لەخەونەکەش دا و لە بویەریش دا بەهۆی فاکتەری ڕێکەوتەوە کۆبونەتەوە... چونکە یاساکانی (احتمال) لەزانستی ئامار دا ئەوە بەدوور دەزانن.

دوووەم: هەندێ هەواڵدانی خەون هەیە کە دێنە دی، بەیەکجار نیشانەی کەسی خەوتوو نادرێ، بەڵکو هەندێ جار دووبارە دەبێتەوە وەك ئاژێرێك لە سەرچاوەیەکی نادیارەوە، هەوڵ دەدات مرۆڤ ئاگادار بکاتەوە لە مەترسی‌یەك کە لەپێشیەتی... بۆیە دەگمەنیش نیە گەر لەماوەیەکی درێژی زەمەنی دا ئاژێرەکە دوبارە بێتەوە... خەونێکی ئاوهاش نارەحەتە بەهۆکاری ڕێکەوت لێك بدرێتەوە... نەخاسمە کە ئێمە دەزانین ڕێکەوت بەیەکجۆر لە حاڵەتی زۆر دەگمەندا نەبێ دووبارە نابێتەوە.

هەموو ئەوەی گوتمان مانای وایە هەندێ لە هەواڵدانەکانی خەون بەڵگەن لەسەر هەبوونی هەستێکی نائاسایی لەمرۆڤ دا، کەدەتوانێ پەردەی زەمەن بڕێت و سۆراخی ئەو ڕووداوانە بکات کە لە پشتی ئەو پەردەیەوەن و لەداهاتودا ڕوو دەدەن.

## گرفتی کات:

هەر چۆن بێت گەر ئەم ڕایە پەسەند بکەین کە گروپی دووەم بڕوایان پێیەتی، ئەوا گرفتێکی فەلسەفی سەخت لەبەردەممان دا قوت دەبێتەوە، ئەویش بریتی‌یە لەوەی : چۆن دەروونی مرۆ دەتوانێ لەکاتی خەون دا پەردەی کات تێپەڕێنێت؟ یاخود بە دەربڕینێکی‌تر: کات چی‌یە؟

ئێمە واڕاهاتووین کات بەوە بناسین کە ژمارەیەك سات و چرکەی هەنوکەین و بەدوای یەکدا دێن و بەسەرماندا تێدەپەڕن... ئەمەش یانی لەنێوان ئێمە و ڕوداوەکانی

داهاتودا بەربەستێ زەمەنی هەیە کە هەندێ جار بەخولەك و چرکە دەیژمێرین و هەندێ جاریتر بە ساڵ و ڕۆژ حسابی دەکەین.

جا ئایا لەتوانای دەروونی مرۆڤ دا هەیە باز بدات بەسەر ئەو بەربەستەدا و ئەو شتانە ببینێت کە لە پشتییەوەن، وەك چۆن مرۆڤ دەتوانێت بەسەر بەربەستی شوێن دا باز دەدات و چی لەپشتیەوەیە دەی بینێت؟

هەندێ لە توێژەران بە (ئەرێ) وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەنەوە، بۆ ئەم وەڵامەشیان پشت بە تیۆرەکەی (ئەنشتاین) دەبەستن لە تێگەیشتنی کات دا[٦].

ئەمانە لایان وایە، کات لە بەدوای یەکدا هاتنی چرکەساتەکان پێك نەهاتووە.وەك ئێمەومانان لە تێگەشتنە باوەکانمان دا وا گومان دەبەین، بەڵکو کات هێڵێکی درێژبووەوەیە لە گەردون دا ، وەك درێژبونەوەی هێڵەکانی درێژی و پانی و بەرزی... کەواتە کات چوارەمین دووری دوای ئەو سێ دوریەیە کە ئێمە پێی ئاشناین.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم تێگەیشتنەدا دەتوانین بڵێین: ئەو چرکانەی کە درێژی کاتیان پێ دەپێوین هیچ نین جگە لە پێوەرگەلێ ئیعتباری کە لە خۆوە پێیان ڕاهاتوین بێئەوەی هیچ بناغەیەکی بابەتیان هەبێ... کات ڕاوەستاوە و نابزوێت، ئێمەین کە لەبەرانبەری دا دەجوڵێین و دوایش بەهەڵە وا دەزانین کات دەجولێت... دەگونجێت مرۆڤ لە ئاقار (کات) دا، بەو سەرنشینەی شەمەندەفەر بچوێنین کە لە پەنجەرەکەوە تەماشای ئەستونی عەلەتریکی سەر ڕێگەکان دەکات کە بەخێرایی بەلای دا تێ دەپەڕن، بەڵام لەڕاستی دا ئەستونەکان ڕاوەستاون و ناجولێن... ئەمە کە دەجولێت و بەلای ئەستونەکاندا گوزەر دەکات.

مامۆستا (جینز) دەڵێت: مرۆڤ لە ژیانی ئاسایی خۆی دا وەك ئەو کرمە کوێرە وایە کە لەسەر پارچە زەویەکی بچکۆلە دەژی... کرمەکە لە دنیادا تەنها بە دوو دوری ئاشنایە، ئەوانیش دوریەکانی پانی و درێژین، وەلێ ئەو دوریەی لە ژوور سەریەوە بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، ئەم هیچی لەبارەوە نازانێت و پێی ئاشنانیە...[٧]

بەدەربڕینێکیتر: مرۆڤ وا ڕاهاتووە سنوربەندی دنیا بەهەر سێ دووری درێژی و پانی و بەرزی بکات... وەلێ دووریەکی تر هەیە ، کە لە گەردوندا درێژ بۆتەوە و مرۆڤ

هیچی لەبارەوە نازانێت ، جگە لەو خاڵەی کە پیای دا گوزەر دەکات لە ڕێکردنی دا لەمیانەی زەمەنەوە... ئنجا واش دەزانێ چرکەیەکی ڕەفتەنیە، کەچی لە هەمان کاتدا بەشێکە لە هێڵێکی درێژ ، کە نەکۆتاییەکەی دەرکی پێ دەکرێ نە سەرەتاکەی.

## خەونەكان و كات:

مەبەستم لە شرۆڤەکردنی ئەو بیردۆزەی باسمکردوە، لەبارەی سروشتی کاتەوە، ئەوە نیە خوێنەر بڕوا بکات بەڕاستی بیردۆزەکە، چونکە ئەوە تیۆرێکە ڕەنگە ڕاست بێ و ڕەنگە هەڵەش بێ.

تەنها مەبەستم لەباسکردنی ئەو تیۆرە ئەوە بوو، خوێنەر ئاگاداری ئەو کۆڵەکە فەلسەفیە بێت کە هەندێ لە توێژەران پشتی پێدەبەستن لە لێک دانەوەی هەواڵدانەکانی خەون دا.

ئەوان بڕوایان وایە لەسۆنگەی ئەوەی کاتیش دووری چوارەمە و لەگەردووندا درێژ بۆتەوە، کەواتە ئەقڵ دەیبڕێ توانایەکی شاراوە هەبێت لە مرۆڤ دا کەیارمەتی بدات تاکو لەخەونەکانی دا بەسەر ئەو دوریەدا بفڕێت، بەجۆرێ کەم تا زۆر پەی بە ڕوداوەکانی داهاتوو بەرێ.

دەگونجێت ئەوە بە سەرنشینی فرۆیەك بچوێنین، ئەو بۆ نمونە کاتێك بەرز دەبێتەوە بەسەر روبارێکدا دەڕوات، دەتوانێت بنواڕێت بۆ هەندێ خاڵی دوور کە سەرنشینی بەلەمێ ناتوانێ سەیری بکات... ئەمەش یانی سەرنشینی فرۆکەکە ڕەنگە هەندێ شت بدۆزێتەوە کە سەرنشینی بەلەمەکە بە ڕوداوی داهاتوی دەزانێ کە دوای ئەوەی دەیگاتێ ئەی بینێت.

## تیۆرەکەی میستەر ( دن ):

لەبەریتانیا چەند ساڵێکە توێژەرێ دەرکەوتووە ناوی (میستەر دن)ە، ئەم توێژەرە پەرتوکێکی بڵاو کردۆتەوە بەناوی (ئەزمونێ لەتەك کات دا)، ئەم پەرتوکە ناوبانگی

باشی هەبوو لەنێو خەڵكی ئەوێندەردا... ئەم توێژەرە ڕایەكی وەك ئەوەی هەبە كەئێمە لەبەر دا باسمان كرد...[٨]

مامۆستا (دن) لای وایە كاتی داهاتوو بەهەموو ڕوداوەكانی یەوە ،لەبەردەممان‌دا ئامادەیە وەك چۆن ڕابردووش ئامادەیە لە پشت مانەوە، ئێمە بەهۆی خەونەكانمانەوە دەتوانین لە داهاتوو بنوارین، وەك چۆن دەتوانین لە ڕابردوو بنوارین، بەڵام ئەوەندە هەیە ئێمە وا ڕاهاتوین ، لە لێكۆڵینەوەی خەونەكانمان دا سەیری بەشی دواوەی هێڵی كات بكەین ، بێ‌ئەوەی سەیرێكی بەشی پێشەوەیشی بدەین... ئێمە لەم خوەماندا دروست لەو كەسە دەچین كە بەپەیژەیەكدا سەردەكەوێت و پشتی كردۆتە بەشی سەرەوە و چاوی بۆ بەشی خوارەوە شۆڕ كردۆتەوە، بۆیە ئەوكەسە هیچ كام لە پلەكانی پەیژەكە نابینێت، ئەوانەیان نەبێ كە لەژێر پێیەوەن و تێ‌پەڕیوە بەسەریاندا... وەلێ پلەكانی بەشی سەرەوە نابینێت و گرنگی‌یان پێ‌نادات چونكە پلەكانی سەرەوە كەوتونەتە پشتی‌یەوە و شاردراونەتەوە لێی... بەڵام گەر ڕوی بسوڕێنێت بەرەو پێشەوە ، دەتوانێت بیان بینێت.

لای (مستەر دن) خەون پێكهاتەیەكە لە تێڕوانینەكانی ڕابردوو و داهاتوو، هەر لەبەر ئەوەشە خەونەكانی مرۆڤ زۆر جار شپرزە و تێكەڵ و پێكەڵن، بەجۆرێ مرۆڤ ناتوانێ جیاوازی بخاتە نێوان ئەو خەونانەی لە ڕوداوەكانی رابردووەوە هەڵدەقوڵێن و ئەو خەونانەش كە لەڕوداوەكانی داهاتووەوە هەڵدەقوڵێن.

(مستەر دن) دەڵێت: گوایە شێوازێكی داهێنەرانەی دۆزیوەتەوە بۆ تۆماركردنی خەونەكانی ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی لەخەو رادەبورێ، ئەمەش بۆ ئەوەی خەونەكانی بپارێزێت لەو زیادە ڕۆییەی كە دەلكێنرێ بەخەونەوە، ئەو بڕوای وایە مرۆڤ دەتوانێت كاری خۆی لەو ڕووەوە بكات، و لەوانەشە بگاتە ڕادەیەك بەو هۆیەوە بتوانێت ڕوداوەكانی داهاتوو ببینێت و بەشێوەیەك لەشێوەكان لەو ڕووداوانەدا بژی..

**ڕەخنەکاری:**

ئەوەی رابورد، پوختەی تیۆرەکەی (میستەر دن)ە کە لە پەرتوکەکەی دا (ئەزمونێ لەتەك کات)دا هێناویەتیە کایەوە، جێگەی خۆیەتی ئاماژە بدەین بەوەی ، هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئەو تیۆرەدا لەبەریتانیا لەڕەخنەلێگرتن قوتار نەبووە... بەڵکو توێژەرێکی زۆر لەبەرانبەری دا ڕاست بونەوە و ڕەخنەیان ئاراستە کرد و بە خورافەچێتی ناوزەدیان کرد...

لەڕاستی دا گەر ئێمە بڕوا بەو تیۆرە بکەین، ئەمانگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی کە لەبڕوا بوون بەقەزا و قەدەر دەچێت، بەهەمان شێوەی بڕوای پێشینیان بە قەزا و قەدەرە... واتە ئەگەر مرۆڤ توانی لەرێگەی خەونەکانیەوە ڕوداوەکانی ئایندە پەی پێبەرێ، ئەوا یانی ڕوداوەکانی ئایندە لە ڕوپەڕی قەدەر دا هەن و بێگومان دێنەڕێمان، ئینجا مرۆڤ هیچی دەستەڵات نیە لەئاقاری دا ئەوەندە نەبێت کە خۆی بدات بەدەستیەوە.

بەهەر حاڵ، ئەمە بۆچوونی ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە تۆبزی (جبر) هەیە، گوایە مرۆڤ لەهەموو کردەوەکانی دا بەتۆبزی کاری پێ دەکرێت نەك بە ویستی خۆی، ڕەفتارەکانی ئەنجام بدات... وەلێ ئەو کەسانەی بڕوایان بە سەربەستی ویستی مرۆڤ هەیە و لایان وایە مرۆڤ خۆی دەتوانێت چارەنووسی خۆی دروست بکات و بینەخشێنێ (دەربڕینی وەرگێڕ)، ئەم جۆرە کەسانە سەختیەکی زۆریان دێتە پێش لە قایل بوونیان دا بەو ڕاو بۆچونە.

لەوانەیە ئەوە ڕاست بێ‌کەهەندێ جار مرۆڤ لە ژێر قورسایی بارودۆخە کۆمەڵایەتی و دەرونیەکانی‌دا بە تۆبزی کاری پێ بکرێ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێت لەنێو ئەو بارودۆخانەدا بوارێك بدۆزێتەوە و، بتوانیت تیای دا سەربەست بێت و، توانای هەڵبژاردنی هەبێ... ئەمەش مەسەلەیەکە هەموو ڕۆژێ لەخۆماندا بەدی دەکەین... جا گەر وابێ ئیدی چۆن دەگونجێت بڕوامان بەوە هەبێ کە ڕوداوەکانی ڕۆژگار سەپێنراون بەسەرماندا و ئێمەش بەهۆی خەونەوە دەتوانین پەیان پێبەرین؟!

**دەرەنجام:**

لەم بەشە دا ، ئەو بۆچون و بیردۆزە جۆراوجۆرانەم نمایش کرد کە توێژەران لەمەسەلەی هەواڵدانەکانی خەون دا هێناویانەتە کایەوە.. هەوڵیشم داوە لە ئاقاریان دا، هەڵوێستی گوێزەرەوەیەکی بێلایەنم هەبێ، لایەنگری لایەکیانم نەکردوە لە بەرانبەر لایەنێکیتر دا... ئەوپەڕی توانا و هەوڵی خۆشم خستۆتە کار تاکو بتوانم بەو شێوەی خاوەن و لایەنگرانی بیردۆزەکە بڕوایان پێیەتی ئاوای شرۆڤەی دید و بۆچونەکانیان بکەم بە بێدەستکاری کردن و گۆڕینیان.

لێرەدا ڕەنگە خوێنەر پرسیاری ڕای خۆمم لێ بکات دەربارەی ئەو هەموو بۆچونە دژبەیەکانە... بۆیە دەمەوێت دان بنێم بە دەستەوسانی خۆمدا لەدەربڕینی هەر بۆچونێکی یەکلاییکەرەوە لەم بابەتەدا... هەموو ئەوەی دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە ئێمە هێشتر لەسەرەتای ڕێگە داین... لەوانەیە زانست "ئیدی دێر بێت یان زوو" پەردە لەڕوی تەم و مژەکانی سەر ئەم بابەتە ئاڵۆز و ناڕەحەتەمان بۆ لا بدات.

ئەمەوێ لێرەدا هەلی ئەوە لەدەست نەدەم کە هەڵەی ئەو خوێندەوارانەمان دەربخەم کە بەچاوی سوکایەتیەوە لەم مەسەلەیە دەڕوانن... هەر کەیەکێکیان گوێی لە باسێکی هەواڵدانی خەونەوە دەبێ، دەست بەجێ ملی بادەدات و بەخورافەی لە قەڵەم دەدات.

ئەو جۆرە کەسانە پێویستە بزانن مەسەلەکە زۆر لەوە گرنگترە گاڵتەی پێ بکەین ، یاخود بە نوکە قەڵەمێ بیسڕینەوە.بەڵکو چەندین لەغزی سەرسامکەری تێدایە... ئەرکی زانستی ئەوە دەسەپێنێ بەسەرماندا کە لەو لەغزانە بکۆڵینەوە، هەوڵی لێك دانەوەیان بدەین ، بەگوێرەی ئەو ئامرازە بابەتیانەی کە لەبەر دەستماندان... ڕەنگە بەوەش بتوانین یارمەتی زانست بدەین، لە دۆزینەوەی هەندێ لە نهێنییەکانی دەروونی مرۆڤ دا... وەك چۆن پێشینیانمان یارمەتی زانست یان دا لە دۆزینەوەی ئەتۆم و ئەلکتریك دا.

## پەراوێزەكانی بەشی سیانزدەیەم:

١ـ بنواڕە: Rhine Reach of Mind, P 59

٢ـ بنواڕە: I bid, P 71

٣ـ بنواڕە: Tyrrell, Personality of Man, P 81

٤ـ بنواڕە: 1 bid, P 76 – 77

٥ـ بنواڕە: أحمد أمين، قصة الفلسفةالحديثة، ج ١ ل ٦٤.

٦ـ بنواڕە: علي الوردي، مهزلة العقل البشري، ل ١٧٧ ـ ١٨٢.

٧ـ بنواڕە: Jeans, Mysterious Universe, P 148

٨ـ بنواڕە: Dunne, An Experiment Withtme

٩ـ بنواڕە: Jaod Guide to Modern Thought, P 172 – 173

# بەشی چواردەیەم

## هەواڵدانەكانی خەون "پاشگر"

لەبەشی رابردوو دا باسمان لەو توانایە كرد ، كەدەدرێتە پاڵ خەون سەبارەت بە هەواڵدان لە ڕوداوەكانی داهاتوو، بینیشمان چۆن توێژەران ناكۆكن و یەكڕانین لەمەڕ ئەو پرسە... لەم بەشەدا دەمەوێت باس لە توانایەكیتر بكەم كە دەدرێتە پاڵ خەون و ئاماژەش بۆ بۆچونی لێكۆڵەران لەو ڕووەوە بكەم.

ئەو توانایەش كە هەنوكە باسی دەكەین ، بەمانایەكی ورد هەواڵدان نیە، چونكە هەواڵی ڕودانی ڕوداوێكی داهاتوو نادات كە ئێستاكە روی نەدابێ، بەڵكو هەواڵ لە ڕودانی ڕوداوێك دەدات كە لە ئان و ساتی خەون بینینەكەدا لە جێیەكی دوور یان نزیك دا ڕوو دەدات.. باوا دابنێین خۆشەویستێك چۆتە سەفەرێك و لێت دوور كەوتۆتەوە و تۆش دەترسیت شتێكی بەسەر بێت و دڵەڕاوكێتە بۆی... ئنجا شەوێك دەخەویت ،خەونێكی پێوە دەبینی و، وا دەبینی كەشتێك بەسەر خۆشەویستەكەت هاتوە... دواتر ڕون دەبێتەوە كە لەهەمان ئەو كاتە دا تۆ خەونەكەت پێوە دیوە ، ئەو شتێكی بەسەر هاتوە.

توێژەران چیرۆك گەلێ زۆر و زەوەندیان لەم جۆرە خەونە لا كۆبوتەوە ،جا ئایا لێكدانەوەیان چۆن دەبێ؟

## هەندێ نمونەی ڕاستەقینە:

مامۆستا (سینل) بەسەرهاتی خەونێكی لەم جۆرەمان بۆ دەگێڕێتەوە، پوختەكەی ئەوەیە ، ژنێكی دانیشتوی شاری (لەندەن) كوڕێكی ئەبێ لێیەوە دوور ئەبێ، كوڕەكەی لەگەڵ هەڤاڵێكیدا بەسەفەر چوەتە دۆڵی ئەمەزۆن ) لە ئەمریكای باشور...بەیانیەك ئافرەتەكە لەماڵ دێتە دەرێ و لەوپەڕی شپرزی و شڵەژاوی دا دەبێت و ، دەڵێت لە خەونی دا دیویەتی كوڕەكەی یان هاوڕێكەی لە لایەن دڕندەیەكی جەنگەڵەكەوە

کراونەتە نێچیر... دوای ماوەیەك کوڕەکەی بەتەنها دەگەڕێتەوە (لەندەن) و باسی گەشتەکەیان دەکات... لەقسەکانیدا دەردەکەوێت کە لەهەمان کات و ساتی خەونەکەی دایکی دا پڵنگێك هێرشی کردۆتە سەریان و هاوڕێکەی بەو هۆیەوە گیان لەدەست دەدات و ئەمیش بریندار دەبێت، بەڵام برینداریەکەی کوشندە نا.[١]

هەروەها مامۆستا (راین)یش چیرۆکی خەونێکی هاوشێوەی ئەو خەونە دەگێڕێتەوە... پوختەکەشی ئاوایە: مامۆستایەك کە هاوڕێی ڕاینە لە زانکۆدا، کوڕێکی دەبێت لە "جاوا" دادەنیشێت... کوڕەکە شەوێك لەخەونی دا دەبینێت خەڵکی لەبە خاك سپاردنی دایکی دا ڕێ دەکەن.. ئەم خەونە وای لێ دەکات نامەیەك بنوسێ بۆ باوکی و هەواڵی دایکی بپرسێت... سەیریش لەوەدایە کەدایکی هەر هەمان شەو مردووە.[٢]

ڕۆژنامەی (ئەهرام) رووداوێکی سەیر دەگێڕێتەوە کە لە یەکێك لەشارەکانی (مەکسیك) دا ڕوو دەدات و پەیامنێری تایبەتی ڕۆژنامەکە هەواڵەکەی بۆ ناردون، پوختەی چیرۆکەکەش ئاوایە: گەنجێك توشی خورپەیەکی دەماریی توند دەبێت ، بەهۆی ترسێك کە لە ناکاودا دوچاری بووە، بەو هۆیەشەوە دەکەوێتە سەر زەوی، کەس و کارەکەی وایان زانی مردووە ، بۆیە لە گۆڕێکی تایبەتی خانەوادەکەیاندا ئەسپەردەیان کرد ، شەوێ دادێ کوڕەکە لە خەو ڕادەبورێ و هەستێکی سەیری لا دروست دەبێت کە کوڕەکەی ئێستاش زیندوە.. بۆیە هەندێ لە دراوسێکان بێدار دەکاتەوە و کرێکار دەباتە سەر گۆڕەکە و ئەیەوێت هەڵی بداتەوە... دەستەڵات دارانی خۆجێیەتی شارەکەش لەسەرەتا دا دودڵن بوون لە ڕێگەدان بەو کارە ،دواتر ڕێگەیان پێدا... بۆیە کاتێ گۆڕەکەیان هەڵدایەوە، دایکەکە کوڕەکەی بینی دانیشتوە و دەگری، بۆیە خێرا باوەشی پێدا کرد و توند لەئامێزی گرت.[٣]

**لە دەرەوەی خەون دا:**

شیاوی ئاماژەپێدانە، ئەم جۆرە هەستە سەیر و نامۆیە تەنها لەکاتی خەوندا ڕو نادات... بەڵکو هەندێ خەڵك لە ساتەکانی بێداری دا هەستی وایان لا دروست دەبێت..

بۆ ڕونکردنەوەی ئەو گوتەیە، ئەم نمونەیە، دەگێڕینەوە کلە (لیوا محمد نجیب) ڕوی داوە... لیوا محمد خۆی لە پەرتوکەکەیدا (مصیر مصر) باسی ئەو ڕوداوەمان بۆ دەکات و دەڵێت: لەساڵی ١٩١٤ دا لە کۆلێژی (گۆردن)ی سەربازی لەسودان خوێندکار دەبێت، ئێوارەیەکی ئەو ساڵە لەبەشی ناوخۆیی دا دادەنیشێت و خۆی بۆ تاقی کردنەوە ئامادە دەکات، لەو کاتەدا بەخەیاڵی دا دێت کەوا باوکی هاتوە و دەیەوێت هەواڵێکی زۆر گرنگی بداتێ، بەو هۆیەوە "محمد نەجیب" بێتاقەتیەکی زۆر دایدەگرێت و فرمێسك لە چاوەکانی دادەبارێت ، تا ڕادەیەك هاوەڵەکانی هەستی پێدەکەن و دەورەی لێ دەدەن و سەریان لێی سوڕ دەمێنێ... کاتژمێر نۆی هەمان ئێوارە ڕاست بۆوە (دەربڕینی وەرگێڕ) و پۆشاکەکەی خۆی دڕی، ئەمەش وایکرد ماموستایەکی بێت و بە شێت تۆمەتباری بکات... محمد نجیب نەی توانی ئەو شەوە بنوێت... سەر لە بەیانی ڕۆژی داهاتووش خورپەیەکی‌تری بۆ هاتەوە و لەئەنجامدا تەرپۆشەکەی سەری خۆی داگرت و فڕێی دایە سەر زەوی و بە پێیەوە چوە سەری... دوای چەند ساتێ ماموستایەکی دێت و هەواڵی مردنی باوکی پێ دەدات... دواتر ڕون بویەوە کە بابی شەوی ڕابردوو مردوە، لەکاتێکی نزیکی ئەو کاتەدا کە محمد نجیب پۆشاکەکەی خۆی تێدا دڕاندوە... محمد نجیب کە توانج لەو ڕوداوە دەدات دەڵێ: "من هیوادارم وا دەرنەکەوم ئەگەر بڵێم: ئەو ڕەفتارە نامۆیەم لەو ڕۆژەدا جۆرێك بوو لە هەستکردنێکی زیادەڕەو"..

### ئەی چی؟

کەواتە بەچی ئەو هەستە کت و پڕیە لێك بدەینەوە؟ ئایا بەرەنجامی هەستێکی زیادەڕەوە وەك (محمد نجیب ) دەڵێ؟ یاخود هەستێکی ئاساییە و دواتر لە ڕێی ڕێکەوتێکی دەگمەنەوە هاتۆتە دی؟!

(ئۆلیفەر لۆدج)ی زانای سروشتناسی بەناوبانگ، یەکێکە لەو کەسانەی هەوڵیان داوە، وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە... (لۆدج) توێژینەوەیەکی بە ئامار سازکرد و بەدووی بارودۆخی ژمارەیەکی زۆری خەڵك دا چوو... لەئەنجامدا بۆی دەرکەوت (١٣٠٠) کەس لە ژیانیان دا یەکجار هەستێکی سەیر دایگرتوون، کە هەواڵی ڕودانی کارەساتێکی

دوانێ کە بەسەر یەکێك لە خزم و دۆست و خۆشەویستانیاندا دێت... هەروەها بۆیشی دەرکەوت تەنها (٣٠) لەو (١٣٠٠) جارە هەستەسەیرەکان هاتونەتە دی... بەمانایەکی‌تر ڕێژەی بەڕاست دەرچون (١) بۆ (٤٣) بوە.

مامۆستا (لۆدج) دەڵێت: ئەو ڕێژەیە سەرەڕای کەمێتی‌یەکەی، بەڵام دیاردەیەکە دەلالەتی ئاماریی مەزنی هەیە، چونکە ڕێژەیەکی زیاترە لەوەی بە ڕێکەوت ڕوی دابێ.. (لۆدج) هەروەها چەندین کرداری ژمێرەیی و ئاماریی ورد و ئاڵۆزی ئەنجام داوە بۆ پشتگیری کردنی ئەم ڕایەی... لەوەش دا گەشتۆتە ئەو بەرەنجامەی کە دەبێت لەنێوان هزر و مێشکی ئەو کەسەی ڕوداوەکەی بەسەر دا دێت و، ئەو کەسەش کە لە دەرەوە هەستی پێ دەکات، جۆرە پەیوەندیەکی نادیار هەبێت، ئەو پەیوەندیەی کە تا ئێستە زانست نەیتوانیوە نهێنی‌یەکانی بدۆزێتەوە.[٤]

مامۆستا (سد جویك)یش لە لێکۆڵینەوەی دا لەم بابەتە ، گەشتۆتە بەرەنجامێکی هاوشێوەی بەرەنجامەکەی مامۆستا (لودج).. (سد جویك) لێکۆڵینەوەی لە (١٧٠٠٠) هەڤدە هەزار حاڵەت کردوە، و پاشان بەراوردی کردوە لە گەڵ (ئاماری گشتی ڕوداوەکان)دا و، لەمەوە بۆی دەرکەوتوە، هەستکردنی مرۆڤ بەمردنی ئازیزێکی، چوار سەد و چل جار زیاتر لە ڕێکەوتی موجەڕەد وەڕاست دەگەڕێ.[٥]

**توێژینەوەکانی ( ڕاین ):**

مامۆستا (ڕاین) توێژەرێکی ئەمریکی‌یە و، بەلێکۆڵینەوەکانی لەم بابەتە و بابەتە پەیوەندی دارەکانی دا ناوبانگ و شۆرەتی پەیدا کردوە... هەروەها ئەو فەزڵی کردنەوەی بەشێکی تایبەت بەم بابەتەی پێ دەبرێت لە زانکۆی (دیوك)دا، کە ناوی نا (بەشی پاراسایکۆلۆژی).

(ڕاین) باسی یەکەمین هاندەرمان بۆ دەکات کە ،پاڵی پێوە ناوە بۆ دامەزراندنی ئەم بەشە زانکۆییە... دەڵێت: کاتێك قوتابی بووم لە زانکۆدا، لەیەکێك لە مامۆستاکانەوە گوێبیستی چیرۆکی خەونێکی سەیر بووم کە مامۆستاکە خۆی یەکێك بووە لەوانەی ڕوداوەکەیان بە چاوی خۆیان دیوە.. پوختەی چیرۆکەکەش ئاوهایە: ژنێکی دراوسێی

ماموستا، شەوێ لە خەونی دا دەبینێت کە براکەی بەخۆکوشتن دەمرێت، بۆیە بە شلەژاوی لە خەو ڕادەبورێ و هاوسەرەکەی لەخەو بێدار دەکاتەوە، پێداگری دەکا لە مێردەکەی تاکو گالیسکەیەك ئامادە بکات، تاکو بچێت بۆ مالی براکەی کە نۆ میل لێیانەوە دوورە... مێردەکەی لە ژێر فشاری ژنەکەدا هەلدەستێت و دەچێت تەقە لە دەرگای دراوسێکەیان (واتە ماموستاکە - وەرگێڕ) دەدات و داوای گالیسکەی لێدەکات، دوای ئەوەی دەیاندانێ ، خۆی و ژنەکەی دەچنە مالی برای ژنەکە... کە ئەبینن هەر بەڕاستی براکەی خۆی کوشتوە... سەیر لەوەدایە براکەی لەهەمان ئەو جێگەیەدا و بەهەمان ئەو شێوەیە کەوتبوو کە خوشکەکەی لە خەونی دا دیبووی...[٦]

(ڕاین) دەلێت) ، ئەم چیرۆکەی کە لەسەردەمی لاوێتی دا بیستوێتی تەواو سەرسامی کردوە، نە توانیوتی بڕوای پێبکات و نە توانیوتی بەدرۆی بخاتەوە... لە لایەکەوە نەی دەتوانی بڕوای پێ بکات چونکە بەلایەوە ماقول نەبووە، هەروەها نەیشی دەتوانی بەدرۆی بخاتەوە، چونکە ئەو کەسەی گێڕاویەتیەوە زانایەکی گەورە و شۆرەت بلندە.

رۆژگار هات و ڕۆیی بەسەر (ڕاین)دا و، پەیتا پەیتا چیرۆکی هاوشێوەی ئەو بەسەرهاتەی دەبیست، بەلام هەستی دەکرد ئەو خەلکەی چیرۆکەکە دەگێڕنەوە بە لایانەوە زۆر ئاساییە ،پێیان وایە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە، زۆربەشیان هەولیان داوە بەهۆکاری (ڕێکەوت) لێکی بدەنەوە.

لێرەوە ئیدی (ڕاین) کەوتە پرسیارکردن لەخۆی: ئایا ڕێکەوت چیە و کامەیە؟ ئایا ڕێکەوت شتێکی بێسەر و بەرە وەکو خەلکی ڕەشۆکی وا گومان دەبەن، یاخود بەگوێرەی یاسا بەڕێوە دەچێ؟ وە ئەگەر ڕێکەوت بەگوێرەی یاسا و ڕێسا بەڕێوە دەچێت، ئایا دەگرێ توێژینەوەلە خەون و هەستکردنە سەیرەکان بکرێت لە بەر ڕوناکی ئەو یاسایانەدا...؟

ئەم پرسیارانە پزیسکەی ئەو ئاگرە بوون کە لە هزری راین دا پێداگری ئەوەی بەرپا کرد کە ڕاین هەستێت بە کۆمەلێ لێکۆلینەوەی تاقیگەیی کە تیای دا شێواز و ئامرازگەلێ زۆری ئاماریی بەکار بردووە... بەرەنجامی توێژینەوەکانیش (ڕاین)یان گەیاندە ئەو بڕوایەی ، کە مرۆڤ لە قولاییەکانی ناخی دا توانای ئەوەی هەیە پەردە و

بەربەستەکانی کات و شوێن تێپەڕێنێت، ئەم توانایەش لە ڕوی بەهێزی و بێهێزیەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر دەگۆڕێت، تەنانەت ڕەنگە لای کەسێك لە کاتێکدا زۆر بەهێز بێت و لەکاتێکیتر دا لاواز بێت.

(ڕاین) ئەم توانایەی ناو ناوە "دەرك کردنی بێهەست"[٧]

## زانایانی ئەمریکا:

جێگەی نیگەرانیە بڵێین توێژینەوەکانی (ڕاین) لە ئەمریکا دا بەگاڵتە و سوکایەتی پێکردنەوە پێشوازی لێکرا... زۆرینەی زانا و مامۆستایانی زانکۆ لەوێندەر ئەو لێکۆڵینەوانەیان دەدایە پاڵ خورافە... هەروەها دەگێڕنەوە یەکێك لە توێژەرە ئەمریکیەکان توێژینەوەکانی (ڕاین) سەرسامی دەکات، بۆیە بەنهێنی دەست دەکاتە تاقیکردنەوە لەسەریان ، لە ئەنجامدا دەگاتە بەرئەنجامێك کە پاڵپشتی ڕاکانی ڕاینی دەکرد، بەڵام ئەمەی لە خەڵك شاردەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا بە خورافەچێتی تۆمەتباری کەن.

لەکاتی کۆبونەوەی (کۆنگرەی ئامارە ماتماتیکیەکان) لە ئەمریکا، لەساڵی (١٩٢٧)دا، توێژینەوەکانی راین تاوتوێ کران، لە دوای تەواو بوونی کۆنگرەکەش ڕونکرنەوەیەکیان بڵاو کردەوە کە تیای دا هاتبوو:

"توێژینەوەکانی ڕاین، دوو لایەنی ئەزمونی و ئاماری تێدایە، ماتماتیکیەکان ناتوانن لە بارەی لایەنە ئەزمونیەکەیەوە هیچ بڵێن... بەڵام سەبارەت بە لایەنە ئاماریەکەی، ئەوا توێژینەوە ماتماتیکیە نوێیەکان دەریان خستوە کە شیکردنەوە ئاماریەکەی (ڕاین) ڕاستە، جا ئەگەر بکرێ هێرش بکرێتە سەر توێژینەوەکانی (ڕاین)، ئەوا پێویستە لە لایەنێکیترەوە هێرشی بکرێتە سەر نەك لە لایەنە ماتماتیکیەکەیەوە".[٨]

## بۆچونی "سینل":

مامۆستا (جۆزیف سینڵ) توێژەرێکی پسپۆڕە لە زانستی زیندەوەرزانی و پەرەسەندنی گیانەوەری دا، ماوەیەکی زۆری تەمەنی خۆی تەرخان کرد بۆ لێکۆڵینەوەی

دیاردەی هەستكردنی نائاسایی لای مرۆڤ و گیانەوەران.. ئەو لێكۆڵینەوانەش "سینڵ"یان گەیاندە بڕوایەك كە بڵێت: مرۆڤ لەنێو مێشكی دا دەزگایەكی تایبەتی هەیە كە دەتوانێت شەپۆلە (كارۆموگناتیسی)یەكان لە مێشكێكیترەوە وەربگرێت، وەك چۆن "چاو" شەپۆلەكانی روناكی وەردەگرێت، یان وەكو چۆن ئامێری رادیۆ شەپۆلەكانی بێتەلی وێستگەكانی رادیۆیی وەردەگرێت. (سینڵ) ئەم دەزگا مرۆییە ناو دەنێت (هەستی شەشەم)... لەبەشی ئایندە دا هەندێ بەوردی باسی ئەم هەستە دەكەین... لێرەدا ئەوەندە بەسە كە بڵێین: بەڕای سینڵ هەستی شەشەم لەمرۆڤ دا زۆر بە لاوازی و پەنامەكی كاردەكات، مرۆڤ لە ژیانی ئاسایی خۆی دا، هیچ گوێی پێنادات چونكە سەرقاڵە بە ژیان و بژێوی خۆیەوە و بیری لێ دەكاتەوە و نەخشەی بۆ دەكێشێ، بەو جۆرە ترپەكانی هەستی شەشەمی لێ بزر دەبێت، وەك چۆن زیكەی قالۆنچەیەك لە نێو ئاهەنگێكی جەنجاڵی مۆسیقی دا وون دەبێت.[٩]

هەروەها ( سینڵ ) باس لەو حاڵەتەی خەون دەكات كە مرۆڤ هەندێ جار بەهۆیەوە هەست دەكات بەوەی كارەساتێ بەسەر خۆشەویستێكی دا دێت لەجێگەیەكی دوورەوە... لەلێكدانەوەكەی دا دەڵێت : لەوانەیە مێشكی ئەو كەسەی خەوەكەی دیوە و ئەو كەسەی كارەساتەكەی لێ ڕوو دەدات پێكەوە گونجاو بن، بەوەش دەتوانێت ئەو شەپۆلانە وەرگرێت كە لەو مێشكە دوورەوە ڕەوانە دەكرێت، وەك چۆن ئامێری ڕادیۆ كاتێ لەگەڵ درێژی شەپۆلەكانی ئێستگەیەكدا گونجا ، شەپۆلەكانی وەردەگرێت.. بۆ نمونە ئەو دایكەی كوڕێكی بەسەفەر دەڕوات و لێی دوور دەكەوێتەوە، هەمیشە پێیەوە سەرقاڵە و هزری بەشەو و ڕۆژ بەكوڕەكەیەوە پەیوەستە... بەڕای سینڵ ئەمەش یانی دەزگای هەستی شەشەمی دایكەكە بە بەردەوامی بەرەو ڕوی كوڕەكە ڤیت بۆتەوە، بۆیە لەو كاتە دا دەگونجێت توانایەكی تایبەتی هەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو شەپۆلانەی لەمێشكی كوڕەكەوە دەردەچن.

### هەندێك بەڵگەی پشتگیری كار:

دەگونجێت بڵێین: ئەم ڕایەی (سینڵ ) لەبارەی هەستی شەشەوە هەیەتی ، هیچ نیە جگە لە "گریمان"ێك، دەگونجێت ڕاست بێ و دەشگونجێت هەڵە بێت، بەڵام لەگەڵ

ئەوەش دا دەتوانین بڵێین، توێژینەوە ( فیزیایی و فەسلەجیە نوێکان ) کەم تا زۆرێ بەلای ئەوە دان کە پشتگیری ئەم ڕایە بکەن، بۆ نمونە: ئەو توێژینەوانە دەریان خستوە ، مێشکی مرۆڤ جۆرە شەپۆلێکی کارۆمۆگناتیسی دیاریکراو دەردەدات.. بەم دواییانەش ئامێرێکی تایبەت دروستکراوە بۆ تۆمارکردنی ئەو شەپۆلانە و بەتاقیکردنەوەش بۆ زانایان ڕون بۆیەوە کە شەپۆلەکانی مێشك لەکاتی نوستن دا جیاوازە لەو کاتانەی بیر ناکاتەوە، لە کاتی تەندروستی و لەش ساغیدا جیاوازن لەکاتی نەخۆشین... (دکتۆر دایفیس) ئەگاتە ئەو بڕوایەی کە بڵێت: هەر کەسێك لەمێشکییەوە شەپۆلی تایبەت بەخۆی دەردەدات و هیچ کەس لە گەڵی دا لەو شەپۆلانە هاوبەش نیە، بەمانایەکیتر شەپۆلەکانی مێشك وەکو مۆری پەنجە (دەربڕینی وەرگێڕ) وان و هەرگیز دوو مرۆڤ ڕێناکەوێ مۆری پەنجەیان لە یەك بچێت (ئەو مۆری پەنجەیەی بۆیە لە فەرمانگەکاندا بەکار دەهێنرێ ، چونکە وێنەی پەنجەی هیچ کەسێ لە کەسێکیتر ناچێت ـ وەرگێڕ).

ئینجا کەوابێ، نارەحەت نیە گەر چاوەڕوانی ئەوە بکەین پێکفەگونجانێکی شەپۆلی ڕوبدات لەنێوان مێشکێك و یەکێکیتردا سەرەڕای دووری نێوانیان، بەوەش یەکێك لە مێشکەکان دەتوانێت هەست بکات بەو کارلێکە هزریە بەهێزانەی کە لەمێشکەکەیتر دا ڕوو دەدەن، هەر چەندە لێشی دوور بێت.

ئێمە نکولی ناکەین لەوەی شەپۆلەکانی مێشك زۆر لاوازن... چونکە لەکاتی تۆمارکردنیدا لە ئامێرە تایبەتەکەدا دەردەکەوێت کە کاریگەریەکی سنورداری هەیە و لەماوەیەکی کورت تێناپەڕێ... بەلام ئەمە یانی نە کە ئاسەوارەکەیشی بەو ئەندازەیە... چونکە بە شێوازی زانستی سەلمێنراوە کە هەر شەپۆلێکی کارۆموگناتیسی لەڕوی کاریگەریەوە هەموو گەردون دەگرێتەوە، ئیدی جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی شەپۆلەکە لاواز بێ یان بەهێز بێت.

**ڕەخنەکانی ( تیرل ) :**

لێرەدا ئەوەی شیاوە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کە زۆرێك لە توێژەران دان بە بوونی هەستی شەشەم یان لێك چویەکی وی لە مرۆڤ دا دەنێن، وەلێ قایلێ ناون لە لێك

دانەوەیدا بە "شەپۆلی كارۆ موگناتیسی" ئاماژەی پێ بكەن... یەك لەوانە، توێژەرێكی بەناوبانگە بەناوی مامۆستا "تیرل". بەڕای ئەم توێژەرە گریمانی "شەپۆلی" ناگونجێت بۆ لێكدانەوەی هەستە نائاساییەكە، بۆ ڕەد دانەوەیشی چوار ڕەخنە دەخاتە ڕوو، كە ئێمە بەم تەرزە كورتیان دەكەینەوە:

١- تیرل دەڵێت: ئەگەر هەستە نائاساییەكە بەهۆی پێكفەگونجانێكی شەپۆلیەوە بوایە لە نێوان دوو مێشك دا، ئەوا دەبوا لەنێو یەكێك لە مێشكەكاندا دەزگایەكی نێرەری شەپۆل هەبوایە ، هێندە بەهێز بوایە بیتوانیایە شەپۆل بەڕووبەرێكی پان و بەریندا ڕەوانە بكات، هەروا دەبوا لە مێشكەكەی تریش دا دەزگایەكی وەرگرتنی ئەو شەپۆلانە هەبوایە، كەچی زانایان هەرگیز دەزگای لەو جۆرانەیان لەمێشكی مرۆڤ دانەدۆزیوەتەوە.

٢- هەروەها تیرل دەڵێت: زانایان ئێستاكە ئامێری هێندە هەستیاریان لە لایە كە دەتوانێت وردترین شەپۆلی كارۆ موگناتیسی تۆمار بكات، كەچی تا هەنوكە نەزانراوە ئەو ئامێرانە كۆمەڵە شەپۆلێكیان تۆماركردبێ یان دۆزیبێتەوە كە هەڵگری بیرگۆڕكێ (دەربڕینی وەرگێڕ)ی نێوان دوو مێشكی لێك دوور بن.

٣- تیرل دەڵێت: شەپۆلە كارۆ موگناتیسیەكان سروشتیان وایە كە بەشێوەیەكی گشتی لەكەمی دەدەن بە ڕێژەی، چوار گۆشەی ماوە (مسافە)، وەك لە توێژینەوەكانی بێتەلیشدا زانراوە... جا ئەگەر هەستە نائاساییەكە بەرئەنجامی گواستنەوەی شەپۆلە كارۆ موگناتیسیەكان بێت ئەوا دەبێت مل كەچی ئەم ڕێسا گشتیە بێت، كەچی لەڕاستی دا دەبینین كە ناچێتە ژێر كاریگەری دووری (ماوە)وە...

٤- تیرل لە كۆتا ڕەخنەی دا دەڵێت: ئەگەر شەپۆلە كارۆ موگناتیسیەكان ، بیرەكان لەنێوان مێشكێكی و یەكێكی دی دا دەگوازنەوە، ئەوا دەبوا شیفرەیەك یان زمانێكی لەگەڵ دا بوایە كە بەهۆیەوە هەر دوو مێشكەكە لەیەكدی تێبگەن.

### وەڵامدانەوەی ڕەخنەكان:

گومانم لەوەدا نیە كە ڕەخنەكانی تیرل بەهێزن، بەڵام هێندەش بەهێز نین كە ئێمە نەتوانین پوچەڵیان بكەینەوە وە یا خود وەڵامیان بدەینەوە، لە ڕەخنەكانی تیرلەوە وام

بۆ دەردەكەوێت كە ئەو پیاوێكە خاوەنی چوارچێوەیەكی فیكری سنوردارە، چونكە لەیەك گۆشەوە سەرنجی ئەگەری شەپۆلەكان دەدات و لە وگۆشەیە تێ‌پەڕ ناكات.

شیاوی ئاماژەپێدانە كە بڵێین: تیرل بەشێكیزۆری تەمەنی خۆی لە لێكۆڵینەوەی بێ‌تەل دا بەسەر بردوە، ئەندازیاری كۆمپانیای (ماركۆنی) بوە و بەشداری كردوە لەدانانی وێستگەی بێ‌تەلی زۆر و زەوەند دا لەمەكسیك و دەرەوەی مەكسیكیش ... بۆیە وا دەردەكەوێ ئەو پیشەیەی وای لێكردوە كە تەنها لەو ئەزمونە سنوردارانەوە سەرنجی مەسەلەكان بدات كە خۆی لەسەری ڕاهاتوە.

جگەلەوەش ڕەنگە (تیرل) كەوتبێتە ژێر كاریگەری هەندی بیرۆكەی میتافیزیكیەوە، ئەمەش وای لێكردوە كە حەزی لە ڕەت كردنەوەی هەر لێكدانەوەیەكی فیزیاییانەی هەستە نائاساییەكە بێت لە مرۆڤ دا...

كاتێ لەڕەخنەكانی (تیرل) دەكۆڵینەوە كە لەدژی (گریمانەی شەپۆلی) هێناونی، كۆمەڵێ خاڵی لاوازی تێدا دەبینین كە ناگونجێن لەگەڵ ئەو ڕێبازە بابەتیەدا كە لە گۆشەنیگا جیاوازەكانەوە لەمەسەلەكان دەكۆڵێتەوە، هەنوكەش هەندێ لەو خاڵە لاوازانە دەخەمە بەر چاوی خوێنەران:

### ئامێرە زانستی‌یەكان:

لەیەكێك لە ڕەخنەكانی دا (تیرل) دەڵێت: ئەگەر شەپۆلی كارۆ موگناتیسی هەبوایە، بیر و كارلێكە هزریەكانی بگواستایەتەوە لەنێوان مێشكێك و یەكێكی‌تر دا ئەوا ئامێرە وردە زانستی‌یەكان پەی‌یان پێ دەبرد و دەیان دۆزیەوە... من لێرەدا لە (تیرل) دەپرسم: ئایا ئەو ئامێرانەی كە ئێستاكە لە بەردەستمان دان توانیویانە هەموو ئەو شەپۆلە كارۆ موگناتیسی‌یانە بدۆزنەوە كە لە گەردونـدان؟ یان ئەگەر ئەو ئامێرانە هەندێ لەو شەپۆلانەیان دۆزیوەتەوە، ئیدی ئایا ئەو قسەیە ڕاستەكە بڵێین لەكاتێكی دور یان نزیك دا جۆری‌تری شەپۆلی كارۆموگناتیسی نادۆزنەوە؟

ئەوە زانراوە كە هەندێ لەو شەپۆلانە زاناكان بەڕێكەوت ڕێیان لێی كەوتوە و دۆزیوییانەتەوە، بێ‌ئەوەی پێشتر نیازی دۆزینەوەی شەپۆلی وایان هەبوبێت..

بۆ نمونە: (تیشکی سینی) لەساڵی (١٨٩٦ز) دا (رۆنتگن) دۆزیەوە، لەکاتێکدا هەندێ تاقیکردنەوەی زانستیتری دەکرد کە هیچ پەیوەندیەکی بە بابەتی شەپۆلەوە نەبوو، دواتر بۆی ڕون بوەوە کە تیشکێکی شەپۆل کورتی دۆزیوەتەوە... زانا گەلێکیتر ، وایان بەسەر هاتوە ، لەکاتێکدا (تیشکە گەردونیەکان یان تیشکە گیمیەکان، یان ... هتد)یان دۆزیوەتەوە... جا کەواتە ئایا لۆژیکی زانستی ئەوەی پێ پەسەندە کە بڵێین: زاناکان لە دۆزینەوەی هەموو جۆرەکانی شەپۆلە کارۆ موگناتیسیەکانی گەردوندا گەشتونەتە کۆتایی؟

سەرباری ئەوەش، ئەو ئامێرانەی ئێستاکە زاناکان بەکاریان دێنن لە دۆزینەوە و تۆمارکردنی شەپۆلەکاندا، بەبەراورد لەگەڵ ئامێرەکانی سەدەی ڕابردوو دا پێشکەوتوون (ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم دا نوسراوە ـ وەرگێڕی کوردی)، ئنجا بەبێ گومان بە بەراورد لەگەڵ ئامێرەگانی سەدەکانی ئایندەدا پێشکەوتوو نابن... کێشمان دەزانین داهێنەران لە رۆژگارەکانی داهاتوودا چ جۆرە ئامێرێکی سەیر دادەهێنن؟

من بڕوام وایە، دێر بێ یان زوو، زانست ئامێرێکی وامان بۆ دادەهێنێت کە دەتوانێت ئەو شەپۆلانە تۆمار بکات کە ئامێرەکانمان لەئێستە دا دەستەوسانن لە تۆمارکردنیان. لەوانەشە ئەو ئامێرە (درێژی شەپۆل)ی مێشکی هەر مرۆڤێکیش دیاری بکات... بەو جۆرەش دەتوانێ ئەو بیر و بۆچونانە بخوێنێتەوە کە لەو مێشکە دا دێن و دەچن. کێ دەزانێ؟ کێ دەڵێ وابێ؟ (دەربڕینی وەرگێڕ).

**لەغزی زیندەمادە:**

ئنجا ئەو گوتەی (تیرل) کە دەڵێت:. ( زاناکان لەمێشکی مرۆڤ دا ، دەزگایەکیان نەدۆزیوەتەوە کە شەپۆل بنێرێت یاخود وەری بگرێت) ئەو وتەیە لە بنەڕەتەوە پوچە... ئەز وام دێ بە خەیاڵ دا کە (تیرل) نایەوێت قایل بێت بە لێکدانەوەی (شەپۆل)ی هەستە نائاسایيەکەی مرۆڤ، لە کاتێك دا نەبێ کە لەمێشکی مرۆڤ دا دەزگایە بدۆزێتەوە وەك ئەو ئامێرە بێتەلانە وا بێ کە خۆی لە ژیانی پیشەیی دا پێیان ڕاهاتوە،

بەوەش ئەو جیاوازیە گەورەیە لەبیر دەكات كە لەنێوان سروشتی مادەی بێگیان و خانە زیندووەكاندا هەیە.

ئێمە دەزانین هەندێ لە زیندەوەرە سادە كان، شەپۆلەكانی ڕوناكی وەردەگرن و دەچنە ژێر كاریگەریەكانیەوە، بێئەوەی چاویان هەبێ یان ئەندامێكیتریان هەبێ كە لە ڕوی ئەرك و فەرمانیەوە لە چاو بچێت.. كەواتە ئایا ناگونجێت لەنێو خانەكانی مێشكی مرۆڤ دا، توانایەكی تایبەت هەبێ بۆ وەرگرتنی هەندێ لەو شەپۆلە كارۆ موگناتیسیانەی كە لە جێگەیەكی دورەوە بۆی ڕەوانە دەكرێت؟!

هەروەها ئێمە دەزانین، مێشكی مرۆڤ جۆرێكی دیاریكراوی شەپۆلی كارۆ موگناتیسی دەردەكات، وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا... جا ئایا چۆن دەلوێت بۆ خانەكانی مێشك شەپۆل بنێرن بێ ئەوەی دەزگایەكی تایبەتی پەخشی تێدا بێت؟!

لەراستی دا خانەكانی مێشكیش وەكو خانەی هەموو تەنە زیندووەكانیتر، تا ئێستەش چەندین نهێنی نەزانراویان تێدایە... زانایان تا ئێستاكەش نەگەیشتوونەتە زانینی هەموو نهێنییەكانی زیندەمادەكان... بەڵام متمانەمان زۆرە بەوەی لەداهاتوو دا زانست زۆرێك لەو نهێنییانەمان بۆ دەردەخات كەتێمان دەگەیەنن لەوەی چۆن خانە زیندوەكان دەتوانن لەیەك كاتدا هەم شەپۆل بنێرن و هەم وەریشی بگرن.

**ماوەی دوری و هێزی شە پۆلەكان :**

(تیرل) لەڕەخنەی سێیەمی دا دەڵێت: شەپۆلە كارۆ موگناتیسییەكان، تا چەندێ ماوەیەكی زیاتری دووری (مسافە) ببڕن، هێندە لاواز دەبن، كەچی ماوەی دووری هیچ كارێك ناكاتە سەر هەستەكە.

هەروەها ماموٚستا (راین)یش رەخنەیەكی ئاوهای هەبووە، چونكە لەهەندێ ئەزمونیدا بۆی دەركەوتووە كە هەستە نائاساییەكە تا دوور بكەوێتەوە بەهێزتر دەبێت... بەڕای (راین) ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت كە هەستە نائاساییەكە لەسەر رێسایەكیتر ڕێ دەكات نەك لەسەر رێسای شەپۆلەكان.

هەندێ لە زانایانی (فیزیا) وەڵامی (ڕاین)یان داوەتەوە و گوتویانە: ڕەنگە لە داهاتودا زانست یاسا و ڕێسای نوێی وا بۆ شەپۆلەکان بدۆزێتەوە کە هەستە نائاساییەکەیان پێ لێك بدرێتەوە، بەڵام (راین) ئەم ڕەدەی وەرنەگرت... بەڵکو ئەو وا دەبینێ کە کەلێنێك هەیە لەنێوان سروشتی هەستە نائاساییەکە و یاساکانی فیزیا داو، ئەو کەلێنە نەگیراوە.. بۆیە کاتێ زانست یاسای فیزیایی نوێ دەدۆزێتەوە، ڕەنگە نهێنی نوێش لە هەستە نائاساییەکەدا بدۆزێتەوە و ئەمەش وای لێ دەکات زیاتر تەم و مژدار بێت و ، زیاتریش دوور بکەوێتەوە لە سروشتی ئەو یاسایانە.[١٢]

بەهەر حاڵ، من لام وایە بۆچوونی زانایانی فیزیا لە ڕێبازی زانستیەوە نزیکترە، وەك لە ڕاکەی راین و تیرل... راین بۆچوونی یەکلاکەرەوە لەم ڕووەوە دێنێت، لەرێبازی زانستیش دا ، ناگونجێت توێژەرێك بێت ، بەرلەوەی لەهەموو ڕویەکەوە لێکۆڵینەوە لەشتێ کرابێ، بێت و حوکم بەسەر ئیشەکەدا بدات... چونکە زۆر جار بووە پێشینیانمان حوکمی یەکلاکەرەوەیان داوە بەسەر هەندێ شت دا و، لە دوایی دا دەرکەوتووە کە بەهەڵە دا چوون.

## زمانی مێشکەکان:

هەر ئەوەندەمان لەبەردەمدا ماوە تاوتوێی ڕەخنەی چوارەمی (تیرل) بکەین کە تیای دا دەڵێت: ئاڵ و گۆڕی بیرەکان لەنێوان دوو مێشك دا پێویستی بە شیفرە یان زمانێك هەیە تاکو لێك بگەن... بەڕای من ئەم ڕەخنەیە زۆر سادە و هیچە... لەم ڕەخنەیەی دا دەردەکەوێت کە پیشەکەی چەندە کاریگەری لەسەر مامۆستا (تیرل) داناوە.

(تیرل) لەکارەکانی بێتەلی خۆیدا ڕاهاتوە لەسەرئەوەی بەهۆی شیفرەیەکەوە، پەیوەندی بەکەسانی ترەوە بکات، ئەمەش وای لێکردوە، وا گومان بەرێ کە مێشکیش لەکاتی پەیوەستەگیە شەپۆلیەکانی دا لەگەڵ مێشکێکی تردا پێویستی بەو شیفرەیە هەیە...

تیرل ئەوەی لە بیر چووە کە (مێشك) بێئەوەی پێویستی بە وەرگێڕ یان واسیتە هەبێ لە وێنەكان دەگات.. بۆ نمونە: مێشك هەر کە ڕەنگی سور دەبینێت دەست بەجێ لێی تێ دەگات و دەرکی پێ دەكات.. ئەمە لەكاتێکدا ڕەنگی سوور هیچ نیە ، جگە لە زنجیرەیەك شەپۆلی خاوەن درێژیی دیاریکراو، کە بەر تۆڕی چاو دەکەوێت وکاریگەریەکەی دەگاتە مێشك... بەڵام ئەو( ڕەنگ)ە ناوو جەفەنگی هەیە ، خەڵك ڕێ کەوتوون لەسەری و لەكاتی پێکەوە ئاخاوتنیان دا یەکتری پێ تێ دەگەیەنن.

ئەمەش یانی ، مێشکەكان لەكاتێك دا پێویستیان بە زمان و جەفەنگ هەیە کە لەمیانەی ئەو بەربەستانەوە دەدوێ کە مرۆڤەكان لەنێو خۆیاندا دروستیان کردوە.. بەڵام لە ئاخافتنی خودی دا هیچ پێویستی بەو جۆرە شتانە نیە... بۆیە هەر کە وێنەیەك لە مێشك دا وێناکرا و شەپۆلی تایبەتی لێوەدەرکرد، دەست بەجێ ئەو (مێشکەی لەگەڵی دا گونجاوە ) بەجۆرێ لەجۆرەكان دەرکی پێ دەكات.

### پوختەی مەبەست:

لەوەی رابورد بۆمان دەردەکەوێ لەمرۆڤ دا هەستێکی نائاسایی هەیە، هەندێ جار کاریگەری ئەم هەستە لە کاتی خەون دا دەردەکەوێت و هەندێ جاریتر لە کاتەكانیتردا... ئەم هەستەش لەو تەرزە هێزە میتافیزیکیيانە نیە کە نەگونجێت لێکدانەوەیەکی شیاوی فیزیایی بۆ بکرێت... بەهێزترین گومانم وایە کە ئەو هەستە لەڕوی کارکردنیەوە لە ڕادیۆ یاخود لە تەلەفیزیۆن دەچێت... ڕۆژێك هەر دەبێ زانست پەردە لادات لە ڕووی نهێنییەكانی، ئیتر ئەو ڕۆژە نزیك بێت یان دوور.

## پەراوێزەکانی بەشی چواردەیەم:


١ـ بنواڕە: سینل، الحاسة السادسة، ل ٧٥.

٢ـ بنواڕە: Rhine, Reach of Mind, P 46

٣ـ بنواڕە: ڕۆژنامەی الاهرامی صري، ژمارەی ڕۆژی ٢٢/٩/١٩٥٦.

٤ـ بنواڕە: المقتطف، رسائل الارواح، ل ١٠٩ ـ ١١٠.

٥ـ بنواڕە: ولیم جیمس، ارادة الاعتقاد، ل ٢٣.

٦ـ بنواڕە: Rhine, New Frontiers of Mind, P 14

٧ـ بنواڕە: Rhine, Extra – Sensory perception

٨ـ بنواڕە: Rhine, New Frontiers of Mind, P 211

٩ـ بنواڕە: سینل، الحاسة السادسة، ل٣٤.

١٠ـ بنواڕە: فؤاد صروف، آفاق العلم الحدیث، ل ٢٣٢.

١١ـ بنواڕە: Tyrrell, Personality of Man, p 69

١٢ـ بنواڕە: Rhine, Reach of Mind, P. 50

# بەشی پازدەهەم:

# خەونەکانی خەواندنی موگناتیسی

**سەبارەت بەدیرۆکی خەواندن:**

خەواندن لەم سەردەمەدا بۆتە بابەتێکی زانستی بەڕێز ، پسپۆڕ و کارشناسی خۆی هەیە... لەڕۆژهەڵات و رۆژئاوای گێتیشەوە زانایان دانیان پێداناوە.. بۆیە جێگەی حەسرەتە، کە دەبینین زۆرێك لەخوێندەوارەکانی لای ئێمە بە هەقیقەتی زانستی خەواندن ئاشنا نین، تەنانەت پێدەچێت هەندێکیان تا هەنووکەش سوکایەتی و گاڵتەی پێ بکەن.

جێگەی خۆیەتی ئاماژە بدەین بەوەی خەواندن هونەرێکی دێرینە و خەڵکی لەچاخە کۆنەکانەوە لەهەندێ کار و باری خۆیاندا بەکاریان هێناوە، بێئەوەی پەی بە نێوەرۆك و ناواخنەکەی بەرن، یاخود ناوێکی بەسەردا ببڕن. لە ڕاستیش دا، لەکۆن دا خەواندن تێکەڵ بوو لەگەڵ فێڵ و جادوودا. بەو هۆیەشەوە بەهالەیەك خورافە دەورە درابوو.

نەشتەرگەری ئینگلیزی بەناوبانگ (جیمس برید)، یەکەمین کەس بوو ، توانی بەشێوەیەکی زانستی لەساڵی (١٨١٤) دا (خەواندن) بدۆزێتەوە و پاکیشی بکاتەوە لە پەڵە و لەکە خورافیەکانی، هەروەها ئەم ناوەیشی بە سەردابڕی کە ئێستاکە لە نێوەندە زانستیەکاندا پێیەوە ناسراوە.

**( مسمر ) :**

ئێمە لەکاتێکدا دان بە فەزڵی "جیمس برید" دادەنێین لەو ڕووەوە، پێویستە فەزڵی ئەو پیاوەش فەرامۆش نەکەین کە بەر لەو بەدەرکەوت و ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئەم، ئەو پیاوەش کابرایەکی فەرەنسیە و ناوی (ئەنتۆنی مسمر)ە، ئەم پیاوە بەیەکەمین کەس

دادەنرێت ، کە لە چاخی نوێ دا توانی سەرنجی خەڵکی بۆ لای خەواندنی موگناتیسی ڕابکێشێت.

(مسمر) بڕوای وابوو خەواندن جۆرێکە لە "موگناتیسی ئاژەڵی"... ئەو خەواندنی بەکار هێنا لە چاککردنەوەی نەخۆشەکاندا، بە تایبەت ئەوانەیان کە دووچاری نەخۆشینە دەرونیەکان بووبوون... ژنان لەهەموو لایەکەوە داباڕین بەسەری دا ، لەئەنجامدا ناو و شۆرەتێکی زۆری پەیدا کرد لە نێو ئافرەتان دا... بۆ نەگبەتی مسمر لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسی دا دەژیا، لەو سەردەمەدا خەڵکی ڕقیان لە هەر شتێك دەبووەوە کە بۆنی خورافە چێتی لێ بێت... لەبەر ئەوە قیامەتی زانا و پزیشکەکان هەستا و، ڕاپەڕین لەدژی و بەخورافەچێتی و جادووبازی تۆمەتباریان کرد.

یەکێك لەو بەسەرهاتە کۆمیدیانەی کە لەم ڕووەوە دەیگێڕنەوە، ئەوەیە کە ڕۆژێك ڕۆژنامەیەك بۆ گاڵتەپێکردن بەم پیاوە، بابەتێك بڵاو دەکاتەوە، بەناوی (ئەکسیری موگناتیسی)... لەو بابەتەدا لەسەر زمانی ئەو پیاوە وەسفەیەکی پزیشکی (گوایە بەنەخۆشێك دەدات ـ وەرگێڕ) و لە بابەتەکەدا هاتووە: (لە زەینی ترس و تۆقین چوار هۆقە وەرگرە، هەروەها لە گیانی وەهم دوو ڕەتڵ بێنە، هەر دوو مادەکە بخەرە نێو شووشەی ئەندێشەوە، چەند ڕۆژێك وازیان لێ بێنە ... ئینجا لەبەیانی دا چل خاڵ لەو گیراوەیە بخۆرەوە، لە هەموو نەخۆشییەك ڕزگارت دەبێت و چاك دەبیەوە) [1]

لەدوایی دا، ساڵی (١٨١٥) مسمر بەدڵێکی شکاوەوە کۆچی دوایی کرد... مرد، بێئەوەی خەڵکی دان بە فەزڵی دابنێن... خەڵکی زۆربەی کات هەر وان ... خودا چاوپۆشیيان لێ بکات!

**ئەزمونێك کە خۆم دیومە :**

نایشارمەوە لەخوێنەر، کەلە سەرەتاکانمەوە منیش وەك هەر خوێنەوارێکیتر کە باسی خەواندنم دەبیست، گاڵتەم پێدەکرد و بەفرۆفێڵی جادووبازیم دەزانی... تا ئەوە بوو لەساڵی (١٩٣٨) دا ئەزمونێکم لە خەواندنی موگناتیسی بینی، لەوساوە ئیتر بۆچونم لەبەرانبەر خەواندن دا گۆڕا و، وام لێهات تا زۆر گرنگی پێبدەم.

پوختەی بەسەرهاتەکەم ئەوەیە: لەو ساڵەدا خەوێنەرێکی موگناتیسی شارەزا لە یەکێك لە وڵاتە عەرەبیەکانەوە هاتە عێراق، ئەو خەوێنەرە کوڕێکی گەنجی لەگەڵدا بوو کە خۆی دەیگوت کوڕمە ... ئەو پیاوە و گەنجە بەناو کوڕەکەی لەسەر هەندێ تەختی شانۆکانی (بەغداد) دا کردەوەی خەواندنیان ئەنجام دا... من ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا کە چومە ئەو ئۆتێلەی ئەوی لێ بوو، داوام لێکرد لەپێش چاوم دا ئەزمونێکی خەواندن ئەنجام بدات، ئەمە دیارە دوای ئەوەی لەسەر کرێکەی ڕێکەوتین.

حەز ناکەم لێرەدا درێژەی ئەو ئەزموون و بەسەرهاتە باس بکەم. ئەوەندە بەسە لێرەدا بڵێم : من هەوڵم دا زۆر بەوردی چاودێری و وردبینی کارەکەی بکەم تاکو هیچ غەش و فرِوفێڵێکی تێدا نەکات... بۆیە کاتێك کوڕە گەنجەکەی خەواند، هەستم کرد دەتوانێ هەر بیرۆکەیەك وەربگرێ کە دێ بەمێشکی خەوێنەرەکەی دا، سەرەڕای ئەوەی ماوەیەکی باشیشی لێکەوە دوور بوون، یەکێك لەو کارانەی من کردم، ئەوە بوو لەسەر پارچە کاغەزێکی بچوك ناوی خۆم و باوکم و نازناوی خۆم و پیشەکەم نووسی، هەر کە خەوێنەرەکە کاغەزەکەی خوێندەوە، پرسیاری کرد لە خەوێنراوەکە، ئەو بەجۆرێك ڕێك و پێك و ورد وەڵامی دایەوە کە بەتەواوی سەرسامی کردم ... ئەمە لەکاتێکدا خەوێنراوەکە هەر دوو چاوی شەتەك درابوو، بەهیچ جۆرێکیش منی نەدەناسی.

جا ئایاچۆن ئەو زانیاریانە لەمێشکی خەوێنەرەکەوە گوازرانەوە بۆ نێو مێشکی خەوێنراوەکە؟ ڕەنگە کەسێك لە وەڵامی ئەم پرسیارە دا بڵێت: لەوانەیە خەوێنەرەکە و خەوێنراوەکە پێش وەخت ڕێکەوتبن لەسەر ئەنجامدانی فێڵێك بەجۆرێك بتوانن لەیەکدی تێبگەن و ئەمیان بزانێ ئەویتریان چی دەڵێت... لەڕاستی دا بەندە ئەو لێکدانەوەیەم پێ قبوڵ نیە ... چونکە لەکاتی تاقیکردنەوەکە دا من زۆر بەئاگا و ورد بووم لەمەڕ هەر شتێکەوە کە لەخەوێنەرەکە و خەوێنراوەکەوە دەردەچوو... هەروەها ئەوەندەش گەمژە نەبووم ئەو دووانە بتوانن یاری بەئەقڵم بکەن.

**هەندێ ئەزمونی دیکە :**

ئەو ئەزمونەی باسمکرد، یەکەمین ئەزموونێ بوو کە خۆم دیتبێتم، ئەو ئەزموونە، سەرەڕای ئەوەی سادە و ساکارە ، بەلاَم گرنگی‌یەکی زۆری هەبوو بۆ من، بەتایبەت کە من زۆر وشیار و بەئاگا بووم لە بەرانبەر هەر شتێك دا کە لەو ئەزمونەدا بکرایە.

لەپاش ئەوەش کۆمەڵێ ئەزموونی دیکەم بینی، زۆربەشیان لەو خەواندنانە بوو کە لەسەر تەختی شانۆدا نیشانی خەڵکی دەدرێن... دانیش بەوە دادەنێم کە ئەو ئەزمونانە ناگونجێن بۆوەی بکرێنە بەڵگەیەکی تەواو لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو دیاردە نائاساییە دەرونیانەی تیایاندا بەدەر دەکەون.. بەڵکو هەر چۆن بێت دەکرێنە بەڵگەی سەقامگیرکردن و ئیسپات کردنی ئەوەی لە ئەزموونی یەکەمجار دا بینیم.

یەکێك لەو شتانەی هەموو بینەرێکی ئاهەنگەکانی خەواندنی موگناتیسی دەیزانن، ئەوەیە کە خەوێنراوەکە زۆرینەی جار دەتوانێت پەی بەرێت بەوەی کە چی لەگیرفانی یەکێك لەئامادەبووانداهەیە، وەك تەزبیح یان پارە وە یان ...؟؟ زۆر جار کەسێك لەئامادەبووان هەڵدەستێتەوە و پرسیار دەکات لە خەوێنراوەکە ئایا چی لەگیرفانم دایە، خەوێنراوەکەش وەڵامی دەداتەوە... بۆ زانینیش خەوێنراوەکە لەسەر تەختی شانۆ دایە و هەر دوو چاویشی شەتەك دراوە، جگە لەوە ناشزانێت ئەوەی پرسیاری کردوە کێیە!!.

لەهەموو ئەوەی رابورد دەتوانم بگەمە ئەو دەرەنجامەی کە دەبێت لەنێوان هزری پرسیارکەرەکە و هزری خەوێنراوەکە دا جۆرە پەیوەستی‌یەکی شەپۆلی هەبێت ، وەك ئەو پەیوەندیەی لەنێوان ئامێری رادیۆ و ئێسگەی ڕادیۆ دا هەیە، ئنجا تۆ بڵێی ئەو دەرەنجامە ڕاست بێت؟

بۆ وەی بتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، باشترە گەر لە ڕووی (فەسلەجی)یەوە لە سروشتی خەواندنی موگناتیسی تێبگەین.

**خەواندن چی‌ی:؟**

لە ڕوی فەسلەجی‌یەوە ،خەواندن بەمەسەلەیەکی زۆر سادە و ساکار دەژمێردرێ. چونکە جۆرێکە لە لە هۆش خۆچوون و بێئاگا بوون ، لە بەر هەر هۆیەك کەوە

دوچاری مرۆڤ دەبێت و کەم تا زۆر "ئاگایی" مرۆڤ ناهێڵێت و، دوچاری فەلەج بوونی دەکات (دەربڕینی وەرگێڕ) ... کەواتە خەواندن لەخودی خۆی دا، هیچ شتێکی سەیر و سەمەرەی تێدا نی‌یە... بەلام ئەو شتەسەیرانەی لێ‌یەوە پەیدا دەبن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ،کردەوە خۆویستەکانی مرۆڤ سڕ و بێئاگا دەکات... بەو سڕکردنەش (نەست) چالاك دەبێت یاخود ڕزگاری دەبێ لە کۆت و سنورە ئاگاکانی... بەو جۆرەش توانا پەیدا دەکات لە وەرگرتنی ئەو هەستکردنانەی کەلەکاتی ئاگایی و بێداری دا دەستەوسان بوو لەوەی بەڕوونی وەریان بگرێت... هەروەها خەواندن جیاوازی نیە لەگەڵ خەونی سروشتی دا بەیەك شت نەبێ، ئەویش بریتی‌یە لەوەی خەواندن، خەوێکی دەستکردە و بەهۆی ئیحا و ئاماژەدانێکەوە دێت بەسەر مرۆڤدا، بەو جۆرەش مرۆڤە نوستوەکە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو کەسەی ئاماژە و ئیحائەکەی بەسەردا داوە، واتە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو کەسەوە کە ئێمە ناومان ناوە خەوێنەر، هەندێ جار دەکرێت مرۆڤ خۆی بخەوێنێ، وەك هەندێ لە سۆفی‌یەکان و هەژارە هندیەکان دەیکەن... زانایان ئەو حاڵەتە ناودەنێن (خەواندنی خودیی).

(ژان لرمیت) کە یەکێکەلە مامۆستاکانی کۆلیژی پزیشکی لە پاریس دەڵێت: جیاوازی نێوان خەوی سروشتی و خەوی موگناتیسی لە پلەدایە نەك لە جۆردا، چونکە لە هەر دووکیان دا (ئاگابوون) کەم دەبێتەوە و ئەو کردەوە خۆویستانەش لاواز دەبن کە دەبنە خەسڵەتی باری بێداری.(٢)

ڕێگە و شێوازی جۆراوجۆر هەیە بۆ خەواندنی مرۆڤ... گرنگترین و ساکارترین ڕێگەشیان ئەوەیە کە (جیمس برید) بەکاری دەهێنا، ئەم توێژەرە ئەوەی دۆزیەوە کە ئەگەر مرۆڤ سەرنجی زۆری خاڵێکی درەوشاوەی دا و، ماوەیەك هزری چڕ کردەوە لەسەری، ئەوا دەمارەکانی بەنج و سڕ دەبن و جۆرێك لە بێئاگایی دێت بەسەردا، لەکۆندا قەشەکانی بەنیئیسرائیل بەم شێوازە خەویان لەخۆیان دەخست، بەهۆی سەرنج دانی زۆرەوە لەو بەردە پیرۆزەی لە زرێکانی بەریاندا بوو...(٢)

هەندێ لەخەوێنەرە شارەزاکان چاوەکانیان لەو پێناوەدا بەکار دێنن، ئەوانەی چاوێکی پان و بزیان هەیە، چاو دەبڕنە چاوی ئەو کەسەی دەیانەوێت بیخەوێنن و

ئاماژەی خەوتنی بەسەردا دەسەپێنن، ئەو هەژارەش بەویستی ئەوان دەنوێت، ئیدی مل کەچیان دەبێت و تا ڕادەیەکی زۆر لە ژێرکاریگەری ئاماژەکانیان دا دەبێت.

### خەونەکانی نوستن و خەواندن:

کاتێ مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی دەنوێت، لەو دەمەدا (نەست) لەکۆتەکانی قوتار و بەڕەڵا دەبێت و بەو هۆیەشەوە خەونە جۆراوجۆرەکان سەرهەڵئەدەن، وەك لەبەشی دووەمی ئەم پەرتووکە دا ڕوونمان کردۆتەوە. لەخەواندنیش دا شتێ وەك ئەمە ڕوو دەدات، هەر چەندە خەونەکانی (خەواندن ) بەوە جیا دەکرێنەوە لە خەونی نوستنی ئاسایی کە ئەوی یەکەم لە ژێر کاریگەری ئاراستەکاریەکانی خەوێنەرەکە دایە... ئەمەش یانی خەوێنەرەکە توانای هەیە کابرای خەوتوو وا لێ بکات ، هەموو ئەو شتانە ببینێت کە ئەم ئاماژەی پێ‌دەدات.

دروستە بێژین: ئەو کەسەی دەکەوێتە ژێر کاریگەری خەواندنەوە لەیەك کاتدا نووستوە و وەئاگاشە. ئەو لە بەر ئەوەی هەست ناکات بەوەی لە دەوری دا ڕوو دەدات بەنوستو دەژمێردرێ، لە لایەکی دیکەشەوە بە (بێدار) دەژمێردرێ چوونکە پەیوەندییەکی هەیە بەخەوێنەرەکەیەوە و، دەتوانێت هەموو ئەو شتانە ببینێت کە خەوێنەرەکە داوای لێ دەکات، لەو حاڵەتەش دا ڕەنگە شتی سەیر و سەمەرە و کۆمیدی ڕوو بدات... بەتایبەت کە دەبینی ئەو تۆ نابینێ کەلە بەردەمی دا ڕاوەستاویت، بەڵام ئەو شتانە دەبینێ کە شاردراوەن و لەگیرفانت دان یان ئەو بیرۆکانە هەست پێ‌دەکات کە لەمێشکت دان، ئەگەر خەوێنەرەکە فەرمانی پێ‌بدات.

### خەواندن و وەڕاستگێڕانی وەهم:

ئەو تاقیکردنەوە زانستی‌یانەی لەسەر خەواندن، ئەنجام دراون، گەشتوونەتە دەرەنجامی ئەوەی کە ئاماژەی خەواندن دەتوانێت وەهمەکان لە لای هەندێ کەس بکاتە هەقیقەت... دەگێڕنەوە جارێکیان کابرایەك دەکەوێتە ژێر جۆرێکی سوکی خەواندنەوە، ئنجا خەوێنەرەکە دەستەسڕێکی بۆ تورڕ دەدات و وای تێ دەگەیەنێت کە سەگێکە و

هاشاوڵی بۆ دێنێ (دەربڕینی وەرگێڕ) ئیدی پیاوەکە دەستەسڕەکەی لێ بویە سەگ و لەدوای بێدار بونەوەیشی هەروا سەیری دەکرد... لە تاقیکردنەوەیەکی دیکەش دا ئاماژە درا بە پیاوێك کە دوو (قۆچ، شاخ) لەسەر سەری دەرهاتووە، پیاوەکە ئەم ئاماژەیەی لێ بوە ڕاست و بڕوای وابوو بووەتە (پیاوێکی دووشاخ دار).(٤)

مامۆستا (ودورپ) دەڵێت: لەوانەیە خەوێنەرەکە شوشەیەك بۆنی ناخۆش و بۆگەن لە لوتی کابرای خەوتوو نزیك بکاتەوە و ئاماژەی بداتێ کە بۆنی گوڵ و ڕێحانەیە... لەو کاتەدا خەوتوەکە بۆنە ناخۆشەکە هەڵدەمژێت و زۆریش پێی شادومان دەبێ و، وادەزانێ هەر بەڕاستی بۆنی گوڵ و ڕێحانە دەکات. یاخود دەگونجێت خەوێنەرەکە ئاماژەی بداتێ کە یەکێك لە ئەندامەکانی لەشی دووچاری ئیفلیجی بووە، ئیدی کابرای خەوێنراو وا هەست ئەکات هەر بەراستی ئەندامەکەی ئیفلیج بووە و ئیدی ناشتوانێ ئەو ئەندامەی لەشی بجولێنێت.(٥)

ئەوانەی زۆر شارەزان لەخەواندنی موگناتیسی دا، بەسەرهاتی سەیر و سەمەرەیان لایە... یەك لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە کە دەڵێن شارەزایەك لە خەواندن دا قسەلەگەڵ پیاوێکی سادە دەکا، ئینجا ئاماژەیەکی سستی خەواندنی بداتێ و وای تێ بگەیەنێت کە ناوی خۆی لەبیر چوە... ئیتر کابرای هەژار ناوی خۆی لەبیر دەچێتەوە.. دروست وەك ئەو مشکەی لێ دێ کە جیوە قوت دەدات، هەر چاوی دەسوڕێنێ بەڵکو ناوی خۆی بیر بکەوێتەوە، کەچی بیریشی ناکەوێتەوە.

### خەواندن و ئازار:

ئاسەواری ئاماژەی خەواندن تەنها لەوە ڕاست گێڕانی دا کورت هەڵناهێنرێ، بەڵکو زۆر لەوە دوورتر دەڕوات... ئەگەر تۆپێکی ئاسنی سارد بخەیتە سەر دەستی کابرایەك کە ئامادەگی خەواندنی تێدابێت و ئنجا ئاماژەی بدەیتێ کە تۆپەکە داغە، دەبینی ئاسەواری سوتان لەسەر دەستی دەردەکەوێت و ئەویش ئازاری سوتاویەکەی دەچێژێ... بەپێچەوانەشەوە ئەگەر پشکۆیەك لەسەر دەستی دابنێی، ئاماژەی ئەوەی بدەیتێ کە یاقوتێکت خستۆتە سەردەستی، ئەوا بەدەست دەیگرێت ، بێئەوەی هەست بە

گەرمی‌یەکەی بکات، تەنانەت ڕەنگە هەوڵ بدا بیرڤێنێ یان لەباخەڵی دا بیشارێتەوە، چونکە وا گومان دەبات کە هەر بەڕاستی بەردێکی بەنرخە.

دەگێڕنەوە لە خوالێخۆشبوو (دکتۆر مستەفا مشرفە)ی ڕاگری پێشووی کۆلێژی زانستی زانکۆی قاهیرە، کە هەستاوە بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەك لەسەر پیاوێك کە لەژێر کاریگەری خەواندنی موگناتیسی دابووە، دەرزیەکی درێژی کردوە بە ڕانی کابرادا، دەرزیەکە چوە خوارێ و چەقیوە بە ئیسقانی ڕانی دا بێئەوەی ئازار بچێژێ یا خود بشجولێتەوە، سەیریش لەوە دا بووە کەیەك دڵۆپ خوێن لە شوێنی دەرزیەکە نەهاتۆتە دەرێ... بەچاوی خۆشم دیومە لە (بەغداد و سامەڕا و تکریت) کە هەندێ سۆفی (لای ئێمە دەروێشەکان ئەو کارانە دەکەن - وەرگێڕ) بە خنجێر و نێزە و تیغ خۆیان بریندار دەکەن بێئەوەی ئازاریان پێ بگات... ئەوان لەو کاتەدا دەکەونە ژێر جۆرێکی تایبەتی خەواندنەوە، ئێمە ئەو جۆرەی خەواندنمان ناوناوە (خەواندنی خودی).

**خەواندن و نەشتەرگەری:**

لەم سالانەی دوایی دا هەندێ لەخەوێنەرە پیشەوەرەکان داوا لە پزیشکەکان دەکەن ،لەبریتی بەنج، سڕکردنی خەواندن بەکار بێنن لە نەشتەرگەریەکانیان دا ... بەڵام پزیشکەکان لەسەرەتا دا ملیان نەدەدا بەم داوایە... شیاوی باسە زۆرێك لەو پزیشکانە تا هەنوکەش بەهەمان چاوی پێشینەکانیان لەسەدەیەك لەمەوبەردا سەیری خەواندن دەکەن، بەڵکو بە جادوو بازیشی تێدەگەن.

لە(لەندەن) ماوەیەك لەمەوبەر، لویەکی پیس لە سەر سنگی کیژێك کەناوی (جانیس ایستون) بوو دەرهات، کیژەکە پێویستی بەکردارێکی نەشتەرگەری بە پەلە بوو، بەرگەی بەنج و سڕکردنیشی نەدەگرت.. پزیشکە نەشتەرگەرەکان سەرسام بوون لەوەی چی بکەن؟، دواجار ناچار بوون بەوەی پەنا بەرنە بەر خەواندن بۆ سڕکردنی، چونکە گەر وایان نەکردایە، لوەکە دەبوە هۆی گیان لەدەست دانی کیژەکە، بۆ ئەوەش پەنایان بردە بەر یەکێك لە خەوێنەرە بەناوبانگەکان لەبەریتانیادا... خەوێنەرەکە هاتە سەر کیژەکە لەکاتێکدا لەسەر قەرەوێڵەی نەشتەرگەری کەوتبوو، دەستی کردە

ئیحا پێدانی گوایە لە جێگەیەکی جوانی سەر ڕۆخی دەریا دا دانیشتوە، و هەستیش بە سەرمایەکی کەم دەکات لەسەر سنگی دا، بەلام هەست بەهیچ جۆرە ئازارێك ناکات، کیژەکە دەستی کردە خەون بینین بەگوێرەی ئارەزووی خەوێنەرەکە، لەهەمان ئەو کاتەش دا نەشتەرگەرەکە نوکی نەشتەرەکەی خستبوە نێو قولایی لوەکەوە... دوای کۆتایی هاتنی نەشتەرگەریەکە کیژەکە لەخەو بێدار بویەوە و لەسەر لێوەکانی دا بزەیەك دەبینرا، ئنجا دەستی کردە باسکردنی ئەوەی لەکاتی نەشتەرکەریەکە دا بینیویەتی... کیژەکە گوتی: "بەڕاستی خەونێکی خۆش بوو، لەشارێکی سپی دا پیاسەم دەکرد لە باشووری فەرەنسا ، لەسەر ڕۆخی دەریای سپی ... دارخورماکانم دەبینی کەپەلیان بەسەر ئاوە شینەکەی دەریا دا شۆڕ کردبووەوە".

هەر چۆن بێ، وادیارە پزیشکەکان لەو ڕایەی پێشویان هاتونەتە خوارێ کە لەمەڕ خەواندن هەیان بوو.. لەم ڕۆژانەی دوایش دا هەوالی ئەوەمان زۆر بەرگوێ دەکەوێ کە ئاماژە دەدات بە بلاوبونەوەی بەکارهێنانی خەواندن لە چارەسەرکردنە پزیشکی و کردەوە نەشتەر گەریەکان دا لە هەموو لایەکی جیهانەوە... کێ دەزانێ لەوانەیە (بەنج) ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە هەواڵێکی ڕابردوو.

**خەواندن و جادوو:**

پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێ کە خەواندن هەمووی لەسەر یەك شێواز نیە، بەڵکو بەشێوازی جوداجودا دەکەونە سەر خەڵکی... جۆری توند و تیژی هەیە کە ئێمە لەبەر دا باسمان لەهەندێ ڕواڵەتی کرد، هەروەها جۆری سوکیش هەیە کە دەکەوێتە سەر مرۆڤ بێئەوەی هەستی پێ بکات.[٦]

هەندێ خەڵکی هەن ئامادەگی باشیان هەیە بۆ وەی لە ژیانی ئاسایی‌یان دا بچنە ژێر کاریگەری ئامازەی خەواندنەوە... ڕەنگە یەکێکیان کە بەکۆلانێکی تاریکدا دەڕوات، پێی بڵێیت: لە فلان گۆشەی کۆلانەکەدا جنۆکەیەك خۆی مەلاس داوە بۆت.... ئیدی ئەو برادەرەمان کە تەماشای ئەو گۆشەیە دەکات شەبەحی جنۆکەکە دەبینێ کە ڕاوەستاوە و چاوی لێ داقڵیشاندوە (دەربڕینی وەرگێڕ)... لەو کاتەدا هەر دوو قاچی بۆ ڕاکردن بە

هەوادا ڕەها دەکات و دواتر باسی ئەو جنۆکەیە بۆ خەڵکی دەکات، لەوانەیە خەڵکیش بڕوا بە قسەکانی بکەن، بۆیە هیچ ناسڵەمنەوە لەوەی لە هەمان سوچ دا جنۆکە ببینن گەر بەلای دا ڕەت بن.

هەموو چیرۆکەکانی خێو و دێو و درنج و جنۆکە لەم شێوەیەن (دەربڕینی وەرگێڕ)، ئەم چیرۆکانە بەهۆی ئەو ئاماژەی خەواندنانەوە لەنێو خەڵکی ڕەشۆکی دا بڵاو دەبنەوە، کەلە باس و خواسەکانی شەویان و لە ئەفسانەکانیان دا ئاراستەی یەکتری دەکەن.

مامۆستا (سینڵ) بڕوای وایە ئەو جڤاتانەی بۆ (مناجاتی گیانەکان) ساز دەکرێن و لەم ڕۆژگارە دا خەڵکانێکی زۆر بەتامەزرۆییەوە ئامادەی دەبن هیچ نین جگە لە کۆمەڵێ وەهم یا خود خەونی هیپنۆتیزمی... ئەگەر کۆمەڵێ خەڵك بەویقار و بێدەنگیەوە لەژوورێکی هێمن و کەم ڕوناکیدا دابنیشن، ئەوا ئاماژەیەك وەردەگرن کە بەڵگەیە لەسەر بوونی گیانی مردوویەك لەنێو خۆیاندا، زۆربەی جاریش کۆمەڵێ شت دەبینین کە بەخەیاڵی خۆیان وا دەزانن ڕاستی ئەو وەهمانە دەسەلمێنێت.[٧]

زۆرینەی گومانەکانم بەلای ئەوە دایە ، زۆربەی ئەو دیاردە سەیرانەی جادوو کە خەڵکی لەدێرزەمانەوە لەنێو خۆیاندا باسی دەکەن، لەگەڵ ئەوەی لێی دووایین هەمان شتە... ئەو خەڵکانەی کاری جادوو بازەکان دەبینن، زۆربەی کات لەو خەڵکە سادە و ساکارانەن کە زۆر لەبارن بۆ کاریگەربوون بە ئیحایەکانی هیپنۆتیزم... کابرای جادووگەر هەندێ فرت و فێڵ دەکات بەجۆرێ نهێنییەکانی خۆی لەوان دەشارێتەوە، دواتر وایان تێدەگەیەنێت کە ئەو کردەوانە دیاردەی ناسروشتین، ئەوانیش بڕوای پێدەکەن.

### جادووگەرەکانی فیرعەون :

(سەعلەبی) دەربارەی جادووگەرەکان لەسەردەمی فیرعەون و موسادا دەڵێت: باری شەست "هێستر" گوریسیان هێنا و بەنێو دۆڵێکدا بڵاویان کردەوە و خەڵکیش لە دوورەوە سەیریان دەکرد، ماری وای تێدابوو ، وەك شاخ وابوون و دۆڵەکەیان پڕ کردبوو،

هەندێکیان سواری هەندێکیتریان ببوون... موسا زۆر ترسا، بەڵام خودا فەرمانی پێدا ئازا و بەجەرگ بێت و گۆچانەکەی فڕێ بداتە سەریان... لەوکاتەدا گاڵۆکەکەی موسا بوە ڕەشمارێکی زۆر ڕەش کە لەسەر چوار پێی کورتی بەهێز دەڕۆیشت بەڕێدا، کلکێکی هەبوو بیدایە لە هەر شتێ تێك و پێکی دەشکاند، دوو چاوی هەبوو ئاگری لێ دەردەپەڕی، لە هەر دوو کونەلوتیەوە ژەهری دەردەدا، لەسەر پشتی موو هەبوو وەك ڕم وابوو، لەدەمیەوە فیشکە و لوشکە دەهاتە دەر، ڕەشمارەکەی موسا ئاوڕی دایەوە بەلای مارەکانی جادووبازەکاندا، یەك لەدوای یەك هەڵیلوشین، تاکو زۆر و کەمیان لەدۆڵەکەدا نەما، خەڵکی کە ئەوەیان بینی زۆر ترسان و ڕایان کرد و لەکاتی هروشە و قەرەباڵغییەکەیاندا هەندێکیان هەندێکیتریان کرد بە ژێر پێوە تا ئەوە بوو بیست و پێنج هەزار کەسیان لەو ڕۆژەدا مردن، فیرعەون بەترس و لەرزەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا ڕای کرد، ئنجا موسا گەڕایەوە ناو قەومەکەی و گۆچانەکەش هێشتر هەر مابوو، شوێنی موسا کەوتبوو وەك چۆن سەگێکی بەئولفەت شوێنی خاوەنەکەی دەکەوێت، خەڵکی سەیریان دەکرد و سەرسام ببوون زۆریش دەترسان ... (٨)

**خەواندن و تاوان:**

ئەو کەسەی دەچێتە ژێر کاریگەری ئاماژەی خەواندنەوە، هەندێ جار مل کەچی خواست و ویستی خەوێنەرەکەیەتی و گوێرایەڵیەکی کوێرانەی دەکات ... لەم ماوەیەی دوایی دا ئەم مەسەلەیە گرفتێکی یاسایی بەرپا کرد لە نێو یاساناسەکان دا... گرفتەکەش ئەمەیە: ڕەنگە خەوێنەرەکە ئەو کەسە بۆ تاوانکاری پاڵ پێوە بنێ، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئاماژەکانیەوە... جا ئایا بەرپرسیارێتی یاسایی ئەو حاڵەتە چۆنە؟!

گەر توانیت کەسێك بخەوێنیت و شمشیرێکی گاڵتینەی لەکارتۆن دروست کراوت دایە دەستی ، پاشان ئاماژەت پێدا کە ئەوە شمشیرێکی یەمەنیە، ئەرکی کابراش ئەوەیە بەو شمشێرەوە هێرش بکاتە سەر خەڵکی و قەتڵ و عامیان بکا (دەربڕینی وەرگێڕ)، دەگونجێت کابرا گوێڕایەڵی فەرمانەکەت بێت و شمشێرە کارتۆنیەکەیەوە هێرش بکاتە

سەر خەڵكی، وەك چۆن( دۆن كیشۆت) هێرشی كردە سەر ئاشە هەواییەكان، گرفتەكە تا هەنوكە سادەیە و لە پێكەنین و كۆمیدیاش خاڵی نیە. بەڵام كاتێ گرفتەكە ڕاستەقینە دەبێت كە شمشیرێكی برندەی ئاسنین بدەیتە دەستی و، فەرمانی پێ بكەیت بەڕاستی خەڵكی بكوژێت... لەو كاتەدا ئایا كێ بەرپرسیاری ئەو كارە دەبێت كە ئەو دەیكات؟!

من ئەو قسەیە بەشێوەی ئەندێشەیی یاخود گریمان ناكەم .... چونكە لەڕاستی دا، كۆمەڵێ ڕووداو ڕویان داوە كە كەسێك كردارێكی پێچەوانەی یاسای كردوە ،لەژێر كاریگەری ئەو ئاماژە تەنویمیەیەی كە بەسەری دا سەپێنراوە... یەك لەو ڕووداوانەش، ڕوداوێك بوو ، لە (دانمارك) ساڵی (١٩٥١) ڕووی دا و دەنگۆیەكی گەورەیشی هەبوو.

پوختەكەیشی ئاوەها بوو: یەكێك لە خەوێنەرەكان ،توانی كەسێك پاڵ پێوە بنێت بۆ تاڵان و بڕۆ و كوشت و كوشتار، بەو هۆیەشەوە سامانێكی زۆری دەست كەوت.. خەوێنراوەكەش گەنجێكی بێگوناهو خاوەن باوەڕێكی قوڵ بوو، خەوێنەردكەش لەم لایەنەوە بەسەری دا زاڵ ببوو، ئاماژەی پێ دابوو كە دەروازەكانی بەهەشت كراوەن لەبەر دەستی دا، و پێویستە بانكەكان تاڵان بكات بۆ خزمەتكردنی نیشتمانەكەی و فریشتەیەكی تایبەتیش هەیە كە لەكاتی دزیەكە دا دەیپارێزێت و بەرپرسیارە لێی... خەوێنەرەكە پێی دەگوت: مادەم تۆ دەچیت بۆ بەهەشت ، كەواتە سوودی ئەم شتە دنیاییانە چیە؟ ڕۆژێكیان ئەم گەنجە دەچێتەسەر ئەمینداری سندوقێك و بەزۆری دەمانچە هەڕەشەی لێدەكات، چەندی پارە لە سندوقەكە دا هەیە دەری بێنێت و بیداتێ، بەڵام كاتێك بینی ئەمینداردكە مل نادات، گەنجەكە دەمانچەیەكی پێوە نا و كوشتی... ئنجا هاتە سەر شەقامەكە و بەوپەڕی هێمنیەوە دەڕۆی بەڕێ دا، وەك ئەوەی گوناهێكی گەورەی نەكردبێ... چونكە ئەو دڵنیا بوو لەوەی فریشتەكە دەیپارێزێت، ئێ خۆ ئەم هیچی نەكردووە، ئەوە نەبێت ئەركی سەرشانی خۆی لەپێناوی خودا و نیشتمان دا ڕاپەڕاندوە.

ئەدگارەكانی ئەم ڕووداوە ڕوون و ئاشكرا بوون، بەرپرسیارێتی یاسایشی ئاشكرا بوو، دادگایەكی دانیماركی سەیری دۆسیەكەی كرد، لەدوای لێكۆڵینەوەیەكی دور و درێژ

کەهەندێ لە زانا دەروونناسەکانیش بەشداری ببوون، لای دادگا سەلمێنرا ، گەنجەکە بێگوناهە و تاوانباری ڕاستەقینە خەوێنەرەکەیە. بۆیە فەرمانی کاری قورسی هەتاهەتاییان بەسەر دا دا... وەڵێ ئەو پرسیارەی کە بە مێشك دادێت ئەمەیە: ئایا هەموو تاوانەکانی خەواندن بەم جۆرە ڕوونن، وە ئایا هەموو دادگاکان لەجیهاندا دان دەنێن بە بوونی شتێك دا کەناوی (خەواندن) و لەژێر ڕوناکی خەواندنیش دا بڕیارەکانیان دەردەکەن؟

ئەم پرسیارە دەرگای ئەندێشەمان لێ دەخاتە سەرپشت، ئەبێ چەند کەس لە رابردوو دا تۆمەتبار کرابن بەتاوان، و تا ئێستەش هەر تاوانبار دەکرێن، لەکاتێکدا ئەوان لە ژێر کاریگەری خەواندن دا ئەو تاوانانەیان ئەنجام داوە، لەهەمان کاتدا ،خەوێنەرەکانیان ئازادن و چێژی خۆشیەکانی دنیا دەکەن. خەریکە هەموو یاسا ناسان ئێستاکە ڕێك بکەون لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری خەواندنەوە لە تاوانکاریەکانی بەرپرسیار نیە، چونکە خەواندن بە هۆکارێکی ناچار کردن و تۆبزی دەژمێردرێ، دروست وەك ئەوە وایە مادەیەکی بێهۆشکەر بدرێتە کەسێك، بۆ خاتری ئەوەی پیرۆزیەکی پێشێل بکرێ یاخود بەرەو تاوانێك پاڵی پێوە بنرێ.

من دەمەوێت ئەم ڕایە بخەمە بەردەمی یاساناسانی لای خۆمان، تاکو قسەی خۆیانی تێدا بکەن.

## گرفتێکی‌تر:

لە خەواندن دا گرفتێکی دیکە هەیە، کە گرنگی‌یەکی دەروونی هەیە پتر لەوەی گرنگی یاسایی هەبێ، گرفتەکەش ئەمەیە: ئایا مرۆڤ لەکاتی خەواندن دا هەموو فەرمانێك جێبەجێ دەکات، یاخود سنوورێك هەیە و ، مرۆڤ کە گەشتە ئەو سنوورە ، ئیدی ڕادەوەستێت لە جێبەجێکردنی فەرمان و ئاماژەکانی خەوێنەرەکەی؟!(دەربڕینی وەرگێڕ)

مامۆستا (لویس) بەم جۆرە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: دەتوانم ئەو كەسانەی دەكەونە ژێر كاریگەری خەواندنەوە بكەمە ئامێر بەدەستی خۆمەوە و چۆنم بوێت بیان جوڵێنم.[٩]

وەلێ ئەم ڕایە بەتەواوی پەسەند نەكرا لە لایەن هەموو توێژەرانەوە... بەڕای زۆرێك لە توێژەران، كەسی خەوتوو لەسنوورێكی دیاریكراو دا نەبێ ، ئیدی ئەو ئاماژانە جێبەجێ ناكات كە بەسەری دا دەدرێن، هەر كارێ پێچەوانەی ویژدانی كەسە خەوتوەكە یاخود پێچەوانەی ویستی وشیاری بێت ،ئەوا جێبەجێی ناكات هەرچەندە خەوێنەرەكە هەوڵ بدات كارەكەی پێ بكات... ئەوەش یانی: تۆ ناتوانیت پاڵ بەكەسە خەوتوەكەوە بنێیت بۆ كردنی كارێك، مەگەر ئەو كارە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو بەهایانەدا كە خەوتوەكە باوەڕی پێی هەبوە بەر لەوەی بكەوێتە ژێر كرداری خەواندنەوە.

بۆ نمونە، ئەو گەنجە دانیماركیە وەربگرە كە كرداری كوشتن و تاڵانی ئەنجامدا لەكاتی خەواندنی دا... وەك دەگوترا گەنجێكی سادەی دڵسۆز و نەزان بوو.. ئەو گەنجە و هاوشێوەكانی وان، لەژیانی ئاساییان دا سڵ ناكەنەوە لەوەی دزێوترینی كردەوە ئەنجام بدەن، ئەگەر پێیان گوترا ئەو كردەوەیە جیهادە لەپێناوی خوا دا، یان خەباتە لەپێناوی نیشتمان دا... كەواتە خەواندن هیچ كاریگەریەكی وایان لەسەر دانانێ ، تەنها لەو ڕووەوە نەبێ كە ئەو ئارەزووەیان تێدا گەورە دەكات و گەرم و گوڕیی پێ دەبەخشێ.

چەند ساڵێك لەمەوبەر لەمیسر دا ڕووداوێك ڕوویدا، پوختەكەیش ئەوە بوو: پزیشكێك پەردەی كچێنی كچێكی لادابوو كە لای خۆی وەك خزمەتگوزار كاری دەكرد، دوای ئەوەی كرداری خەواندنی موگناتیسی بۆ ئەنجام دابوو... یەكێك لەدادگاكانی میسر، سەیری ئەو دۆسیەیان كرد و سزای سەختیان بەسەر پزیشكەكەدا سەپاند... كاتێك لە ڕووی سایكۆلۆژیەوە لەو كێشەیە دەكۆڵینەوە، دەتوانین وای دابنێین كە پزیشكەكە نەیدەتوانی كیژەكە هەڵخەڵەتێنێ ئەگەر لەكاتی خەواندنەكەی دا هەستیارترین ژێی نێودڵی كیژەكەی نەدایە، وەك ئەوەی پێی گوتبێ تۆ هاوسەری منی و هاوسەرگیریش كارێكە خودا و پێغەمبەر پێی قایلن. ئنیجا دووریش نیە كچەكە

ئەم ئاماژەی پێ خۆش بێت و، ئیتر ئەو فەرمانە جێبەجێ بکات کە خەوێنەرەکەی پێی دەکات.

جارێکیان لەکاتی خەواندن دا، پرسیاری ئەوە لەژنێك کرا کە ئایا تەمەنی چەندە، ژنەکەش خۆی لادەدا لە وەڵامدانەوە. کاتێکیش ئاماژەی ئەوەی پێ درا کە پێویستە تەمەنی ئاشکرا بکات، بۆ وەی پاساپۆرتی دەست بکەوێ، وەڵامێکی ڕاستەوخۆی نەدایەوە... لێکدانەوەی ئەو ڕووداوەش ئەوەیە کە ئەو ژنە لەبێداری دا حەز ناکات تەمەنی خۆی ئاشکرا بکات، کەواتە ئەو ئاماژە تەنویحیەش هیچ کارێکی تێ ناکات، ئەگەر پەساپۆرتی سەر مەریخیشی لەگەڵدا بێت.

تاقیکردنەوەیەکی خەواندن لەسەر ژنێکیتر جێبەجێ کرا، ئەو ژنە سەگێکی بچکۆلانەی هەبوو زۆری خۆش دەویست، لەکاتی خەواندنەکەی دا ئاماژەی ئەوەی درایە کە سەگەکەی تووشی تاعون بووە و چاودێری تەندروستی گشتیش وا دەخوازێ سەگەکە بکوژرێ... دواتر قەڵەمێکیان دایە دەستی ژنەکە گوایە چەقۆیە، هەروەها جانتایەکی بچوکیشیان دایە دەستی گوایە ئەو سەگەیە کە دەبێت بکوژرێت، ژنەکە باوەڕی بەهەموو ئەو ئاماژانە کرد، بەڵام بەتەواوی خرۆشا کاتێك خەوێنەرەکە داوای لێکرد سەگەکە (واتە جانتا بچوکەکە ـ وەرگێڕ) بەچەقۆکەی دەستی (واتە بەقەڵەمەکەی ـ وەرگێڕ) بکوژێت، بەڵکو قیڕاندی بەڕوی خەوێنەرەکەدا و گوتی: بڕۆ هەی نالەبار "دەربڕینی وەرگێڕ"... نایکوژم... نایکوژم... نایکوژم.. ئنجا دەستی کرد بەگریان و فرمێسك لە چاوەکانی دابارین، لەوکاتەدا خەوێنەرەکە هەوڵێکی زۆری دا تاکوو بتوانێ بیگەڕێنێتەوە سەرباری دامەزراوی خۆی.[١٠]

### خەواندن و قەناعەت پێکردن:

وەك گوتمان خەواندن پلەی جوداجودای هەیە، پلەی توند و پلەی سوکی هەیە، لێکۆڵینەوە دەروونی و یاساییەکان گرنگی بەپلە توندەکەی دەدەن، بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە خەواندنی سوکیش ڕەنگە شوێنەوارێکی زۆر لەژیانی دەروونی و

کۆمەڵایەتی دا دابنێت، ئەمەش بەڕوونی کاتێ دەردەکەوێ کە یەکێکمان هەوڵ دەدات قەناعەت بەکەسێك بكات.

بێگومان هێزی قەناعەت پێکردن لەمرۆڤ دا پشت بەفاکتەری جۆراوجۆر دەبەستێ، وەڵێ هۆکاریتر هەیە کە زۆربەی خەڵك پێی ئاشنا نین ،هەر چەندە گرنگیشە لە قەناعەت پێکردن دا، ئەویش بریتییە لە توانای خەواندن و ئیجا... خاوەنی ئەو توانایە، تواناکەی بەکار دەهێنێت لە مامەڵەکردنی دا لەگەڵ خەڵکیدا، تاڕادەیەکی زۆریش کار لە سەرکەوتنی دەکات، ئەمە لەکاتێکدا خۆی هەستی پێ ناکات ، یان پەی بە گرنگییەکەی نابات لەژیانی دا.. ئەم توانایە بەشێکە لەوەی خەڵکی دەیدەنە پاڵ شانس (بەخت) و بەختیش لێی بێبەریە.

ڕەنگە کەسێك لەوانەی ئەو توانا تەنویمییەیان هەیە بێتە لات و سەرنجە تیژەکان و ئاماژە بەهێزەکانی چڕ بکاتەوە بەسەرت دا. ئەو وەك خۆی دەڵێت دەیەوێت بەبەڵگەی لۆژیکی قەناعەتت پێ بکات، وەڵێ ئەو لەڕاستی دا کرداری سوکی خەواندنت بۆ ئەنجام دەدا بەجۆرێ تۆ نازانیت، ئاماژەی ئەو ئەندێشە و بیرۆکانەت دەداتێ کە دەیەوێ، جار لە دوای جار ڕۆیان دەکات بەسەرت دا، تاکو دواجار مل کەچت دەکات بۆ ویست و ئارەزووەکانی خۆی و، تۆش ناتوانیت لێی دەرباز بیت.

هەروەها کەسێکی دیکە دێتە لات لەو کەسانەی توانای خەواندنیان نیە، یاخود ئەو توانایە تیای دا لاوازە، دەبینی لەبەرانبەری ئەمیاندا ئازادیت و دەتوانیت پێی بڵێیت (نەخێر) و ئاسودەشی، تەنانەت لەوانەیە بتوانیت کاریگەری خەواندنەکە بەسەری دا پێچەوانە بکەیتەوە و تۆ ببیتە خەوێنەری وی.

ئەو کەسەی توانای خەواندنی تێدا لاوازە لە قەناعەت پێکردنی بەرانبەرەکەی زیاتر پشت بە بەڵگەی لۆژیکی دەبەستێ وەك لەهێزی ئاماژەدان، چونکە وا گومان دەبات کە مرۆڤ ئاژەڵێکی ژیرە، بەڵام زۆر جار ئەو گومانەی بەرەو شکستی دەبات لەژیاندا.

ئەو کەسانەی سەرەڕۆیی سێکس زۆر دەکەن و، تیاشیدا سەرکەوتوو دەبن وا ناسراون کە ئەوەندە جوان نین تاکو جوانیەکەیان کارسازییان بۆ بکات، بەڵکو لە بریتی جوانی شتێکیتریان هەیە، کە بریتییە لە هێزی ئاماژەدان.. ئەو جۆرە پیاوانە بەقسەی

هەنگوینی و چاوتیژی خۆیان دەتوانن ژنەکە ڕابێنن... ژنەش لە بەردەستی دا شل دەبێت بێئەوەی هەست بکات پیاوەکە بەشێوازی موگناتیسی دەیخەوێنێت.

لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەم ئەگەر بڵێم: هەموو ژیانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە تۆڕێك لەیەکتر خەواندنی ئاڵوگۆڕ پێکراو، خەڵکی هەندێکیان هەندێکیتریان دەخەوێنن یاخود (ئیحا) بەیەکتری دەدەن، بێئەوەی هەست بکەن .. زۆر جار مرۆڤ کارێ دەکات کە ئاماژەی کردنی ئەو کارەی پێدراوە، کەچی بوغراشە بە ئەقڵی خۆیەوە، وا گومان دەبات کە لەڕوی قەناعەتی خۆیەوە کارەکە ئەنجام دەدات.

هەرچۆن بێ، بەڕواڵەت خەڵکی جیاوازن لەپلەی کاریگەربوونیان دا بەئاماژەی خەواندن، هەندێکیان تا ڕادەی کردنی دزێوترین تاوان دەکەوێتە ژێر ئەو کاریگەریەوە، وەڵێ هەندێکی دیکە لە سنورێکی دیاریکراودا دەچنە ژێر کاریگەریەکەوە... دەکرێت بڵێین: تا چەندە تاك خاوەنی ویستی بەهێز و بیرکردنەوەی پێگەیشتوو بێت، ئەوەندە سەختە خەوێنەرێك مل کەچی بکات بۆ ویستی خۆی، تەنانەت لەوانەیە لەنێو خەڵکیدا کەسی وا هەبێت کە هەرگیز نەخەوێندرێ.

### خەواندنی کۆمەڵایەتی:

بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشە بێنین، هەقە ئەوە بەیادی خۆمان بێنینەوە کە خەواندن تەنها لەنێوان دوو کەس دا کورت هەڵناهێنرێ کە یەکێکیان ئەوی دیکەیان بخەوێنێت. بەڵکو لەوانەیە لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی بەرفراواندا بێت، ئەم جۆرەی خەواندنەکە ئێمە لە بەشێکی رابردوو دا ناومان نا (خەواندنی کۆمەڵایەتی).

ئەم جۆرەی خەواندن ئاسایی لەو خۆپیشاندان و قەرەباڵغیانە دا توند و سەخت دەبێت کەخەڵکی کۆ دەبنەوە بۆ هوتاف و هاوارکردن. لێرەدا دەبینین ئەو کەسانەی بەشداری قەرەباڵغیەکە دەکەن، هەست ناکەن بەوەی چی دەکەن، چونکە بیرۆکەیەکی دیاریکراویان بەسەر دا زاڵ دەبێت و ، ئەمەش وایان لێدەکات ئاگایی خۆیان لەدەست بدەن، تەنها لەیەك ڕووەوە نەبێت، ئەویش ئەو لایەنەیەکە هوتاف و هاوارەکان ڕۆ دەکرێنە ناوییەوە... بۆیە دەبینین کۆمەڵێ کاری قێزەوەن دەکەن، وەك ئەشکەنجەدان و

سەربڕین و لەش تێکدان، بۆوەی دەرک بکەن بەگەڵحۆیی ئەو کارەی دەیکەن... دەکرێت لەو بارەدا ئەو خەڵکانە بچوێنین بەو گەنجە دانیمارکیەی کە دزی دەکرد و خەڵکی دەکوشت و بڕواشی وابوو کە دەرگاکانی بەهەشت لەبەردەمیدا کراوەن.

کەسێك هەواڵی ئەو کردەوە تۆقێنەر و قەسابخانانە ببیستێ کە جەماوەر پێی هەڵدەستن لەساتەوەختەکانی خەواندنی کۆمەڵایەتی دا، ڕەنگە بڕوا نەکات بەهۆی ڕادەی ئەو ترسناکیەی لە کردەوەکەیاندا هەیە ، ئەوانەش بەقەسابخانەکان هەڵدەستن، دوای ئەوەی ئاسەواری خەواندنەکەیان لەسەر نامێنێ، بڕوا ناکەن ئەوەی دەدرێتە پاڵیان ڕاست بێت... بۆیە هەر سەر بائەدەن و ئەپرسن: تۆ بڵێی ئەوان بووبن ئەو کردەوەی تۆقێنەرانەیان ئەنجام دابێ؟!.

خەواندنی کۆمەڵایەتی ،کاریگەریەکی گەورەی هەیە لە ئیفلیج کردنی بیرکردنەوەدا، چونکە ئەو کەسەی دەکەوێتە ژێرکاریگەری ئەو خەواندنەوە، ناتوانێ بیر بکاتەوە، لەو سنوورەدا نەبێ کە ئامازەکانی خەواندنی گشتی بۆی دەکێشن، بۆیە ناتوانیت هەڤپەیڤینی لەتەك دا بکەیت ،هەر چەندە بەلگەکانت ڕوون بن لەگەڵی دا، چوارچێوەی ئاوەزیی وی، بەجۆرێ کلۆم دراوە کە هیچ بەلگەیەکی لێوە ناچێتە ژوورێ، ئیدی بەلگەکە هەرچی بێت.

ئەو لەمیانەی ئەو چوارچێوەیەوە لەمەسەلەکان دەڕوانێت، تەنانەت لەوانەیە وەکو گا بخرۆشێت کاتێ هەوڵ دەدەیت لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیەوە شتێکی (نوێی بخەیتە بەردەم ـ دەربڕینی وەرگێڕ).

ڕۆژێکیان لە (کاظمیة) لەگەڵ گەنجێکدا دەدوام، لەبارەی مەترسی و دزێوی ئەو نەریتەی ناویان ناوە (التطبیر) [11] ،

کە هەندێ کەس سەری خۆیان بەنێزە بریندار دەکەن ،خۆیان ئاوقەی مردن دەکەن، گەنجەکە گوێی بۆ گرتم تا ئەو ڕادەیەی وام زانی بڕوای بەبۆچونەکانم کردوە. دواتر لەرۆژێکی (عاشورا)دا هەمان گەنجم بینیەوە، لەمەراسیمێکی (تەطبیر)دا، هەر ئەوەندەی لە دوورەوە منی بینی هەستم کرد غەزەب پەرپە چاوەکانی، لەو کاتەدا ئەو گەنجە لە ژێر کاریگەری خەواندنی کۆمەڵایەتی دا بوو، دیمەنەکانی خوێن و ( گێژو

هوڕ) ئەوانەی دەگریان بەسەر دڵ و دەروونی دا زاڵ ببوون و، ئیتر هیچ لەم دنیایەی نەدەگەشت ئەوەندە نەبێ پشتگیری (تەطبیر) بكات و بەرەو ئەو مەراسیمە بڕوات... سەرباری ئەوەش من پێویستم بەوە نیە كە بڵێم كاتێ گەنجەكەم دیتەوە قاچەكانی بەهەوادا ڕەها كرد بۆ ڕاكردن لەترسی ئەوەی نەكا گەنجەكە بگاتە سەرم و ( یەخە)م بگرێ و سەرم بڕێ و تەرمەكەم بشێوێنێ... ئایا چەن كەس بەبێتاوان بەوشێوەیە بوونە قوربانی.

دروستە بێژین لەهەر جێگەیەك مرۆڤ هەبێ، خەواندنی كۆمەڵایەتی بوونی هەیە، هەر مرۆڤێكیش بگری ، كەم و زۆر دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئەو جۆرەی خەواندنەوە... وەڵێ دەتوانین لەمەڕ خەواندنی كۆمەڵایەتیش هەمان ئەو ڕایە دەربڕین كەلە بەرانبەر خەواندنی (تاكەكەس) دا دەرمان بڕی، ئەویش ئەو ڕایە كە گوتمان : تا چەندە خەڵكی ڕۆشنبیر بن و، ئاوەزیان كراوە بێت، كاریگەری خەواندن لەسەریان لاوازتر دەبێت و مەترسیەكانیش كەمتر دەبن.

## پەراوێزەكانی بەشی پانزدەیەم:

١- بنوارە: المقتطف، رسائل الارواح، ل ٢٩.

٢- بنوارە: بول جاكو، التنويم المغناطيسي، ل ٥.

٣- بنوارە: سينل، الحاسة السادسة، ل ٥٨.

٤- بنوارە: Humphry, story of man's mind, p 269

٥- بنوارە: Wood Worth, study of Mentalcife

٦- بنوارە: سينل، الحاسة السادسة، ل ٨٨ ـ ٩٢.

٧- بنوارە: هـ.س، ل ٧٧.

٨- بنوارە: الثعلبي، قصص الانبياء، ل ١٠٦.

٩- بنوارە: وليم سرجيوس، التنويم المغناطيسي، ج١ ل ١٤٩.

١٠- بنوارە: هـ.س، ج١، ل ١٥٢.

١١- التكبير / بريتيە لەو ڕێو ڕەسنەی شیعەكان لەعاشورادا بۆ یادكردنەوەی جینۆسایدەكەی دژ بە (حسەین) سازی دەكەن و هەندێك ڕواڵەتی وەك بەزنجیر لەخۆدان و زەرگ وەشاندنیشی تێدا پەیڕەو دەكەن — وەرگێڕ -

# بەشی شازدەیەم:

## بلیمەتیی خەونەکان

لەوەی رابورد، باسمان لەخەون کرد ،لەڕوی پەیوەندی بەخەواندن و هەوڵدان لە ڕووداوەکانی دا هاتوو. هەنوکە دەمانەوێت لە ڕویەکی دیکەوە باس لەخەون بکەین، ئەو ڕوەش بریتییە لە پەیوەندی خەون بەبەرهەمە زانستی و هونەریەکانەوە... هەندێك لە هونەرمەندە داهێنەرەکان و ئەوانەی دۆزینەوەیان کردوە، ئەوەیان لێدەگێڕنەوە کەلەکاتی خەودا یاخود لەکاتی شێوەخەودا (وەك سەراسیمەیی) گەشتونەتە داهێنانە قەشەنگەکانیان.

## هەندێ نمونەی واقیعی:

پەرتوکە زانستی‌یەکان لەم ڕووەوە چیرۆك و بەسەرهاتی زۆرمان بۆ دەگێڕنەوە، ئێمە بەنموونە چیرۆکی دۆزینەوەی (ئەنسۆلین) باس دەکەین، واتە ئەو دەرمانەی (نەخۆشینی شەکرە)ی پێ چارەسەر دەکرێت. ئەم نەخۆشینە یەکێك بوو لەو نەخۆشینە ترسناکانەی کە لە پزیشکەکان یاخی بوو، و چارەیان پێ نەدەکرا، تا ئەو کاتەی توێژەرێکی (کەنەدی) بەناوی (فردریك گرانت) توانی مادەی (ئەنسۆلین) بدۆزێتەوە، بەو هۆیەشەوە (گرانت) ساڵی (١٩٢٣) خەڵاتی (نۆبلی) وەرگرت.

گرانت باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە چۆن مادەی (ئەنسۆلین)ی دۆزیەوە، دەڵێت: شەوێکیان کۆوتارێکم ئامادە دەکرد لەسەر نەخۆشینی شەکرە ئنجا دوای ئەوەی ماندوو دەبێت خەوەنوچکە بەسەری دا زاڵ دەبێت و دەنوێت، کاتژمێر دووی ئەو شەوە لەخەو ڕادەبێ و گڵۆپەکە هەڵدەکات و سێ دەستەواژە لە تیانوسەکەی دا تۆمار دەکات، ئنجا دەنوێتەوە، دواتر ئەو سێ دەستەواژەیە بوونە کلیلی دۆزینەوەی ئەو دەرمانەی کە گیانی ملیۆنەهای لەمردن ڕزگار کردووە!

شتێكی ئاوهاش لەو پیاوە دەگێڕنەوە كە (مەكینەی درومان)ی دۆزیەوە، ئەو پیاوە دیزاینی هەموو بەشەكانی مەكینەكەی كردبوو، تەنها ئەوەندە مابوو شێوەی دەرزیەكی گونجاوی بۆ بسازێنێ... ماوەیەكی زۆر هەر سەرسام بوونەی، دەزانی چی بكات، دوای ئەوەی نائومێدی باڵی بەسەر دادەكێشێت، جارێكیان دەنوێت، لەخەونی دا وادەزانێت كەوتۆتە نێو كۆمەڵێك لە (زنجی)یە سەرەتاییەكان و دەوریان داوە و دەیانەوێت بیكوژن... كاتێ ڕمەكانیانی ئاراستە دەكەن و لێی نزیك دەكەونەوە سەرنج ئەدا هەموو ڕمەكان گونێك لە نزیكی نوكەكەیاندا هەیە... بەترسەوە لەخەو ڕادەچەنێت، بەڵام دەست بەجێ هەست دەكات ئەوەی بەدوایدا وێڵ بوو دۆزیویەتیەوە، بۆیە لەسەر شێوەی ڕمی زنجیەكان دەستی كردە دروستكردنی دەرزیەكانی.

هەروەها دەڵێن: (دیكارت) كاتێ لە نێو نوێنی خەونی بەیانی دا بوو ،گەشتە دۆزینەوە مەزنەكەی، هەمان شتیش دەربارەی (هنری بوانكاریە)ی زانای بیركاریزانی بەناوبانگ دەگوترێ، گوایە لەخەون دا یەكێك لەهەرە مەسەلە ماتماتیكیە گرنگەكانی شیكار و حەل كردوە.[۱]

(هنری فابر) باسی هەندێك لەخەونەكانیمان بۆ دەكات و دەڵێت: پریشكێكی بریكەدار لەمێشكی دا دەدرەوشێتەوە لەسەر نوێنەكە باز دەدات و گڵۆپەكەی هەڵدەكات و شیكارەكە دەنوسێت لە ترسی ئەوەی نەبادا لەبیری بچێتەوە، ئەو پریشكە وەك ڕوناكی چەخماخە لە ناكاو بزر دەبێ، وەك چۆن لەناكاو دا دەردەكەوێ.[۲]

**لەگەڵ هونەردۆستان دا :**

مەسەلەكە تەنها لەئاستی زانا و داهێنەراندا كورت هەڵنایەت، بەڵكو پەل دەهاوێ بۆ نێو هونەر دۆستانیش... سەبارەت بە مۆسیقاژەنی بەناوبانگ (ئارسەرسیمۆن سۆلفیان) دەڵێن ،گۆرانیە بەناوبانگەكەی كەناوی (ژیی ونبوو) بوو، لەخەوندا داناوە، كاتێ لەخەو ڕاچەنیوە، گۆپلە یەكەمینەكانی لە یاد ماوە تۆماری كردون، وەڵێ پاشماوەی سترانەكە بۆ هەتا هەتایە ونبوون.

خاوەنی پەرتووکی (الاغاني) باسی هۆزانڤانێکی سەردەمی نەفامیمان بۆ دەکات کەناوی (عبید کوڕی ئەبرەص) بووە ،کەلە گەڵ خوشکەکەی دا پەزی لەوەڕاندوە... پیاوێکی هۆزی (بنی مالك) دەچێ بەگژی دا و، ڕێگەنادات بچێتە سەر ئاوەکە و ئنجا سوکایەتیشی پێ دەکات و بە (کردەوەی بەد ـ وەرگێڕ) لەگەڵ خوشکەکەی دا تۆمەتباری دەکات.. ئیدی (عبید) لەگەڵ خوشکەکەی دا دێنەبەر سێبەری کۆمەڵێك نەمام، زۆر (تورەو بێتاقەت) دەبێت و خەوی لێدەکەوێت، لەخەونی دا دەبینێ کابرایەك (سەنگە هۆنراوە) یەکی بۆ دێنێت و دەیخاتە ناو دەمیەوە، کەلەخەو هەڵدەستێ هۆنراوەیەکی توندی پیا هەڵدان ڕێك دەخات ، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر هەرگیز هۆزانی نەگوتوە.[٢]

**ئامادەکاری دەروونی :**

ئاشکرایە هەندێ لەبیرمەندان تەنها بەو سودە کومساییان نایەت کە بەڕێکەوت لە ڕێگەی خەونەوە دەستیان دەکەوێ، بەڵکو بەرلە وەی بنون پەنا دەبەنە بەر ئامادەکردنی هزریان، لە ڕووی دەرونیەوە، تاکو ئەو سودە وەرگرن کە لەخەون چاوەڕوان دەکرێ... لەم ڕووەوە فەیلەسوفی عەرەبی (ابن سینا) لێی دەگێڕنەوە کە هەرکات مەسەلەیەکی فەلسەفی لێ یاخی ببوایە، دەستنوێژی دەگرت و نوێژێکی دەکرد و پاشان دەخەوت، بەوجۆرە وەڵامی ئەو مەسەلەیەی لەخەوندا وەردەگرت.

ئێمە ناتوانین نکولی لەکاریگەری دەست نوێژ و نوێژ بکەین لەم ڕووەوە، چونکە ئەو دووە دەبنە هۆی ئامادەکردنی هزر و چڕکردنەوەی لەسەر ئەو مەسەلەیەی کە گەرەکە لەخەون دا وەڵامەکەی دەستگیر ببێت، تەنانەت لەوانەشە بەهەر ڕێگەیەکی دیکەی دەرونیش جگە لەدەست نوێژ و نوێژ کردن مرۆڤ هەمان بەرەنجام بەدەست بێنێت.

یەکێك لەپیاوە ئیداریە بەناوبانگەکان کەناوی (ولیەم جیمس)ە لێی دەگێڕنەوە کە هەر کات گرفتێکی لێ یاخی بووبا، کەلەسەر جێگەکەی ڕادەکشا بیری خۆی چڕ دەکردەوە لەسەر ئەوەی پێنوس و کاغەز بەتەنیشتی نوێنەکەیەوە دابنێ، زۆر جاری وا دەبووکە لەخەو هەڵدەستا بیرۆکەیەکی بەپێز کەوتبوە مێشکیەوە، بۆیە بەپەلە تۆماری دەکرد بەر لەوەی لەبیری بچێتەوە.[٤]

مامۆستا (فورستر)یش پەنای دەبردە بەر ئەو ڕێگەیە کاتێ خوێندکار بوو لەزانکۆ دا، ئەمیش کاغەزێکی لەپاڵ نوێنەکەی دادەنا بۆ وەی وەڵامی ئەو مەسەلانەی تێدا بنوسێتەوە کە لەکاتی بێداری دا لێی یاخی ببوون.(٥)

## بۆچونی ئیبن خەلدون:

جێگەی ئاماژەپێدانە (ابن خلدون) نزیکەی شەش سەدە لەمەوبەر پەی بەو ڕاستیەیە بردوە، ئەو بڕوای وابوو خەونەکان دەتوانن هەندێك لە گرفتەکانی بێداری چارەسەر بکەن، بەمەرجێك ئەو کەسە بەر لەوەی بنوێ ئامادەکاریەکی دەروونی باشی بۆ کردبێ.

(ابن خلدون) لە (مقدمة)کەی دا ڕێگەیەکی خۆش (دەربڕینی وەرگێڕ)ی باس کردوە و دەڵێت ئەو ڕێگەیەی لەهەندێ کتێبی ئەستێرەناسەکانەوە وەرگرتوە و خۆیشی تاقی کردۆتەوە و خەونی سەیری لێ بەرهەم هێناوە... پوختەی ڕێگەکەش وەك ابن خلدون باسی دەکات ئەوەیە: مرۆڤ بەر لەوەی بنوێت، دوای ئەوەی ڕوگەی باش بۆ خەوتن هەڵدەبژێری ،پێویستە ئەم ڕستەیە بڵێتەوە (تماغس بعدان یسواد و غداس تنوفنا غادس) ئنجا بنوێت.. ئیتر ئەو شتە دەبینێ کە لەکاتی بێداری دا تامەزرۆی بینینی بووە.

(ابن خلدون) لەو وشە ئەعجەمیانە دا هیچ توانایەکی جادوویی یاخود نهێنیەکی پەنامەکی نابینێت... چونکە ئەو دەربڕینانە هیچ نین جگە لە کۆمەڵێك واژەی بێمانا کە ئەستێرەناسەکان لە (تەلایمە) کانیان دا دەینوسن بێئەوەی لە خودی خۆیاندا ئەو وشانە هیچ مانایەکیان هەبێت... تەنها ئەوەندە هەیە، ئەو کەسەی بڕوای پێ دەکات ئامادەباشیەکی دەروونی تێدا دروست دەکەن و، وای لێ دەکەن بتوانێت هێزە هزریەکانی ئاراستە بکات بەرەو چارەسەری داواکراو.

(ابن خلدون) بەدەربڕینێکی جوان بۆچونی خۆی کورت دەکاتەوە، دەربڕینەکەی لەهەندێ ڕووەوە لەو ڕایە دەچێت کە دەروونناسانی نوێ بڕوایان پێیەتی... دەڵێت: "فالقدرة على الاستعداد غير القدرة على الشيئ"(٦)

کەواتە مەسەلەکە مەسەلەی ئامادەباشیە کە لە ڕێگەی دەستنوێژ گرتن و نوێژەوە دەبێت، یان لە ڕێی هەندێ دەستەواژەی ئەعجەمی بێماناوە، وەك: (تماغس نوفنا غادس...).

**بۆچونی برجسۆن:**

هەر چۆن بێت، لەنێو توێژەراندا کەسانێك دەرکەوتن کە گومان بکەن لە تواناداری خەونەکان لە مەسەلەی ئەفراندن ،یاخود چارەسەرکردنی کێشەی ئاڵۆز و یاخییەکان دا... یەکێك لەوانە (برجسۆن)ی فەیلەسوفی بەناوبانگی فەرەنسی بوو... (برجسۆن) پێی وایە: ئاوەز لەکاتی ئەفراندن دا پێویستە ئەوەندە توانا بەگەڕ بخات کە پرۆسەی ڕێك و پێك کردن و ڕێکخستن ئەنجام بدات، ئەو توانایەش لەکاتی نوستن دا چنگی مرۆڤ ناکەوێ، چونکە نەست لەوکاتە دا شڵەژاوە.(٧)

ڕەوایە بۆ ئێمە، کە ناکۆك بین لە گەڵ (برجسۆن) دا لە بارەی ئەو بۆچونەیەوە... جارێ ئێمە ملەجەڕێ ناکەین لەوەی ئەفراندن پێویستی بەکۆششێکی وشیارانە هەیە کە هزر بیخاتە کار لەپرۆسەی ڕێك و پێك کردن و ڕێکخستنی دا، بەڵام ئایا تەنها ئەو کۆششە بەسە بۆ بەدی هێنانی ئەفراندن؟ بەنمونە مەکینەی درومان وەربگرە کە ئێمە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد... ئەوە بوو زانیمان دۆزەرەوەکەی پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانی دیزاینی ئەو مەکینەیە بکات، هیچی نەمابوو تەنها دروست کردنی دەرزیەکی گونجاو نەبێت بۆی، بەردەوام بیری لەوە دەکردەوە بەبێ سود... تەنانەت چارەنووسی هەموو داهێنانەکە بەند بوو بەشێوازی دەرزیەکەوە، کە دەبێ کونەکەی لە نزیکی نوکەیەکەوە بێت... وەلێ پەیی بەمە نەدەبرد هەر چەندە بیری لێ دەکردەوە، تا ئەوە بوو لەکۆتایی دا، بەئاماژەیەکی تێپەڕ، بیرۆکەیەکی لەکاتی خەو دا بۆ هات... بۆیە کە بێدار بویەوە، هاواری کرد، وەك چۆن پێشتریش (ئەرخەمیدس) هاواری کرد: دۆزیمەوە.... دۆزیمەوە.

دەتوانین دەربارەی هەموو دۆزەردوە و داهێنەرەکان هەر وا بڵێین.. داهێنەر لەهەموو لایەکەوە لە گرفتە یاخی بوەکە دەنوارێت و ئەمدیودیوی دەکات، کەچی

دەستەوسانیشە لەوەی چارەسەری بكات... لەكاتێكدا ڕەنگە چارەسەر و حەلەكەیشی لەبیرۆكەیەكی زۆر سادەدا بێت، وەك سادەیی جێگەی كون كردنی دەرزی مەكینەی درومانەكە... كەچی ئەو بیرۆكە سادەیە نایەت بەمێشكی مرۆڤ دا، هەرچەند بەشێوازی وشیارانە بیری لێ بكاتەوە... تەنانەت دەتوانین بڵێین تا چەندە ئەو بیری لێ بكاتەوە، بیرۆكەكە پتر لێی دوور دەكەوێتەوە، بەڵام كاتێ كە لەبیر خۆی دەباتەوە، بیرۆكە سادەكە وەكو پزیسكەی بروسكەیەك دێتە مێشكیەوە.

**قۆستنەوەی بیرۆكەكان:**

پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی، وەدەركەوتنی بیرۆكەی تێپەڕی داهێنەرانە تەنها لەكاتی نوستن دا كورت هەڵنایەت... بەڵكو لەوانەیە لەهەر كاتێكیتر دا كە مرۆڤ تیای دا سەراسیمە دەبێت و چالاكیەكانی ئاوەزی وشیاری خامۆش دەبن، ئەو بیرۆكە داهێنەرانە بەمێشكی دا بێن... زۆر جاری وا هەبووە كەسە بلیمەتەكان لەكاتێكدا بەبیرۆكە مەزنەكانیان گەشتون، كە بەشەقامەكاندا گەڕاون یاخود چونەتە سەر پێشاو یاخود لەسەر نوێنی حەوانەوە هەڵاژیاون.

ئەمەش یانی، كەسی بلیمەتی داهێنەر، نابێت تەنها بەچالاكی ئاوەزی وشیاری كومسایی بێت، بەڵكو لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لە بۆتە دابێت بۆ ئەو تیشكۆیانەی لەئاوەزی ناوەگیەوە سەرهەڵئەدەن و لەئامادەباشی دابێت بۆ قۆستنەوەی ئەو بیرۆكە تێپەڕ و ناكاوانەی لێوە دێنە نێو مێشكی... چونكە گەر دوودڵ بێت لە قۆستنەوەی ئەو بیرۆكانە لەكاتی گونجاوی خۆیاندا، ئەوا هەلی تەمەنی لەدەست دەچێت.

ئەوەی كەلەداهێنەرەكاندا تێبینی دەكەین، هەر یەك لەئێمە لەخودی خویشی دا تێبینی دەكات... ئێمە زۆر جار هەوڵ دەدەین شتێكمان بیر بكەوێتەوە، لەوانەیە ئەو شتە یەكێك بێت لەو شتە ئاساییانەی كەهەمیشە لە بیرماندان، وەلێ هەر كە هزرمان چڕ كردەوە لەسەری ئەو خۆیمان لێ بزر دەكات و لەیادەوەریمان دا نامێنێ... خەڵكی بەوەیە دەڵێن (فلان شتە كە لەسەر زارمانە و ناتوانین بیدركێنین ــ دەربڕینی

وەرگێڕ).. سەیریش لەوە دایە هەر کەشتەکەمان فەرامۆش کرد، لەناکاو دێتەوە بیرمان، بەڵام ڕەنگە دوای ئەوەی پێویستمان پێی نامێنێ ئەوجا بێتەوە بیرمان.

زۆر جار گەربمانەوێ نوکتەیەك لە بۆنەیەکدا بگێڕینەوە، وامان بەسەر دێ کەلێی دواین... هەر چەندە خۆمان ماندوو بکەین بەدووی نوکتەیەکی گونجاو دا، زیاتر دەستەوسان دەبین لە دۆزینەوەی، ئنجا کاتێ بۆنەکە کۆتایی دێت دەبینین مێشکمان پڕبوە لەنوکتەی جوان... زۆر بەداخەوە.

**بەهرەی هۆزانڤانان:**

نوسراوە وێژەییەکان باسی ئاوهای هۆزانڤانەکانمان لەکۆن و نوێ دا بۆ دەکەن... هەندێ جاری وا دەبێ، یەکێکیان هەوڵ دەدات هۆنراوەیەك بهۆنێتەوە، کەچی ناتوانێت، وەلێ دوای ئەوە چەند ساتێکی بەسەردا تێدەپەڕێ ، هۆنراوە لەسەر زاری زریان دەکات، وەك ئەوەی لەهێزێکەوە بەسەری دا بسەپێنرێ کە لەدەرەوەی ویست و خواستی دایە.

عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی بەو چرکەساتانەی کە تیایاندا هەست و توانای شیعری زریان دەکات، دەیان گوت لەکردەی جنۆکەکانە... لەوەشدا سەرکۆنە ناکرێن، چونکە ئەوان لەو نهێنییە ناگەن کە وایان لێ دەکات هەستی شیعرییان زریان بکات و هەندێکاتیتر چوڕەبڕ بێت (دەربڕینی وەرگێڕ) بێئەوەی ویستی وشیاریان هیچ دەستێکی لەو مەسەلەیەدا هەبێ، کەوابێ پێویستە بیدەنە پاڵ (جنۆکەکان ) چونکە وا ڕاهاتوون هەرچی دیاردەی سەیر هەیە بەو جۆرە لێك بدەنەوە.

(سەعالبی) دەڵێت: "هۆزانڤانەکان وایان باسدەکرد ، شەیاتینەکان هۆنراوە دەخەنە سەر زاریان و فێریان دەکەن... پڕو پاڵانتەی ئەوەشیان دەکرد کە هەر یەکێکیان شەیتانێکیان هەیە کە هۆنراوە لەسەر زاری دەڵێت ... هەر کامێکیان شەیتانەکەی لوس کەلەتر بێت هۆنراوەکەیشی پاراوتر دەبێ... ڕادەی بڕواکردنیشیان بەو مەسەلەیە هێندە بوو کە بۆ هەر شەیتانێك لەو شەیتانانە ناوێکیان دانابوو، دەیانگوت شەیتانەکەی (أعشى) ناوی (مسحل)ە، و شەیتانەکەی (فرزدق) ناوی (عمرو)ە، شەیتانەکەی (بشار)یش ناوی (شنفناق)ە...."[8]

بۆ نمونە، لە فەرزدقەوە دەگێڕنەوە كە گوتویەتی: (ساتی وام بەسەردا تێدەپەڕێ كە هەڵكەندنی خرێیەكم پێخۆشتر و لام ئاسانترە لە ڕێكخستنی دێڕێك هۆنراوە)... جارێكیان پیاوێكی (ئەنسار)ی سوكایەتی بە فەرزدق دەكات و تەحەداشی دەكات كە بتوانێ هۆنراوەیەكی وەك هۆنراوەكانی (حەسانی كوڕی سابتی ئەنساری) بهۆنێتەوە... لەوكاتەدا فەرزدەق بەتوڕەیی پشت هەڵئەكات و هەوڵ دەدا هۆنراوەیەك ڕێك بخات و نەی دەتوانی .. بۆیە بەردەوام ململانێ دەكرد لەگەڵ هەست و توانای شیعری خۆی دا ، بەڵام بێسوود بوو... وا دیارە برادەری جنۆكەكەی لەوكاتەدا لەگەڵی دا نەبووە ... فەرزدەق ناچار دەبێ جڵەوی وشترەكەی بگرێ ، بەرەو شاخێ لە دەرەوەی شار بڕوات و بگەڕێ بەدووی برادەرەكەی دا... لەوێدا بەدەنگی بەرز هاواری كرد (براگەتان! براگەت بابی لوبنا)! ... ئیتر جنۆكەكە بەزەیی بە (فەرزدەق)دا هاتەوە، هەر ئەوەندەی (فەرزدەق) وشترەكەی بەستەوە ، خەریك بوو وشترەكەیان پاڵ بداتەوە و دەست بەجێ شەپۆلی شێعر سنگی (فەرزدەقی) داگیر كرد... ئەوە بوو لەو جێگەیە هەڵنەسا تاكو پتر لەسەد كۆپلە شیعری ڕێكخست كە لەباشترین شێعرەكانی بوو.

(جەریر)یش ڕوداوێكی وای هاتوە بەسەردا. دەڵێن یەكێك لە والیەكان دەنێرێتە لای و داوای هۆنراوەیەكی لێ دەكات ... (جەریر) ئەو شەوەی گوزەراند و بەردەوام هەوڵی دەدا هۆنراوەیەك بڵێت، بەڵام نەی دەتوانی. لەوكاتەدا هاوڕێ جنۆكەكەی لە گۆشەیەكی ماڵەكەوە هاواری لێ دەكات: (ئایا وات دەزانی شیعر دەڵێیت... ئەوەتا شەوێك تێپەڕی بەسەرت دا و نەت توانی هیچ بڵێی...)[٩]

یەكێكی دیكە لەو ڕوداوە سەیر و سەمەرانەی لەم ڕووەوە دەگێڕدرێنەوە، ئەم ڕووداوەیە: دەگێڕنەوە (فەرزدەق) دێت بۆ لای (حەسەنی بەصری) و پێی دەڵێ: (من هەجوی ئیبلیسم كردوە ـ واتە بەهۆنراوە دام شۆریوە ـ وەرگێڕ) حەسەنی بەسری بەسەرسامیەوە دەڵێت: (چۆنی هەجو دەكەیت لەكاتێكدا تۆ لەسەر زاری ئەوەوە دەدوێیت؟).[١٠]

## هۆزانڤانە بیانیەكان:

زۆربەی شاعیرانی بیانیش لەسەدەی نوێدا، ئەو هەستەیان كردوە كە هۆزانڤانانی عەرەب لە دێرزەماندا هەستیان پێكردوە. بەڵام ئەمان دیاردەكەیان نەداوەتە پاڵ جنۆكە. بەڵكو گوتویانە بارێكی تەم و مژدارە، دایان دەگرێت و وایان لێ دەكات بەبێ ئاگابوون و خواست هۆنراوە ڕێك بخەن.[11]

یەكێك لەوانە شاعیری بەناوبانگی ئینگلیزی (شیلی)یە... ئەم شاعیرە بەوە ناسراوە كە ڕەفتاری ڕیزپەڕی هەبوە بەڕادەیەك دەوروبەرەكەی بە "شێت" تۆمەتباریان كردوە. جارێكیان بینیویانە كە لەدارستانێكدا لەپاڵ درەختێكدا دانیشتوە و گەڵایەكی زۆر كە هەر یەكێكیان دێرێكی لەسەر نوسرابوو، یەك بەسەر ئەویتردا كەوتون بە جۆرێكیترسناك، كاتێك پرسیاری ئەوەیان لە (شیلی) كرد گوتی: مێشكم كاتێ بەبیرۆكە پڕ دەبێ، دەست بەجێ دێتە كوڵ، ئنجا هێندە بەخێرایی وشە و ئەندێشەكان تورڕ دەداتە دەرێ كە من ناتوانم بیان گرمەوە...

هەروەها (شیللی) لەو بارەوە دەڵێت: (شیعر لەوبابەتی بیركردنەوانە نیە كە مەبەست و ویست بەسەری دا زاڵ دەبن، مرۆڤ ناتوانێت بڵێت: ئەمەوێ شێعرێك ڕێك بخەم، تەنانەت لە توانای مەزنترین شاعیریش دا نیە وا بڵێت).

(كیتس)یش كەشاعیرێكی ناسراویترە، دەڵێت گوایە كاتێ ئەو شیعرانە دەخوێنێتەوە كە لەكاتی ئیلهام دا نوسیویەتی، سەری لێیان سوڕ دەمێنێ و وا دەزانێت خۆی ڕێكی نەخستون، بەڵكو یەكێكیتر بۆی ڕێك خستوە.

(جۆرج ئەلیۆت) دان بەوەدا دەنێت كە باشترین نوسراوەكان لەوەوە دەرنەچوون، بەڵكو لەكەسێتیەكی ترەوە دەرچوون، ئەو هیچ نەبووە جگە لەئامێرێك بۆ تۆماركردنی ئەو شتانەی كەسایەتییەكەیتر بەسەری دا دەدات.[12]

جگە لەویش، (ولیەم بلیك) ئەوە ئاشكرا دەكات كە ئەو تەنها ئەو شیعرانەی نوسیوە كە بەسەری دا دراون.[13]

لەراستی دا جگە لەوانەی ئاماژەمان پێدان، شاعیرانێکی زۆری تر هەن کە دانیان ناوە بە زاڵ بوونی بارێکی تەم و مژدار بەسەریاندا کاتێ هۆنراوەیان رێك خستوە.. بەڵام ئەو بارە نادەنە پاڵ جنۆکە، وەك پێشتر عەرەبەکان دەیانکرد.. واش دەزانم گەر ئەمانیش لە رۆژگارەکانی نەفامیدا بژیابان ئەوا دودڵ نەدەبوون لەوەی ئەو بارە تەم و مژدارە بە کردەوەی شەیاتین و جنۆکەکان وسف بکەن.

**شێوازەکانی هاندانی بەهرە:**

هەر شاعیرێك میکانیزمێکی تایبەتی هەیە، لەکاتێکدا "بەهرەی شیعری"یان لێ یاخی دەبێت، بەو میکانیزمە هانی دەدەن و دەیخرۆشێنن... بۆ نمونە هەندێ لە هۆنەرانی سەردەمی نەفامی ڕویان دەکردە چۆڵەوانیەکان چونکە بڕوایان وابوو لەوێ دا بەجنۆکەکان دەگەن... بەبڕوای ئەوان جنۆکە لە چۆڵەوانی دادەژین... و زۆر جار جنۆکەکانیش لەو جێگایانەدا دەبینن بەهۆی کاریگەری وەهم و ئیحائی خودیەوە.

(کثیر عزة)ی شاعیر باسی خۆیمان بۆ دەکات و دەڵێت: "نیوەڕۆیەك بەسەر پشتی وشترێکەوە لە غەمیم یان لە بیقاعی حەمداندا دەڕۆیشتم، سوارێك لێم نزیك کەوتەوە تا هاتە تەنیشتمەوە.. پێی گوتم: شیعر بڵێ، شیعری بەسەرم دا خوێندەوە... وتم: تۆ کێیت: گوتی: من هاوتا و هاوەڵە جنۆکەکەی تۆم...."(١٤)

ناڕەحەت نیە بۆمان تەسەوری ئەوە بکەین، جنۆکە لەو شاعیرە پەیدا ببێ، چونکە ئەو شاعیرە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی کردوە و ئاماژەی وایشی بەخۆی داوە، کردەوەی خەواندنی خودی بۆ خۆی ئەنجام داوە. لەو حاڵەتەشدا خەیاڵ پەل کێشی دەکات بۆ بینینی ئەوەی چاوەنواڕی دەکرد... لەو کاتەشدا شیعر زریانێکی دەکاتە سەر، خوێشی وا دەزانێ هاوڕێ جنۆکەکەی ڕوی کردوە بەسەری دا.

هەندێ شاعیری تر هەن بە شێوازیتر "بەهرەی شیعری" خۆیان دەخرۆشێنن، وەك ئەوەی خۆیان دەخستە بەر سەرما یا خود گەرما، یان خۆراکە بێهۆش کەرەکانی دەخوارد یاخود خۆراکە وریاکەرەوەکان، یاخود کارێکی دەکرد کە لەکاری نادان و شێتەکان دەچوو... دەگێڕنەوە (ابن تمام) هەر کەهۆنراوەی لێ یاخی ببوایە (دەربڕینی

وەرگێڕ) پەنای دەبردە بەر تانکیەکی ئاو (حەوزی ئاو) کە لەماڵەکەی دا ئامادەی کردبوو، خۆی لەو تانکیە دا نقوم دەکرد، لەو کاتەدا ئیلهامی شیعری بۆ دەهات... هەروەها دەگێڕنەوە (جەریر)یش هەر کات شیعری لێ یاخی ببوایە، هەموو جلکەکانی بەری دادەکەند و دەستی دەکردە خۆگەوزاندن و تەپاوتل بەسەر خۆڵ و لمی سەرزەوی دا، وەك چۆن گوێ درێژ خۆی دەگەوزێنێ، ڕەنگە لەو کاتەدا "سنگە خشکێ"یشی کردبێ تا ئەندازەیەك کەسێك سەیری کردبێ وای زانیوە شێتە... هەروەها دەڵێن شاعیرانی دیکەی وەك (ئەختەل، ئەبی نواس، خیام) لەڕێگەی خواردنەوەی (مەی)یەوە هەستی شیعری خۆیان بزواندوە.

لەم سەردەمەی ئێمەش دا واباس دەکەن، زۆرێك لەداهێنەران ناتوانن هیچ بەرهەمێك بەدەست بێنن، مەگەر زۆر جگەرە بکێشن یاخود زۆر قاوە بخۆنەوە، یان هەر نا بڕێکی باش مەی یان تریاك وە یان مادەی بێهۆشکەری دیکە وەرگرن... ئنجا هەر کاتێ واز لەو شتانە بێنن هەست بە وشکەوەبونێکی قەڵس دەکەن لەبەهرەیان دا.

بۆئێمە ئاسان نیە هەموو ئەو شێوازانە بژمێرین کە هۆزانڤان و هونەرمەندان لەو ڕووەوە بەکاری دێنن. هەر چۆن بێت دەتوانین بڵێین: ئەو شێواز و میکانیزمانە سەرباری جیاوازی جۆرەکانیان ،بەڵام مەبەست لێیان بێهۆش کردنی (ئاوەزی وشیار)ە، بۆ ئەوەی نەست بتوانێ لە ڕویەك لە ڕوەکانەوە چالاکی خۆی بەدەر بخات.

### فێ (بورانەوە) و داهێنان:

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کەهەندێ لە بلیمەتە بەناوبانگەکان لە مێژوودا بەجۆرێك لەجۆرەکان تووشی "فێ" بوون... بەهرەکانیان لەبەردەمیاندا واڵا نەدەبوو ئەگەر جارناجارێك فێیان لێ نەهاتایە ... ڕەنگە خوێنەر سەری لەم پەیڤە سوڕ بمێنێ ، چونکە فێداری لەدیدی خەڵکی دا نەخۆشینێکە دوچاری هەر کەس ببێ کەسایەتی ئەو کەسە تێك و پێك دەشکێنێ....

لەڕاستی دا فێداری کەسایەتی توشبوەگەی تێك دەشکێنێ لەهەندێ باردا، نەخاسمە گەر ئەو کەسە دەبەنگ و نادان بێ.. وەلێ ئەو کەسانەی زیرەکیەکی درەوشاوە و

بەهرەیەکی زۆریان هەیە لە (فێداری)یش سودمەند دەبن، چونکە ئاوەزی وشیاریان لەهەندێ کاتدا سڕ دەکات و هەل دەرەخسێنێت بۆ (نەست) یان تاکو کاری داهێنەرانە ئەنجام بدات.

شیاوە گەر ئاماژە بدەین بەوەی "فێ"ش هەمووی بەیەك شێواز و، بەو ڕادە سەختە نیە کە لای خەلکی ناسراوە، چونکە جۆرێکی سوکی هەیە کە هیچ زیانێك بە توشبوەکەی ناگەیەنێ. لەو کاتەدا کە ئەم جۆرە سوکە بەسەر خاوەنەکەی دا دێت کەمێك بێ ئاگا دەبێت (دەبورێتەوە ـ وەرگێڕ) و ئارەقیش دەکاتەوە.. لەوانەیە ئەو ماوە بێئاگاییەش بەسود بێت و کابرا بەجۆریك لێی بێتە دەرەوە کە لێوان بێت لە بیرۆکەی نوێ.

لەوانەشە ئەمە وای کردبێ لەهەندێ لە میللەتانی کۆن کە فێداری ناو بنێن "نەخۆشینە پیرۆزەکە"... زانراویشە گەلە سەرەتاییەکان بورانەوەیان بەشێوازێك دەزانی لەشێوازەکانی پەیوەندی کردن بەگیانەکان و خواوەندەکانەوە.[١٥]

**( ئیبن فارچ )**

لێرەدا ئەو بوارەمان نیە، ناوی هەموو ئەو بلیمەتانە ئاماژە پێبدەین کە دووچاری فێداری بوون... ئەوەندە بەسە باسی یەکێکیان بکەین ئەویش شاعیری میسری (ابن فارض)ە کەلە سالی (٦٣٢ك) دا کۆچی دوایی کرد.

کاتێ لەژیاننامەی ئەم شاعیرە دەکۆلینەوە، بەگوێرەی ئەوەی لە پەڕاوەکانی وێژەی عەرەبی دا هاتوە، هیچ باسێکی (فێداری)مان بەر چاو ناکەوێت... کە لەڕاستی دا دووچاری فێداری بووە، ئەوەندە هەبووە کە ئەم تووشی جۆرە سوکەکەی فێداری بووە کە جارناجارێ لەشێوەی جەزبەی سۆفی و غەیبو بە "لەهۆش خۆچوون" دای گرتوە.

مێژوونووسان دەربارەی ئەو شاعیرە دەلێن زۆرینەی هۆنراوەکانی لەژێر کاریگەری غەیبوبەی سۆفێتی دا هۆنیوەتەوە.. کورەکەی خۆی باسی دەکات و دەلێت: "جارێکیان شێخم بینی بەرزەوە بوو، ماوەیەکی دوور و درێژ سەمای کرد، دواتر ئەوەندەی ئارەق کردەوە تاکو چۆڕایە ژێر قاچەکانی و کەوت بە ئەرزدا و زۆر شلەژا، جگە من کەسی‌تر

لە لای نەبوو، پاشان ئۆقرەی گرت و کڕنۆشی برد بۆ خوای گەورە، پرسیاری ئەو حاڵەتەم لێکرد گووتی: کوڕی خۆم! خودا مانایەکی لە کۆپلەیەکدا بۆ کردمەوە، کە هەرگیز مانای وای لێنەکردومەتەوە..."

(ابن فارض) ئەم حاڵەت و بێئاگابوونەی خۆیی ناو دەنا (سەرخۆش بوون بە شەرابی خۆشەویستی خودا).

### سەراسیمەیی بلیمەتەکان:

زۆرێك لەبلیمەتەکان بەوە ناوبانگیان دەرکردوە کەخاوەنی سەراسیمەییەکی زۆر بوون، بەڕادەیەك خۆشیان و خەڵکانی دەوروبەریشیان لەبیر کردوە... دەبینی یەکێکیان تەماشات دەکات و تۆ وادەزانیت گوێی بۆ قسەکانت گرتوە، کەچی ئەو یەك وشەت لێ تێنەگەیشتوە، زۆر جار بەو هۆیەشەوە کابرای بلیمەت ناوی نزیکترین هاوڕێی خۆی لەبیر دەکات، یاخود جموجوڵێکی سەیر و چاوەڕوان نەکراوی لێ دەبینرێت لەسەر شەقام یاخود لە نێو جڤات و دانیشتنەکاندا.

ئێمەومانان کەخەڵکی ئاسای یشین جاری وا هەیە چەند ساتێکی سەراسیمەییمان بەسەردا تێ دەپەڕێت ، لەو ساتانەدا خۆمان لەبیر دەچێت و سەرنجی‌تیژ لە "هیچ" دەدەین. وەلێ ئەو سەراسیمەییە لەئێمەدا جۆرێکی سوکە و بەخێرایی نامێنێت لەگەڵ ڕودانی بچوکترین شت لە دەوروبەرماندا... سەراسیمەیی بلیمەتەکان لەجۆرێکی‌ترە، لەوانەیە دنیا پڕ بێت لە هاوار و قیژ و هوڕ کەچی ئەوان هەر لەدنیای سەراسیمەیی خۆیان دان و هیچ هەست ناکەن بەوەی لە دنیای دەوروبەریاندا ڕو دەدات.. بۆ نمونە لە ئەرخەمیدس دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان لەنێو حەوشەی ماڵەکەی دا بەدەمدا کەوتوە و هێڵکاری و حساباتەکانی لەسەر زەویەکە دروست دەکات. لەو کاتەدا یاساوڵێك دێت و داوا دەکات ئەرخەمیدس بەپەلە بچێتە لای پادشا... ئەرخەمیدس گوێی لەبانگی یاساوڵەکە نەبوو، بەردەوام سەرقاڵی هێڵکاریەکانی خۆی بوو... یاساوڵەکە وا گومانی برد کە ئەرخەمیدس سوکایەتی بە فەرمانی پادشا دەکات، ئاخەر چۆن کابرای یاساوڵ لەسەراسیمە بوونی بلیمەتەکان تێ دەگات؟ بۆیە هێرشی کردە سەری و کوشتی.[١٦]

هەروەها دەڵێن (نیوتن)یش هەمان سەراسیمەیی توندی توش بوە، جارێکیان گەرەکیە بێت هێلکەیەك بخاتە نێو ئاوی گەرمەوە تاکو "بیکوڵێنێ" بەڵام لە بریتی ئەوەی هێلکەکە بخاتە ناو ئاوەکەوە، کاتژمێرەکەی دەستی تێدەخات... سەیریش لەوەدایە هێلکەکەی هەر بەدەستەوە بووە و بەردەوام تەماشای کردوە، لەوانەیە ویستبێتی ئەو کاتەی بۆ دیاری بکات کە "کوڵاندن"ی کاتژمێرەکەی تێدا ئەنجام دەدرێ.!!

جارێکیتر کۆمەڵێك لەهاوڕێکانی بۆ نان خواردن داوەت دەکات، کاتێ هەموویان ئامادە بوون، هەستا و بە جێی هێشتن و ڕۆیشت لە کتێبخانەکەی دا ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە... بۆیە کاتێ هاوڕێکانی بێزار دەبن لە چاوەڕوانی دەچنە لای و پێی دەڵێن: "زۆر سوپاس" ئەویش زۆر بەهێمنانەوە دەڵێت: (نا، ئەرکی سەرشان سوپاسکردنی ناوێ).!!

لەبلیمەتێکیتری ماتماتیك دەگێڕنەوە ،جارێك بەشەقامدا ڕۆشتوە و مێشکی سەرقاڵی مەسەلەیەکی ناڕەحەت بوە. ئۆتەرێکی ڕەش دەبینێ کە لەسەر ڕێگەکە ڕاوەستاوە. ئەمیش هیچ لەخۆی تێك نادا (دەربڕینی وەرگێڕ) بەڵکو پارچەیەك تەباشیر لەباخەڵی دەردێنێت و دەست دەکات بەنوسینی هاوکێشە ماتماتیکیەکانی لەسەری، بەگومانی ئەوەی لەسەر ئەو تەختە ڕەشە دەنوسێت کە لەماڵە بەڕێزەکەی دایە، بەخۆی نەزانیوە تاکو ئۆتەرەکە دەجوڵێت، ئیدی چاوی ڕێچکە و پێچکە دەکات و وادەزانێ توشی سەرەسوڕێ بوە (دەربڕینی وەرگێڕ).

## نەست و ئەفراندن:

لەوەی رابورد دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کە (ئەفراندن)، هەموی مرۆڤ لە ئەنجامی وشیاری ئەنقەست یاخود لەرێگەی بیرکردنەوەی ڕێك و پێکیەوە پێی ناگات. گومان لەوە دا نیە کە بیرکردنەوەی ڕێك و پێك پێویستە بۆ داهێنان، بەڵام تەنها ئەویش بەس نیە، چونکە هەر چەندە بیریارێ هەوڵ بدات بگاتە بیرۆکەیەکی نوێ، هەست

بەدەستەوسانی دەکات ئەگەر (نەست) بەفریای نەکەوێت کە بەئاماژە تیەڕ و ناکاوەکانی ڕێگەی بۆ ڕوناك دەکاتەوە.

مامۆستا (سیر بیرت) لەمەڕ ئەو شێوازەی کە بلیمەت و هونەرمەندەکان دەگەیەنێتە دەستکەوتەکانیان، بەم شێوەیە دەدوێت: "ئەو لێکۆڵینەوانەی زانایانی شیکردنەوەی سایکۆلۆژی لەسەر خەونەکان و خەونەکانی بێداری پێی هەستاون، ڕوناکیەکی زۆریان خستۆتە سەر کاری ئاوەز لای هونەرمەند... ئەو ئیشی داڕشتنەی کە هونەرمەند پێی هەڵدەستێ زۆر جار ـ وەك خەونی بێداری ـ بەرەنجامی کردەوەیەکی نەستیە... ئەوەی کە تەنها وەك ئاماژەیەك لە ئیلهام یاخود ئارەزویەکی ئینشایی بەرچاو دەکەوێ.. گەر تۆ بیپشکنی ئەوا لەسروشتە ئاڵۆزەکەیەوە بۆت دەردەکەوێ کە لەچەندین ئارەزووەوە هەڵقوڵاوە، کە لەقوڵاییەکاندا و لە ژێر ڕوپەڕی هەست دا کار دەکەن... ئەو ئارەزوانە بەردەوام دەبن لەسەر ئەرك و کاری (نەستی) خۆیان تاکو بەخەفەکراوی بمێننەوە.. ئاسەوارەکانیشی سادە و نەزانراو دەبن تاکو سەرچاوەکانیان پەنامەکی بێت"[17]

هەروەها مامۆستا (کنمیر)یش کەلێکۆڵینەوە لەسەر (بلیمەتی) دەکات هەر وا دەڵێت. بەڕای ئەو ئەفراندنی بلیمەتانە بریتی‌یە لە (ئەو ڕێگە نامۆیەی کە ـ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی‌تر ـ بیرۆکە تازە و دۆزینەوە سەیرەکانی لێوە ڕۆ دەکرێت بەسەر کەسە بلیمەتەکەدا، لەسەرچاوەیەکی نادیارەوە هەڵدەقوڵێت، ئەو خۆی نای ناسێت و (ئاوەزی هەستی)یش ناتوانێت پەی پێ بەرێت).[18]

(دکتۆر برود)یش گەشتۆتە ڕایەکی وا... ئەوەتا دەڵێت: "ئەو چالاکیە هزریانەی کەکار دەکەن بۆ چارەسەرکردنی گرفتێ، لەو شتانە نیە کە ئەقڵ کۆنترۆڵی بکات یاخود هەستی پێ بکات".[19]

## بۆچی:؟

ئەو پەیوەندیە توند و تۆڵەی ، لەنێوان نەست و ئەفراندن دا هەیە و وامان لێ دەکات بپرسین، و پێداگریش بکەین لە پرسیارکردن لەهۆکاری ئەو مەسەلەیە.. کە

بەڕاستی مەسەلەیەکی ورد و گرنگە... بەبۆچوونی من ئێمە ناتوانین چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە، بەر لەوەی شتێ بزانین لەبارەی سروشتی میمۆری لەمرۆڤ دا... وەك لەپێشەوەش ئاماژەمان پێدا، ئەوەی بەسەر داهێنەر دا دێ، ڕەنگە بەسەر هەر یەکێك لە ئێمەشدا بێت کاتێك بمانەوێ شتێکمان بیر بکەوێتەوە ... دەبینین تا خۆمان ماندوو بکەین و هەوڵ بدەین شتێکمان بیر بکەوێتەوە کە دەمانەوێت، ئەوا زۆر ناڕەحەتە و بیریشمان ناکەوێتەوە. بەڵام کە فەرامۆشمانکرد هێندە نابات لەناکاو وەك تیشکێکی تێپەڕ بەبیرمان دا دێتەوە.

بەشێوەیەکی گشتیش، گرفتی یادەوەری، گرفتێکی سانا نیە. زانایان ماوەیەکی دور و درێژ هەوڵیان دا پەردە لە ڕوی نهێنییەکانی لا بدەن بەڵام بێسوود بوو. لەبەر ئەوە تا ئەم رۆژگارەش هەندێ لەزانایان یادەوەری بە لەغزێکی نەزانراو دەژمێرن... وەڵێ لەم ماوەیەی دوایی دا (ئەم پەرتووکە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا نوسراوە - وەرگێڕ) رۆژنامەکان هەواڵی دۆزینەوەیەکی گرنگیان پێداین سەبارەت بەیادەوەری، لەسەر دەستی زانایەکی ڕوسی کەناوی (دکتۆر بلومنفلد)ە.. ئەم زانایە کۆمەڵێ تاقیکردنەوەی تاقیگەیی ئەنجام دا لەسەر خانەی زیندوو، بەتایبەتی ئەو زیندەخانانەی کە لەمێشك و مۆخی ئێسکەکاندا هەن، لەئەنجامدا بۆی دەرکەوت کە کۆمەڵێ تایبەتمەندی (کارۆموگناتیسی)یان تێدایە کە تاڕادەیەکی زۆر لەو تایبەتمەندیانە دەچن کە لەئامێرە بێتەلە پێشکەوتوەکاندان... زانایان ڕایان گەیاند : پێدەچێ ئەو دۆزینەوەیە ببێتە هۆی پەردەلادان لە ڕوی نهێنییەکانی یادەوەری لەمرۆڤ دا... ڕەنگە یادەوەری هیچ نەبێ جگە لەکردەوەیەکی ئاڵۆزی تۆمارکردنی موگناتیسی کە لەنێو مێشکی مرۆڤ دا ڕو دەدات، بەهەمان ئەو شێوەی تۆمارکردنە موگناتیسییەی کە لەنێو ئەقڵەی ئەلکترۆنیەکاندا جێبەجێ دەکرێ.

پێم وایە ئەم دۆزینەوە زانستییە مانایەکی گەورەی هەیە لە مەسەلەی ئەفراندن دا... ئێمە دەزانین داهێنانی هەر بیرۆکەیەکی نوێ هیچ نیە جگە لە پەیوەست کردن و لێ دروستکردن لە دوو بیرۆکەیتر، کەپێشتر ناسراون.[٢٠] ئەمەش یانی داهێنەر ناتوانێ شتێ لەنەبوونەوە وەدی بێنێت، بەڵکو لەکۆمەڵێ شت دروستی دەکات و پێکی دەهێنێ

کە ئەوشتانە پێشتر هەبوون، هیچ فەزلێکیش لەو ڕووەوە نیە، تەنها فەزڵی پەیوەست کردن و پێکهێنانەکە نەبێت.

سەرباری ئەوەش، گەر بزانین مێشک پێکهاتوە لە ملیۆنەها بیرۆکە و یادگاری کەلەئەنجامی ئەزمونەکانی پێشوی دا تۆمار و زەخیرەی کردوە، ئەوا دەگونجێت بڵێین: هەر بیرۆکەیەکی نوێ بریتی‌یە لە بەرەنجامی کردەوەیەکی نەستی‌ی کە لەنێو مێشکدا دروست دەبێ، لەو کردەوە و پرۆسەیەدا دوو بیرۆکەی کۆن پەیوەستەگی پەیدا دەکەن، وەك چۆن زانیاریە جۆراوجۆرە زەخیرەکراوەکانی نێو ئەقڵی ئەلکترۆنی پەیوەستەگی لەنێو خۆیاندا دروست دەکەن.

## پرسیارێکی‌تر:

ڕەنگە لەهەمان ڕووەوە پرسیارێکی‌تر بەمێشکدا بێت: بۆچی نارەحەتە بۆ مێشك لەکاتی وشیاری و( بیرکردنەوەی بەمەست )دا بیرۆکەی نوێ بقۆزێتەوە، بەڵام لەکاتێك دا (ئاوەزی وشیار) بێ‌ئاگایە بەئاسانی ئەو بیرۆکەیە دەقۆزێتەوە؟ وا دەردەکەوێت ( ئاوەزی وشیار) سروشتێکی شیکاری هەیە نەك پێکهاتەیی... دەتوانێت لێکۆڵینەوە بکات و بیر بکاتەوە و لەدوی شتان بگەڕێت، وەلێ کەمێك نەبێ ئیدی ناتوانێ داهێنان بکات. لەوانەیە نهێنی ئەوەش لەوە دابێت کە (ئاوەزی وشیار) بەلای تەرکیز کردن و ورد و سەرنجی دایە، کاتێ مەسەلەیەك دەکۆڵێتەوە هەوڵ دەدات سەرنجەکانی لەسەر یەك خاڵی ئەو مەسەلەیە چڕ بکاتەوە. بۆیە ئاسان نیە بۆی کە بتوانێت لەمیانەی یەك سەرنج دانەوە کۆمەڵێ خاڵی نێو ئەو مەسەلەیە لەخۆ بگرێت... ئەوەتا دەبینین لەکاتی لێکۆڵینەوەدا بیرۆکەکان کۆ دەکاتەوە و بەدووی وردەکاریەکانیدا دەڕوات، بەڵام توانای نیە پەیوەستەگی دروست بکات لەنێوان دوو بیرۆکەی لێکدی دووریاندا.

هۆکاری دەستەوسانی ئەوانەی زۆر شت لەبەر دەکەن لەوەی تێگەیشتن و داهێنانیان هەبێت هەر ئەوەیە... ئەوان زانیاری زۆر لەمێشکی خۆیاندا زەخیرە دەکەن (کە گوترا فلان کەس فلانە هۆنراوە یاخود فلانە پەرتوك یان قورئانی لەبەرە، واتە لەمێشکی دا زەخیرەی کردوە، بەو مانایەش لەبەر کردن واتە زەخیرەکردنی تێکست لەنێو مێشك دا -

وەرگێڕ) و دەمدرێژیشی پێوە دەکەن و چەند بارەی دەکەنەوە، وەلێ وەکو توتی دەستەوسانن لەهەڵگۆستنی هەر سودێ لەو شتەی کەلەبەریان کردوە... زیرەکەکانیش بەپێچەوانەوەن.. وا ڕاهاتوون لەبیرۆکە جۆراوجۆرەکان تێدەگەن و دواتر لەبیریان دەکەن... ئەمەش یانی زیرەکەکان ئەو بیرۆکانە بەزەخیرەکراوی لەنێو ئاوەزی ئاوەکیاندا واز لێ دێنن... لەوێندەر کار لێك دەکەن و پێکدا دێن... لەبەر ئەوە، ئەمان لەوەڵامدانەوە و چارەسەری گرفتەکاندا بەتواناترن لەوانەی شتان لەبەر دەکەن (واتە دەرخ کەران).

### شیعر چۆن هەڵدەقوڵێ:

هۆزانڤان پێویستە هۆنراوەی زۆر لەبەر بکات بەر لەوەی ببێتە هۆزانڤان، هەرگیز نابێت کەسێك لە خۆیەوە ببێتە هۆزانڤان گەر لەوەوپێش حەزی لەهۆنراوە نەبووبێت و شیعری زۆریشی لەبەر نەکردبێ... واتە ئەو هۆنراوانەی لەبەری کردووە بە نێو ئاوەزی ناوەکیی دا ڕۆچوون و زەخیرە کراون، دواتر کار لێك دەکەن و پێکەوە مۆتروبە دەبن.

بینیمان زۆر ناڕەحەتە شاعیر هەر کات ویستی بتوانێ هۆنراوەی باش دابنێت. (ویست) لێرەدا دەبێتە لەمپەرێك و ئەو دەرگایە لەسەر ( نەست ) دادەخات کە شیعری لێوە هەڵدەقوڵێ (دەربڕینی وەرگێڕ) ... کەوابێ شاعیر پێویستی بەچەند ساتێ هەیە کە تیای دا ئاوەزی وشیاری بێ ئاگا بێت و ویست فەرامۆش بکات... ئەو دەمەش نەست ئازاد دەبێت، ئیدی کار لێك و پێکڤەموتروبەکردن ڕوو دەدات بە بێ لەمپەر و کۆت وبەند.

لە (معروف ر صافی) یەوە دەگێڕنەوە جارێکیان (گێلەپیاوێك) هاتۆتە لای و داوای لێکردوە هۆنراوەیەکی بەپەلەی بۆ بنوسێت تاکو لەیەکێك لە بۆنە کت و پڕەکاندا بخوێنرێتەوە. ئەو پیاوە گومانی وا بوە ، شاعیر دەتوانێت هەر کاتێ ویستی شیعر بڵێت. بۆیە زۆر سەرسام بوو کاتێ بینی (ڕەصافی) داوای لێبوردن دەکات لە وەڵامدانەوەی داواکەی و پێداگریش دەکات لە پۆزش هێنانەوە... کاتێ کابراکە داواکەی دووبارە

دەکاتەوە ڕەسافی لێی تووڕە دەبێت و قسەیەکی وای پێ دەڵێت کە بۆ ئێمە ناشێت لێرەدا باسی بکەین... بەڵام قسەکەی ئەو مانایەی لێ دەخوێندرێتەوە کە هۆنراوە لەخۆوە هەڵدەقوڵێت و مل کەچی ویست نابێت.

**گرنگی کات:**

بیستومە جارێك شاعیرۆکەیە هۆنراوەیەکی درێژ لەئاهەنگێك دا دەخوێنێتەوە و بەلای هەندێ لەئامادەبووانەوە هۆنراوەیەکی باش دەبێت. کاتێ شاعیرۆکەکە لەخوێندنەوەکەی تەواو دەبێت دەست دەکاتە شانازی کردن بەخۆیەوە و دەڵێت گوایە هەموو هۆنراوەکەی لەچەند خولەکێك دا داناوە... مەبەستی لەو قسەیەش ئەوە بوو کە سەرەڕای تەنگی کات توانیویەتی هەڵبەستێکی جوان دابنێت و ئەگەر کاتێکی درێژتری لەبەر دەمدا بوایە هەڵبەستێکی جوانتر و مەزنتری دادەنا... ئەم شاعیرۆکەیە لەبیری چوە کە درێژی کات گرنگیەکی نیە لەمەسەلەی ڕەوانی و جوانێتی هۆنراوەدا.. لەوانە هۆزانڤانێکی مەزن چەند ڕۆژێ هەوڵ بدات شیعرێك دابنێت و نەتوانێت... کەچی دوای ئەوە لەچەند چرکەیەك دا هۆنراوەیەکی نەمر دادەنێت.

گرفتی داهێنان بەشێوەکی گشتی ئەوەیە کە مل کەچی حسابی کات نابێت و لەخشتەی لێکدان (جدول ضرب)یش تێناگات... چونکە لەو کارە تەرتیب کراوانە نیە کە تا کاتەکەی درێژتر بێت بەرهەمەکەی زیاتر دەکات.

تکام وایە لەخوێنەر و ا حاڵی نەبێت کە (کات) هیچ گرنگیەکی لەو مەسەلەیەدا نیە. لەڕاستی دا هەندێ جار کات زۆر گرنگە، چونکە ئەو بوارە لەبەردەمی داهێنەردا والا دەکات کە لێشاوی بەهرەکەی بقۆزێتەوە... تاکو کات لەبەر دەمیدا درێژ بێت، ئەوا هەلی ئەو قۆستنەوەیەش زیاتر دەبێت. ئەو داهێنەرەش کە بەپچرپچری لەبەهرەکەی سودمەند دەبێت ، ئەو ڕاستیەی بەسەر دا دەسەپێ ، چونکە لە هەرجارێکدا شتێکی نوێ دەخاتە سەر داهێنانەکەی پێشوی... جار لەدوای جار زیادە دەخاتە سەر داهێنانەکەی و پاڵفتەی دەکات، تاکو لەکۆتایی دا زۆرترین ڕووەکانی کامڵبوونی لەداهێنانەکەی دا کۆ دەبنەوە.

هەر داهێنەرێکی مەزنی بوارە زانستی‌یەکانیش بگری هەر وایە، بۆ نمونە سەیری چیرۆکی دۆزینەوەی تەلەفۆن بکە... (گراهام بێل) چەند ساڵێك خەریکی دۆزینەوەی بوو، کۆششی دەکرد و خۆی هیلاك دەکرد، هەر جار نا جارێکیش گرفتێکی یاخی لەبەردەمیدا قوت دەبویەوە، بۆیە جار لەدوای جار ناچار دەبوو ئیلهام لەنەست وەربگرێ، تاکو لەکۆتایی دا توانی دۆزینەوەکەی تەواو بکات، بەجۆرێك لەو داهێنانەی دا بەرهەمەکانی کۆشش و هەوڵی وشیار و نیگاکانی نەست شان بەشانی یەکتر کۆبوونەتەوە.[٢١]

### بەزۆر خۆکردنە بلیمەت:

هەندێ خەڵك وایان پێخۆشە زۆر لەخۆیان بکەن ،تاکو وەك بلیمەت دەربکەون، بەتایبەت مێرمنداڵە دەوڵەمەندەکان، ئەوان لەدنیادا هەر پلە و پایە و ماڵ و سامانێك ئاواتیان بووبێت دەستیان کەوتوە، بۆیە وا دەزانن دەتوانن بلیمەتیش وە دەست بێنن، وەك ئەوەی بلیمەتی پێویستی‌یەك بێت کە بەپارە و پول دەست بخرێ، وەکوئەو ژنە شەنگ و، کۆشکە قەشەنگانەی کەبە پارە و پوڵ دەستیان دەکەوێ. لەوانەیە باسی سەراسیمەیی بلیمەتەکان ببیستن، بۆیە هەوڵ دەدەن لاساییان بکەنەوە، دەبینی قژێ درێژ دەهێڵنەوە و سەرنجی قوڵ لەخۆیاندا دروست دەکەن، ئنجا سەریان دەخەنە سەر دەستیان و ئاخ و پف هەڵدەکێشن (دەربڕینی وەرگێڕ). کەلەنێو خەڵکیش دا دادەنیشن قسە لە لوتەکانیانەوە دەردەکەن (دەمنگێنن) و وتەکانیان پڕ دەکەن لە وشە و دەستەواژەی ناسك. زۆر جاریش خەڵکی ماستاوچی (دەربڕینێکی کوردیە بۆ سووکایەتی پێکردن ـ وەرگێڕ) لە دەوریان کۆ دەبنەوە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدەن و ستایشیان دەکەن، ئەمانیش وا دەزانن هەر بەڕاستی بونەتە بلیمەت ـ پەنا بەخوا!

خەڵکانێکی‌تر هەن ، حەزیان لەوەیە بلیمەت بن، بێئەوەی پلە و پایە و ماڵ و سامانیان هەبێت. ڕەنگە بۆیە ئارەزووی بکەن، تاکو ئەو ناتەواویەی پێ‌پڕ بکەنەوە کە بەهۆی سەرشۆڕی و بێبەری بوونەوە هەستی پێدەکەن. لەکتێبە کۆنەکانی پەروەردەدا دەخوێنینەوە کە بلیمەتێتی بەکۆشش کردن دێتە دەست، هەر کەسیش لەسەر ڕێگەکە

بڕوات دەگاتە مەبەست، بۆیە وادەزانن دەرگای بلیمەتێتی لەبەر دەمیاندا کراوەیە، ئەگەر بێت و کاری بۆ بکەن و بیرکردنەوەی دروستی لەپێناودا بەکار بێنن.

گرفتی ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە کە ناگەن بەو ئاواتەیان، بەڵام خۆیان وادەزانن کە پێی گەشتون. کاتێکیش دەبینن خەڵکیرێزی ( بلیمەتێتی ) یەگەیان ناگرن، ئەوا تورە دەبن و دەبەنگێتی و ڕژدی دەدەنە پاڵ خەڵك. دواتر دنیا پڕ دەکەن لەهات و هاوار و ئەفسوس لەسەر مردنی بلیمەتەکان لەم وڵاتە بێ وەیەدا!

ئەم وتەیە بەڕونی بەقوتابیانی وێژەی ئێمەوە دەردەکەوێت، هەر یەکێکیان دەیەوێت ببێتە وێژەوانێکی بلیمەت تەنها بەوەی لێکۆڵینەوەی ئەدەب و مێژووی ئەدەب بکات و ئاوەزی وشیاری پڕ بکات لە لەبەر کراوێکی زۆری ئەدەبی... لەو پێناوەشدا هەوڵێکی زۆر دەدات... کاتێکیش لەوە تەواو دەبێت، وادەزانێت هیچ لەنێوان ئەو و بلیمەتی دا نەماوە، ئەوەندە نەبێت بەرهەمەکەی بخاتە بەر دەمی خەڵك و، خەڵکیش بەچەپڵەڕێزان و سەرسامی داباڕن بەسەری دا.. لەوانەیە کەسانێك لەڕوی موجامەلەوە وای بۆ بکەن، ئیتر ئەم وا دەزانێت پێشی هەموو ئەدەب شوناسانی پێش و پاشی خۆی کەوتووە... لەو کاتە بە دواوە دەست دەکاتە شانازی کردن و فشەو فاڵ (دەربڕینی وەرگێڕ).

گرفتی ئەو هەزارانە و هاوشێوەکانی ئەوەیە کەزیاتر لاسایی دەکەنەوە وەك لەوەی داهێنان بکەن. لەوانەیە سەرسام بن بە ئەدیبێکی بەناوبانگ، دواتر هەوڵ دەدەن لاسایی دەربڕینێکی یان شێوازێکی بکەنەوە. جا مادەم ئەو ئەدیبە بۆتە بلیمەت، کەواتە بۆچی ئەمانیش بلیمەت نەبن؟ ئایا ئەمانیش وەکو ئەو مرۆڤ نین؟

### لە خەسڵەتەکانی بلیمەتێتی:

ئەو کەسانەی بەزۆر خۆ دەکەنە بلیمەت، یاخود هەوڵ دەدەن لاسایی بلیمەتان بکەنەوە، شتێکی گرنگ لەبیر دەکەن، ئەویش ئەوەیە بلیمەتێتی بە لاسایی و زۆر لەخۆکردن بەدەست نایەت. لەڕاستی دا لاسایی کردنەوە و داهێنان دوو مەسەلەی پێچەوانەن، مرۆڤ تا لەیەکێکیاندا شکست نەهێنێ لەوی‌تریان دا سەرکەوتوو نابێت.

یەكێك لە خەسڵەتەكانی بلیمەتی داهێنەریش ئەوەیە كە زۆر ڕقی لە لاساییكردنەوەیە، حەز ناكات هیچ شتێ بێنێتە كایەوە دوای ئەوە نەبێت كە لەرۆحی خۆی بەبەردا بكات و مۆركی خۆیی پێوە بنێت.

نكۆڵی لەوە ناكەین كە كابرای بلیمەتیش ڕەگ و ڕیشەی داهێنانەكانی لە بلیمەتەكانی پێشوو وەردەگرێ. بەڵام ئەم دێت موتروبەیان دەكات و دوبارە سەرنجیان دەداتەوە، تاكو شتێكی نوێیان لێ بەرهەم دێنێت بەجۆرێ جیاواز دەبێت لە بەرهەمەكانی پێشینانی... بە دەربڕینێكیتر: زۆر لێكۆڵینەوە دەكات و زۆریش شت لەبەر دەكات، بەڵام بۆیە شت لەبەر دەكات تاكو لەبیری بچێتەوە. لەم ڕووەوە لەبیر چونەوە ئەركێكی دەروونی گەورەی هەیە، چونكە زانیاریە زەخیرەكراوەكان لەئەقڵی وشیارەوە دەگوازێتەوە نێو ئەقڵی ناوەكی و دەیانكاتە بەشێك لەقەوارەی نەستی كەسە بلیمەتەكە.

ئەو زانیاریە زەخیرەكراوانە لە قوڵاییەكانی دەروندا دەمێننەوە، وەك ئەوەی بیەوێت هەڵ بێت، لەناكاویش دا، كاتێ كەسە بلیمەتەكە لە سەراسیمەیی دا نغرۆ بوە، یاخود لە قوڵایی خەو دایە، بیرۆكەی نوێ لەمێشكییەوە، وەك پزیسكەی ئاگر سەرهەڵئەدات (بەهۆی هەڵهاتنی بیرۆكە و زانیاریە زەخیركراوەكانەوە ـ وەرگێڕ). وەلێ بۆ وە سەرهەڵنادات تاكو كەسە بلیمەتەكە خۆی پێوە با بدات، بەڵكو بۆ وەی ئاگرێكی بەكڵپەی نێوناخی پێ دابگیرسێنێت ... ئیدی گوێش نادات بەوەی ئاخۆ بەو ئاگرە دەسوتێت ؟ یان ڕوناكی لێ وەردەگرێت؟.

**وێكچواندن و ڕونكردنەوە:**

دەگونجێت لەو ڕووەوە كابرای بلیمەت بەنوكتەبازێكی لێزان بچوێنین، تەنانەت لەوانەیە نوكتەبازی لێزانیش لە ڕویەك لە ڕوەكانەوە لە(بلیمەت )ی بێبەش نەبێت!!.

ئاشكرایە كەسێ نوكتەبازێكی لێزان بێت بەزۆر لەخۆكردن نوكتە ناگێڕێتەوە لە هەموو جڤاتێك دا تاكو بەسوعبەتچی و قسەخۆش دەركەوێ. بەپێچەوانەی (ئەو گێلە پیاوانەوە ) كە خەڵكی لەهەموو كات و شوێنێك دا بەدەستیانەوە گیرۆدە بوون.

ئەو كەسەی نوكتەبازێكی كارامەیە، زۆر جار دەبینین كە داوای لێدەكرێت نوكتەیەك بگێڕێتەوە، ناتوانێت. بەڵام كاتێ بەشێوازی ئاسایی خۆی بێت، ئەوا نوكتەی زۆر جوان و گونجاو بەشێوەیەكی سەرنج ڕاكێش و لێزانانە دەگێڕێتەوە، گوێش نادات بەوەی نوكتەكە لەسەر خۆی دەكەوێت یان لەسەر كەسانیتر، جیاوازی ناكات لەوەی خۆی بگەزێت یان كەسانیتر.

شیاوی باسكردنە كەئەم كابرانوكتەبازە لێزانە، نوكتەكانی خۆی لەدیاردە دەگمەن وسەیرەكانی خەڵكەوە یان لەڕواڵەتە سادەكانی ژیانەوە وەردەگرێت، وەلێ بەشێوازێكی تازە دەیگێڕێتەوە، بۆیە ناڕەحەت نیە تێبینی مۆركی تایبەتی ئەوی تێدا بكەین، وەك ئەوەی دروستكراوی ئەم بن نەك ئەو كەسانەی كەلێی وەرگرتوون. بەڵام دوای ئەوەی بەقوڵایی قەوارەی نەستی ئەمدا ڕۆ دەچن و ڕەنگی ئەم دەگرن ئەو جا لێی دێنە دەرێ.

پاشتر (گێلە پیاوە)كان دێن و دەیانەوێت لاسایی ئەم برادەرەمان بكەنەوە لەقسە و جموجوڵەكانی دا، وا گومان دەبەن مەسەلەكە ئاسانە بۆیان، مادەم ئەو خەڵكی پێكەناندوە بەنوكتەكانی، كەواتە بۆچی ئەمانیش پێت بەپێت لاسایی نەكەنەوە؟! بۆیە دەبینین بەدووی گوێگرانێك دا دەگەڕێن تاكو ئەو نوكتانە بڕشێننەوە بەسەریاندا كە لەبەریان كردون. گوێگرەكانیش هیچیان لەبەرانبەریاندا نامێنێت و ناچار دەبن لەگەڵیان دا پێبكەنن... پێكەنینێك كەلە گریان دەچێت؟!

بەڵاكە كاتێك سەختتر و، قورسترەكەش كاتێ خەست تر دەبێتەوە، گەر یەكێك لەو (گێلەپیاو)انە خاوەن دەستەڵات یاخود پارە و پول و سامان بن، وەك (صاحب كوڕی عباد) بۆ نمونە... ئەم كابرایە لەهەموو دانیشتنێك دا نوكتەیەكی بێتام دەكات... دانیشتوانیش بۆ خۆلێ نزیك كردنەوەی بەنوكتەكانی پێدەكەنن، بەڵام ئەگەر بەدەستیان بوایە قۆندەرە بارانیان دەكرد... دەگێڕنەوە بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك لەم جۆرە بووە، فەرمانبەرانی فەرمانگەكەش بۆ هەر نوكتەیەكی بێتام، قاقایان دەكرد كە بەڕێوەبەرەكە دەیگێڕایەوە، تەنانەت لەوانەیە هەندێكیان لەهۆش خۆیان چووبن. هێندە پێی سەرسام بووین، جارێكیان بەڕێوەبەرەكە دەبینێت فەرمانبەرێك لەناو

فەرمانبەرانەکاندا پێناکەنێت بە نوکتەکەی. پرسیاری لێدەکات کە هۆی پێنەکەنینی چىیە؟ فەرمانبەرەکە زۆر بەخوێن ساردیەوە لە وەڵامی دا دەڵێت: "بەڕێوەبەری بەڕێز، پێویست ناکات پێبکەنم چونکە من فەرمانبەری فەرمانگەیەکی‌ترم"!!.

ئەم بەڕێوەبەرە (زەوق سز)ە - دەربڕینی وەرگێڕ-)، هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ ئەو ئەدیبانەدا کە دەیانەوێت لەڕێگەی لاسایی و لەبەر کردنەوە ببنە بلیمەت. ئەوان هیچ لە ئەدەب نازانن جگە لەو دەستەواژانەی کەلە پەرتوکی ویژەوانە مەزنەکاندا دەیخوێننەوە.. سەرسام دەبن پێی و هەوڵ دەدەن خۆیان بەوان وێکچوێنن، بێئەوەی ئەو پریشکە دەگمەنەیان هەبێت کە ڕێ و شوێنی داهێنانی وەدی هێنەرانەیان بۆ بسازێنێ.

## پەراوێزەکانی بەشی شازدەیەم:


١ـ بنواڕە: Sullivan, Outline of Modern Belief, VOIII, P.811

٢ـ بنواڕە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ١٥٠.

٣ـ بنواڕە: ابوالفرج الاصفهاني، الاغاني، ج ١٩، ل ٧٦.

٤ـ بنواڕە: وليم سرجيوس، القوي الخفية، ل ٧٩.

٥ـ بنواڕە: Forester, Studies in Dreams, ch, 6

٦ـ بنواڕە: ابن خلدون، المقدمة، ل ١٠٥.

٧ـ بنواڕە: توفيق الطويل، الاحلام، ل ١٥٠.

٨ـ بنواڕە: عبدالرزاق حميده، شياطين الشعراء، ل ٨٩.

٩ـ بنواڕە: جرجي زيدان، تاريخ الاداب العربية، ج ١، ل ٢٩٢ ـ ٢٩٣.

١٠ـ بنواڕە: ابوالفرج الاصفهاني، الاغاني، ج ١٩، ل ٣٣.

١١ـ بنواڕە: Harding, An Anatomy of Inspiration

١٢ـ بنواڕە: Tyrrell, Personality of man, P, 30 - 36

١٣ـ بنواڕە: Kenmare, Stolen Fire, P. 16

١٤ـ بنواڕە: جرجي زيدان، تاريخ الاداب العربية، ج ١، ل ٢٩٣.

١٥ـ بنواڕە: Abnormal Psycholigy, Murphy. PIX

١٦ـ بنواڕە: Wilson, Great Men of Seience, P 49

١٧ـ بنواڕە: سيرل برت، كيف يعمل العقل، ج ٢، ل ٢١٨.

١٨ـ بنواڕە: Kenmare, Stolen Fire, P. 1

١٩ـ بنواڕە: Broad, Mind And Its Place in Nature

٢٠ـ بنواڕە: بەشی شەشەمی ئەم پەڕاوە.

٢١ـ بنواڕە: كاترين شبن، اختراع الهاتف.

# پاشکۆکان

ئەم چەند بەشە جودا جودان و بەم دواییانە نوسیومن، وەك خوێنەریش تێبینی دەکات پەیوەندیی یەکی راستەوخۆیان نیە بە بابەتی خەونەوە... وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا هیوادارم بێسود نەبن بۆ خوێنەری ژیر.

## پاشكۆی یەكەم:

### كۆمیدیای ئاوەزی مرۆڤ :

لەساڵی (١٩٥٦)دا پەرتوكێكم بڵاو كردەوە بەناوی (كۆمیدیای ئاوەزی مرۆڤ)، مەبەستم لە بڵاوكردنەوەی ئەو كتێبە پوچەڵ كردنەوەی ئەو (ئاوەز)ە ئەبستراكتیكیە بوو كە میتافیزیكیەكان و تۆباویەكانی وەكو ئەفلاتون و فارابی و ئیبن توفەیل و ئیبن رۆشد و كەسانی وەك ئەمان دەستی پێوە دەگرن و پێیەوە پابەندن... لە دوو توێ ئەو پەرتووكەدا نمونە گەلێكم هێناوەتەوە لەو بیریارانەی كەلەم سەردەمەی ئێمەدا دەژین، كەچی تا ئێستاش بەو جۆرە بیردەكەنەوە كە ئەو بیرمەندە كۆنانە بیریان پێ دەكردەوە.

لەڕاستی دا ، ئێمە لەكۆندا ئالودەی ئەو جۆرە بیركردنەوە بووین، تا ئێستاش زۆرێكمان تێدا هەیە دووچاری هەمان دەرد بوون... مەسەلەكەش تەنها بەسەر كۆنە پەرستەكان یاندا كورت هەڵناهێنرێ، بەڵكو پەل دەهاوێ بۆ هەندێ لەگەنجەكانیان، واتە ئەو گەنجانەش دەگرێتەوە كە خۆیان بەتازەگەر و نوێخواز و پێشكەوتنخواز دەزانن. بۆیە گەر ڕەوا بێت بۆمان كۆنەپەرەستەكان بەوە ناوزەد بكەین كە توشی نەخۆشینی (پیرێتی) بوون، ئەوا بۆشمان ڕەوایە كە هەندێ لەپێشكەوتنخوازەكانیش بەوە ناوزەد بكەین كە دوچاری نەخۆشینی (منداڵێتی)بوون.

گرفتی ئەوانە و ئەمانیش پێكەوە، ئەوەیە كە لەبیركردنەوەیاندا لەسەر ڕێبازی (لۆژیكی فۆرمی) كۆن بەڕێوە دەچن. بۆیە دەبینین، كاتێ گفتوگۆ دەكەن لەسەر كێشە وپرسەكانی سەردەمی ئێستا، هیچ سڵ ناكەنەوە لەوەی هەمان ئەو پێوەرە بەكار بێنن كە لەكۆندا بیرمەندان بەكاریان دەهێنا (دەربڕینی وەرگێڕ) ... لەسەرەتاوە پێشەكیەكی لۆژیكی دێنن. دواتر لێرە ولەوێ دەسكاریەكی دەكەن، تاكو پێی بگەنە ئەو بەرەنجامەی كە خۆیان ئارەزووی دەكەن.... لەوانەیە هەندێكیان كە ئەم پەیرەوە دەكەن هەست

بەخۆیان نەکەن، چونکە وا گومان دەبەن گوایە لە بیرکردنەوەیاندا بەگوێرەی پێوەرەکانی (بیرکردنەوەی دروست) دروست دەڕۆن بەڕێوە.

نکۆڵی ناکەین لەوەی (لۆژیکی فۆرمیی) ڕاستە. بەڵام ئەوەی نابێ لەیادی بکەین ئەوەیە کە ئەم لۆژیکە بوارێکی دیاریکراوی هەیە، لەسنووری ئەو بوارەدا ڕاست و دروستە... وەلێ کە لەو بوارە دەرهێنرا ، ئەوا گرنگی خۆی لەدەست دەدات و بەکارهێنانیشی بەرەنجامی هەڵەی دەبێت... بەڕاستی (کیدرۆف) ڕاستی پێکاوە کاتێ (لۆژیکی فۆرمیی) بەوە ناوزەد دەکرد، کە وەکو (خشتەی لێکدان) وایە، ئەوەتا هەر قوتابیەك بگری لەسەرەتاوە پێویستە لەسەری فێری خشتەی لێکدان ببێت و، لەبەری بکات و ، لە ڕاهێنانە ژمێرەییەکانیدا لەسەری بڕوات... بەڵام نابێ بەخشتەی لێکدان دەست کۆتا بکات، یاخود پشتی پێ ببەستێ کاتێ لەگەڵ ڕاهێنانە ژمێرەییە باڵاکاندا مامەڵە دەکات (دەربڕینی وەرگێڕ)، بەڵکو لەو کاتەدا پێویستی بەخشتەی بەرفراوانتر و ئاڵۆزتر دەبێت.

(کیدرۆف) دەڵێت: لۆژیکی فۆرمی ، لەسنوری ڕاستیە سەقامگیرە ڕێژەییەکاندا نەبێ ئیدی ڕاست دەرناچێ، وەك ئەوەی بگوترێ: "فلان کەس لە فلانە ڕۆژ دا مرد"[1]. جا ئێمە لەو ڕاستییەوە دەتوانین بگەینە بەرنجامێکی ڕاستی لۆژیکی، ئەویش ئەم بەرەنجامەیە: ئەو کەسە هەر دەبێت ڕۆژی بەر لەو ڕۆژەی تیای دا مردوە، زیندوو بووبێ، وەلێ گرفتەکە لەوەدایە کە هەموو ڕاستیەکانی گەردوون لەم جۆرە سادەیە نین. گەردون لەپێشکەوتن و ئاڵ و گۆڕی بەردەوامدایە، کەواتە دەبێ ڕاستیەکانیش لەگەڵی دا پێش بکەون، جا ئەو دەستپێکە لۆژیکیەی کە ڕۆژێك ڕاستە، لەوانەیە لە ڕۆژێکیتر دا ڕاست نەبێ.. ئا لێرەدا لۆژیکی نوێ ئەو بنەمایە هێنایە ئاراوە کە دەڵێت: (ئیبستیمۆلۆژیا پرۆسەی پێشقەچونە و لەسنورێکدا ڕاناوەستێت).

**فۆرم و ناومرۆك:**

یەك لەو جیاوازیانەی ، لۆژیکی کۆن جیا دەکاتەوە لە لۆژیکی نوێ، ئەوەیە یەکەمیان گرنگی بە فۆرم دەدات لەکاتێکدا دووەمیان گرنگی بە نێوەڕۆك دەدات.. لەوانەیە دوو کەس لەوانەی هەڵگری لۆژیکی کۆنن لە مەڕ بیرۆکەیەکی دیاریکراو و

ببێتە مشت و ماڵیان، بەڵام هەر یەکێك لەو دوو کەسە بەرەنجامێکی لۆژیکی جیاواز لەوی‌تری لێ هەڵدەگۆزێ... بۆیە مشت و مڕەکەیان پەل و پۆی لێ دەبێتەوە و بەبێ سودیش درێژە دەکێشێ.

فاکتەری ئەمەش ئەوەیە کە هەر دووکیان گرنگی بە شێوە و فۆرمی بیرۆکەکە دەدەن نەك بەناوەڕۆکەکەی. شیاوی باسکردنە، بیرۆکە پارێزگاری لەشێوەی خۆی دەکات سەرەڕای گۆڕانی بارودۆخەکانی دەوروبەری، وەلێ نێوەڕۆکەکەی سروشتی وایە کە جار لەدوای جار بەگوێرەی گۆڕانی بارودۆخەکانی دەوروبەری ئەمیش دەگۆڕێت.

بۆ نمونە، قەدەغەکردنی (سوو) وەربگرە، کە ئیسلام هێنایە کایەوە و پێداگریشی لێکرد... ئێمە دەزانین کە ئیسلام بۆیە( سووخۆری) یاساغ کرد چونکە زیانێکی کۆمەڵایەتی گەورەی هەبوو، دەوڵەمەندەکان هەژارەکانیان پێدەچەوساندەوە و کەرامەتیان پێشێل دەکردن... کەچی (شەرعناسەکان ـ فوقەها) دوای ئەوە هاتون گرنگی‌یان نەداوە بەنێوەڕۆکی (سوو) بەڵکو هەموو گرنگی‌دانێکیان هەر لەسەر شێوە و فۆرمەکەی چڕ کردۆتەوە... بەو پێودانگە هەموو جۆرەکانی (بانك)یان حەرام کرد گوایە (بەبڕوای ئەوان) سووداری تێدا دەکرێ... وەلێ ئەو سووخۆرەی کارەکەی بەناوی فرۆشتن یاخود بارمتە دانانەوە دەکات هیچیان لەسەری نیە. لەبەر ئەمەیە دەبینین جیهانی ئیسلامی پڕ بوە لەو دیندارانەی کە بەکردەوە سوخۆری دەکەن و بەتیۆریش نکۆڵی لێ دەکەن... ئەوەتا یەکێکیان دەبینی ڕدێنی درێژ دەکاتەوە و نوێژانیش زۆر دەکات کەچی سووخۆرێکی ترسناکە... کاتێکیش مامەڵە سووخۆرییەکەی دەکات قاڵبێکی شەرعی بۆ دەدۆزێتەوە، وەك ئەوەی بە قەرز وەرگرەکە دەڵێت: ئەم شتەم بەنرخی زانراو پێ فرۆشتی، ئنجا هەندێ شیرینی پێدەدات گوایە لەسەر ئەو شیرینیە مامەڵە کراوە، کابرای قەرزگەریش دەزانێت ژەهری (کوشندە) وەردەگرێت. ولا حول و لا قوە الا باللە.

لەڕاستی دا ، لۆژیکی نوێ دان نانێت بەم پڕوپاڵانتە و لێکدانەوە و بۆچونانەدا... بەڵکو نێوەڕۆك ئەو بناغەیە کە حوکمەکانمانی لەسەر بنیات دەنێین... ئیدی گوێ نادەین بەوەی فۆرم و شێوەکەی هەر چۆن بێت.. بۆیە (بانك) دەکەینەوە و لقەکانیشی

لەهەموو جێگەیەكدا فراوان دەكەین، تا ئەوەندەی خزمەتی خەڵك بكات... بەوەش لەڕاستی دا قەڵاچۆی (سوو) و (سوو) خۆران دەكەین چونكە ئەو بوارەیان لێ بەرتەسك دەكەینەوە كە تیای دا كار دەكەن و، هەڵ دەسوڕێن... لەهەمان كاتدا نابێ كەمتەرخەمی بكەین لە قەڵاچۆكردنی هەر بانكێ كە هەوڵ بدات وەكوو سووخۆرەكان خەڵكی بچەوسێنێتەوە (دەربڕینی وەرگێڕ).

ئەو نموونەیەی كە لەبارەی (سوو)ەوە هێنامانەوە، لەوانەیە بچەسپێت بەسەر زۆرێك لەو (وردە دەمبەدەمە) ڕواڵەتیانەدا كە هەڵگرانی (لۆژیكی كۆن) دەمدرێژی پێوە دەكەن، چ پیرەكانیان یاخود منداڵەكانیان... ئەوان بیرۆكەیەك دێنن لەهەمان فۆرمی چەسپاوی خۆی دا و، دەیكەنە پێشەكی بۆ پێوانەكاریە لۆژیكیەكانیان، دواتر بە ئارەزووی خۆیان بەرەنجامی لێ دەردەهێنن... دیارە ئەمە بەچاوپۆشی كردن لە نێوەڕۆكەكەی، كەبەگوێرەی گۆڕانی بارودۆخ ئەمیش دەگۆڕێت.

ڕەنگە جیاوازیەكی ڕواڵەتی هەبێت لەنێوان (پیران) و (منداڵەكان) دا لەم ڕووەوە.... ئەو جیاوازیەش لەوەدا خۆی دەنوێنێ كە پیرەكان پشت بەپێشەكی گەلێ كۆن دەبەستن، بەڵام منداڵەكان پشت بەپێشەكی گەلێ نوێ دەبەستن... وەلێ هەموویان دەمارگیرن بۆ پێشەكیەكانیان و بڕواشیان بەوەیە كە ئەو پێشەكیانە بۆ هەموو كات و شوێنێ دەست دەدەن و دەگونجێن.

تێبینی دەكرێ، ئەوانەی دووچاری نەخۆشینی (منداڵێتی) بوون، وازیان لەواژەی (بەڵگەی ئەقڵی) هێناوە كە قەیمیەكان لە وتووێژەكانیان دا دەمدرێژیان پێوە دەكرد، لەبەرانبەر دا دەستیان بە واژەی (بەڵگەی زانستی)یەوە گرتووە... جا ئەگەر بیانەوێ ستایشی ڕاو بۆچونێك بكەن دەڵێن (بۆچونێكی زانستیە)، ئەمە لەكاتێكدا لە كۆندا دەیانگوت (ماقوڵە) یاخود (لۆژیكیە)... ئنجا من هیچ جیاوازیەكی ریشەیی نابینم لەنێوان چەمكی (زانست) و چەمكی (ئاوەز) دا لەم ڕووەوە... چونكە ئەوەتا وەكو شمشێری بڕندە هەر كات گەرەكیان بوو بەكاری دێنن... سڵیش ناكەنەوە لەوەی جارێكیتر بەپێچەوانەی ئەوەی لەیەكەمجار دا لەدژی بەكاریان هێناوە، بەكاری بێننەوە.

**زانست و ئاوەز:**

گرۆهێ لە فێرخوازان هەن، نازانین ناویان بنێین چی!! هیچ جیاوازیەك نابینن لە نێوان بەلگەی زانستی و بەلگەی ئەقلی دا، بەلکو تێکەڵاویان دەکەن و بەیەك شتیان دادەنێن، جارێکیان لەگەڵ یەکێك لەوانەدا دەم بەدمەیەکی توند و تیژ کەوتە نێوانمانەوە، نە ئەو توانی قەناعەت بە من بکات و نەمنیش توانیم قەتاعەت بەو بکەم. ئەو دەیگوت ناکرێ زانست و ئاوەز پێکەوە ناکۆك بن؟ مادەم ئەقل بێخەوش و لەکە بێت و ،پشتی بەپێشەکی لۆژیکی ڕاست و دروست بەستبێ، ئەوا هەر چۆن بێت ئەو بەرەنجامە بەدەست دێنێ کە زانست و زانیاری پێ‌ی دەگات.

گرفتەکە لەوە دایە، ئەو برادەرەم شەیدای ئەوە بووە کە قەیمیەکان ناویان ناوە( بیرکردنەوەی ساغ) . ئیدی نازانم مەبەستیان لەوە چی بووە... هەموو مرۆڤێك بڕوای پتەوە بەوەی بیرکردنەوەی خۆی بیرکردنەوەیەکی ساغ و تەندروستە ... لێرەوەیە کە دەبینین قەیمیەکان ناکۆك دەبوون و دەمبەدمەیان دەکرد و هەر گروپێکیشیان ئەوانیتریان تۆمەتبار دەکردبە بە هەڵەداچوون و لوت بەرزی. جا هەیاران! دەبێ کامیان خاوەنی بیرکردنەوەی ساغ بووبێت؟

لێرەدا تایبەتمەندی زانست سەرهەڵئەدات و دەردەکەوێ... زانست دان نانێت بە پێشەکی گەلی لۆژیکی ڕاست دا، هەر چەندە ئەو پێشەکیە ڕۆشنیش بێت یاخود هەموو ژیرەکان لەسەری کۆ بن... زۆرێك پێشەکی هەبوون و ژیرەکان کۆ دەنگ بوون لەسەر ڕاستی و دروستی‌یان، دواتر دەرکەوت کە ئەو پێشەکیانە هیچ نین جگە لە کۆمەڵێ (مەئلوفات)ی ئایدیۆلۆژی زانست دان نانێ بە ڕاستی هیچ ڕایەکدا، مەگەر دوای ئەوەی کە دەیخاتە سەر ڕوپەڕی توێژینەوەی بابەتی و ئازمایشی بەرهەستەوە... کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێ‌داناگرێت لەسەر ئەوەی ئەو بۆچوونە بۆ هەتاهەتایە هەر ڕاستە و بەڕاستێتی دەمێنێتەوە. بەڵکو پێی وایە ڕایەکی ڕاستە، لە سنووری ئەو توێژینەوەیە دا کەزانست پێی هەستاوە... کێ دەزانێ؟ لەوانەیە هەر زانیاری، هەندێ ڕوکار و لایەنی

دیکە لەو مەسەلەیەدا بدۆزێتەوە کە پێشتر خودی زانست پەی پێ نەبردوە... لەو کاتەش دا زانست ناچار دەبێ بۆچونی خۆی لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە بگۆڕێت.

جارێکیان کۆمەڵێ لە هزرمەندانی لە چاخەکانی ناوەڕاست کۆدەبنەوە و دەبێتە دەمبەدەمەیان لەسەر ژمارەی ددانەکانی ئەسپ. ئایا ژمارەیان چەند ددانە؟ بەردەوام دەمبەدەمەیان بوو، کردیانە شەڕە سەرین و شەڕە کەوش... لەهەمان کاتدا ئەسپەکە لە تەویلەیەکی نزیک لەخۆیاندا بەسترابویەوە و دەیان توانی بچنە ئەو تەویلەیە و ددانەکانی بژمێرن!! وەلێ ئەوان وا دەزانن دەتوانن لەڕێگەی بیرکردنەوەی ساغەوە بگەنە ژمارە ڕاستەکە، کەوابێ حەوجێیان نیە بەوەی خۆیان ماندوو بکەن و بچن بۆ لای ئەسپەکە و، دەستیان پیس بکەن... سەرەنجام نەگەشتنە هیچ بەرەنجامێکی یەکلاکەرەوە، چونکە هەر یەکێکیان شتێکی دەگوت و پشتیشی بە پێشەکیەکی لۆژیکی بەستبوو... وایشی دەزانی خۆی (گەورەی دانایان)ە.

**ئەرکی بەرەنجامگیری لۆژیکی:**

نکولی ناکەین لەوەی ، بەرەنجامگیری لۆژیکی ئەرکی هەیە لە لێکۆڵینەوە زانستیەکاندا... زانست ناتوانێ لەو ئەرکەی بەرەنجامگیری لۆژیکی دەست بەردار بێ..بەڵام ئەوەندە هەیە زانست ناتوانێ بەرەنجامێك بەدەست بێنێ لەسەر پێشەکیەك لە خەڵکی لەسەری ڕاهاتوون، وەك هزرمەندانی قەیمی بەدەستیان دەهێنا.

زانست دوو پایە و کۆڵەکەی هەیە کە ناگرێت یەکیان لەوی دیکەیان دابڕێت: پراکتیك و تیۆر ... یاخود بەدەربڕینێکیتر: ئەزمونی بابەتی و بەرەنجامگیری لۆژیکی.[٢]

زانست یەکەمجار شتەکەی تاقی دەکاتەوە و دواتر بیرۆکەیەکی لێ هەڵدەهێنجێ... لە درێژەی گەشەکردنیشی دا کەمتەرخەمی ناکات لەوەی جار لە دوای جار تاقیکردنەوە و بەرەنجامگیری بکات.

مامۆستا (ماوتسی تونگ) ڕاڤەیەکی زۆر جوانی ئەم بابەتەی کردوە، کاتێ پێشڤەچونی ئیبستیمۆلۆژیای زانستی لێکچواندوە بە قۆناغە لولەکیە بەرەو سەرەکان...

هەر قۆناغێك دوو ڕووی هەیە، لایەنێکی ئیدراکی ئەزمونکاری و لایەنێکی بەرەنجامگیری لۆژیکیش... کاتێ ئیبستیمۆلۆژیا لەیەکێك لە قۆناغەکانی دا ئەو دوو لایەنە لەخۆ دەگرێت، ئەوا بەرەو قۆناغێکی سەروتر هەڵ دەکشێ.

بۆ نمونە: تۆ گەر بتەوێ بەسەر ڕێگەی زانست دا بڕۆیت، یەکەمجار بەپەیوەندی کردن بەژینگەو دەوروبەرتەوە دەست پێ دەکەیت، لەو دەور و بەرەتەوە خاڵە بەرهەستەکان وەردەگریت... دواتر ئەو خاڵە بەرهەستانە پێکەوە کۆ دەکەیتەوە ، تاکو چەمکێکی فیکری دیاری کراویان لێ بەدەست بێنێ، بەگوێرەی ئەوەی لەو کاتەدا بۆت دەست دەدات، ئنجا نابێ لەو سنورە دا چەق ببەستیت، بەڵکو پێویستە لەسەرت زانیاری خۆت بەرز بکەیتەوە بەرەو قۆناغی سەروتر... لەم قۆناغە سەروترە دا هەوڵ دەدەیت ئەو بەرەنجامەی لە قۆناغی پێشوودا بەدەستت هێناوە، پراکتیزەی بکەیت بەسەر کۆمەڵێ خاڵی بەرهەستی نوێ دا... چونکە خاڵە بەرهەستەکان بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێن... کەوابێ پێویستە لەسەرت، تێگەیشتن و چەمکەکانی خۆت پێش بخەیت بەگوێرەی گۆڕانی ئەو خاڵە بەرهەستانە.

ڕاوەستان لەسەر چەمکێکی فیکری دیاریکراو، هەرچەندە ئەو چەمکە لەکاتی خۆی دا ڕاست و دروست بێتە بەرچاو، دەبێتە هۆی دۆگمابوونی "ئایدیۆلۆژی". ئەمەش کاری ئاوەزی ئەبستراکتیکی‌یە نەك کاری زانیاریی گەشەکردوو.[٣]

**کەڵەکە بوونی وەهمەکان:**

ئاوەزی ئەبستراکتیکی، کۆڵەکەی پشتی قەیمیەکان بوو لەهەوڵ دانیان دا بەدووی ڕاستی و هەقیقەت دا... ئەوان - وەك لە پێشەوە گوتمان - بڕوایان وا بوو دەتوانن لە ڕێی بیرکردنەوەی ساغەوە بگەنە ڕاستی تەواوەتی. هەر لەبەر ئەوە، دەیانبینیت لە سەر جێگە نەرم و نۆڵەکانیان دادەنیشن و سەریان دەخەنە ناو دەستەکانیانەوە و دەست بە بیرکردنەوە دەکەن، گوایە ئەمە تاکە ڕێگەی بیرکردنەوەی ساغە... ئەو هەموو پێشکەوتنە جەنجاڵەی دنیا لەبیر دەکەن و مل نادەن بەوەی لە( قوللە عاجیەکانیان) بێنە خوارێ بۆ نێو دنیا، تاکو بەشێوەیەکی کردەیی لێی بکۆڵنەوە... هەموو هەوڵ و

مەبەستێكیان بۆ ئەوەیە كە بیر بكەنەوە و بیر بكەنەوە و بیر بكەنەوە... بەوەش گەشەی بیر كردنەوەیان بەجۆرێ خودی دەبێ.... بۆیە تاكو بیركردنەوەیان بەو شێوازە زیاد بكات ئەوەندەش لە بویەر دوور دەكەونەوە و بەئاسمانی ئەندێشە و وەهمی پان و بەریندا دەفڕن.

ماموستا (بولیتزیر) دەڵێت: "بیرەكان خاوەنی هێزی زنجیرەیی تایبەت بەخۆیانن... هەر كات بیر هەبێت ئەو هێزەشی لەگەڵ دا دەبێ... بە دەربڕینێكی‌تر: چالاكی مێشكی مرۆڤ ، دەتوانێت بەهێزیكی خودی ڕێژەیی بەڕێوە بچێت، بەوەی كە جیا ببێتەوە لەو پراكتیكەی كە تەنها ئەو توانای حوكم دانی هەیە بەسەر بەهای ئەو پێكهاتە فیكریانە دا كە لەدووری ئەمەوە پێك دێن... لێرەدا پراكتیك دەبێتە تاكە ئامرازی دیاریكردنی (هەڵە) چونكە ڕەهەندەكانی ڕاستی دەسەپێنێت بەسەر بیركردنەوەدا، واتە پراكتیك( بیر) ڕادەكێشێتە سەر زەوی"[(٤)]

**بەهای ئاوەز:**

ئێمە بەم قسەیە نامانەوێت لەبەهای ئاوەز كەم بكەینەوە. لەڕاستی دا ئەقڵ خەڵات و دیاریەكی گەورەیە كە بەهۆیەوە مرۆڤ لەئاژەڵ جیا بۆتەوە و، هەر بەهۆی ئەقڵیشەوە مرۆڤ توانیوتەی بەجۆرێكی سەرسامكەرانە بەسەر پلیكانەی شارستانیەت دا سەر بكەوێ... وەلێ نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت ، كاتێ ئاوەز زیادەڕەوی بكات لەبیركردنەوەی خودی دا و، ڕەها بێت لە كۆتەكانی لێزانیشی بابەتی، ئەو دەمە دەبێتە ئاهرێكی بەكڵپە و بەبێ بەربەست گەشە دەكات، بەوەش زیان دەدات نەك سود بگەیەنێ.

ئێمە دەزانین ئاور كەڵكێكی مەزنی هەیە، كاتێ چوارچێوەكەی سنوردار بكرێ و لەجێگەی تایبەتی خۆی دا دابنرێ بۆ وەرگرتنی ئەنرژی لێیەوە... ئاوەزیش هەر وایە، ئەمیش توانایەكی زۆری هەیە بۆ ئەفراندن و دۆزینەوە، گەر بێت و بەباشی بەكار بهێنرێ و بخرێتە شوێنی شایستەی خۆیەوە... وەلێ گەر وازی لێ بهێنرێ بە ڕەهایی چۆنی دەوێت وا بیر بكاتەوە، ئەو دەم لە زیانەكانی دڵنیا و بێ‌وەی نابین.

مامۆستا (ماوتسی تۆنگ) دەربارەی ئەو كەسانەی خاوەنی ئەو ئاوەزە ئازاد و ڕەهایەن، دەڵێت: لەمێژووی فەلسەفە دا كەسانێك هەبوون كە بە ئاوەزخوازەكان ناوزەد كراون، ئەوا دانیان بەهیچ دا نەناوە جگە لە هەقیقەتی ژیری و نكۆڵیان لە هەقیقەتی خیبرە و ئەزمونكاری كردەوە، ئەوانە پێیان وابوە ئاوەز تاكە شتێكە كەپشتی پێ ببەسترێ، هەر چی ئەزموونی ئیدراكی بەر هەستیشە ئەوا ناكرێ پشتی پێ ببەسترێ... بەڕاستی هەڵە و ناتەواویەكان ئەم قوتابخانەیە لەهەوڵدان بۆ هەڵگێڕانەوەی سەرەوخواری ڕاستیەكان دا قەتیس دەبێت.[٥]

### ڕەدی ئاوەزخوازان:

ئاوەزخوازەكان دەڵێن: ئێمە ناتوانین ئەقڵ ببەستینەوە بەخیبرەی بەرهەستەوە، چونكە ئەوبە گوێرەی گۆڕانی ئەو بویەرەی تیای دا دەژین دەگۆڕێت، بەمەش ئەو بناغە سەقامگیرانەمان لەدەست دەچێ كە پێوەرە فیكریەكانمانی لەسەر بنیات دەنێین... ئاوەز خوازان بەم ڕەدەیان دەیانەوێت ڕاستی ئەو هەقیقەتە ڕەهایانە نیشان بدەن كە ئەقڵی ئەبستراكتیكی پێی دەگات.

لەڕواڵەت دا ئەم ڕەخنەیە لە جێی خۆی دایە، بەڵام لە ناو كرۆك دا خاڵی نیە لە هەڵەیەكی مەترسیدار... ئێمە هاودەنگین لە گەڵ ئاوەزخوازاندا لەسەر بوونی ڕاستی ڕەها لەگەردون دا، وەلێ ناكۆكین لەگەڵیاندا لەسەر چۆنێتی گەشتن بەو ڕاستیە. واتە ئایا تەنها لە ڕێی ئەقڵەوە پێی دەگەین؟ یاخود لە ڕێ ئەقڵەوە كە بە ڕوداوە بەرهەست و پراكتیكە كردەییەكانیش پشتگیری بكرێ؟

بەكردەوە زۆرێكمان لەو "ڕاستیە ڕەها"یانە بینی كە ئاوەزخوازان لەڕێگەی ئەقڵی ئەبستراكتیكیەوە پێی گەیشتوون، كەچی لە "وەهمی ڕەها"وە نزیك تر بوون وەك لە "هەقیقەتی ڕەها".. خوێنەر دەتوانێ كتێب و پەڕاوەكانی ئەوان بخوێنێتەوە تاكو ڕاستی قسەكانی ئێمە ببینێ.

لەكتێبەكانیاندا كۆمەڵێ واژەی تەم و مژداریان هێناوە كە هیچ مانایەكیان نیە، كەسێكی ئاسایی كە دەیخوێنێتەوە هەست دەكات دەستەوسانە لەوەی لەو واژانە بگات،

ئیدی وا گومان دەبات كە نهێنی‌یەكانی گەردون لە ناو ناخیاندایە... كە لەڕاستی دا هیچ نین جگە لە كۆمەڵێ واژەی پوچ، وەك ئەو واژانەی ئەستێرەناسەكان لە تەلیسمەكانیان دا دەیان نوسن.

ماموستا (وتجنشتین) لەم بارەیەوە دەڵێت: "زۆربەی ئەو نوسراوانەی لەبارەی، فەلسەفەوە نوسراون، یان ئەو پرسیارانەی كە كراون، نەك هەر پوچن، بەڵكو بەتاڵن لە واتا، بۆیە ناتوانین هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە، تەنها دەتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین كە بەتاڵن لە واتا، زۆربەی پرس و گرفتەكانی فەیلەسوفەكان لەوەوە سەرچاوەی گرتوە كە لە زمانی ئەوان تێناگەین... كەواتە هیچ سەیر نیە كە دەبینین قوڵترین گرفتیان، گرفت نین"[٦]

## كەش و فشە فەلسەفیەكان:

ئێمە دەمانەوێت ئیبستیمۆلۆژیا یارمەتیمان بدات، بۆ تێگەیشتن لە سروشتی بویەر، تاكو بتوانین خۆمانی لەگەڵ دا بگونجێنین و سودی لێوەر بگرین... وەلێ ئاوەز خوازەكان دەیانەوێت بەهۆی ئیبستمۆلۆژیاوە بەرز بنەوە لە بویەر، تاكو كەش و فش بەسەر خەڵكی ڕەشۆكی دا بكەن، بەهۆی ئەو واژە بریقەدار و نەخش ونیگارە فیكریانەوە كە بەكاریان دێنن.

دەگێڕنەوە (ئەسكەندەری مەكدۆنی) كاتێ بۆ داگیركاری دەچێ، هەواڵ دەبیستێ (ئەرستۆتالیسی ماموستای) كۆمەڵێ كتێبی لەبارەی فەلسەفەوە بڵاو كردۆتەوە، ئەسكەندەر بەمە زۆر توڕە دەبێت و نامەیەك دەنێرێتەوە بۆ ماموستاكەی و تیای دا دەڵێت: "بەڕاستی هەڵەت كرد بەوەی هەندێ لایەنی ناوەكی زانستت بڵاو كردەوە... وەگەر نا چۆن ئێمە لەخەڵكی جیا دەبین،چونكە تۆ ئەو زانیاریە باڵایەت بڵاو كردەوە كە ئێمە لەتۆمان وەرگرتوە" ئەرستۆتالیس لەوەڵامی دا دەڵێت: "بڵاومان كردۆتەوە و لەهەمان كاتدا بڵاویشمان نەكردۆتەوە... چونكە كەس لەو كتێبانە تێ ناگات ئەو كەسانە نەبێت كە وەكو تۆ لای ئێمە دەخوێنن".

جێگەی نیگەرانیە، كە بڵێین پاشماوەیەك لەو كەش و فشە فەلسەفیە تا هەنوكەش لەنێو برادەرە ڕۆشنبیر و ئەدیبەكانماندا بڵاوە... حەز ناكەن چەمك و واژەكانیان دابەزێنن بۆ ئاستێك كە خەڵكی ڕەشۆكی هاوبەشیان لەگەڵ دا بكەن... بۆیە دەبینین لە وتاردان و پەرتوكەكانیاندا پێداگری دەكەن لەسەر هێنانە كایەی بیرۆكەی زۆر بڵند و زۆر بۆش!! خەڵكیش ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی قوڵاییە فەلسەفیەكانی بەئەندازەی لێتێنەگەیشتنیان لەو بیرۆكانە بپێون، جا گەر لە بیرۆكەكان تێگەشتن، نرخ و بەهای بیرۆكەكانیان لە لا نامێنێت!!

### هەڵە و ڕاست:

یەك لە ناتەواویەكانی ئاوەز خوازان ئەوەیە كەپێیان وایە هەڵە و ڕاست دوو پۆلی لێك جودان و ناكرێ تێكەڵاو بكرێن لەیەك مەسەلەدا... هەر بیرۆكەیەك یان ئەوەتا هەمووی ڕاست و دروستە یان ئەوەتا هەمووی هەڵەیە... ماقوڵ نیە بە لایانەوە كە ئەو بیرۆكەیە لەیەك كاتدا هەڵەش بێت و ڕاستیش بێت. ئەمەش هۆكاری دان نەنانیانە بە هەڵەیەتی بیرۆكەیەكدا كە پێشتر باوەڕیان پێی هەبووبێ، بۆیە دەبینین بەردەوامن لەسەر هەڵە ، نەك هەر ئەوەش بگرە بەڵگەی ئەقڵیش دێننەوە بۆ وەی بیسەلمێنن كە لەسەرەتاوە و، ئێستاشی لەسەر بێت ئەمان هەر لەسەر ڕاستی و هەقیقەت بوون.

لەدیدی وان دا، دان نان بە هەڵەدا بریتییە لە (ناساغیو نەزۆكێتی بیر كردنەوە )، بۆیە هەر چۆن بێت حەز ناكەن مۆری تەكفیریان پێوە بنرێ... هەر گا، بارودۆخ پاڵیان پێوە بنێ بۆ پشت كردن لە بیرۆكەیەكی كۆن و ڕوكردنە بیرۆكەیەكی نوێ كە دژ بێ بەبیرۆكە كۆنەكەیان، ئەوا هەوڵ دەدەن بەڵگە بێننەوە لەسەر ئەوەی كە ئەوان ئاڵ و گۆڕیان بەسەر دا نەهاتوە بەڵكو لەدێرزەمانەوە بڕوایان بەو بیرۆكە نوێیە هەبووە.!!

ئەم تێڕوانینە یان لە چەمكەكانی (هەڵە و ڕاست)، لە متمانەیانەوە بە ڕاستی و دروستی یاسای (شوناس)ەوە سەری هەڵداوە كە لۆژیكی فۆرمیی كۆنی لەسەر بنیات دەنرێ... بەگوێرەی ئەو یاسایە، هەر شتێ بگری ،هەر ئەو شتەیە و ناكرێت لەیەك

کاتدا دژەکەشی لەخۆ بگرێ... ئێستاکەش پوچەڵی ئەو یاسایە لەچوارچێوەی بویەری پێشکەوتو دا بەدەر کەوتوە.

## ڕەوتی لۆژیکی نوێ:

لۆژیکی نوێ ئەوەی ڕون کردۆتەوە کە هیچ بیرۆکەیەك ناکرێ بەڕەهایی ڕاست بێ... مادەم ئەو بیرۆکە ڕەنگ دانەوەی بویەرێکی دیاریکراو بێ کەواتە سنوربەندە بەو واقعەوە... شیاوی ئاماژە پێدانە، ئەو بویەرەی کە لەدەرەوەی چوارچێوەی ئاوەزی مرۆڤ دایە چەندین ڕوکاری هەیە... سروشتی ئاوەزیش وایە ناتوانێ پەی بەرێ بەهەموو ڕوکارەکان بەیەك تێڕوانین.. بەڵکو ئاتاجی بەوە هەیە، چاو بگێڕێ لەگۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی‌تر، لەهەر جارێکیش دا ڕویەکی نوێ لە بویەردا دەدۆزێتەوە.

دەگونجێت هەقیقەتی واقعی بەو هەرەمە بچوێنین کەچەند ڕوویەکی هەیە، مرۆڤ کە لەلایەکەوە ڕوو لە هەرمەکە دەکات، ناتوانێ لەڕویەك زیاتری ببینێ، بەڵام گەر مرۆڤ بەدەوری هەرەمەکەدا جوڵا و سوڕایەوە، ئەوا دەتوانێ ڕووە شاردراوەکانیشی ببینێ.

ناتەواوی ئاوەزخوازەکان ئەوەیە کە بڕوایان نیە بەجوڵان، ئەگەر بیرۆکەیەك لەکات و شوێنێکی دیاریکراو دا بەلایانەوە ڕاست بێ، ئەوا بیرۆکەکە دەگشتێنن بەسەر هەموو کات و شوێنێك دا... لێرەوە ئاوەزخوازان بوونەتە کەسانێکی ئایدیۆلۆژی، دنیا دەڕوات و ئەوان ڕاوەستاون.

ئەوان وەك ئەو کەسە وان کە لەبەرانبەر ڕویەکی هەرەمەکە دا دەوستێت و دەبینێ بۆ نمونە ڕەنگی سەوزە، ئنجا دێت و ئەم ڕەنگە دەگشتێنێ بەسەر هەموو ڕوەکارە ناوەکی و دەرەکیەکانی هەرەمەکەدا، ئنجا تۆ کە بەدەوری هەرەمەکەدا سوڕایتەوە، و بەشێك لەناوەکەیشیت پشکنیوە، دێیت و گفت و گۆ و دەمبەدمە دەکەیت لەگەڵ کابرادا لەسەر هەرەمەکە، بەڵام ئەو نایسەلمێنێت و جگە لەبایی بوون و دەمارگیری هیچی لێ دەدی ناکەیت... بەڕاستی تۆ لەشێوێك دایت و ئەو لەدۆڵێکی‌تر دا!!.

**لەنێوان ئاوەزخوازان و نازانمی یەکان دا :**

لەبەرانبەر ئاوەز خوازەکان دا گرۆهێ تر لە فەیلەسوفان بەدەرکەوتن کە بە(نازانمی یەکان) ناوزەد کراون... ئەمانە بڕوایان وایە ئاوەزی مرۆڤ بەتەواوی دەستەوسانە لەپەیبردن بەهیچ شتێ لە هەقیقەتی ڕەها... ئەمان و ئاوەزخوازان لەم ڕایەدا پێچەوانەی یەکتر دەبنەوە.

وەك بینیمان، ئاوەز خوازان پێیان وایە ئاوەز بەیەك سەرنج دان دەتوانێ هەقیقەتی ڕەها ببینێت، ئەمە لەکاتێکدا (نازانمی یەکان) بەپێچەوانەوە بیر دەکەنەوە، بەڕای ئەمان هەقیقەتی ڕەها لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو شتانەدایە کە ئەقڵ بتوانێ لێی تێبگات... تەنها شتێ ئەقڵ لەم ڕووەوە پێی بکرێ ئەوەیە لە دیاردە ڕوکەشەکان تێبگات، دیاردە ڕوکەشەکانیش زۆر دوورن لەنێوەڕۆکی هەقیقەتی بونەوە.

با بگەڕێینەوە بۆ نمونەی هەرەمەکە، کە لە بەرداهێنانمەوە.. (نازانمی یەکان) دەڵێن مرۆڤ ناتوانێ بچێتە ناو هەرەمەکە و پەی بەرێ بەو شتانەی لەنێو قوڵاییەکانی دا هەن... توانای مرۆڤ بەلای ئەوانەوە تەنها لەسوڕانەوە بەدەوری هەرەمەکەدا و لە ڕوانین بۆ هەرەمەکە لە گۆشە جیاجیاکانەوە کورت هەڵدەهێنرێ... هەموو ئەمانەش بەلای ئەوانەوە بەس نین بۆ تێگەیشتنی هەقیقەتی هەرەمەکە.

(نازانمی یەکان) لەوەوە بەرەنجامگیریەکیان کردوە و دەڵێن: هەموو ئەو بیرۆکانەی مرۆڤ هێناوتیە کایەوە ڕێژەیین و پەی نابەن بە هیچ شتێ لە هەقیقەتی ڕەها... کەوابێ، بیرمەندی ئازاد پێویستە لەئاقاری هەموو ئەو بیرۆکانەدا هەڵویستی تەماشاکاری هەبێت و، بەهەموویان پێ بکەنێت و سوکایەتیان پێ بکات.

**بۆچونی مام ناوەند :**

لەنێوان ئاوەزخوازان و نازانمی یەکاندا گرۆهێ ڕادەوستن کە دەگرێ بە (خاوەنی ڕای مام ناوەند) ناوزەد بکرێن، زۆرینەی زانا و فەیلەسوفانیش لەم سەردەمەماندا لەگەڵ ڕای ئەم گروپە دان.

ئەم گرۆهە ،نكۆڵی ناكەن لە ڕێژەی بوونی هەموو بیرۆكە مرۆییەكان، بەڵام بڕوایان وایە سەرەڕای ڕێژەیی بوونیان، ئەو بیرۆكانە لەكۆتاییدا دەبنە هۆی تێگەیشتن لەڕاستی ڕەها... چونكە لەڕاستی‌دا هەر بیرۆكەیەكی ڕێژەیی هەنگاوێكە بەرەو پەی‌بردن بەهەقیقەتی ڕەها.

ئەمەش پشتگیری ئەوە دەكات كە لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، لەبارەی ئەوەی كە ئیبستیمۆلۆژیای مرۆیی بریتی‌یە لە پرۆسەیەكی پێشڤەچوون و گەشەكردن... هەر دۆزینەوەیەك كە لەمیانەی گەشەكردنی یەكبینەی دا ئیبستیمۆلۆژیا پێی بگات. تەنها ڕوویەكە لە ڕووەكانی هەقیقەت.. بەگەڵەكەبوونی ڕوە جۆراوجۆرەكانیش، پلەبەپلە، ئەوا كۆمەڵەیەكی تەواومان لێی دێتە دەست... واتە: تاچەندە ڕاستی ڕێژەییمان بە تێ‌پەڕینی ڕۆژگار بێتە دەست، ئەوەندە لەڕاستی ڕەها نزیك دەكەوینەوە، ئیدی كەم بێت یان زۆر.

مامۆستا ئیسماعیل مەهداوی دەڵێت: "هەقیقەتی ڕەها بەكاملی و تەواو ئامادەگی نیە، بەڵكو پێشكەوتنی مێژوویی بەخۆوە دەبینێ و كۆمەڵێ لە ژمارەنەهاتووی هەڵەی بچوكیش لەخۆ دەگرێ... هەروەها ڕاستی ڕێژەییش، بەپێچەوانەی بۆچونی گرۆی نازانمی‌یەكانەوە، بەتەواوی ڕێژەیی نیە... بەو واتایە كە ئەو بیردۆز زانستی‌یەی لەنێو ئەم نەوەیەدا ڕاست بێ، لەوانەیەبۆ نێو نەوەی داهاتوو سەرتاپای هەڵە بێت... مەسەلەكە هەمووی بریتی‌یە لەوەی ئەو خەڵكەی وێنەی واقعی دەرەكی دەدەنەوە، لەنێو بارودۆخی ڕێژەیی دا دەژین، لەڕوی پێشكەوتنی زانستی و هونەری سەردەمەكانیانەوە، هەروا لە ڕوی ئەو پێكهاتە فیكریانەوە كە كاریگەی‌یان لەسەر دادەنێت.. ئەم بارودۆخە سنووردار و ڕێژەییە وا دەكات زانیاریەكانیان ڕێژەیی و سنووردار بن، و هەر ئەمیشە ئەو هەڵە بچوكانەی تێكەڵاو دەكات و وای لێ دەكات پێویستی بەفراوانكردن یان بەرتەسك كردنەوە هەبێ... وەلێ گەر سەرنجی مرۆڤایەتی بدەین لەنەوەكانی ئەم دواییانەی دا، دەتوانین پەی بەرین بەو توانا گەورە و بێ‌سنور و ناڕێژەییانەی كە فیكری مرۆ هەیەتی... ئا لەمەش دا هەقیقەتی ڕەها قەتیس دەبێ". [٧]

**نمونەگەلێ لە گەردونناسی دا:**

باشترین نمونەیەك بۆ ڕونکردنەوەی ئەو بۆچونە بیهێنینەوە، بریتی‌یە لەو بیردۆزە یەك لە دوای یەکانەی ، ئێمەیان گەیاندە تێگەیشتنێکی تازە لەگەردون.

مرۆڤ لەسەرەتا دا بڕوای وابوو ئەو زەمینەی لەسەری دەژی تەختە و، ئاسمانیش وەکو سەقفێ بەسەریەوە دروستکراوە و ئەستێرەکانیش وەکو چرا پیای دا شۆڕکراونەتەوە. ئەم بیردۆزە سادەیەش، بەتەواوی دەگونجێ لەگەڵ ئەقڵیەتی مرۆڤی سەرەتایی دا.

دوای ئەمە (بەتلیمۆس) هات وبیردۆزە بەناوبانگەکەی خۆی هێنا لەبارەی خڕێتی زەوی و، ئەوەی کە زەوی سەقامگیر و چەقی گەردونە و هەسارەکان بەدەوری دا دەسوڕێنەوە.. شاراوە نیە کە ئەم بیردۆزەش سادەیە، بەڵام هەر چۆنێك بێت خارەتێك ڕاستترە لە بیردۆزەکەی پێش خۆی و ، لەویش نزیکترە لە هەقیقەتی بوونەوە.

ئینجا لەسەدەی شانزدە دا (کۆپەرنیکۆس) هات و بیردۆزەکەی (بەتلیمۆس)ی پوچەڵ کردەوە و گوتی: خۆر چەقی گەردونە، زەویش هیچ نیە جگە لە پاشکۆیەکی خۆر... کەمێك پاش ئەمیش (کبلر) هات و گوتی: بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆس، سەرباری ئەوەی لەهەندێ ڕووەوە ڕاستە، بەڵام لەهەندێ ڕوی‌ترەوە هەڵەیە.. ئەو وێنای زەوی و هەسارەکان دەکات کە لەخولگەی بازنەیی دا دەخولێنەوە، کە لەڕاستی دا لەخولگەی (ئەهلیلیجی ـ ) دا دەخولێنەوە... کبلر خولگە (ئەهلیلیجی) یەکانی بەوە لێکداییەوە گوایە جۆرێکن لەئاوازی ئاسمانی... خۆر جەستەی گیانێکی ئاسمانیە... هەسارەکانیش بەسوڕانەوەیان بەدەوری خۆر دا مۆسیقای گەردون دەژەنن و گیانی خۆریش گۆرانی بۆ دەڵێت.[8]

(کبلر) ڕاستی پێکا لەوەدا کەشێوازە ئەهلیلیجی‌یەکەی خولگەکانی دۆزیەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەهەڵەداچوو، کە ئەو شێوازەی بەجۆرێك لە ئاوازی ئاسمانی لێك دایەوە. چونکە هیچ بەڵگەیەك لەئارا دا نیە بۆ سەلماندنی ئەوەی شێوازی ئەهلیلیجی خۆشنودترە لای فریشتەکانی ئاسمان لە شێوەی بازنەیی.

لەوکاتە دا (نیوتن) هات و بیردۆزە بەناوبانگەکەی لەمەڕ یاساکانی کێش کردن هێنایە گایەوە... ئەو بیردۆزە ئەویٚ دەمیٚ هەنگاوێکی مەزن بوو بەرەو تێگەیشتنی گەردون... چونکە ڕافەی جوڵەی هەسارە ئاسمانیەکان و شێوەی خولگەکانیانی بەجۆرێکی ماتماتیکی ماقولٚ کردبوو.

گەردونناسەکان زۆر شادومان بوون بەم دۆزینەوە مەزنە و، توانیان زانیاریەکانی خۆیانی لە بارەی ئاسمانەوە پیٚفراوان بکەن، تاگو ئەو ڕادەیەی وایان گومان دەبرد هیچ نهێنییەك لەئاسماندا نەماوە کە مل کەچی ئەو یاسا ماتماتیکییانە نەبیٚ کە (نیوتن) هێناونیەتە کایەوە... ئەوەیشی زیاتر گەشبینی دەکردن، ئەوە بوو کەهەندێکیان لە ڕیٚی حسابە نیوتنیەکانەوە توانیان هەسارەی گەڕۆکی نەناسراویتر بدۆزنەوە و، دواتریش بەهۆی دوربین و تلسکۆپەکانەوە ڕاستی دۆزینەوەکانیان بەتەواوی سەلمێنرا.

ماوەیەکی زۆر گەردونناسەکان لەسەر ئەم گەشبینییەیان مانەوە، تاگو رۆژێك هات کۆمەڵیٚ دیاردەی گەردونیان تێدا دۆزیەوە کە مل کەچی یاساکانی نیوتن نابن... ئەوەتا بۆ نمونە هەسارەی (عەتارد) کە لەنزیکی خۆرەوە دەسوڕێتەوە بەجۆرێکی گاڵتەپیٚنەکراو پێچەوانەی ئەو یاسایانەیە...(٩) کەواتە بەچی ئەم پێچەوانە بوونە لێك بدەینەوە؟ لەسەرەتا دا گەردونناسەکان گریمانەی ئەوەیان دانا کە ئەستێرەیەکی بچوك هەیە لەنێوان (خۆر و عەتارد)دا دەسوڕێتەوە، و ئەمە وا لەعەتارد دەکات لەو خولگەیە لا بدات کە بۆی دیاری کراوە... گەردونناسەکان ئەو ئەستێرەیان ناو نا (فۆلکانۆ)... وەلیٚ لێکۆڵینەوە گەردوونیە وردەکان نەیانتوانی ئەستێرەیەکی وا بدۆزنەوە، بۆیە گەردوونناسەکان لەئاقاری ئەم گرفتە دا هیچ یان لەبەردەمدا نەمایەوە، ئەوە نەبیٚ کە گومانی خۆیان لەبیردۆزەکەی (نیوتن) ڕابگەیەنن.

(ئەنیشتاین) لێرەدا بەخۆیی و بیردۆزەکەیەوە لەبارەی (ڕێژەیی بوون)ەوە، بەدەر کەوت... لەبەر رۆشنایی ئەم بیردۆزەدا، ئەوەمان زانی کە یاساکانی (نیوتن) لەسنوری دیاریکراوی خۆیاندا ڕاستن... وەلیٚ هەر کە لەو سنورانە دەرچون ئیدی هەڵەیەتیەکانیان دەردەکەویٚ... کەوابیٚ مەسەلەکە، مەسەلەی هەڵەیەتی ڕووت یاخود ڕاستێتی ڕووت نیە... بەلکو مەسەلەیەکی ڕێژەییە کە هەڵە و ڕاستێتی لەسەر ئەو

سنووره، بەندە کە لە ئاستیدا دەوەستیَ... لێرەدا ڕاستە و ،لەو لا هەڵەیە... کەوابیَ هەر توێژەریَ پێویستە لەسەری ڕوبەرو ماوەی ئەو چوارچێوەیە بزانیَ کە لێکۆڵینەوەی تێدا دەکات، بەر لەوەی بزانیَ ڕادەی ڕاستی و هەڵەیەتی‌یەکەی چەندە.

(ئەنیشتاین) یاساکانی (نیوتن)ی گۆڕی بە کۆمەڵیَ یاسای دیکە کە، لەوان بەرفراوانتر و ئاڵۆزترن... ئەمەش یانی: بیردۆزەکەی (ئەنیشتاین) ، (نیوتن)ی نەسڕیوەتەوە، بەڵکو ئەو چوارچێوەیەی بۆ دیاری کردووە کەتێیدا ڕاست دەردەچیَ.. کیَ دەزانیَ لەوانەیە بیردۆزەکەی (ئەنیشتاین)یش چوارچێوەیە تایبەت بەخۆی هەبێت؟... پێدەچیَ لە ڕۆژگارەکانی داهاتوودا، زانست کۆمەڵیَ دیاردە بدۆزێتەوە کە مل کەچی یاساکانی (ئەنیشتاین) نەبن... ئیدی لەو کاتەش دا پێویستی بەبیردۆزێکی نویَ و بەرفراوانتر دەبیَ.

پوختەی ئەو بەرەنجامەی، لەوەی ڕابورد دەستمان دەکەویَ ئەمەیە: هەر بیردۆزێکی زانستی کە مرۆڤ پیَی دەگات هەتاهەتایی نیە و ناکرێت "نەمر" بێت... بەڵکو هەمیشە لەبەردەمی گۆڕین و پێشخستن دایە.. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەو بیردۆزە هەمووی هەڵەیە... بەڵکو ڕاست و دروستە مادەم بنەڕەتەکانی لە واقعی بابەتیەوە وەربگریَ... وەلیَ ڕاست بونەکەی سنوربەندە بەسنوری ئەو بویەرەوە... تاچەندەش ئیدراکمان بەو بویەرە زیاد بکات، بەو ڕادەیەش ئەو چوارچێوەیە بەرفراوان دەبێت ،کە بیردۆزەکەی تێدا ڕاست دەردەچیَ.

### تیۆرە کۆمەڵایەتی‌یەکان :

سەبارەت بەبیردۆزە کۆمەڵایەتیەکانیش، دەگرێت هەمان قسە بکەین، لەوانەیە توێژەرێکی بلیمەتی کۆمەڵایەتی بێت و، تیۆرێکی جوانمان بۆ دابنیَ لەبارەی سروشتی کۆمەڵگەی مرۆڤ و پێشکەوتنەکانیەوە، بەجۆریَ وامان لیَ بکات بیردۆزەکانی پێش ئەم بسڕینەوە... ئنجا ئێمە کاتیَ لەو تیۆرە دەکۆڵینەوە و پیَی سەرسام دەبین، ڕەوا نیە بۆمان دەمارگیر بین بۆی و، ببینە لەمپەڕ لەبەردەم هەر بیردۆزێکیتردا کە لەدوای ئەوەوە بێنە ئاراوە.

بەڕاستی توێژەرەکە، ڕیشەی تیۆرەکەی لەو قۆناغە کۆمەڵایەتیەوە وەرگرتوە کە تێیدا ژیاوە... کەوابێ بیردۆزەکەیشی ناگونجێ لەسنوری ئەو قۆناغەدا نەبێ... ئەمەش یانی ئەو ڕاستی‌یەکی ڕێژەیمان دەداتێ نەك ڕەها، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نكوڵی ناکەین لەبوونی ڕاستی ڕەها لە کۆمەڵگەدا، وەلێ ئەوەندە هەیە ناتوانین بەیەکجار بگەینە ئە ڕاستی‌یە (وەك ئاوەزخوازەکان وا گومان دەبەن). بەڵکو پێویستە لەسەرمان لەمیانەی ڕاستی‌یە ڕێژەییە یەك لەدوی یەکەکانەوە، بەرەو ڕوی بڕۆین.

زانیاریی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی، هەنگاو لەدوای هەنگاو بەڕێی خۆی دا دەڕوات. ناتوانێ ڕابوەستێت و ناشتوانێت باز بدات... بەڵکو گەشە دەکات وەك چۆن هەر زیندەوەرێ قۆناغ بەقۆناغ گەشە دەکات... هەر گەشەیەکی نوێ زەمینەسازکردنە بۆ گەشەی دواتر.... ئینجا بۆ کەیی و تا کەی؟ یاخود ئایا سنوورێکی کۆتایی هەیە کەتیای دا پێشکەوتن ئیبستیمۆلۆژیای مرۆڤ ڕابوەستێنت و مرۆڤ تیای دا بڵێت گەشتومەتە ئەو ڕاستی‌یەی کە لەدوایەوە هیچ ڕاستی‌یەك بوونی نیە؟ ئەز ئەمە نازانم.

### تیۆر و ئایدۆلۆژیاکان

جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان تیۆرەکان لەلایەك و، ئایدۆلۆژیاکانیش لە لایەکی‌ترەوە، لەپلەی مل کەچ بونیاندا بۆ گەشەکردن و پێشکەوتن... سروشتی ئایدۆلۆژیاکان وایە کە هەمیشە ڕوو لە نەگۆڕی و دۆگمابوونن. تکا لەخوێنەر دەکەم، وا لەم قسەیەم حاڵی نەبێ کە ئێمە لەپلەی ئایدۆلۆژیاکان کەم دەکەینەوە یاخود گاڵتە و سوکایەتیان پێدەکەین... ئەوی ڕاستی بێ لەو دەمەوە مرۆڤ وەدی هێنراوە، ئایدۆلۆژیا و بیر و باوەڕەکان کاریگەری گەورەیان هەبوە لە ژیانی مرۆڤ دا... چونکە ئارامی و دڵنیایی پێدەبەخشن، هەروەها یارمەتیشی دەدەن لە ڕووبەڕوو بونەوەی کێشە و گرفتەکانی ژیان لە لایەك و، لەلایەکی‌تریشەوە پاڵی پێوە دەنێن بۆ خەبات و دڵگەرمی... هەر نەتەوەیەکیش بیر و باوەڕی نەبێ، زۆر لاواز دەبێ لە بەرانبەر دوژمنەکانی‌دا. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ لەیادمان بچێ کە ئایدۆلۆژیا شتێکە و زانیاری

پێشکەوتووش شتێکیترە، هەر کامیان بگری بوارێکی تایبەتی هەیە کە جیاوازە لە بواری ئەویتر.

تایبەتمەندی زانیاری پێشکەوتوو ئەوەیە کە لێکۆڵیار بەگومانە و هەموو ڕۆژێ بەدووی بۆچوونێکی تازەتر دا دەگەڕێت... وەلێ تایبەتمەندی ئایدۆلۆژیا بریتییە لە بێخ داکوتان و باوەڕی پتەو و... مرۆڤیش دەتوانێ بڕوا بەهەر ئایدۆلۆژیایەك بێنێ کە خۆی گەرەکییەتی، لەوەدا ئازادە، بەلام لەو کاتەدا نابێ خۆی ناو بنێ توێژەری کۆمەلایەتی. ئەو ئازادە لەوەی بەتەواوی واز لەلێکۆڵینەوەی زانستی بێنێ، یاخود ئەو لایەنەی لێ وەربگرێ کە بیروباوەڕەکەی دەستی تێوەرنادات، وەلێ گەر بیەوێ هەردووکیان لەیەك بوار دا کۆبکاتەوە، ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە نە تێگەشتوە و نەگەرەکیشیەتی تێبگات.

یەکێك لەو هەلانەی لە لای ئێمە باوە، ئەوەیە  پیاوانی ئایینی ناو دەنێین (زانایان)!! ئەمەش هەلەیەکە لە ناو هەموو نەتەوەکانی دنیا دا ئێمە تەنها خاوەنی ئەو هەلەیەین... دەگونجێ پیاوانی ئایینی ناو بنێین (ئاقلەکان ـ ژیرەکان) بەلام ناگونجێ ناویان بنێین (زانایان)، چونکە ئەوان خاوەنی بیر و باوەڕی سەقامگیرن و ناخوازن لێی لا بدەن، بیر و باوەڕەگەشیان بە یەکێك لەو زەروراتە ئەقلیانە دەبینین کە دوو کەس شك نابرێن ،لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو بیر و باوەڕە ناکۆك بن.

ئێمە لەو ڕووەوە، ڕەخنەیان لێناگرین، لەوانەیە ئەرکی سەرشانی خۆیان بەرانبەر بەئاینەکەیان بەو جۆرە ڕاپەڕێنن،بەلکو لەو ڕووەوە ڕەخنەیان لێ دەگرین کە هەندێ جار خراپە بەرانبەر ئاینەکەیان دەکەن و، واش دەزانن چاکەیان کردوە!!

پیاوی ئاینی ڕاهاتوە لەسەر ئەوەی نەریتە باوەکانی نێو تایفەکەی خۆی وەکو ئەو ڕاستییە ڕەهایە وەربگرێ کە گومان هەلناگرێ.. پێدەچێ ئەو نەریتانەش زۆر لە کرۆکی ئاینەکەوە دوور بن، کەچی گوێ بەمە نادات... تەنها هەلپە بۆ وە دەکات بەلگەی ئەقلی کۆ بکاتەوە بۆ پشتگیری کردنی ئەو نەریتانە... ئینجا متمانەشی پتەوە بەوەی لەنێو هەموو مەردومدا تایفەکەی خۆی (گرۆی ڕزگاربوو)ن.

ئێمە بەڕوونی لەكۆمەڵگای خۆماندا ڕاستی ئەو وتەیەمان بینیوە، نمونەگەلێكی زۆرمان لەسەری هێناوەتەوە، لەپەرتوكی (كۆمیدیای ئاوەزی مرۆڤ)دا.. بۆ نمونە ئێمە ئەو هەموو سروت و نەریتە گەندەڵانە دەبینین كە لەعێراق دا بەناوی ڕابەری شۆڕشگێڕ (حسێنی كوڕی عەلی)یەوە دەكرێت... لەڕاستی دا ئەو نەریت و سروتانە لەنێو ئێمەدا بەهاندان و چاودێری هەندێ گروپی هەلپەرست تەشەنەی كردوە، كەئێمەباش باش مەرامەكانیان دەزانین. لەگەڵ ئەوەش دا هەندێ لە (ژیرەكان) لەپیاوانی ئایینی دەبینین بەلگەی ئەقلی جۆراوجۆر دێننەوە و پەرتوكەكانی لێ پڕ دەكەن، بۆ پشتگیری كردنی ئەو گەندەڵیانە... كاتێكیش لە لای ئەو (ئاقلانە)دا، دادەنیشین و گوێ دەگرین بۆ قسەكانیان، دەبینین باس لە لۆژیك و ئاوەزی ساغ دەكەن، خۆشیان وا دەپۆلێنن گوایە لەبیر و باوەڕ و بۆچونەكانیان دا بەگوێرەی ڕێبازی زانستی دەڕۆن بەڕێوە.

لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە ڕەخنە لە تایفەیەكی دیاریكراو بگرم و، ئەوانی‌تر نا. من بڕوام پتەوە بەوەی هەموو گروپەكانی دیكەی لای ئێمە لەو شێوازەن.. هەر گروپێ سەیری پوشێك دەكات لە چاوی گروپەكانی‌تر دا، بەلای تەختە گەورەكەی نێو چاوی خۆیدا ناچێت!!. لەوانەشە ئەوانەی هەڵگری بیری نوێن و، خۆیان بەئازادیخواز و مۆدێرنیزمیش دەزانن هەر وا بكەن!!.

خودا بەزەیی بەو كەسە دا بێت كە ناتەواویەكانی خۆی سەرقاڵی دەكەن، لەوەی سەرنج لە ناتەواوی كەسانی‌تر بدات.

## پەراوێزەكانی پاشكۆی یەكەم:

١ـ بنوارە: كيدروف، المنطق الشكلي، ل ١٤.

٢ـ بنوارە: جورج بوليتزير، المادية و المثالية في الفلسفة، ل ١١٣.

٣ـ بنوارە: ماوتسی تونگ، حول التطبيق، ل ٢٤.

٤ـ بنوارە: جورج بوليتزير، المادية و المثالية في الفلسفة، ل ١٠٣.

٥ـ بنوارە: ماوتسی تونگ، حول التطبيق، ل ٢٤.

٦ـ بنوارە: زكي نجيب محمود، خرافة الميتافيزيقا، ل ٢-٤.

٧ـ بنوارە: جورج بوليتزير، المادية و المثالية في الفلسفة، ل ٢٢٩.

٨ـ بنوارە: برتراند رسل، الثورة الكوبرنيكية، ل ١٩.

٩ـ بنوارە: Sulivan, Outline of Modern Belfevol. III, P. 874

پاشكۆی دووەم:

## لەنێوان گونجاو و ئەستەم دا

ئەمێستاكە پەرتوكی یەكێك لە موتەكەلیمەكانی سەدەی هەشتەمی كۆچیم لەبەر دەست دایە، ئەویش (حەسەن كوڕی مطهر الحلی)یە كە بە (العلامة الحلي) ناوبانگی پەیدا كردوە... دانەر ئەو پەرتوكەی بۆ ڕەت دانەوەی (ئەشعەری)یەكان داناوە، كە لەنێوان ئەم و ئەواندا دەمبەدەمەیەكی توند و تیژ ڕوی داوە... ئێمە هیچ شتێكی ئەو دەمبەدەمەیەمان لە لا گرنگ نیە، چونكە جیاوازیەكی نیە لە گەڵ ئەو شتانەدا كە ئاسایی زانایانی عیلمی كەلام لەپەرتوكەكانیان دا دەینوسن... بەڵكو دەمانەوێت ئەو مەرجانە بخەینە بەرچاو كە (حلي) لەپێشەكی وتوێژەكەیدا داینــاون بۆ ئیدراك كردن لەمرۆڤ دا... ئەوەش دیارە ڕایەكە و پەیوەندیەكی توند و تۆڵی هەیە بە ئەم بابەتەی ئێمەوە...

دانەر دەڵێت ئیدراك پەیوەستە بەهەشت مەرجەوە، بەبێ ئەو مەرجانە دەستەبەر ناكرێن، مەرجەكانیش ئەمانەن:

١. ساغی و بێوەیی هەستەكان.

٢. بەرانبەربوون لەگەڵ شتەكەدا، یاخود وەك ئەوەی لەبەرانبەری دابێت بەنمونەی وێنەكان لەئاوێنەدا، چونكە شتێك نابینین كە لەبەرانبەرماندا نەبێت یاخود نەچێتە چوارچێوەی حوكمی لەبەرانبەردا بوونەوە.

٣ـ زۆر نزیك نەبوونەوە لەشتەكە، چونكە چاو تەنێك نابینێ كەزۆر لكابێت بەچاوەوە.

٤ـ زۆر دوور نەبوون لەشتەكە، چونكە ئەگەر زۆر لە شتێك دوور بین ناتوانین بیبینین.

٥. نەبوونی پەردە لە نێوان بینەر و بینراودا.

٦. تەنك و ناسك نەبوون، چونكە هەر تەنێكی تەنك كە ڕەنگی نەبێت (وەكوو هەوا) ئەوا نابینرێت.

٧. سەیركەر بەمەبەستی ئیدراك سەرنج بدات.

٨. روناكی بكەوێتە سەری، چونكە هیچ شتێكی ڕەنگدار لە تاریكی دا نابینرێ.

* * *

(حلي) لە سەر ئەو مەرجانە دەڕوات و دەڵێت: "هەموو ژیرەكان لەسەر ئەو مەرجانە كۆكن، جگە لە ئەشعەریەكان، چونكە ئەشعەریەكان هیچ كام لەو مەرجانەیان بۆ ئیدراك دانەناوە". ئەمەش وەك حلی دەڵێت: ئەوەش سەختە و لوت بەرزیەكی ئاشكرایە و هیچ ئاقڵێ گومانی نیە لە پوچ و بەتاڵ بوونی.

هەروەها حلی لەپەرتووكەكەی دا ڕاوبۆچوونی ئەشعەریەكان سەبارەت بەم مەسەلەیە دەخاتە ڕوو... بۆ نمونە ئاماژە دەكات بە ڕای ئەوان ودەڵێت: ئەوان بەگونجاوی دەزانن شاخی بەرزی تا كەشكەڵانی ئاسمان لەبەر دەستماندا بێت و لەهەموو لاوە چوار دەوری دابین و پێمانەوە نوسابێت، بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دا زەمینی پڕ كردبێ لە ڕەنگی جوان و دڵڕفێن، كەچی ئێمە هەرگیز هیچی لێ نەبینین... هەروەها بەگونجاوی دەزانن دەنگی بەهێز و گەورە ئامادەگی لە لاماندا هەبێ، دەنگەكە بەجۆرێ گەورە بێت هەموو دنیای پڕ كردبێ و هەر كەس بیبیستێ پێی قەڵس و نارەحەت بێ، لەهەمان كاتدا ئێمە ئەو دەنگە نەبیستین، بەمەرجێ هەستەكانیشمان ساغ بن و هیچ بەربەست و دووریەكیش لەنێوان ئێمە و ئەو دەنگە دا نەبێ، بەڵكو زۆریش لێمانەوە نزیك بێت... كەچی لەلایەكیترەوە، بەگونجاوی دەزانن كابرایەكی كوێر لەرۆژهەڵاتی زەویەوە، لەشەوێكی تاریك دا، مێرووڵەیەكی ڕەش بەسەر تاشەبەردێكی ڕەشەوە لە ڕۆژئاوای زەوی دا ببینێت... جگە لەوەش بەگونجاوی دەزانن كەسێكی كەڕ لەرۆژهەڵاتەوە، پەنامەكی‌ترین دەنگ لەرۆژئاوا دا ببیستێ.

(حلي) بەم جۆرە کۆتایی بەوتەکانی دێنێت و دەڵێت: "گومانی تێدا نیە ئەو کرۆکی سەفسەتەیە، تا دەڵێت: هەر کەس گومان لەوە بکات ، نکوڵی لە دیاریترین بەرجەستەکانی لای ئێمە کردوە". [1]

## ئایا ئەوە سەفسەتەیە؟

وادیارە ئەو قسەی (حلي) کردویتی لەسەردەمە دێرینەکاندا ڕەواجێکی زۆری هەبووە. (حلي)یش توانیویەتی دوژمنەکانی بەو قسەیە بشکێنێت و بەسەریاندا زاڵ بێت... لێرەدا دەمانەوێت بپرسین: ئەگەر ئێستا (حلي) زیندوو بکرایەتەوە، ئەو قسانەی بکردایە کە لەسەدەی هەشتەمی کۆچی دا کردوونی، ئایا ئەو ڕەواجەیان دەبێ کە لەو سەردەمەدا هەیبووە؟

لەڕووی زانستیەوە، گرفتی (حلي) لەوە دایە کە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر و بابەتیەوە نەگەشتۆتە ئەم مەرجانە... بەڵکو هەمان ئەو کارەی کردوە کە بیرمەندە قەیمیەکانی هاوشێوەی کردویانە، دانیشتوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بیری کردۆتەوە، لەئەنجامدا گەشتۆتە ئەو بڕوایەی، کە ئەو مەرجانە،( ئیدی وای بۆ چوە) دەبێ لەهەموو بوارەکانی‌تری ئەم گەردونە فراوانەدا هەر ڕاست بن.

ئێمە کەهەنوکە سەرنجی ئەو مەرجانە دەدەین، لەوانەیە هاوڕا بین لەگەڵی دا و بڵێین کۆمەڵە مەرجێکی ڕاست و دروستن... وەلێ ئەوەی نابێ لەیادمان بچێ ئەوەیە کە ڕاستێتی ئەو مەرجانە، لەوانەیە پەیوەست بێ بە سنووری ئەو بویەرە تەسکەی کە تێیدا دەژین و هەستەکانمان کۆنتڕۆڵی دەکەن، هەر چەند ئەو زەوی پڕ کردوە بێ وەی ئێمە هەستی پێ بکەین یاخود هیچی لەبارەوە بزانین.

## زاگونەکانی هەستی مرۆڤ:

یەك لەو ڕاستیانەی زانستی نوێ بڕیاری لەسەر داون، ئەوەیە کە هەر یەك لەپێنج هەستەکانمان، سنورێکی دیاریکراوی هەیە بۆ هەست کردنی بە شتێ لە دەرەوەی خۆیەوە... بۆ نمونە هەستی بیستن وەرگرە، تۆ ناتوانی دەنگێك ببیستی مەگەر

لەرەلەرەکەی لە سنورێکی دیاریکراودا بێ، جا ئەگەر لەرەلەرەکەی لەو ڕادەیە زیاتر بێت یان کەمتر بێ، ئەوا گوێچکە ناتوانێ بیبیستێ... ئەمەش یانی لەوانەیە دەنگی زۆر گەورە و ترسێنەر لەبۆشایی دەوروبەرماندا هەبێت، کەچی ئێمە هەستیان پێ ناکەین و لێیان بێئاگاین.

سەبارەت بەهەستی (بینین)یشمان هەر وایە، چونکە لەپلەی شەپۆلە (کارۆ موگناتیسی‌یەکان) دا تەنها حەوت پلە دەبینێت، هەر ئەمەشە حەوت ڕەنگە ناسراوەکانمان دەداتێ... کەواتە گەردوون لەوانەیە پڕ بێت لە ڕوناکی زۆر و وێنەی هەمە جۆر، ئەوەندە هەیە کە ئێمە نایان بینین، چونکە لە دەرەوەی چوارچێوەی هەستی بینینی ئێمە دانە.

هەر ئەمەشە وای لەزاناکان کردوە بڵێن: پێنج هەستەکانمان هیچ نین، جگە لە پەنجەرەگەلێ بچوك کە مرۆڤ لەمیانەیانەوە سەرنجی گەردوونی گەورە دەدات... بەمەش مرۆڤ لە بەندیەك دەچێ لەژوورێکی تەسك دا بەند کرابێ، و هیچ پەنجەرەیەك لەو ژوورەدا نەبێ جگە لەکونی بچوك بچوك لێرە و لەوێ... جا ئەو بەند کراوە هیچ لەڕوداوەکانی گەردون نابینێ جگە لەبەشێکی زۆر سنووردار نەبێ، بەشەکانی تری ڕووداوەکان ،لەپشتی دیوارەکانەوە بەشاراوەیی دەمێننەوە.

**بەرفراوان بوونی کەلێنەکان:**

ئەوەی شیاوی ئاماژەپێدانە، ئەوەیە ئەو کونە بچوکانەی مرۆڤ لێیانەوە سەرنجی جیهانی دەرەوەی خۆی دەکات، بەردەوام هەروا بەبچوکی و بەبێ بەرفراوان بوون نامێنێتەوە... ئەوەتا زانست ئامێر و ئامرازی جۆراوجۆری خستۆتە بەر دەستی مرۆڤ و، توانیویەتی بوارەکانی ئیدراك کردنی گەردون لەمرۆڤ دا بەرفراوان بکات... ئەو ئامێرانەش لەگەشەیەکی بەردەوام و چاك تربوونێکی وا دان کە لەسنورێکدا ناوەستێ.

دیارە مرۆڤ لەسەرەتاوە ئەو جۆرە ئامێرانەی نەبوو، تەنها لەڕێی هەستەکانیەوە سەرنجی گەردوونی دەدا. لەبەر ئەوەش زانیاریەکانی لەبارەی گەردونەوە زۆر سنوردار بوو.. بەم هۆیەشەوە ئەقڵی مرۆڤ پەنای دەبردە بەر ئەفسانە، و ئەو کەلێنە گەورەی پێ

پڕ دەکردەوە کە کەوتبویە نێوان ئەو دیاردە سەیرانەی گەردون کە دەی بینین و ئەوانەشی کەنەی دەبینین.

دواتر مرۆڤ ،پەیتا پەیتا دەستی کردە فراوان کردنی ئەو کونانە، ئەوە بوو دوربین و پێوەر و ئامێرە وردەکانی داهێنا... هەر جارێکیش نهێنی‌یەکی نوێی لەنهێنی‌یەکانی گەردون دەدۆزیەوە بەهۆی ئەو ئامێرانەوە... هەر دۆزینەوەیەکی نوێش، پانتایی ئەو ئەفسانانەی بەرتەسك دەکردەوە کە بەسەر ئاوەزی مرۆڤ دا زاڵ بوون.

**بەرەنجامی نەریت:**

لەبەر دا ئاماژەمان دا بە وەی زۆرینەی شتە ڕۆتینی و ، زەرورەتە ئەقلیەکان، کە بیرمەندە کۆنەکان متمانەی ڕەهایان بەڕاستێتی‌یەکەیان هەبووە، هیچ نەبوون جگە لەهەندێ شتی باوی ناو خەڵك کە ماوەیەکی زۆر خویان پێوەگرتوە تا وای لێهاتوە بونەتە هەقیقەت و ڕاستی سەقامگیر، راستی‌یەك کە ناکرێ ژیرێ گومانی لێ بکات.... ماوەیەکی زۆر تێپەڕیمرۆڤ پێی وابوو زەوی تەخت و ڕاخراوەئەی چۆن ئەبێت وانەبێت لەکاتێکدا ئەم بەچاوی خۆی وای دەبینێ... بۆیە کاتێ بیرۆکەی گۆیی بوونی زەوی هاتە ئاراوە خەڵکی گاڵتەیان پێ کرد و بەدرۆیان خستەوە، تەنانەت هەندێکیان خستیانە خانەی ئەو کوفرەوە کە خودا و پێغەمبەر لێی قایل نین.[٢]

دەکرێ لەمەڕ پێنج هەستەکەش هەر وا بێژین... خەڵکی لەگەڵیاندا ڕاهاتن تاکو وایان گومان بردوە کە هەموو دنیا لەبەر هەستیاندایە... وەلێ گەر لەدنیا دا شتێ ڕو بدات و نەتوانن هەستی پێبکەن، ئەوا دەبێ هەر کاری پەری یاخود گیانەکانی‌تر بووبێ!! بەو جۆرە جیهان لەبەر چاویاندا دابەش بوو بۆ دوو جۆری لێك جیاواز، لایەنێکی هەست پێکراو (بەرهەست) و لایەنێکی نادیار (غەیبی).

فەیلەسوفەکانیش بەمجۆرە ڕۆشتون، دەیانبینین ئەمانیش جیهانیان کردۆتە دوو بەشەوە، فیزیکی و میتافیزیکی... تا کو ئەمڕۆکەش ئاسەوارەکانی ئەم دابەشکردنە وەهمیە بەڕونی لەبیر کردنەوەی خەڵکێکی زۆر دا ماوە.

## چیرۆکێکی مانادار:

دەگێڕنەوە لەدێرزەمان دا، شوانێك بەناوچەیەکی شاخاوی دا دەڕوات، کەوشێکی لەپێ دا دەبێ کە بزماری پێوە دەبێ... لەناکاو شوانەکە هەست دەکات کەوشەکانی بەتوندی بەزەویەوە نوساون، تمەس لە زەویەکەدا هەندێ بەردی موگناتیسی هەیە، و بزمارەکانی بەرەو خۆی ڕاکێشاوە... وەلێ شوانەی هەژار وا دەزانێ جنۆکەکان گاڵتەی پێ دەکەن، بۆیە دڵی ڕادەچڵەکێ و زۆر دەترسێ... لەکۆتایی دا هەر ئەوەندەی پێ دەکرێ، کەوشەکانی دادەکەنێت و ڕادەکات و بێئەژماریش نەفرەت لە جنۆکە دەکات.

نابێ لۆمەی شوانەکە بکرێ لەسەر ئەو کارەی... چونکە نازانێ چ لێکدانەوەیە بکات بۆ ئەو ڕوداوەی بەسەری هاتوە، ئەو نازانێت شتێ هەیە و ناوی موگناتیسە و ئاسن بۆ خۆی ڕادەکێشێ... بۆیە پێویستە پەنا بەرێتە بەر ئەفسانەی جنۆکە و، ئاوەزی سەراسیمەی خۆیی پێ بحەوێنێتەوە.

هەروەها چیرۆکێکی دیکە هەیە کە هاوشێوەی ئەو چیرۆکەیە کە لەبەر دا هێنامان، وەلێ ئەوەندە هەیە لەسەدەی بیستەم دا ڕوی داوە، نەك لەدێرزەمان دا.

(شێخ حافظ وهبە) کەوەزیرێکی ناسراوی سعودیە بۆمان دەگێڕێتەوە، پیرانی ئاینی لە (نەجد) دا لەسەرەتاوە نەیاندەتوانی بڕوا بکەن بە (ئامێری بێتەل) کاتێ بۆ یەکەمجار وێستگەکانی لەساڵی ١٩٢٨ دا لەشانشینی سعودیەدا دانراوە.(٢)

ئەقڵیان ئەوەی وەرنەگرتوە کە چۆن چۆنی هەواڵێك لەنێوان مەککە و ڕیاز دا لەیەك چرکە دا دەگوازرێتەوە... لەکاتێکدا حوشترەکان بەچەند ڕۆژێ ئەو ماوەیە دەبڕن...کەوابێ هەر دەبێ لەنێو وێستگەی بێتەل دا نهێنیەکی دۆزەخی یاخود گەمەیەکی کافران هەبێ، نەفرەتی خوایان لێ بێ، لەدوای بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ، پیرانی ئاینی (مشایخ الدین) هاتنە سەر ئەو ڕایەی کە شەیتان هەواڵ لەوێستگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگوازێتەوە، چونکە جگە لەشەیتان کەسی دیکە ناتوانێ ئەو کارە سەیرە ئەنجام بدات.

(حافظ وهبە) هەروەها دەڵێت: هەندێ لەو پیاوە ئاینیيانە زۆر جار سەردانی ئەو وێستگە بێتەلەیان دەكرد كە لە (ریاظ) دامەزرێنرابوو، لە كارمەندی وێستگەكەیان دەپرسی: ئایا وادەی سەردانی شەیتان بۆ ئەو وێستگەیە كەیە؟ وە ئایا شەیتانە گەورەكە لە (مەككە) دایە یا خودلە (ریاظ) دا؟ و ژمارەی ئەو نەوانەی چەندن كە لە گواستنەوەی هەواڵەكاندا یارمەتی دەدەن؟

دواتر بەهۆی ئیجتهادكردنیانەوە گەشتنە ئەو بڕوایەی كەشەیتان هیچ كارێ بۆ خزمەتی مرۆڤ ناكات، مەگەر دوای ئەوەی مرۆڤ قوربانی بۆ سەر ببڕێت و لە بریتی ناوی خودا ناوی شەیتانی لەسەر بێنێت... لەسەر بناغەی ئەم ئیجتهادەیان یەكێكیان بەنهێنی چوەتە وێستگەكە و دەستی كردۆتە گەڕان بەدووی پاشماوەی ئەو قوربانیانەدا كە لەو وێستگەیەدا بۆ شەیتان كراون وەكو شاخی ئاژەڵ و ئیسقان و خوری...تەنانەت ڕەنگە پیاوە ئاینییەكە بەرتیلیشی دابێتە كارمەندەكە تاكو نهێنی شەیتانەكانی لێوە دەست بكەوێت.

وام دێ بەخەیاڵ دا، گەر موگناتیس لای پیرانی ئاینی نەجد ناسراو نەبوایە، ئینجا بۆ یەكەمجار لە ژیانیان دا بیان بینیبایە، ئەوا بەهەمان شێوازی شوانە هەژارەكە حوكمیان بەسەر دا دەدا، و لەوانەیە فتوایان لەسەر دەربكردایە و بەكارهێنانی موگناتیسیان لە هەموو پیاو و ئافرەتێكی موسڵمان یاساغ كردایە.

## نەریتی ژیران:

وا دیارە پیرانی (نەجد) ئەمڕۆكە بڕوایان بەوە پەیدا كردوە كە شەیتان هیچ وەخت دەست وەرنادات لە مەسەلەی (بێتەل)... بەڵكو بۆیە نكوڵییان لە بێتەل كردوە لەسەرەتاوە چونكە پێشتر نەیان بینیوە، بۆیە دوای ئەوەی كە پێی ڕاهاتوون ئینجا (ڕادیۆ)یان بینیوە كە هەموو ڕۆژێ هەواڵەكانی دنیایان بۆ دەگوازێتەوە، ئاسان بوە بڕوا بە ڕادیۆ بكەن و خۆیان بدەنە دەست خوا!

لەڕاستی دا، بەشێوەیەكی گشتی سروشتی ئاوەزی مرۆڤ ئاوهایە، ناتوانێ بڕوا بكات بەهەر مەسەلەیەكی نامۆ كە پێشتر پێی ڕانەهاتبێ، تەنانەت لەوانەیە بە ئەستەمیشی

بداتە قەڵەم.. وەلێ هەر ئەوەندەی پێی ڕاهات، لەبەر چاوی دا لە ئەستەمێكەوە كە ئەقڵ نایبڕێ، دەبێتە شتێكی ماقوڵ و گونجاو.

جیاوازی نێوان (گونجاو) و (ئەستەم) لەدیدی زۆرینەی (ژیران)داوەك جیاوازی شتێك وەهایە كەپێی ڕاهاتوون لەگەڵ شتێكی تردا كە پێشتر پێی ئاشنا نەبوون، كەواتە جیاوازیەكی ئاساییە و لەنێوخۆی هزرەوە هەڵدەقوڵێ نەك لە دەرەوەی دا.

ئەو كاتەی ئامێری (ڕادیۆ) لە تەشەنە كردن دابوو لەعێراق دا، كابرایەكم بینی گاڵتەی بە ئامێرەكەش و ئەو كەسانەش دەكرد كە بەڕاستی دەزانن.. سەبارەت بەڕادیۆ دەیگوت: شمەكێكی بازرگانیە و بۆ چاوبەست كردن دروست كراوە. دەنا ماقوڵ نیە ڕادیۆ دەنگ لە وڵاتێكی دوورەوە وەربگرێ، ئەگەر ڕادیۆ ڕاست بوایە (بەقسەی كابرا ــ وەرگێڕی كوردی) دەبوا بمانتوانیا دەنگی (حاجی محەمەد)ی پێ وەربگرین كە لەناحیەی (دجیل) دادەنیشێ... كە پرسیارم لەكابرا كرد، كە ئایا سەرچاوەی ئەو دەنگەی لە ڕادیۆدا هەیە لە كوێیە؟ وتی: لەوانەیە لەجێگەیەكی نزیكەوە بێت و لە ڕێگەی تەلە كارەباییەكانەوە بێت وەك لەئامێری تەلەفۆن دا.

وەك دەبینین ئەم كابرایە لەسەر بەكارهێنانی (تەلەفۆن) ڕاهاتوە ، بۆیە بەلایەوە شتێكی ئاسایی و ماقوڵە و نەك هەر ئەوەندە بگرە بەهۆی تەلەفۆنەوە ئامێری (ڕادیۆ) لێك دەداتەوە... بۆیە بەهێزترین گومان بەلای ئەوە دایە گەر ئەم كابرایەش سەر بە نەوەی پێشتر بوایە و، بۆیە یەكەمجار تەلەفۆنی بدیایە، ئەوا هەمان حوكمی ڕادیۆكەی ئێستای بەسەر دا ئەدا... ئیدی ناشزانم ئێستاكە چی دەڵێت كە ئامێری سەیر و سەرسوڕهێنەری (تەلەفزیۆن)[٤] دەبینێ بە چاوی خۆی؟

**بەڵگەڕێژەییەكان :**

كە لەكۆتاییەكانی سەردەمی عوسمانیدا، تیۆرەكەی (داروین) هاتە عێراقەوە، (ژیرەكان) پیای دا هەڵشاخان و دەستیان كردە پرۆتستۆ و سوكایەتیپێكردنی... لەدیدی ئەواندا نەدەگونجا مرۆڤ لە ئاژەڵەوە گەشەی كردبێ، ئایا هیچ ژیرێ قایل دەبێت باپیری مەیمون یاخود گوێدرێژ بێت؟ نا بەخوای گەورە!

دەگێڕنەوە یەكێك لەشێخە گەورەكانی (نەجەف)ی پیرۆز نامەیەكی دوور و درێژ دەنوسێت و لێوان لێوی دەكات لەبەڵگەی جوارجۆری ئەقڵی و نەقڵی بۆ پوچەڵ كردنەوەی تیۆرەكەی (داروین)، و نامەكە دەنێرێت بۆ مامۆستا (شبلی شمیل) لەمیسر، چونكە ئەم پیاوە هەڵگری بەیداخی ئەو تیۆرە بوو لە نیشتمانی عەرەبی دا... جەنابی شێخ وای گومان بردوە كە مامۆستا (شمیل) بەڵگەكانی دەخوێنێتەوە و دەست بەجێ دان بە ڕاستی و دروستییاندا دەنێت... ئەی چۆن دانی پێدا نانێت؟ لەكاتێكدا وەك خۆری ڕوناك دیار و ئاشكران!!. بۆیە شێخ بەجۆرێكی گەرمتر لە پشكۆ چاوەڕانی وەڵامی مامۆستا (شمیل)ی دەكرد... دوای ماوەیەك وەڵامە چاوەڕوان كراوەكە گەشت... شێخ بەپەلە دەستی بردە زەرفی نامەكە، بەڵام هیچی لەنێو دا نەبینی جگە لەم دەستەواژەیە كە تیای دا نوسیبووی: "پاساوەكانت بەڵگەی زانینە و ئیتر سڵاو".

لەدوایدا دەركەوت مامۆستا (شمیل) كە بەڵگەكانی شێخی خوێندۆتەوە پێیان پێكەنیوە، وەك چۆن شێخ بەبەڵگەكانی مامۆستا پێدەكەنێ... هەر یەكێكیان لەمیانەی مەئلوفاتە فیكریەكانی خۆیەوە لەمەسەلەكان تێدەگەشت... هەر یەكیشیان بڕوایان پتەو بوو بەوەی كە هەق لای خۆیەتی.

## لە وڵاتە پێشكەوتوەكاندا:

تكام وایە خوێنەر وا گومان نەبات كە ئەم مەسەلانەی ئاماژەمان پێدان، تەنها لە وڵاتەكانی ئێمەدا ڕوو دەدەن، بەڵكو لە زۆرێك لەو وڵاتانەشدا كە ئێمە پێشكەوتن دەدەینە پاڵیان و لای زۆرێك لەو خەڵكانەش كە ناوی (زانایان)مان بەسەر دا بڕیون، هەمان شت ڕو دەدات.

مامۆستا (ولیەم باریت) باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە كاتێ بۆ یەكەمجار ئامێری (گرامافونی)ی لە ئەكادیمیای زانستی پاریس دا نمایش كردووە، زانایان ڕایان گەیاند كە ئەوە شتێكی ئەستەمە، چونكە بە لایانەوە ماقوڵ نەبوو دەنگی مرۆڤ لەسەر دیسكێكی كانزایی دا تۆمار بكرێت.. لەوەش سەیرتر ئەوەیە زانایان خاوەنی ئامێرەكەیان تاوانبار

کرد بەوەی لەژێر مێزەکەدا پیاوێکی شاردۆتەوە کەبەجۆرێکی تایبەت قسە دەکات تاکوو وا لەئامادەبوان بگەیەنێت ئەو دەنگە لەخودی ئامێرەکەوەیە...

بەسەرهاتێکی ئاوهاش لەمامۆستا (تیت) لەزانکۆی (ئەدنبنەرە) دەگێڕنەوە، دەڵێن: کاتێ هەواڵی داهێنانی تەلەفۆنی بیستوە، "ملە جەڕەی لێکردووە"چونکە وەك دەڵێت : (داهێنانی ئامێرێکی وەها لەڕوی فیزیاییەوە ئەستەمە).(٥)

(ئاغاخان) لەیاداشتەکانی دا باسمان بۆ دەکات کە لەسەردەمی لاوێتی دا چاوی کەوتوە بە (لورد کالفن) کە ئەوکات وەك یەکێك لە گەورە زانایانی فیزیایی لەدنیا دا دەژمێردرا... لەمیانەی وتوێژکردنی دا لەگەڵ (ئاغاخان)دا، (کالفن) دوپاتی ئەوە دەکاتەوە کە فڕین بەئامێرێکی قورس تر لەهەوا بەئاسماندا شتێکی ئەستەمە لەڕوی مادیەوە، هەرگیز مرۆڤیش ناتوانێ بەو قۆناغە بگات....(٦)

**(کالفن) و (سەی موحسین) :**

وادیارە لەم ڕووەوە مامۆستا (کالفن) هیچ جیاوازیەکی نیە لە (سەی موحسین)ی باپیرەم (خوای لێ ڕازی بێت)، دەگێڕنەوە باپیری ڕەحمەتیشم کە یەکەمجار هەواڵی فڕۆکەی بیستووە بڕوای پێ نەکردوە... ڕۆژێکیان پێیان وتوە کە (ئیفرنجی ـ بیانی)یەکان فارگۆنێکیان دروست کردوە ، بەهەوادا دەفڕێت و لەتەختە و ئاسن دروست کراوە.. باپیرم گوتوێتی هەرگیز ئەمە ماقوڵ نیە، ئنجا دەستی کردۆتە هێنانەوەی بەلگەی ئەقلی بۆ سەلماندنی ئەستەمێتی فڕینی فارگۆنێك بەهەوا دا، کە لەتەختە و ئاسن و تەختەدار دروستکراوە و دەڵێت: "ئەو چەکوشەش لە ئاسن و تەختەدار دروستکراوە، ئایا دەگونجێ بفڕێت؟!" بۆیە ئامادەبوان هوتافی لەگەڵدا دەکێشن: (نافڕێت ... نافڕێت...)

(سەی موحسین) نەی دەتوانی تەسەوری ئەوە بکات فارگۆنی بجوڵێت بەبێ ئەوەی ولاخێك لەپێشەوە ڕای بکێشێت، ئنجا چۆن دەتوانێ تەسەوری ئەوە بکات فارگۆنێ بەئاسماندا بفڕێت، بەڕاستی فڕینی ئەو فارگۆنە (بەبڕوای وی ـ وەرگێڕی کوردی) تەنها شێتەکان پێی قایل دەبن!!.

هەر چۆن بێت (سەی موحسین) تاکو ئەو ڕۆژە ژیا، کە فارگۆنی بینی بەتەختە و ئاسنیەوە بەئاسماندا فڕی!! بۆیە چاوی بەئاسماندا دەگێڕا و نەی دەزانی چ بڵێت؟! . جا ئەگەر بهاتبا و ماوەیە درێژتر بژیابا، ئەوا کوڕە زاکەیی دەبینی (واتە نووسەری ئەم چەند دێڕە)، کەسواری فڕۆکەش دەبێت و، بەلوت بەرزیشەوە!!

**پەی بردن:**

ئەوە دادگەری نیە ڕەخنە لە (سەی موحسین) و کەسانیتری وەك ئەو بگرین،لەسەر ئەو بڕیارە یەکلا کەرەوانەی کە دەری دەکەن، بەپشت بەستن بەو زەرورەتە عەقڵیانەی کە رۆژێك لە رۆژان متمانەیان بەڕاستی و دروستییان کردوە...

ئێمەش هەموومان بڕیاری وا دەردەکەین و لەدوایی دا بۆمان دەردەکەوێ کە بەهەڵەدا چووین.. ئەمە (وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا )

لە هەموو کات و شوێنێك دا نەریت و خوی ژیرەکانە، بەڵام دەتوانین پەی بەرین بەڕاستییەك و بڵێین: هەندێ جار ئەو نەریتە سەخت و توند دەبێت لەسەر هەندێ خەڵك و، وایان لێدەکات سەرەڕای ئەزمونە تاڵەکانیشیان تیای دا هێشتر سوورن لەسەری... هەر ئەو نەریتە هەندێ جاریتر، لەسەر هەندێ کەس سوك و لاواز دەبێت و ئەمەش وایان لێدەکات دودڵ بن لەکاتی دەرکردنی بڕیار لەسەر هەر شتێ، چونکە نازانن رۆژگاری دادێ چ داهێنانێکی سەیرتر دێنێتە کایەوە.

شیاوی ئاماژەپێدانە کە بڵێین:ئەم خوە لەسەدەی بیستەمدا بەگشتی ڕوو لەلاوازی و سووك بوونە... لەکاتێکدا زانایانی بەر لەم سەدەیە جیاوازیەکی گەورەیان نەبوو لەگەڵ سەرجەمی ژیرەکانیتردا، و زیاتر بەلای ئەوە دا بوون کە هەر مەسەلەیەکی نامۆ و نائاشنا بەدرۆ بخەنەوە.. ئێستا لە (دودڵی و)دڕدۆنگی دان و نازانن چی بەدرۆدا بخەنەوە و بڕوا بەچیتر بکەن.

**زانایانی سەدەی رابردوو:**

لەکۆتاییەکانی سەدەی رابردوودا (نوسەر مەبەستی لەسەدەی رابردوو و سەدەی نۆزدەیەمە، چونکە ئەم پەرتوکە لەپەنجاکانی سەدەی بیستەم دا نوسراوە... وەرگێڕی

كوردی) یەكێك لە زانایان هەڵدەستێ لەنێو كۆمەڵێ لەزانایان دا وتار دەدات و دەڵێت: "ڕەنگە گرنگترین دۆزینەوەكانی زانستی سروشت ناسی لەسەدەی نۆزدەهەمدا كۆتایی هاتبێت، بۆیە دۆزینەوەكانی داهاتوو گرنگیەكی گەورەیان نابێت، ئەزموونەكانی داهاتوشمان هیچ نابن جگە لەدوبارەبوونەوەی ئەزموونەكانی پێشوومان، ئنجا بەرەنجامەكانیشیان تەنها لەڕاستكردنەوەی ئەو بیردۆزانە دا كورت هەڵدەهێنرێ كە ئێمە پێیان ئاشناین و ناسیومانن"[٧]

لەوەش سەیرتر هەواڵێك بوو كە لەرۆژنامەی (تایمزی لەندەنی)دا لەساڵی (١٨٨٦ز) دا بڵاو كرایەوە و تیای دا هاتبوو: بەڕێوەبەری (تۆماركردنی داهێنانەكان) راپۆرتێكی ئاراستەی میری كردوە و، تیای دا داوای ئەوەی كردوە ئیدارەی تۆماركردن هەڵبوەشێنرێتەوە، چونكە چاوەڕوانی ئەوە ناكرێت لەداهاتوودا جگە لەچەند شتێكی كەم نەبێ‌ئیدی داهێنان سەرهەڵبدات، چونكە ئێستا كە هەموو شتێ داهێنراوە.

ئێمە كە ئێستا ئەو هەواڵە دەخوێنینەوە سەرمان لێی سوڕ دەمێنێ... لە ڕاستی دا نابێ نكۆڵی لەوە بكەین كە ئەو دۆزینەوە و داهێنانە زانستیانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەركەوتن زۆر مەزن بوون، زانایانیش هەقی خۆیان بوو شانازی پێوە بكەن... وەلێ كاتێ بەراوردیان دەكەین بەدۆزینەوەكانی سەدەی بیستەم، خەریكە هەست بكەین بەوەی داهێنانەكانی سەدەی نۆزدەهەم هیچ نەبوون و بەڵكو لەیاری زارۆیان دەچوون.

**شۆڕشێكی مەزن:**

بەراستی سەدەی بیستەم شۆڕشێكی زانستی وای بەخۆوە بینی كە بەراورد ناكرێ بەهیچ كام لەو شۆڕشانەی لە رابردوو دا ڕوویان داوە... یەكێك لەبەرەنجامەكانی ئەو شۆڕشە ئەوە بوو، كەزانایان باوەڕیان لاواز بوو بەڕاستی و دروستی زەروراتە عەقلیە كۆنەكان و كەمتریش پشتیان پێ‌دەبەستن لەدەركردنی بڕیاری یەكلاییكەرەوە دا... تەنانەت هەندێكیان گەشتونەتە ئەوەی كە بڵێن هیچ شتێ لەگەردوندا نەماوەتەوە ئەستەم بێ...[٨]

یەکێك لەگرنگترین ڕواڵەتەکانی ئەو شۆڕشە زانستیەیە، بریتی بوو لەو ڕاڤەیەی کە بۆ چەمکی (مادە) هاتە کایەوە... زانایانی سەدەی رابردوو بڕوایان وا بوو هەموو گەردون پێك هاتوە لەدوو شت کە سێیەمیان نیە، مادە و جوڵە... ئەگەر ئەو بوارە هەبوایە پرسیارمان لێکردنایە لەبارەی نهێنی (مادە)ەوە، لە وەڵامدا دەیانگوت هیچ نهێنیەکی تێدا نیە... ئەو مادەیە کە بە دەستمان دەیگرین و دەی پێوین و لەکار و بارەکانی رۆژانەماندا بەکاری دێنین.

ئەو دەمە زانایان،هیچ شتێکیان لە قوڵایی (گەردیلە) و ئەو وزە زۆرەی ناوی نەدەزانی... بۆ نمونە بەردێکیان دەگرت بەدەستەوە و بەئامێرەکانیان دەیان پشکنی و هیچ نهێنیەکی شاردراوەیان تێدا نەدەبینی، بۆیە وایان بەخەیاڵدا دەهات کە مادەی گەردون هەر هەمووی لەجۆری ئەو بەردەیە.

(دالتۆن) لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ،بیردۆزە ناسراوەکەی لەمەڕ (گەردیلە) هێنایە کایەوە... وەلێ تیۆرەکەی لەبنەڕەتەوە جیاوازی نەبوو لە بیردۆزی (جەوهەری تاك) کە فەیلەسوفانی ئەغریق بڕوایان پێی هەبوو... تیۆرەکەش باس لەوە دەکات کە (گەردیلە) بەشێکی بچوکی مادەیە و دابەش ناکرێت و لەسروشتی دا جیاواز نیە لەسروشتی ئەو مادەیەی کە لێی پێك دێت.

لەساڵی (١٨٩٧ز)دا، یەکێك لەزاناکان تەوژمێکی کارەبایی بە بۆریەکی خاڵی کراو لەهەوادا ڕەت دەکرد، لەو بۆریەدا (دنکۆڵە)ی زۆر وردی دۆزیەوە کە دووهەزار جار بچوکترن لە هەرگەردیلەیەکی دالتۆنی... ئەم ئەزمونەش ڕوداوێکی گرنگ بوو لەمێژووی زانست دا.. چونکە بەهۆی ئەم ئەزمونەوە بۆ یەکەمجار زانایان پەیان برد بەوەی کە (گەردیلە)ش دەکرێ دابەش بکرێت، واتە گەردیلەش بەو شێوەیە نیە کە پێشتر ئەوان بۆی دەچون... لەدوای ئەوەش ئەزمونگەلێ تر جێبەجێ کران ، زانایان توانیان بەهۆی ئەو ئەزمونانەوە سروشتی ئەو دنکۆڵانە بناسن، دەنکۆڵەکان ئەو (ئەلکترۆن)انەن، کە لەشەپۆلی کارۆموگناتیسی پێك هاتوون.

مامۆستا (جینز) دەڵێت: هیچ جیاوازیەکی جەوهەری نیە لەنێوان ئەو پارچە مادەیەی کە بەدەستمان دەیگرین و ئەو تیشکی ڕوناکیەی بەچاو دەی بینین.. هەر

یەکێکیان پێك هاتوون لە شەپۆلی کارۆ موگناتیسی... ئەو جیاوازیە ڕواڵەتیەش کە دەبینرێ لەنێوان مادە و تیشك دا، هۆکەی ئەوەیە کەشەپۆلەکانی مادە لەقاڵب دراون و لەخولگەی زۆر بچوك دا لەنێو گەردیلە دا دەسوڕێنەوە، لەکاتێکدا شەپۆلەکانی تیشك ڕەهان لەبۆشایی دا...[٩]

ئەگەر ئەو قسەیەی (جینز) ڕاست بێت، ئەوا ئێمەش بۆمان هەیە بڵێین: ئەو مادەیەی کە بەدەست دەیگرین بریتییە لە وەهمی هەستە سنوردارەکانمان... چونکە (مادە) نیە بەو مانایەی زانایانی سەدەی نۆزدە لەو وشەیە تێدەگەشتن.. بەڵکو ڕاستترە گەر بڵێین وزەیەکی لەقالب دراوە.. گریمان بتوانین برێکی گەورە لەتیشکی ڕوناکی کۆ بکەینەوە و وای لێ بکەین بەدەوری ناوکێك دا بسوڕێتەوە، ئەوا دەبێتە گەردیلەیەکی مادی لەهەمان جۆری ئەو گەردیلەیەی کە بەردەکانی زەوی و ئاسمانی لێ پێك دێ.

زاناکان تا هەنوکە نەیان توانیوە (مادە) لەتیشکەوە دروست بکەن، بەڵام کە بۆمبی ئەتۆمییان تەقاندەوە، توانییان (مادە) بگۆڕن بە تیشك... ئیدی ئێمە نازانین سبەینێ چیتر دروست دەکەن؟

## مادیەت و میتافیزیکیەت:

سەبارەت بە مادیەتی سەدەی ڕابردوو (واتە سەدەی نۆزدەهەم - وەرگێڕی کوردی) دەتوانین بڵێین : لەمیتافیزیکیەتەوە نزیک تر بوە وەك لە مادیەتی ئەم سەدەیە... زانایانی سەدەی رابردوو بڕوایان وا بوو (مادە) لەسروشتی خۆیدا نەجوڵاوە و لەگەردیلەی بێجم و جوڵ پێك هاتوە، بۆیە پێویستی بەپاڵنەرێکی دەرەکی هەیە تاکو بیبزوێنێ.. لێرەوە ئەو ڕایە سەبارەت بە گەردون لەلایەن گەلاڵە بوو کە دەیانگوت: گەردوون لە دوو لایەنی لێك جودا پێك هاتوە کە بریتین لە مادە و جوڵە.

گەر دەست بەو ڕایانەوە بگرین، ئەوا پێویستە لەسەرمان پرسیاریان لێ بکەین لەبارەی سەرچاوەی ئەو جوڵەیەی کە پاڵ بەمادەوە دەنێت، ئەم پرسیارەش پەلکێشمان دەکات بۆ بڕوابوون بەهێزێکی نادیار کە مادە دەجوڵێنێت لەدەرەوەی مادەوە، وەك چۆن

مرۆڤ مەکینەیەك دەبزوێنێت، ئەمەش دیارە کە یەکێکە لە خەسڵەتە تایبەتمەند و جیاکەرەوەکانی فیکری میتافیزیکی...[١٠]

لێکۆڵینەوە ناوکیەکانی ئەم دواییە، بێئاتاجیان کردوین لە هەر ڕاڤەیەکی میکانیکی گەردوون... لەو لێکۆڵینەوانەوە ڕون بۆتەوە کە هیچ جیاوازی و لێك جودابوون و تایبەتمەندی نیە لەنێوان مادە و جوڵەدا... تەنانەت ئەو قسەیەش ڕاستە کە بێژین: (مادە و جوڵە) دوو ڕواڵەتی یەك ڕاستین.. مادە جوڵەیە و جوڵەش مادەیە... یاخود بەدەربڕینێکیتر: هەر دوکیان وزەیەکی (کارەبایی ـ موگناتیسی)ن و بەدوو ڕواڵەتی جیاوازەوە بەرهەستە سنوردارەکانمان دەگەون.

## بۆشاییە قەشەنگەکەمان:

ئەم تێگەشتنە نوێیەی مادە، وامان لێدەکات بەجۆرێکیتر لەمادە تێبگەین، جیاواز لە تێگەشتنی قەیمیەکان.. وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، ئەمرۆکە زانایان وای دادەنێن و بەگریمانی دەزانن، کەژمارەیەکی بێشومار شەپۆلی کارۆ موگناتیسی لەگەردوندا هەیە و پێکدا دەدەن و کار لێك دەکەن لەئاسمانەکەماندا بێئەوەی ئێمە هیچیان لە بارەوە بزانین... گەر ئەو هەستەمان ببوایە کە هەموو شەپۆلەکانی فەزامان هەست پێ بکردایە، ئەوا بێهۆش دەکەوتین بەهۆی ئەو ملیۆنەها ڕەنگ و وێنە و شتە هەمەڕەنگانەی لەفەزا دا هەن.

زانای فیزیایی بەناوبانگ (روبرت دنکان) دەڵێت: شەپۆلە کارۆ موگناتیسیەکان بەبێپچڕان لەهەموو مادەیەکی (بونەوە) دەردەچن و خۆیان دەکێشن بەمادەکانی دەوروبەری دا و کاریان لێ دەکەن..[١١]

ئەمەش یانی مرۆڤ کە لەم گەردونە دا دەژی وەك ئەوە وایە (لە گوێی گا دا نوستبێ ـ دەربڕینی وەرگێڕ) وەك خەڵکە ڕەشۆکیەکە وا دەڵێت... ئەوەتا بەبێ ئاگایی بەڕێ دا دەڕوات و نازانێت دونیا لەدەوروبەری دا لەجەنجاڵیەکی سەخت دایە... نەك هەر ئەوەندە بگرە شانازی بەهەستەکانیەوە دەکات و متمانەی پێیان هەیە، لەکاتێکدا هەستەکانی بڕێکی کەم نەبێت هیچی دیکەی لەگەردون پێئاشنا ناکەن.. لەوانەیە

خێری تێدا بێت كە هەستەكانی بەو ئەندازەیە سنوردارن، چونكە ئەگەر مرۆڤ پەیی بەهەموو ئەو دیاردە ترسناكانەی دەوروبەری ببردایە، ڕەنگە هەموو دنیا بگۆڕایە بە(شێتخانەیەكی گەورە)!!

## هەندێ لەزانایان:

ئەم تێگەیشتنە نوێیە لە مادە، پاڵی بەهەندێ لە زانایانەوە ناوە تاكو بڕیار لەسەر پوچەڵی فەلسەفەی مادیەت بدەن... سێ كەس لەو زانایانە ناوبانگیان پەیدا كردوە كە بریتین لە (ئارسەر ئەدنكتۆن) و (جیمس جینز) و فیزیاناسی میسری (دكتۆر محمد مستەفا مشرفە).

بەڕای ئەم زانایانە مادە لەگەردوندا بوونێكی دان پێدانراوی نیە، بەڵكو وزە جێگەی مادەی گرتۆتەوە.. ئنجا كاتێ زانست دەستەوسان بێ لە پەی بردن بەكونهی ئەنەرژی، ئەوا پێویستە لەسەرمان دەرگاكە بەكراوەیی بەجێ بهێڵین تاكو بەڕێگەیەكی‌تری جیاواز لە ڕێگەی زانستی بەو مەعریفەیە بگەین.[١٢]

لەڕاستی دا، ئەم ڕایە دروستە، ئەگەر مادیەتی سەدەی نۆزدەهەم لەبەر چاو بگرین، نەخاسمە ئەو مادیەتەی كە (بخنر) و دەوروبەرەكەی بانگەشەیان بۆ دەكرد... ئەو مادیەتە لەم سەدەیە دا پوچەڵ بۆتەوە، چونكە لەبنەڕەتەوە مادیەتێكی سادە و ساكارە و هیچ جیاوازی نیە لەمادیەتی هەر پیاوێكی سەر شەقام، كاتێ سەیری كەل و پەلی ناوماڵ و شمەكی نێو دوكانەكەی دەكات... وەلێ مادیەتی سەدەی بیستەم لەجۆرێكی دیكەیە.

مادیەت لەم سەدەیە دا گوێ نادات بە وەی گەردون لە وزە پێك هاتوە یاخود لەشتی تر.. بەڵكو هزری كراوەیە بۆ هەر ڕایەكی نوێ كە زانست بیهێنێتە كایەوە، ئینجا كەمتەرخەمیش ناكات لەوەی ڕویەكی تازە بۆ خۆی هەڵبژێرێت لەگەڵ هەر دۆزینەوەیەكی زانستی مەزن دا.[١٣]

هەموو ئەوەی مادیەتی نوێ لە (توێژەر)ی دەوێت، ئەوەیە بابەتی بێت لە بیركردنەوەی دا و ئەزمونی زانستی بۆ هەر كوێی برد بەرەو ئەوێ بڕوات، و دەمارگیر

نەبێت بۆ هیچ بیرۆکەیەکی پێشوەخت یان تیۆرێك هەر چەندە لە خودی خۆی دا تیۆرێکی جوانیش بێت.. لێرەوە ئەو قسەیە ڕاست دەردەچێ کە دەڵێت: مادیەتی نوێ، هیچ نیە جگە لەهەستی بابەتی بوون لە توێژەردا... تەنانەت ڕەنگە بگونجێت (مادیەت) و (بابەتی بوون) هەر یەك بخەینە جێگەی ئەویتر بەبێ جیاوازی، چونکە دوو زاراوەی هاو واتان و یەك مانایان لێ دەفامرێتەوە.

پوختە و کاکڵەی مەبەست ئەوەیە: مادیەت لەسەدەی بیستەمدا لەوە دەرچوو کە فەلسەفەیەکی سەقامگیربێت، بەڵکو بویە ڕێبازێکی زانستی... لەبەر ئەوەش بڕیار و حوکمەکانی لە بویەری دەرەکیەوە وەردەگرێت نەك لەو پێودانگە هزریانەوە کە ئەقڵ خوی پێیانەوە گرتووە.

## گەڕانەوەیەك بۆ نەخۆشینی منداڵێتی:

لەوانەیە لێرەدا گونجاو بێت، کەجارێکیتر بگەڕێمەوە بۆ ختوکەدانی ئەو کەسانەی پێشتر بەوە پێناسم کردن کە دووچاری نەخۆشینی منداڵێتی بوون... ئەوان پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە (مادیین) یاخود بابەتین لە بیرکردنەوەیاندا، لەکاتێکدا هیچ لەمادیەت نازانن جگە لەو وێنە سادە و گەمژانەی کە لەماوەیەکی دووری ڕابردوەوە پێی ڕاهاتوون.

کاتێ پەرتوکی (خوراق اللاشعور)م لەساڵی (١٩٥٢)دا بلاو کردەوە، مادی بوونی ئەو جۆرە کەسانەم تاقی کردەوە.. من لەدانانی ئەو پەرتوکە دا بەپێی توانای خۆم پێداگر بووم لەسەر پەیڕەو کردنی ڕێباز و ڕێچکەی زانستی... کەچی ئەو جۆرە کەسانە قوت بونەوە و گاڵتەیان پێ دەکرد و نکوڵیان لەو شتانە دەکرد کە تێیدا هاتبوو، بەبیانووی ئەوەی ئەو شتانە ئەقڵ ڕەت دەکەنەوە و پێچەوانەی چەمکە مادیەکانیشن.

جارێکیان لەگەڵ یەکێك لەو کەسانەدا کەوتمە گفت و گۆ، ئەو کەسەش ئێستاکە شەمچەیەکە لەشەمچە کانی فیکر لەعێراق دا، وتوێژەکەمان لەسەر ئەو هەست کردنە نائاساییە بوو کە توێژەران لەهەندێ کەسدا دۆزیویانەتەوە... برادەرەکەمان گوتی: ئەمە یەکێکە لەو شتە ئەستەمانەی کە ئەقڵ قبوڵی ناکات.. لەوکاتە دا بەردێکی بچکۆلەم

لەسەر زەوی هەلگرت و گوتم: ئەقڵ چۆن قبوڵی ئەوە دەكات كە بەردێكی ئاوها، وزەیەكی وا گەورەی تێدا بێت كە توانای هەبێ كەشتیەكی گەورە چەند جارێك بەدەوری زەوی دات ببزوێنێت؟

لەوانەیە زیادەڕەویم نەكردبێ ئەگەر بڵێم :هەندێك لە فێرخوازانمان وەكو (شەمەندەفەر) وان لەبیركردنەوەیاندا ناتوانن لەو سكەیە دەربچن كە لەبەر دەمیاندا دانراوە... هەندێ چەمكی زانستی‌یان لە رۆژگارەكانی قوتابێتی‌یاندا لەبەر كردوە، ئیدی وا گومان دەبەن كە هەموو نهێنی گەردونیان لەبەر دەستە.. نازانن چەمكە زانستی‌یەكان رۆژ بەرۆژ لەپێشكەوتنی یەكبینەدان.

## پاساوی قەڵاچۆكردنی ئەفسانە :

جۆرێكی‌تری خوێندەوارەكانمان دژایەتی ئەو بیرۆكانە دەكەن كە لەپەرتووكی (خوراق اللاشعور) دا هێناومن، پاساوی ئەوەش دێننەوە گوایە ئەو بیرۆكانە خورافە و (ئەفسانەگەرێتی) لەنێو خەڵك دا بڵاو دەكەنەوە و یارمەتی دەری بڵاوبونەوەی بیرۆكەگەلی (غەیبی)شن لەنێو خەڵكیدا.

لەڕاستی دا من ناكۆك نیم لەگەڵ ئەو كەسانەدا لەسەر پێویست بوونی قەڵاچۆكردنی ئەفسانە و بیرۆكە غەیبی‌یەكان، بەڵام ئەو پرسیارەی لەم ڕووەوە بەخەیاڵمدا دێت ئەمەیە: ئایا ڕاستە ئێمە لەمەسەلەی قەڵاچۆكردنی ئەفسانەدا بەڕادەیەك توندەڕەو بین ڕەوتی زانست و لێكۆڵینەوە بابەتیەكان بخەینە بەر لەمپەر؟ بەدەربڕینێكی‌تر: ئایا ڕەوایە دەرگای زانیاری دابخەین لەهەر گرفتێ كە لێكچونێكی هەیە لەگەڵ ئەو ئەفسانانەدا كە لەكۆن دا لەنێو خەڵكی دا باو بوون؟!

بەڕای من، ئەوانەی دژایەتی لێكۆڵینەوە لە دیاردە نائاساییە دەرونیەكان دەكەن، بەپاساوی قەڵاچۆكردنی ئەفسانە، ئەوانە بەشێوازێكی ناڕاستەوخۆ هانی ئەفسانە دەدەن و پشتگیری لێ دەكەن... گریمان ئێمە چوینە سەر ڕاگەی ئەوان و هەر كەس هەوڵی دا لەو ڕووەوە لێكۆڵینەوە بكات بە ئەفسانەگەرمان دایە قەڵەم، ئەو كاتە ئەنجام چی دەبێت؟!

بۆ نمونە، وا دەبێ یەکێك لەئێمە کارێك لەخەواندنی موگناتیسی دەبینێ و سەری لێ سوور دەمێنێ و سەرسامیەکی زۆر دای دەگرێت. ئەو دەیەوێت لێکدانەوەیەك بکات بۆ ئەو دیاردەیەی کە بەچاوی خۆی دیویەتی. جا ئەگەر ئێمە لێکدانەوەیەکی بابەتی پێنەدەین، ئەو ناچار دەبێ لەخۆیەوە لێکدانەوەیەك دروست بکات، لەوانەشە لەپێناوی ئەو لێکدانەوەیەدا پەنا بەرێتە بەر بیرۆکە غەیبیە کۆنەکان یاخود باوەڕکردن بە (جادوو) و رۆحەکان... بەمەش دەروازەکانی ئەفسانەی لەبەر دەستدا والآ دەبێت و بەو هۆیەشەوە لە چەمکەکانی شارستانێتی نوێ دوور دەکەوێتەوە.

**بەلای رۆژهەلات:**

لەدێرزەمانەوە رۆژهەلات ئالودە بووە بە بەلای جادووگەر و ئەستێرە ناس و چاوبەست کەرانەوە و، ئەم ئالودە بونەش تا ئێستاکە بەردەوامە... هەر کەس ئەمڕۆ بە کۆلانەکانی (بەغداد) دا بڕوات، لەم گۆشە یاخود لەو گۆشە دا ئەستێرەناس (بەخت گرەوە ـ وەرگێڕی کوردی) دەبینێ لەبەر دەستی خۆی دا تەلیسم و نوشتەی جۆراوجۆری داناوە، هەزارەکانیش دادەبارن بەسەری دا و پرسیاری لێ دەکەن بەختی چروکیان لەم دنیایە دا بۆ چ لایەك چوە، داوای لێدەکەن فریایان بکەوێ بەهەندێ یارمەتی لەجنۆکەوە. مەسەلەکەش تەنها لەسەر هەژارەکاندا کورت هەلناهێنرێ، بەلکو میر و دەولەمەندانێکی زۆر هەن، پەنا دەبەنە بەر جادوباز و ئەستێرەناسەکان و بڕواش بەقسەکانیان دەکەن... ئەستێرەناسەکانیش جاری وا هەیە هەندێ دیاردەی نائاسایی نیشان دەدەن، بەهۆی ئەوەی هەندێ بەهرەی تەنویمی یاخود بەهرەی دیکەیان هەیە... بەو جۆرەش هەوالیان بەناو خەلکی دا بلاو دەبێتەوە و لەگەل هەوالەکەش دا ئەفسانە بلاوە دەکات. ئاواش پارە و پول و کۆششێکی مرۆیی زۆر و زەوەند بەفیرۆ دەڕوات، لەو کاتەشدا دوور نیە قوربانیەکی زۆریشی لێ نەکەوێتەوە.

ئەوە سودی نیە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ قەلاچۆی ئەو ئەستێرەناسانە بکرێ.. چونکە گەر لێرە قەلاچۆیان بکەین لەو لا دەردەکەون.. بەڕاستی بازاڕێکی گەرم و بەرەواجیان هەیە لەنێو خەلکی دا. ئێمەش هیچ کاریگەریەك لەسەر خەلکی دانانێین

کاتێ ئامۆژگاریان دەکەین بەوەی (ژیر) بن و هەموو ئەو پڕوپاگاندانە بەدرۆ بخەنەوە کە ئەستێرەناسەکان باسی دەکەن... کە ئەو ئامۆژگاریەمان کردن، خەڵکی لەوەڵامماندا دەڵێن: "گوایە خۆشیان (ژیرن) و بەچاوی خۆشیان دیاردەی سەیریان لەئەستێرە گرتنەوە دیوە"!!.

بڕوام وایە، باشترین چارەسەر بۆ چارەکردنی ئەم دەردە کۆمەڵایەتیە، بریتییە لەوەی بیرۆکەی زانستی لەنێوخەڵکی دا بڵاو بکەینەوە، و بەو هۆیەوە هەوڵ بدەین ئەو دیاردە نائاساییانە لێك بدەینەوە کە ئەستێرەناسەکان پیشانی دەدەن، لێکدانەوەیەکی بابەتیانە.

چونکە هەندێ جار دیاردە نائاساییەکان، ڕاستەقینەن و، ئیتر لەو کاتەشدا ئەوە سودی نیە وەکو (وشترمر) سەری خۆمان بکەین بەژێر خۆڵدا... ئەوەتا (وشترمر) کاتێ ڕاوچی دەبینێ سەری خۆی لە نێو خۆڵدا بزر دەکات، ئەم ڕاوچییەکە نابینێ، بۆیە وا گومان دەبات ڕاوچییەکەش ئەم نابینێ (دەربڕینی وەرگێڕ).

لەخوارەوە بەدەق، قسەی یەکێك لەو عێراقیانە دەگوازمەوە کەلەساڵی ١٩٥٧ دا سەردانی وڵاتی (چینی میللی)ی کردوە، و ئاوها بۆمان دەگێڕێتەوە: "سەیرترین شتێ کە لە (کانتۆن) بینیمان ئەوە بوو کە ئاپۆرەی خەڵکی لەدەوری چەند جادوبازێك کۆببونەوە، واتە ئەو کەسانەی کە یاری (سوکە بزاوت) دەکەن، لەنێو یەکێك لەو کۆمەڵانە دا ڕاوەستاوین، بینیمان، کابرای جادوباز و هاوکارەکانی دەستەسڕێك دەدڕێنن و دواتر لەگیرفانی کەسێکیتر دا دەری دێننەوە، هێلکەیەك دەشکێنن و ئنجا چاکی دەکەنەوە.. تا کۆتایی ئەو یاریانەی کە بەڵگەن لەسەر بەهرەداریەکی باڵای چینییەکان... ئێمە سەرمان لەم نمایشە سوڕما... ئایا چۆن حکومەتی میللی ئەو یاریانە یاساغ ناکات؟ ئەم پرسیارەمان لەخۆمان دەکرد... هیچ وەڵامێکی ماقوڵی ئەو پرسیارەمان چنگ نەکەوت، تاکو سەردانی شاری (شەنگهای)مان کرد، لەوێ زانیمان کە خەواندنی موگناتیسی و یاریەکانی (سوکەبزاوت) لەو بابەتانەن کە لەگەڵ مۆزیك و سەما و نواندن و شتی دیکە دا بەمنداڵان دەخوێندرێن... ئەو کاتە لەنهێنی خوێندنی ئەو بابەتە بەمنداڵ تێگەشتین... ئەوان بۆیە ئەو بابەتە بەمنداڵ دەخوێنن، تاکو

منداڵان بەخۆیان تێبگەن کە ئەو دیاردە نائاساییانە پەیوەندیان بە (سوکەبزاوت)ەوە هەیە و هیچ فاکتەرێکی دەرەکی تیای دا ڕۆڵی نیە، نەرۆحەکان و نە شەیاتینەکان.... بەو جۆرە بڕوا بوون بەو مەسەلانە لەڕەگ و ڕیشەوە لەهزری منداڵاندا دەردەهێنن". [١٤]

## پەراوێزەكانی پاشكۆی دووەم:

١. بنواڕە: العلامة الحلي، كشف الحق و نهج الصدق، ل ٥ ـ ٦.

٢. پیاوێكی گەورە، لەپیاوە ئاینیەكان دەناسم كە لەبەغداد دەژیا، چەند ساڵێكە كۆچی دوایی كردوە.. ئەو پیاوە تاكو كۆتا رۆژی تەمەنی، بڕوای وابوو كە هەرگیز ناگونجێت زەوی خڕ بێت، هەمیشە دەیگوت: خەڵكینە چۆن دەبێ نكولی لە شتێ بكەین كە بەر هەستە... ئەی خەڵكینە؟!

٣. بنواڕە: حافظ وهبە، جزيرة العرب فى القرن العشرين، ل ٢٧٠ ـ ٢٧٣.

٤. ئەمەوێ ئەم هەلە بقۆزمەوە و بڵێم، من پێم باشە لە بریتی وشەی (تلفزیون) وشەی (تلفاز) بەكار بهێنرێت، چونكە ئەوی یەكەمیان قورسە لەسەر زمانی عەرەبی... لەڕویەكی تریشەوە، دەتوانین لەوی دووەمیان چاوگ و فرمان دروست بكەین، بۆ نمونە بڵێین (تلفز يتلفز تلفزە) جا ئایا ڕاوبۆچونی برادەرە نەحویەكانمان لەم بارەوە چیە؟ فتوامان بۆ بدەن پاداشتتان ون نابێ!

٥. بنواڕە: Tyrrell, Personality of man, P 266

٦. بنواڕە: آغا خان، مذكرات آخاغان، ل ٢٦، ١٠٦.

٧. بنواڕە: عبدالحميد محمد امين، الطاقة الذرية، ل١١.

٨. بنواڕە: Rhine, Reach of Mind, p 58

٩. بنواڕە: Jeans, Mysterious Universe, P93

١٠. بنواڕە: بوليتزير، المادية و المثالية في الفلسفة، ل٣٨.

١١. بنواڕە: سينل، الحاسة السادسة، ل١٤.

١٢. بنواڕە: محمد مصطفى مشرفة، النظرية النسبية الخاصة، ل ٥٠ ـ ٥١.

١٣. بنواڕە: بوليتزير، المادية و المثالية في الفلسفة، ل٤٤.

١٤. بنواڕە: حميد حمدي، عراقي في الصين الشعبية، ل ٢٠ ـ ٢١.

# پاشکۆی سێیەم:

## هەستی شەشەم

**دیاردە نامۆکانی ئاژەڵ:**

لێکۆڵەرەوان ،تێبینی کۆمەڵێ دیاردەی زۆر نامۆ وسەیریان لەجیهانی ئاژەڵاندا کردووە،کەناگرێت بەپێنج هەستە ناسراوەکە لێك بدرێنەوە٠٠٠٠ بۆنمونە (کۆتری نامەبەر)وەربگرە٠٠٠ وا زانراوە ئەم کۆترە گەر بخرێتە نێوسندوقێکی داخراو وماوەیەکی زۆر دوور و درێژ لەشاخ وداخ ودەریا دوور بخرێتەوە، کەبەر درا، دەگەڕێتەوە شوێنی یەکەم جاری٠

زاناکان لەسەدەی ڕابردوودا ئەو توانایەی کۆتریان بەوە لێك دەدایەوە گوایە "غەریزە" یە ٠٠ وەلێ ئەم لێکدانەوەیە ئەمڕۆکە جێگەی قبوڵ نیە ، چونکە دروست لەوە دەچێ کە یەکێ بەشتێ نادیار ، شتێکی نادیاری دیکە لێك بداتەوە٠٠٠ جا ئەگەر "غەریزە" نهێنی ئەو توانا نائاساییەبێت ، ئەی نهێنی خودی "غەریزە" چی یە؟

*** *** ***

شتێکی دیکە کەپەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە ، ئەو ڕووداوەیە کەبەسەر یەکێك لەزانایانی{مێروناس} دا هاتوە٠ ئەم زانایە ڕۆژێك (گەرا- سەرە مێکوتەی جۆرە زیندەوەرێکی دۆزیوەتەوە ) هەڵی گرت وبریەوە بۆ ماڵەوە و لە نێو سندوقێکی هاویشت و، سندوقەکەی لەژووری کتێبخانەکەی دا دانا٠٠٠ دوای ئەوە جارێکیان لەژووری نانخواردنەکەی دا دانیشتبوو،خزمەتکارەکەی هات وبەشڵەژاویەوە هەواڵی ئەوەی دایە کەژووری کتێبخانەکەی لێوان بووە لەو جۆرە مێروە گەورەیە٠٠٠

کاتێ زاناکە ئەڕوات تاکو بەچاوی خۆی ڕووداوەکەببینێت ، سەیر دەکات مێروەکەی خۆی گەشتۆتە قۆناغی پێگەشتن ،بۆیە ژمارەیەك لەنێرەی ئەو مێروە بەدەوری سندوقەکەدا گەرد وخولیانە٠٠ کاتێ زاناکە بینی مێروەکان لەجۆرێکی نامۆن بەو ناوچەیە، گەشتە ئەو دەرەنجامەی کەدەبێت لەجێگەیەکی زۆر دوورەوە هاتبن٠

زاناکە هەموو ئەو مێروانەی کۆکردەوە کەتازەکی هاتبوون ،ئەو شوێنانەی بڕین کە هەستی بۆنکردنی تێدایە، دواتر هەموویانی خستە تورەکەیەکەوە و، تورەکەکەشی هەلگرت و وبریە دارستانێ کەنزیکەی دوومیل لەماڵەکەیەوە دوور بوو... کەچی سەیری کرد هێشتر چەند کاتژمێرێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێ نەپەڕی بوو، دووبارە مێروەکان لەژووری کتێبخانەکەدا لەدەوری مێینەکە کۆبوونەوە. [١]

ئەم ئەزموونە ، دەلالەتێکی زانستی گەورەی هەیە، ئایا چ شتێ ڕێنمونی مێروەکانی کرد بۆ شوێنی مێینەکە؟... بێگومان مێروەکان پشتیان بەهەستی (بۆنکردن) یان (بینین) نەبەستبوو، ئەی ئایا پشتیا بەستوە بەیەکێکی تر لەپێنج هەستەکان ، یاخود بەهەستی شەشەم کە ئێمە نایزانین ؟؟.

**سەیرو سەمەرەی شەمشەمەکوێرە:**

یەکێ ترلەودیاردەسەیرانەی ،سەرنجی توێژەرانی بەلالای خۆی داڕاکێشاوە ،ئەو توانا گەورەو نائاساییەی شەمشەمەکوێرەیە بۆبینین لەتاریکیدا ...شەمشەمەکوێرە ،خەریکە بڵێین هەربەڕاستی کوێرە ،چونکە دووچاوی زۆربچکەڵەی هەیە ،هەرهورچۆنی بگری ئەودووچاوە سوود بەشەمشەمەکوێرە ناگەیەنن ...چونکە ناتوانێ لەڕووناکی ڕۆژدا هیچ شتێکیان پێ ببینێت .کەچی لەتاریکی شەودا زۆر بۆ بینین بەهێزن ،ئەوەتا دەتوانێ بەخێراییەکی زۆر گەورە بفڕێت بێئەوەی خۆی بکێشێت بەدیوارەکانی دەوروبەری یاخودبەپەلی درەختەکاندا .لەدوای توێژینەوەیەکی تێروتەسەل .زاناکان لەشەمشەمەکوێرەدا کۆئەندامێکی تایبەتیان دۆزیەوە کەلەهیچ ئاژەڵێکی تردا نیە .ڕوون بویەوە شەمشەمە بەو دەسگایە شتەکان نابینێت ،بەڵکو دەیان بیستێت... چونکە شەمشەمە دەنگ بە لەرەلەرێکی بەرز دەردەکات .. ئەو دەنگانەش بەر بەربەستەمادیەکانی دەورو بەری دەکەون و، بەربەستەکانیش دەنگەکە دەدەنەوە،وەك هەر دەنگێکی تر.. ئنجا شەمشەمە کوێرە ئەو دەنگە دووبارە بەدەسگا تایبەتەکەی خۆی وەردەگرێتەوە، بەو هۆیەشەوە زۆر بەوردی دەزانێت دووری بەربەستەکان لەخۆیەوە چەندە.. [٢]

نەخاسمە ئەگەر شەپۆلەکانی دەنگ بگۆڕن بە شەپۆلی بێ تەل. بۆیە لەکۆتاییدا زاناکان ئەوەی ویستیان دەستگیریان بوو ، بەوەش ئاژێر هاتەکایەوە!.

ئێمەدەزانین شەپۆلەکانی دەنگ، دووریەکی کورت وخێراییەکی زۆر کەمیان هەیە ، بەبەراورد لەگەڵ شەپۆلەکانی بێ تەل دا کەلەجۆری شەپۆلەکانی (کارۆموگناتیسی)یە.... جاکەواتە ئایا ئەگونجێت بۆ ئێمە، گریمانی ئەوە دابنێین کەسروشت دەستەو سانە لەبەرهەمهێنانی دەسگایە لەهەندی گیانەوەردا کەشەپۆلی(کارۆ موگناتیسی) بەکاربێنێ ، وەك چۆن لەشەمشەمەدادەسگایەکی دروست کردووە کەشەپۆلەکانی دەنگ بەکاردێنێ؟.

ئەوەڕاست نیە کەئێمە دەمارگیر بین بۆ پێنج هەستەکانمان ، بەجۆرێك بڕوای تەواومان هەبێت بەوەی (خودا) جگە لەوپێنج هەستە ، هەستی دیکەی وەدی نەهێناوە لەگیانداران یاخود لەمرۆڤدا.. چونکە بەو دەمارگیریە هیچ جیاواز نابین لەو(کرم)ەی ، کەهەستی بینینی نیە و واش گومان دەبات ئەو هەستە لەهیچکام لە زیندەوەراندا بوونی نیە.

**هەواڵێکی گرنگ:**

بەم دواییانە یەکێك لەگۆڤارە ئەمریکیەکان هەواڵێکی بڵاوکردەوە، بەڕای من گرنگی یەکی زۆری هەیەی بۆ ئەم بابەتەی کەباسی دەکەین . گۆڤارەکە دەڵێت:{ کۆمەڵەی کۆتری نامەبەر لەئەمریکا} لەم دواییانەدا (١٧٠٠) هەزارو حەوت سەد کۆتری هەڵدا ، بەڵام تەنها (٤٠) چل کۆتریان گەڕانەوە بۆ شوێنی دیاری کراوی خۆیان .. ئەمەش کاتێ بوو کەحکومەتی ئەمریکا خەریکی تاقی کردنەوەی ئەتۆمی نوێ بوو لەبیابانی (نیڤادا) ی وڵاتە یەکگرتووەکاندا ... یەکێك لە خاوەن کۆترەکان بەم بۆنەیەوە گوتی : ڕەنگە کۆترەکان بەچوار چێوەی تیشکە ئەتۆمیەکاندا ڕۆشتبن و ئەمەش وایکردبێ (غەریزەی گەڕانەوە) یان بزر کردبێ...[٢]

ئەگەر ئەم هەواڵەڕاست بێ . ئەوا دەتوانین بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە(کۆتری نامەبەر) لەنێو دەماخی دا ئەندامێکی هەیە دەتوانێت ئەو

شەپۆلە(كارۆموگناتیسی)یانە وەربگرێتەوە كەلەو جێگە یەوە ئاراستەی دەكرێت كەتیای دا پێگەشتووە٠٠ بۆیە كاتێ دەگەڕێتەوە ئەو جێگەیە، ئەوا بەشێوەیەك لەشێوەكان ڕێنمونی لەو شەپۆلانەوە وەردەگرێت ٠

وادیارە تەقینەوە ئەتۆمیەكان، كۆتردەشڵەژێنن و ڕێگیری دەكەن لەوەی ئەوشەپۆلەتایبەتیانە وەربگرێت كەلەگەڕانەوەدا پشتی پێ دەبەستێ...هەر ئەمەش وایكردووە ،دەستەوسانبێت لە ڕێنمونیوەرگرتن بۆگەڕانەوە بۆشوێنی یەكەمینی - وەك بینیمان ..بەهەرحاڵ ،،ئەمەگریمانێكە ونازانین چەندە لەگەڵ بویەر دا دەچەسپێت ،وەلێ دەتوانین پشتی پێ ببەستین ،،مادەم بەلگەیەنەبێ پێچەوانەی بێت٠٠ هەموو گریمانە زانستی یەكانیش ، بەڕاست سەیر دەكرێن تاكو لەبەرانبەریاندا بەلگەی پێچەوانەیان پەیدا دەبێت ٠٠

**بۆچونی سینڵ:**

لەبەشێكی ڕابردووی ئەم پەڕاوەدا باسمان لە مامۆستا(سینڵ) و هەندێ لەڕاو بۆ چونەكانی كردووە٠٠ بۆیە خراپ نیە لێرەشدا هەندێ لەو بۆچونانەی باس بكەین كەپەیوەندیان بەهەستی شەشەمەوە هەیە ٠

(سینڵ) بڕوای وایە ،مادەم گەردوون پڕو بارگاویە بەشەپۆلی (كارۆ موگناتیسی ) هەمەجۆر ، ئەوا ناڕەحەت نیە ، گریمانی بوونی دەسگایەك لەمێشكی ئاژەڵدا بكەین كەلەڕووی ئەرك و فرمانەكانیەوە لەئامێری ڕادیۆ بچێت وتوانای ئەوەی هەبێت هەندێ شەپۆلی پێ وەر بگرێت.

(سینڵ) سەرنجی خۆی چڕدەكاتەوە لەسەر ئەو (نیتكە) بچكۆلەیەی كەلە دەماخی ئاژەڵدا هەیە وزانایان ناویان ناوە(تەنۆلكەی سنەو بەری)٠٠٠ ئەو تەنۆلكە بچكۆلەیە تائێستاكە زانایان هیچ فەرمانێكیان بۆی نەدیتوە٠٠٠ سینڵ بڕوای وایە ئەو تەنۆلكەیە دەسگای هەستی شەشەمە لەزیندەوەراندا٠

ئنجا ئەو شێوەیەی كە(تەنۆلكەی سنەوبەری) بەهۆیەوە دەتوانێت جۆرە شەپۆلێكی دیاریكراو وەربگرێت ٠ بەجۆرێكە كەئەو ئەندامە ، خانەكانی خۆی كەتایبەتن بۆ ئەم

مەبەستە ، دەخاتە بارێكەوە كەلەڕووی لەرەلەرەوە گونجاوبێت لەگەڵ لەرەلەرە خوازراوەكەدا٠٠٠ بەوجۆرەش خۆی دەساچێنێ لەگەڵ ئەو شەپۆلانەدا ، وەك چۆن ئامێری ڕادیۆ خۆی دەساچێنێ لەگەڵ یەكێك لەئێستگەكاندا٠(٤)

**دەماخی ئادەمیزاد :**

ئەوەسەلمێنراوە كە(تەنۆلكەی سنەوبەری ) لەدەماخی مرۆڤیش دا هەیە، بەڵام زۆر بچوكە٠٠٠ لەنێرینەی مرۆڤدا بچوكترە وەك لە مێینە٠ هەروەها لەمرۆڤی پێگەیشتوودا بچكۆلەترە وەك لە منداڵدا٠

(سینڵ) دەڵێت: مێشكی مرۆڤ تەرخانكراوە بۆ بیر كردنەوە، لەبەر ئەوە بەكارهێنانی تەنۆلكەی سنەوبەری فەرامۆش كردووە٠ ئەمەش یانی مرۆڤ وارا هاتووە خۆی سەرقاڵ بكات بە گرفتەكانی ڕۆژانەیەوە وبیریان لێ بكاتەوە ونەخشەیان بۆ دابرێژێ و سێ و دوویان بكات ( دەربڕینی وەرگێڕ) ٠٠٠ ئیدی بوارێك بەدی ناكات تاكو لێیەوە گوێ بگرێت بۆ ئاماژەكانی (هەستی شەشەم) كەتەنۆلكەی سنەوبەری هەستی پێ دەكات ٠

وەلێ ئاژەڵ لەم ڕووەوە جیاوازە لەمرۆڤ ٠٠ ئاژەڵ نەئەزانێت بیر كردنەوە چییە و نە خۆیشی پێوە سەرقاڵ ئەكات ، بەوپێ یەش دەتوانێت هەستی شەشەمی بەكاربێنێت ، وڕاستەوخۆ پەی بە پێداویستی یەكانی ژیانی خۆی بەرێت بەبێ دوودڵی٠ لە بەر ئەوەشە دەبینین تەنۆلكەی سنەوبەری لەئاژەڵدا گەورەترە وەك لە مرۆڤدا٠٠ تاچەندە ئاژەڵەكە لەپلەكانی پێشكەوتندا خاوتر بێت ، ئەوەندەش قەبارەی تەنۆلكەی سنەوبەری تیایدا گەورەتر دەبێت ٠ئەمەش بەوما نایەنایەت كە(هەستی شەشەم )هیچ ئاسەوارێكی لەمرۆڤ دانیە.لەڕستیدا هەندێ جاری واهەیە ،سەرباری ئەوەی كەزۆر لاوازە .بەڵام كاردەكا تە سەرمرۆڤ ..ئێمەهەندێكمان لەودیاردەسەیرانە ئاماژە پێدا لەبەشەكانی ڕابردودا،گا تێ با سمان لەهەواڵدانەكانی خەون ودیاردە نا ئاسا ییەكانی خەواندن كرد...بینیمان چۆن ئەو هەستە لەمرۆڤ دابەدەوردەكەوێ ،لەوكاتانەدا كە(ئاوەزی وشیار )بێئاگادەبێت و،ویست خامۆش وكپ دەبێت .

وادیارە پێچەوانە بونەوەیەك هەیەلەنێوان هێزی بیرکردنەوەو هێزی (هەستی شەشەم) لەمرۆڤ دا٠ ٠ئەوەتا چەندە بیرکردنەوە توند ترو سەخت تربێت ، ئەوەندە ئامادەگی ئەو بۆ کاریگەر بوون بە ئاماژەکانی ئەو هەستە کەمتر دەبێت٠٠ ڕەنگە هەر ئەمەش وای کردبێ ، ژن گومانڕەواتربێ لەپیاو لەهەندی لەو مەسەلانەدا کەپێویستیان بەبیرکردنەوە نیە٠٠٠ ژن لەبەر ئەوەی زۆر لەماڵەوە دەمێنێتەوە وکەمتر پەیوەستە بەگرفتەکانی ژیانەوە، وای لێهاتووە زیاتر پشت بە هەستی شەشەمی دەبەستێ وەك لەپیاو ٠ [٥]

بەڕای (سینڵ) هەستی شەشەم کاریگەریەکی ئاشکرای لەژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکاندا هەیە،ئەوانەی ئێستاش لەسەر سروشتی زگماکی دەژین ٠٠ ئەوانە ڕانەهاتوون لەسەر بیرکردنەوەی چڕ ،بەوجۆرەی شارستانیەکان لەسەری ڕاهاتوون، لەبەر ئەوەش لەبرا شارستانیەکانیان بەتوانا ترن لەوەبەر هێنانی هەستی شەشەم دا ٠

## نمونە گەلێ ڕیز پەڕی مرۆیی:

هەرچۆن بێ، هەنێ جار لەنێو شارستانیەکانیش دا ، کەسانێك دەردەکەون کەهەستی شەشەمیان بەهێزە ، و دەشتوانن بەجۆرێك ئەو هەستەیان وەبەرهەم بێنن کەجێ ی سەرسوڕمانە٠ یەکێك لەوانە پیاوێ بوو کەلەسەدەی (هەژدە) دا دەژیا، ناوی (سویدنبرگ) بوو، ئەم پیاوە بەهەستی شەشەمی ناوبانگێکی زۆر بەر فراوانی بەدەست هێنا بوو ٠٠ شیاوی باسە ئەو پیاوەلەشاری (گۆتەنبەرگ) دەژیا ، هەمان ئەو شارەی کەفەیلەسوفی ناسراوی ئەڵمانی (کانت) ی لێ دەژیا٠٠ ئەو بوارە ڕەخسا بۆ (کانت) تاکو لەوپیاوە بکۆڵێتەوە و هەندێ لەکردەوە نائاساییەکانی ئەو پیاوە لە یەکێك لەپەڕتوکەکانیدا تۆمار بکات ٠

(کانت) دەڵێت: {"سویدنبرگ" ڕۆژێ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوەو ڕوخساری ترسی لێ نیشتووە ٠٠ لەوێ وە ڕای گەیاند کەئاگرێکی گەورە لە "ستۆکهۆڵم" کەوتۆتەوە وخەریکە ماڵەکەی ئەمیش دەسوتێنێ لەو شارەدا، سویدنبرگ لەشاری ستۆکهۆڵم خانوویەکی دەبێت ، پاش ماوەیەکی کەم سویدنبرگ

ڕایگەیاند کەخانوەکەی بێ وەی بووە و ئاگرەکەش چەند مەترێ لەدووری ماڵەکەی ئەمەوە کوژێنراوەتەوە. ئەم هەواڵدانەی " سویدنبرگ " بوویە جێگەی سەرسوڕمانی خەڵکی شاری "گۆتەنبەرگ" ، چونکە "ستۆکهۆڵم" نزیکەی سێ سەد میل لەو شارەوە دوورە ، لەو ڕۆژگاردشدا هۆکارێ نەبوو بۆ گواستنەوەی هەواڵ لەنێوان ئەو دووشارەدا ، جگە لەوەی کەرێبوار و( ساعی یەکان ) دەیان هێنا}..

جا کەوایە چی وای کرد لە"سویدنبرگ " کەهەواڵی کەوتنەوەی ئاگرەکە بزانێت ، لەکاتێکدا ئەو ماوە زۆرە لەو شارەوە دوور بووە ؟ .تۆ بڵێی لەسەریدا ئامێری تەلەفزیۆنی هەبوبێ ؟.

(کانت) دەڵێت: {دەستەڵاتداری شاری "گۆتەنبەرگ" کەهەواڵەکەی بیست ناچار بوو"سویدنبرگ" بانگ بکات بۆ لێکۆڵینەوە.. کەچی پاش دوو ڕۆژ تەتەرێ لە"ستۆکهۆڵم "ەوە هات و ، ئەو هەواڵەی پشت ڕاست کردەوە کە" سویدنبرگ" ڕای گەیاندبوو، پشت ڕاست کردنەوەیەکی تەواوەتی .[٦]

**پیاوێکی تر:-**

پیاوێکی تریش بەناوی"لدوگ کهن " ناوبانگی بەهۆی (هەستی شەشەم) یەوە پەیدا کرد.. لەساڵی (١٩٢٥ز) دا ئەم پیاوەهێنرایە (ئەنستیتۆی فەلسەفی لەپاریس) و کۆمەڵێ ئازمایشی زانستی لەسەر کرا .. یەکێك لەو کەسانەی لەتاقی کردنەوەکاندا بەشدار بوون ، زانای ناسراو " شارل ریشیە" بوو ، کەلەو کاتەدا مامۆستای "فەسلەجە" بوو لە کۆلیژی "پزیشکی" زانکۆی "پاریس" دا ... وا لەخوارەوە تێکستی گەواهی دانێکی "ریشیە" لە دوای یەکێك لەتاقی کردنەوەکان دەخەمە بەردەستی خوێنەر ...

"ریشیە" دەڵێت:{ کە ئامادەی دانیشتنە کەبووم، لەگەڵ کەسانێکی زۆری تردا لە نمایشگای فەلسەفی ، هێشتر گومانم زۆر بوو لەڕاستی بانگەشەکانی پیاوەکە . ڕەنگە ئەوەش وابکات گەواهی دانەکەم ئەرزشێکی هەبێت .. کابرا داوای لێکردم دوو ڕستە هەریەکیان لەنێو کاغەزێکدا بنوسم ، ئەوەبوو دووڕستەم نووسی ، لە کاتێکدا من لە

لایەكی نوسینگە كەمەوە بووم و ئەو لە لایەكی تردا بوو، هەریەك لەو دووكاغەزە هەشت جار نوالّەم كردن و یەكیانم خستە نێو مشتی ڕاستمەوە و ئەوی دیكەیانم خستە نێو مشتی چەپمەوە ٠٠ ڕێگەم نەدا كابراكە دەستیشی لێ بدات ٠٠ كەچی نیو چركە بەدوو دلّی ڕاوەستاو دواتر بە دەق پێی گوتم كەچیم لەو دوو كاغەزەدا نوسیوە!!. ئینجا بۆ جاری دووەم تاقیم كردەوە ، ڕۆشتمە ژورێكی ترو بەتەنها لێی دانیشتم ، چوار برگە نوسینم لەسەر چوار كاغەزی جودا جودا نووسی ، یەك لەكاغەزەكانم خستەژێر پەرتوكێ و یەكێكی تریانم سوتاند و دووانەكەی تریشیان ،یەكێكیانم خستە نێو مشتی ڕاستم وئەوی تریانم خستە نێو مشتی چەپمەوە٠٠٠ ئینجا كابرام بانگ كردوو دەست بەجێ پێی گوتم كەچیم لەسێ كاغەزەكەدا نووسی بوو ٠٠ وەلێ نەی توانی پێم بلّێ كە چیم لە كاغەزە سوتاوەكە دا نووسی بوو ، دوای ئەوە نەبێ كەسێ چارەكی (٤\٣) ی چركەیەك وورد بیری كردەوە، دوای ئەوە بەڕاستی پێمی گووت كەلەنێو كاغەزە سوتاوەكەشدا چیم نووسی بوو}!! ٠ [٧]

### ئاژێری مرۆیی :-

لەسالّی (١٩٥١ز) داو لەیەكێك لەگۆڤارە میسریەكاندا ڕاپۆرتێكم لەبارەی پیاوێكەوە كەناوی " توجانز" بوو ، خوێندەوە، ڕاپۆرتەكە بەوێنەش پشت ڕاست كرا بوویەوە٠٠ ئەو پیاوەلەسەر شانۆكانی "قاهیرە" دەركەوتبوو بەجۆرێكی سەیر دەیتوانی بیرو ئەندێشەی تەماشا كەرانی بخوێنێتەوە٠٠ گۆڤارەكە ئەو پیاوەی ناونابوو " ئاژێری مرۆیی" و دەیشی گوت ، گوایە هەستی شەشەمی هەیە ٠٠٠

" توجانز " باسی ئەوە دەگێڕێتەوە كەچۆن بۆ یەكەم جار لە خۆیدا هەستی شەشەمی دۆزیوەتەوە٠٠ دەلّێت: لەكاتی جەنگە جیهانی یەكەمدا دوو گوللە بەرسەری كەوتوون ، بەو هۆیەوە براوەتە نەخۆشخانەو نزیكەی بیست ڕۆژ بەبێ هۆشی ماوەتەوە٠٠ كاتێكیش لەبێ هۆشیەكەی وەئاگادێتەوە، هەوالّی ئەوەی داوە كەئەو بریندارەی لەتەنیشتی یەوە كەوتووەلە ماوەی دوو ڕۆژی تردا دەمرێت ٠٠ ئەوە بوو هەر بەڕاستی پێشبینی یەكەی "توجانز" هاتە دی و ، دواتریش چەندین پێشبینی دیكەی

هاتۆتە دی ٠ سالی (١٩٢١) توجانز لەگەڵ هەندێ هاوڕێی دا دەچنە گوند ، وەلێ هەر ئەوەندەی بەلای کێلگەیەکی " پەمــــوو " دا تێ پەڕین دەست بەجێ " توجانز" لەهۆش خۆی چوو ٠٠ دواتر ڕوون بوویەوە کەئەو کێلگەیە چاوگێکی کۆنی نەوت بووە٠٠ بۆ جارێکی تر" توجانز " دەچێتەوە بۆ لادێ و بەنزیك یەکێك لەکێلگە نەوتینەکاندا تێ دەپەڕێت و هەمدیسان لەهۆشی خۆی دەچێت٠٠ دوای پشکنینی لەیەکێك لە ئەنستیتۆکانی تیشك دا دەرکەوت کەتیشك دانەوەکانی جەستەی زۆر بەهێزترە لەو تیشك دانەوەی لەلەشی کەسانی ئاسایی ترەوە دەردەچێت ٠٠٠ بۆیە دەکەوێتەژێرکاریگەری شەپۆلی کانزا شاردراوەکانی ژێرزەویەوە بەتایبەت شەپۆلەکانی " نەوت" ٠

تواناکانی "توجانز" تەنها لەو بوارەدا کورت هەڵناهێنرێ ، بەڵکو ئەو دەتوانێت تێبگات لەو خەیاڵ و ئەندێشانەی بەمێشکی کەسێکدا دێت کەلە نزیکیەوە بێت ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە بەزمانێکیش بدوێت کە" توجانز" لێی تێ نەگات ، هەروەها" توجانز" گەر دەست بدات لە لەشی هەر نەخۆشێکەوە دەزانێت نەخۆشینەکەی چی یە!! ، چونکە لەو کاتەدا هەست بەهەمان ئەو ئازارەدەکات کەنەخۆشەکە هەستی پێ دەکات ٠ جگە لەوەش لەوانەیە نائاساترین دیاردەی " توجانز" ئەوەبێت کەدەتوانێت لە قەرەباڵغ ترین شەقامدا بەچاو بەستراوی ئۆتۆمۆبیل لێ بخوڕێت ٠٠٠ جارێکیان بەچاو بەستراوی بەشەقامەکانی شاری " جەزائیر" دا ئۆتۆمۆبیلی لێ دەخوڕی ، ئەوەبوو دوچاری بێ هۆش بوونێکی قورس هات ، بۆیە پزیشکەکان فەرمانیان پێدا کەجارێکی تر ئەو تاقی کردنەوەیە دووبارە نەکاتەوە نەکا تووشی کارەساتێ ببێ کەسەرەنجامەکەی ناخۆش بێت} ٠ [٨]

**بەسەرهاتێکی هاوشێوە:-**

نایشارمەوە لەخوێنەر ، کاتێ چیرۆکەکەی (توجانز ) م خوێندەوە ، وام گومان دەبرد کەدروستکراوی زیادەڕەویەکانی ڕۆژنامەگەریە٠٠٠ ئێمە دەزانین کە هەندێ جار ڕۆژنامە وگۆڤارەکان زیادەڕەوی دەکەن لە گواستنەوەی هەواڵەکاندا ٠٠٠٠ وەلێ بەم

دواییانە لەسەر چاوەیەکی متمانەپێ کراوەوە بەسەر هاتێکی هاوشێوەی ئەوەی (توجانز) م خوێندەوەو ، وای لێکردم کەچیرۆکی یەکەم (بەسەر هاتەکەی توجانز) بەهەندێ کەمەوە لەهەندێ ڕوویەوە وەڕاست بگێرم.

چیرۆکی دووەم ، کۆمەڵەی توێژینەوە دەرونیەکان لەبەریتانیا دەیگێڕێتەوە و، دوای ئەوەی لەڕاستی و دروستی بەسەرهاتەکە دڵنیا بووەلەنێو تۆمارەکانی خۆیدا نوسیویەتیەوە.

پوختەی چیرۆکەکەش ئاوایە: پیاوێکی هیندی کەناوی ( گودا بوکس ) ە، هاتۆتە بەریتانیا وبەنێو شەقامە قەرەباڵغەکاندا بەچاو بەستراوی پاسکیلەکەی لێ دەخوڕێت... یەکێك لەپزیشکەکانی شاری ( مانچستەر ) ویستویەتی خۆی ئەو کابرایە تاقی بکاتەوە، هەویرێکی تایبەتی هێناوخستیە سەر چاوی ، هەویرەکە لەتوانایدا بوو بەتەواوی ڕوناکی لەچاوەکانی بەربەست بکات ، ئینجا بەپارچە پەڕۆیەکی ئەستور چاوی داپێچا، وپێی گوت : { خۆشەویستەکەم ! ئێستاکە تۆ دەتوانیت بەئارەزووی خۆت بەسەر پاسکیلەکەتەوە پیاسە بکەیت لەشەقامەکانی شارەکەتدا، بەڵام ئەگەر من لەجێ ی تۆدا بوایەم سەد جار دەسڵەمیمەوە بەر لەوەی ئەو سەرە ڕۆییە مەترسی دارە دەست پێ بکەم} !.. پیاوەکە هەستایەوە سواری پاسکیلەکەی بوو ، بەشەقامە قەرەباڵغەکاندا لێی دەخوڕی وەك ئەوەی چاوەکانی کراوە بن ، ڕێبوارەکان لەو کابرایە زۆر سەرسام بوون، ئۆتۆمۆبیلەکان یەك بەوی تریاندا دەکێشا لە بەر بەزەیی هاتنەوە یان بەوکابرایەدا کەمردنێکی راستەقینە چاوەڕوانی دەکرد .. وەلێ کابراکە خۆی لەو پەڕی ڕادەی ئارامی ودڵنیایی دا بوو .

### نهێنی یەکە چییە؟:

دەگونجێت ئەو توانا نائاساییەی کەلە (گودا بوکس) یان لە( توجانز ) دا یان لە هەرکەسێکی تریش دا بینیمان بەوەی لێك بدەینەوە کە جۆرێکە لەهەستی شەشەم .. وەلێ ئەوەی لێکدانەوەی بەلامانەوە نارەحەتە ، ئەوەیە کە بۆچی (هەستی شەشەم) لەو کەسانەدا دەرکەوتووە و لەکەسانی تردا بەو جۆرە ڕوونە دەرنەکەوتووە ؟ .

هەندێك لەتوێژەران لەوەڵامی ئەو پرسیارە دا دەڵێن: ئەو جۆرە کەسانە ئامادەباشیەکی تایبەتیان هەیە بۆ ( خەواندنی خودی) واتە دەتوانن بە خۆیان ،خۆیان بخەوێنن ، بەوەش بزاوتی بیرکردنەوەی خۆیان ڕادەوەستێنن ، ڕێگە خۆش دەکەن بۆ (هەستی شەشەم) تاکو بەبێ تەشویش کاری خۆی بکات ٠٠ لەسەر وی ئەوەشەوە ، لەوانەیە ئەو جۆرە کەسانە پشکێکی زۆرتریان لەهەستی شەشەم بەر کەوتبێ بەبەراورد لەگەڵ کەسانی تردا٠

وادەردەکەوێت مامۆستا( سینڵ ) یش هەمان ڕێچکەی هەیە لە لێکدانەوەی ئەو مەسەلەیەدا ٠٠٠ (سینڵ) کیژێك دەناسێت کەهەستێکی شەشەمی بەهێزی هەیە،بەدرێژایی هەشت ساڵ تاقی کردنەوەی لەسەر ئەو کیژە کرد ٠٠ (سینڵ) دەڵێت : جاری واهەیە کیژەکە لەسەرەتای ئەزمونەکەوە مێشکی سەرقاڵی شتێك دەبێت ، لەبەر ئەوە ناتوانێت تاقی کردنەوەکە ئەنجام بدات ٠٠٠ بۆیە پێی دەڵێت : کەمێك ئارام بگرە تاکو بیرو هۆشم خاڵی دەکەمەوە ٠٠ دوای ئەوە ىبیر وهۆشی ساف دەکات وئامادەی دەکات ، دەڵێت: ئێستاکە من ئامادەم ، ئیدی تاقی کردنەوەکە ئەنجام دەدات وسەرکەوتنی تێدا بەدەست دەهێنێ ٠٠٠ ( سینڵ ) بڕوای وایە هەندێ لەو کەسانەی بەناوبانگن بەدۆزینەوەی شتە نادیارەکان لەڕێ ی سەرنجدان لە ئاو یان گۆیەکی بلوری یان دلۆپێ مرەکەب یان فنجانەوە٠٠٠ پێی وایە ئەو کەسانە ئەو ئامرازانە بەکاردێنن بۆ ڕاوەستاندنی بزافی بیرکردنەوە لەمێشکی خۆیاندا٠٠٠ بەوەش یارمەتنی هەستی شەشەمی خۆیان دەدەن بۆ کارکردن ٠٠ هەموو ئەو ئامرازانەش کۆنن ولەگەڵ سەرهەڵدانی مێژوودا یان بەر لەمێژووش سەریان هەڵداوە ، نیشانەی ئەمەش ئەوەیە کەمیسریە کۆنەکان هەموو ئەو ئامرازانەیان بەکار هێناوە ، هەر لەوەشەوە گرۆهی (بەخت گرەوەکان) سەریان هەڵدا٠٠ جگە لەوەش ئەو بەردە پیرۆزەی کەلە زرێی قەشەکانی جولەکەدا هەبوو، بۆهەمان مەبەست بەکاریان دەهێنا، قەشەکە دوای ئەوەی سەرنجێکی زۆری لەبەردەکە دەدا ، شتی سەیری دەگووت ٠٠ [٩]

**ڕەخنەیەکی دروست:-**

لەوانەیە ڕەخنەگرێك ، ڕەخنە بگرێت وبلێت: ئەگەر ئەوە بسەلمێنین کە هەندێ کەس دەتوانن لەڕێی هەستی شەشەمیانەوە پەی بەدیاردە شاردراوە و نادیارە کان بەرن ، دەی کەواتە بۆچی ناتوانن بەو هەستەیان کانزا بەنرخەکانی ژێر زەوی بدۆزنەوە و بەوەش ببنە خاوەنی سامانێکی زۆر؟٠

بەڕاستی ئەم ڕەخنەیە لەجێی خۆیدایە و دروستە ٠٠٠ یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی بەریتانیاش ، کاتێ دەنگوباسی ئەوەی بیستبووکە هەندێ کەس لە بەریتانیا کرداری سەر سوڕ هێنەر ونائاسایی دەکەن ٠ ویستی بە کردەوە تەحەدای ئەو جۆرە کەسانە بکات ٠٠٠ بۆیە لەڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردەوە وڕای گەیاندبوو کەلەنێو زەرفێکدا کاغەزێکی هەزار جونەیهی داناوە ، بەڵێنی دا ئەو کاغەزە هەزار جونەیهیە دەکاتە دیاری وخەڵات بۆ هەرکەسێك بتوانێت بەهۆی هەستی شەشەمیەوە ژمارەی کاغەزەکە بزانێت، ئەم کابرایە ماوەیەکی دورو درێژ لە ڕۆژنامەکاندا ئاگاداری بڵاو کردەوە لەسەر ئەو خەڵاتە بێ ئەوەی کەسێك بێت بۆلای وژمارەکەی بزانێت وخەڵاتەکە وەرگرێت ٠ لەئاکامدا تاقی کردنەوەکە شکستی هێنا ٠٠ نوسەرەکان لەبەریتانیادا ئەم ڕوداوەیان کردە بەڵگە بۆ بەدرۆ خستنەوەی هەستی شەشەم لەمرۆڤدا٠

مامۆستا (سینێ ) سەبارەت بەو مەسەلەیە ئاوادەدوێت:هیوا بوون بەدەست کەوتنی کاغەزێك کە بەهاکەی هەزار( جونەیه) بێت ، پێداگری وبیرکردنەوەی بەئەنقەست لە نێو ناخی ئەو کەسەی کە خاوەنی هەستی شەشەمە دروست دەکات ، ئەم بیرکردنەوەیەش ڕێ دەگرێت لەساف کردنی مێشك و دەبێتە لەمپەر لەڕێی ئەوەدا کەسەکە هزری خۆی ئاراستەی دۆزینەوەی ژمارەی کاغەزەکە بکات٠٠٠ ئەمەش یانی : هەرچەندە مرۆڤ شتێکی بوێت وگەرەکی بێت بەدەستی بهێنێت ، ئەوا ناتوانێت بەڕێك وپێکی هەستی شەشەمی بەکار بێنێت٠٠٠ هەستی شەشەم بەهەرەیەکی نائەنقەستەو لە نەستەوە هەڵدەقوڵێ٠٠٠ بۆیە تاچەندە ( ئاوەزی وشیار ) سەرقاڵ بێت بەمەسەلەیەکەوە ، ئەوە دەبێتە بەربەست وڕێ دەگرێت لەوەی نەست کار بکات ٠٠٠

بۆیە لەوانەیە ئەو قسەیە ڕاست بێ کەدەڵێ : ویست و خواستی ئەنقەست و، نەست ، دووشتی پێچەوانەی یەکترن ، تاچەندە یەکێکیان لاوازبێت بەو ئەندازەیە ئەوی دیکەیان بەهێز دەبێت.[10]

بەهەرحاڵ ، ئەمە مەسەلەیەکە تێبینی دەکەین لەهەموو ئەو بەهرە نائەنقەستانەدا کەپەیوەستن بە نەستەوە، جیاوازی نیە لەنێوان هەستی شەشەم و شتی دیکەدا... بۆ نمونە ئەگەر بتەوێ چاوت بە پیاوێکی گەورەی دەوڵەت بکەوێ ، تاچەندە پێداگربیت لەسەر ئەوەی بتوانیت کاری لێ بکەیت ، بەو ئەندازەیە هەست بەدەستەوسانی دەکەیت و بێ ئومێد دەبیت .. چونکە ئەو پێدا گریەت هەموو ئەو گوتە وجمو جوڵە نائەنقەستانەت لێ بەر بەست دەکات کەلە ناختەوە هەڵدەقوڵێن ... وەلێ گەر لەسەر باری ئاساییت چاوت بەکابرا گەورە دەوڵەتیەکە بکەوێت ، بەبێ زۆر لەخۆ کردن ، ئەوا زۆر جار لەم حاڵەتەدا بەتواناتر خۆت دەبینیتەوە بۆ کار تێکردنی ، وەك لەباری پێشوو.

دەشگونجێ هەمان شت بڵێین دەربارەی ووتاربێژێ کەوتارێکی سەر پێی دەدات یاخود ، فەرماندەیەك کەڕوبەڕوی هەڵوێستێکی سەربازی لەناکاو دەبێتەوە ، یاخود نەشتەرگەرێك کەکردەوەیەکی نەشتەرگەری وورد ئەنجام دەدات... هەموو ئەوانە و کەسانی تریش ، لەکاتی ڕوبەڕوبونەوەی ساتەسەختەکاندا بەو ئەندازەیە سەرکەوتن بەدەست دێنن کەلەسەر بەدیهیەت و ئاسایی بوونی خۆیان بڕۆن بەڕێوە و، بەئاراستەی داخوازیەکانی نەست دا بچن بەبێ زۆر لەخۆ کردن و پێداگری( دەربڕینی وەرگێڕ ) .

لێرەوە هۆکاری ئەو شکست خواردنە دەزانین کەزۆر جار دووچاری ئەو کەسانە دەبێت کەزۆر لەخۆکەرن ... ئەوکەسانە ئاماژەکانی ئاوەزی ناوەوەیان فەرامۆش دەکەن و سەرقاڵ دەبن بەکۆمەڵێ مەسەلەی دەستکردی بەئەنقەستەوە ، واش دەزانن ئەوە کلیلی سەرکەوتنە ، کەلەڕاستی دا کلیلی شکست هێنان وبێ ئومێدیە .

**بەخت و هەستی شەشەم:-**

زۆر كەس لەڕۆڵەكانی ئەم نەوەیە ، بڕوایان وایە بەخت ئەفسانەیە و سەركەوتنی مرۆڤیش لەژیاندا بەئەندازەی ئەو هەوڵ وكۆشش و بیركردنەوە چڕە دەبێت كەلەو پێناوەدا دەیخاتە كار...

لەواقعدا ئەم ڕایە ڕاست ودروستە لەسنورە بەرفراوانەكەیدا ، لەڕوی مەبدەئیەوە ئێمە هیچ ڕەخنەیەكمان لێی نیە ... بەلآم ئەوەندە هەیە ، كەبەهەرەیەكی نەستی هەیە ،ڕەنگە لەهەندێ كەسدا بەدەر بكەوێت و ببێتە كارای یاریدەدەر بۆسەركەوتنیان ،شان بەشانی ئەو هۆكارەكانی دیكەی سەركەوتن یان نە... جائەو بەهرەیە ڕەنگە ناوی بنێین شانس (بەخت ) یاخود هەرناوێكی تر... لەم ڕووەوە پەند لەناوەكەدا نیە .

خەلكی بازاڕیی لای ئێمە بەشێوازێكی سادەو ساكار پەی یان بەم ڕاستی یە بردووە ، ئەوان بەهۆی ئەزموونە زۆرەكانیانەوە ئەوڕاستی یەیان بۆ دەركەوتووە، كەهەوڵ و بیركردنەوە بەتەنها بەس نین بۆ سەركەوتن لەبازرگانی دا.

زۆر جاری وادەبێ ، بازرگانێ ڕەنج دەكێشێ لەكارەكەی داو بیركردنەوەی خۆی بەكاردەهێنێ، كەچی لەبازرگانیەكەیدائەوەندەی دەست ناكەوێكومسایی بژێویەكی كەم وكورتی بدات ..بەلآم لەولاوە بازگانێكی ترقازانج لەدوای قازانجی دەست دەكەوێت ،بێ ئەوەی هیچ پێداگریەكی هەبێت لەسەر هەولدان یان بیركردنەوە. هەرئەمەشە وای لەخەلكە بازاریەكەی لای ئێمە كردووەكەبێژن : ( ئەو كەسەی هاتە بازاڕ پێویستە عەقلی بخاتە سەر ڕەفەیەك ) واتە عەقلی لەسەر ڕەفەیەك دانێت ونەی هێنێت بۆ بازاڕ( دەربڕینی وەرگێڕ ).

لەم ڕووەوە ئەولێكدانەوەیەم زیاتر بەلاوە پەسەندە كەهەستی شەشەم لەسەركەوتنی بازرگانی وشتی تریشدا كاریگەری وئاسەواری زۆری هەیە .

كاتێ سەرنجی هەلس وكەوتی بازرگانی سەركەوتوو لەبازاڕدا دەدەین، دەبینین ئارامەو، كاتێكیش پێشوازی مەعمیلەكانی دەكات هیچ جۆرە نیشانەیەكی پێداگیری وئالۆزی فیكری پێوە نابینرێت .. جاری واهەیە( دەلآلەكە) دێتەلای ومامەلەیەكی

گەورەی بازرگانی دەخاتە بەردەم ،بابای بازرگان بەووشەی (بەڵێ) یان (نەخێر) یکی سادەو بێ زۆر لەخۆکردن وەڵامی دەداتەوە ، وەك ئەوەی بیەوێت کوپێك ئاو بخواتەوە.

لەوانەیە بەهەڵەدا نەچووبم گەر بڵێم : ئەوبازرگانە لەکاتی کارەکەی دا نیگا لەهەستی شەشەمی وەردەگرێت ، تەنانەت لەوانەیە بەهۆی (هەستیشەشەمیەوە — وەرگێڕ) تاوتوێی مامەڵەکەبکات ولێکی بداتەوە کە چ بەرز بوونەوە ودابەزینێکی نرخ بەخۆوە دەبینێ.. دەکرێت بڵێین: تاچەندە هێور وئارام بێت لەکاتی کارکردندا ئەوەندە بەتوانادەبێت لە وەبەر هێنانی هەستی شەشەمی دا.

وەلێ بازرگانی دۆڕاو ، هەمیشە سەرقاڵە بە کارو بارە ئاگاییە کانیەوە و بەوەش دەیەوێت قازانج دەست خۆی بخات و پێداگیریش دەبێ لەسەری .. ئینجا ئەو پێداگیریە لەهزری دا دەبێتە گرێ یەك و ئاماژەکانی هەستی شەشەمی لێ بەربەست دەکات .

ئەمەی گوتمان بەتەنها تایبەت نیە بەسەر کەوتن وشکست هێنان لەبواری بازرگانی دا ، بەڵکو لەهەموو بوارەکانی ژیاندا هەر وایە .. دەتوانین نمونەی ڕاستی ئەو قسەیە تەنانەت لەلای حەماڵ وپینەدۆز وچەقۆ تیژ کەرێکیش ببینین.. جاری واهەیە یەکێك لەو کەسانە لەهاوەڵەکانی کەمتر ڕۆزیی هەیە ،لەکاتێکدا لەڕواڵەت داهیچی لەوان کە متر نیە.. بۆیەدەست دەکاتە پرسیار کردن لەهۆی کەمیڕۆزیەکەی ...کەبێ ئومێدیش دەبێ ،پێیخۆشە ئۆباڵی کەمی ڕۆزیەکەی بداتەپاڵ قەدەرە، لەکاتێکدا قەدەر لێی بەریە.

**هەستی حەوتەم :**

دوای ئەو باس و خواسەی کەکردمان لەسەربونی (هەستی شەشەم) لەمرۆڤ داوڕادەی کاریگەری ئەوهەستەش لەژیاندا ،دەمانەوێسەرنجی خوێنەر ڕابکێشین .بۆلای بۆچونێك ،کەبەم دواییانە توێژەرەکان ڕویان تێکردوە،ئەویش ئەگەر ێبونی (هەستیحەوتەمین )ە لەمرۆڤ دا...لێکۆڵەرەوەکان نایانەوێت ئەو هەستە نوێ یەناو بنێت (هەستی حەوتەم) ..ئێمەین بەزیادەڕەوی ئەخوازین وای ناو زەردبکەین ..بەڵکو ئەوان ناوێکی تایبەتی بەسەردا دەبڕن کەبریتی یەلە(psychometry) ئێمەچوزانین لەوانەیە

ئەمیش بەشێك بێت لە هەستی شەشەم ،یاخود ڕویەکی تایبەت بێ لەڕووە هەمەچەشنەکانی ٠

هەرچۆن بێ،ئەم هەستەزۆر سەیرە ،خوێنەر یەکەمجار دەیبیستێت ناڕەحەتە بڕوای پێبکات ٠٠بۆئەوەی خوێنەر بەهەندێ لەتایبەتمەندیەکانی ئەوهەستە ئاشنا بێت ،والەخوارەوە پوختەی ڕوداوو چیرۆکێکی ڕاستەقینە دەگوا زمەوە٠٠ئەوچیرۆکە دوور و درێژە و وردەکاری ولق وپۆپی زۆری هەیە ، بەهەموو وردەکاریەکانیشی یەوە لەتۆمارەکانی (کۆمەڵەی پزیشکی ) دا لەمەکسیك وهەردووکۆمەڵەی (توێژینەوە دەرونیەکان ) لەوڵاتەیەکگرتوەکان وبەریتانیاش داپارێزراوە ٠

**پوختەی چیرۆکەکە :**

لەساڵی (١٩٢١) دا،خانمێکی مەکسیکی کەناوی «سنیورەماریاریس » دەبێ دووچاری خەوزڕان دەبێ٠٠ئەم خانمە سەربەبنەماڵەیەکی بەڕێزی مەکسیکە وباوکی فەرمانداری یەکێك لەکەرتەکان « مقاطعات » بووەلەوێندەر ٠٠لەورۆژگارەدا پزیشکێکی ئەڵمانی بەناو بانگ بەناوی «دکتۆرباجن ستیخر » ەوە لە پایتەختی مەکسیکدا دەبێت ٠ ژنەکە دەچێتە لای ئەو دکتۆرە ٠٠ پزیشکەکە لەچارەسەر کردنی دا پەنا دەباتە بەر خەواندنی موگناتیسی٠٠ لەئەنجامی خەواندنی دا بۆی دەرکەوت کە ئەو ئافرەتە توانایەکی دەروونی نائاسایی هەیە ٠٠ چونکە هەر ئەوەندەی شتێك بخەیتە بەری دەستی ، یەکسەر دەست دەکات بەباسکردنی وورده کاریەکانی مێژووی شتەکە و سەرچاوەکەی و خەسڵەتەکانی خاوەنەکەی ٠ ئەم هەواڵە سەرسامیەکی زۆری خستە ڕیزی لێکۆڵەرەوە کانەوە٠٠ لەئەنجامدا( دکتور واڵتر فرانکلین برنس ) سەرۆکی (کۆمەڵەی توێژینەوە دەرونیەکانی ئەمریکا ) هات بۆ لای ژنەکە تاکو لەنزیکەوە لەو توانا سەیرەی بکۆڵێتەوە ٠

یەکێك لەو تاقی کردنەوانەی کەلەسەر ئەو ژنە پەیڕەو کرا ، ئەوە بوو پارچەیەك (مەڕ مەڕ ) یان هێنا کەلەیەکێك لەشانۆکانی ( ڕۆمانی ) یکۆندا دەرهێنرابوو کەتائێستەش ئاسەوارەکانیان لە (ڕۆما) دا ماوە ٠٠ ئەوە بوو ( ماریا ) خان دەستی

کردە باسکردنی تەختی شانۆکە، وەك ئەوەی لەکونجێکەوە سەیری بکات ٠٠ ئەمە لەکاتێکدا ئەو خانمە پێشتر هیچی لەبارەی ئەو (مەڕ مەڕ) ەوە نەدەزانی ٠

لەتاقی کردنەوەیەکی تردا ( زەبر جەد ) یکیان بۆ هێنا کەلەبنی یەکێك لە دەریاکانەوە هێنرابوو ٠٠ کەچی (ماریا خان ) دەستی کردە وەسف کردنی ئەو ماسی یانەی کەبەسەر ( زەبرجەد) ەکەداهات وچۆیان کردووە لەو کاتەدا کەلەبنکی دەریاچەکەدا بوو٠

تاقی کردنەوەی هەرە گەورەی ئەو ژنە ، ئەو ڕۆژە دەستی پێکرد کە ( دکتۆر باجس ستیخر ) نامەیەکی لەهاوڕێ کەیەوە لە (ژاپۆن ) ەوە بەدەست گەیشت ٠٠ نامەکە کاغەزێکی مۆر کراوی تێدا بوو ، دەیان گووت لەنێو بتلێکدا لەئاوەکانی زەریادا دۆزراوەتەوە ٠٠ کەژنەکە کاغەزەکەی بەدەستەوەگرت ، دەستی کردە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی کەبەسەر ئەو کاغەزەدا هاتوون وەبۆچی خراوەتە نێو زەریا کەشەوە لەنێو بتلێکدا٠٠ ماریا خان گووتی: نامەکە پیاوێك نووسیویەتی کەلەنێو پاپۆڕێکدا بووە لەو زەریایەدا،کاتێ خەریك بوو پاپۆڕەکە نقوم بێت ئەو نامەی نووسیوە ٠٠٠ نیشانەی ناسینەوەی ئەو پیاوەی نامەکەشی نووسیوە ،ئەوەیە کە جێگە برینێکی کۆن بەسەر برۆی چەپیەوە بووە٠٠٠ کاتێ ئەوپیاوە هەستی بەمەترسی کردووە و بینیویەتی سەرنشینەکانی کەشتیەکە گەوتوونەتە هاوار کردن و پەنایان بردۆتە بەر پشتوێنەکانی ڕزگار بوون ٠٠٠ دەستی بردووە لەنێو تیانووسی یادەوەریەکانی دا کاغەزێکی بچوکی دەرهێناوە و نامەیەکی تێدا نووسیوە بۆ ژنەکەی ، بەم جۆرە: ( پاپۆڕەکە نقوم دەبێت ، خواحافیز خۆشەویستەکەم لویزا ٠٠٠ مەهێڵە منداڵەکانم منیان لەبیر بچێت ٠٠ داوا لەخوا دەکەم چاودێری منیش وتۆش بکات ٠٠٠ ئیتر خواحافیز – هاوسەری خۆت ڕاموون ) ئینجا پیاوەکە کاغەزەکەی خستۆتە نێو بتلێکەوەو سەری ناوەتەوە و فڕێی داوەتە نێو ئاوەکەوە ٠

لەدوای لێکۆڵینەوەو بەدوادا چوون ، دەرکەوت ئەو پیاوە ( ی ماریاخان باسی کردووە- وەرگێڕ) خەڵکی شاری (هاڤانا ) ی وولاتی ( کوبا ) بووە ،و لەساڵی (١٩١٦)ی زاینی دا سواری پاپۆڕی ( لوزیتانیا ) بووە ، واتە ئەو پاپۆڕەی کە ئەڵمانیەکان

لەشەڕی جیهانی یەکەم دا نقومیان کرد٠٠٠ لێکۆڵەرەوان دواتر توانیان کەس وکاری ئەو پیاوە لە (هاڤانا ) دا بدۆزنەوە ، ژنەکەی هات و کاغەزەکەی خوێندەوە ، ئەوەی پشت ڕاست کردەوە کە ئەو خەتە ، خەتی مێردەکەیەتی ، و هەر بەڕاستیش مێردەکەی لەگەڵ پاپۆڕی ( لوزیتا نیا ) دا نقوم بووە ، و ئاسەواری زامێکی کۆنیش بەسەر برۆی چەپیەوە بووە٠

**لێکۆڵینەوەیەکی دانیشگایی :**

لێکۆڵەرەوەکان بۆیان دەرکەوت کە( خاتوو ماریا ) تاکە کەس نیە کەئەو توانا سەیرەی هەبێ ٠ بەڵکو کەسانێکی تر هەن ، کەم تا زۆرێك لەو دەچن لەبوونی ئەو توانایەدا٠٠٠ ( زانکۆی لەندەن ) هەوڵی دا بەشێوەیەگی بابەتیانە لەو کەسانە بکۆڵێتەوە ٠٠٠ لەم میانەیەدا لەساڵی(١٩٤٠) دا ، توێژەرێك کەناوی ( هتنجر) بوو ، توێژینەوەیەکی لەسەر ئەو بابەتە نووسی کەنهێنی گەلێ زۆری تێدا بوو ٠٠٠ [١١]

(هتنجر) هەوڵی دابوو ، زۆر ترین زانیاری بەدەست هاتوو لەسەر ئەو بابەتە بئاخنێتە نێو توێژینەوە کەیەوە ، بەخشتەی ئاماری و هێڵی بەیانی جۆراو جۆر یش توێژینەوەگەیی دەوڵەمەند کردبوو ٠٠٠ لەکۆتایی توێژینەوەکەی دا گەشتبووە ئەو ئەنجامەی کە ئەو توانا نائاساییە ڕاستیەکەو بوونی هەیە، بەڵام ناتوانێ لێك دانەوەی بۆ بکات ٠

**بۆچونی ئەسپۆرۆن :**

( ئەسپۆرۆن ) باسی شاگردێکی خۆیمان بۆ دەکات کەئەو توانا یەی هەبووە ، و ئەسپۆرۆن بەخۆی تاقی کردنەوەی لەسەر کردووە ٠٠٠ جارێك وا ڕێ دەکەوێ کەئەم لە (ئوستورالیا ) دەبێت و نامەی لە(گێل فرێند) ێکی خۆیەوە بۆ دێ ٠٠ شاگردەکەی نامەکە وەردەگرێ کەلەناو زەرفێکدا دەبێ ، بێ ئەوەی زەرفەکە بکاتەوە وبیخوێنێتەوە ، گوتی : نوسەری نامەکە ژنێکە ، پرچێکی سپی هەیە، نەرم ونیان وخۆش ڕووە ٠٠٠ ئینجا شاگردەکە دەستی کردە باسکردنی ئەو ژنە کەلەکاتی نوسینی

نامەكەدا چی كردووە و ، كێ لەنزیكی یەوە وەستاوە دواتر باسی خەسڵەتە دەروونی و ڕەوشتی یەكانیشی كرد .

(ئەسپۆرۆن) ڕای بەلای ئەوە دایە كە توانای شاگردەكە زیاتر دەچێتە خانەی ئاڵوگۆڕكردنی بیرۆكە لەنێوان دوو مێشك دا.. بەڕای ئەسپۆرن شاگردەكە ئەو زانیاریانەی لە نامەكەمەوە دەرنەهێناوە، بەڵكو لەهزری خودی ئەسپۆرۆنەوە وەریگرتوون.[١٢]

ئاشكرایە ئەمەش مەسەلەیەكی ئاسانە بۆ زۆرێك لەو شاگردانەی كە دەكەونە ژێر كاریگەری خەواندنی ئاراستەكراوەوە.

مامۆستا (تیرل)یش زیاتر پشتگیری ئەم لێكدانەوەیە دەكات... ئەو كاتێ باسی چیرۆكەكەی (سنیورە ماریا)ی بۆ كرا، گوتی: لەوانەیە سنیورە ئەو زانیاریانەی لە هزری ئەو خەوێنەرەوە وەرگرتبێ كە لەنزیكی یەوە ڕاوەستاوە، نەك لەو شتەوە كە لەكاتی خەواندنەكەدا دەخرێنە دەستی یەوە... تیرل لەم ڕووەوە باس لەوە دەكات كە (سنیورە ماریا) بەشێوازێكی دەروونی بەدەمەوە چونی هەبووە لەگەڵ خەوێنەرەكەی دا، جا هەر شتێ خەوێنەرەكە هەستی پێ بكات، بەجۆرێك لە جۆرەكان دەگوازرایەوە بۆ ئەویش، و ئەمیش هەستی پێ دەكرد..[١٣]

**لێكدانەوەیەكی تر:**

یەكێكی تر لەو كەسانەی هەوڵیان داوە ئەو توانا دەرونیە سەیرە لێك بدەنەوە نوسەرێكی ئینگلیزیە بەناوی (هۆبرت ستانسبری)... ئەم نوسەرە ئەفسەرێكی دەریاوانی خانەنشین كراوو پسپۆڕ بوە لە لێكۆڵینەوەی بێتەل و كارەبایی بەتایبەت لە بابەت جموجوڵی كەشتیە جەنگیەكاندا (دەربڕینی وەرگێڕ)... جگە لەوە پەرتوكێكی داناوە بناوی ناوە (لەمەڕ گەڕان بەدوی ڕاستی‌دا) ... لەڕوی بەهای زانستیەوە پەرتوكێكی خراپ نیە.

ئەو نوسەرە دەڵێت: مادە بێگیانەكان لە هەندێ بارودۆخی دیاریكراودا دەتوانن هەندێ كاریگەری كارەبایی وەربگرن، لە بیركردنەوەی ئەو كەسەوە كە دەستیان لێ

دەدات یاخود لێیان نزیك دەکەوێتەوە، هەر ئەو ماودە بێگیانانە دەتوانن ئەو کاریگەریانەی وەریان گرتوە بگوازنەوە بۆ مێشکی کەسێکیتر... بەم پێودانگە مادە بێگیانەکان وەکو باتری زەخیرەگردنیان لێ دێ، جارێ کارەبا وەردەگرن و جارێکیش خاڵی دەکەنەوە...[١٤]

(سینلێ)یش پشتگیری ئەم ڕایە دەکات کە (ستانسبری) هێناویەتی... (سینلێ) لە هەندێ لەو ئازمایشانەوە کە لەم ڕووەوە ئەنجامی داون بۆی دەرکەوتووە، کە ئەو کیژەی تاقی کردنەوەکانی لەسەر ئەنجام دەدا، هەندێ جار دەستەوسان دەبوو لەوەی بزانێ لە کاغەزەکەی دا چی دروست کردوە، دوای ئەوە نەبێ کە بەسینلی دەگوت "ڕێگەم بدە با ئەو قەڵەمە بەدەستەوە بگرم کە بەکارت هێناوە". هەر کە پێنووسەکەی دەگرت بەدەستیەوە، بەڕوونی وێنەکە لە مێشکی دا دەردەکەوت. جا کەواتە ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ ئایا ئەوە ناگەیەنێت کە قەڵەمەکە هەندێ لەو شتانەی زەخیرە کردوە کە بەمێشکی سینلێدا هاتوون؟ و دواتر گواستوینەوە بۆ مێشکی کیژەکە، پاش ئەوەی گرتویەتی بەدەستەوە؟...[١٥] وا دەردەکەوێ لەهەندێ ڕووەوە ئەم لێکدانەوەیە پەسند بێت.. تەنانەت ڕەنگە کەم تا زۆرێك توێژینەوە فیزیاییە نوێکان پشتگیری لێ بکەن... بۆ نمونە ئەگەر پارچەیەکی بچوك لە مادەی (فۆسفۆڕ) بێنین، ماوەیەك لەبەردەم گڵۆپێکی زۆر تیشك دار دای بنێین،دواتر بینێیەجێگە یەکی تاریکەوە ،لە جێگە تاریکەکەدا ئەو ڕوناکیە دەردەداتەوە کە زەخیرەی کردبوو.. کەواتە ئایا ناگونجێت هەموو مادەکانی گەردون هاوشێوەی (فۆسفۆڕ) بن و شەپۆلە کارۆمۆگناتیسیەکان وەربگرن و دواتر یش بیدە نەوە، بەجۆرێکی نەبینراو؟

ئێمە دەزانین، شەپۆلە( کارۆ موگناتیسیەکان) فرەچەشن و جۆراوجۆرن، وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا، شەپۆلەکانی ڕوناکی هیچ نین جگە لەبەشێکی کەمی ئەو شەپۆلانە.

دەی کەواتە چ بەربەستێك هەیە لەبەر دەم ئەوە دا کە هەندێ مادە، شەپۆلی نەبینراو زەخیرە بکەن لەخۆیاندا، بەهەمان ئەو شێوەیەی کە مادەی (فۆسفۆڕ) شەپۆلەکانی ڕوناکی زەخیرە دەکات؟ هەروەها چ بەربەستێکیش هەیە لەبەردەم ئەوەدا

کە هەندێ لەو کەسانەی خاوەنی هەستی نا ئاسایین دەرك بەو شەپۆلە شاردراوانە بکەن، وەك چۆن ئێمەومانان دەرك بە شەپۆلەکانی ڕوناکی دەکەین؟ بەجۆرێك گەر یەکێکیان پارچەیەك لەو مادەیە بەدەستەوە بگرێ مێشکی بکەوێتە بەر کاریگەری ئەو شەپۆلانەی کە لەمادەوە دەردەچن، بەو جۆرەش ئەو ڕوداوانە ببینێ کە بە سەر مادەکە دا هاتون؟

**ئاواتێکی زانایان:**

یەکێ لەو ئاواتانەی ،هەندێ جار بەمێشکی زانایاندا دێ، ئەوەیە کە ڕۆژێ بێت، زانست بتوانێ ئامێرێك دابهێنێ کە بە هۆیەوە بتوانین ڕوداوەکانی مێژوو ببینین و دەنگیان ببیسین.. دیارە بەدەست هێنانی ئەم ئاواتە دوورە و لەوانەشە ئەستەم بێت، بەڵام هەر چۆن بێت دەگونجێت بیری لێ بکرێتەوە لەبەر ڕۆشنایی توێژینەوە زانستی‌یە نوێ‌یەکاندا.

بۆ نمونە، دەگونجێت هەموو ئەو شەپۆل و لەرەلەرانەی کە لە ڕودواوەکانی مێژووەوە پەیدا بوون، ئێستاکە لە نێوانماندا بن، و لەنێو بۆشایی چوار دەورماندا بە یەکتردا بدەن، لەوانەیشە هەندێکیان لەو ئاسەوارە دێرینانەدا زەخیرەکرابن کە ئەو ڕوداوانەیان بەسەردا هاتووە.

گومان لەوەدا نیە کە شەپۆلەکان بە تێپەڕینی کات لاواز دەبن. بەڵام بە تەواوی لە ناو ناچن.. جا کە ئامێرەکانمان لەم بارەی ئێستایاندا ناتوانن شەپۆلە زۆر لاوازەکان بدۆزنەوە، ئەوا نابێت ئیتر ئومێدبڕاو ببین لە توانای زانست لەوەی ئامێری وردتر لەم ئامێرانە دابهێنێ، کە بتوانین بەهۆیانەوە شەپۆلەکانی سەردەمانی ڕابردوو بدۆزینەوە.

بۆ ڕون کردنەوەی مەبەست با ئەو ڕوناکیە بە نمونە وەربگرین کە لە ئەستێرە دوورەکانەوە دەمانگاتێ... ئەو ڕوناکیە دوای ئەوە دەگاتە ئێمە کە لە بۆشایی‌دا چەندین ملیۆن ساڵ دەبڕێ.. دەگونجێ ئەستێرەیەك بەر لە چەند ملیۆن ساڵێك تەقیبێتەوە و لەناو چوبێت، کەچی ئێمە ئێستا کەسەیری دەکەین دەبینین لە شوێنی خۆی دا ماوەتەوە.. هۆی ئەمەش لەوەدایە کە ڕوناکی تەقینەوەکەی هێشتر نەگەیشتۆتە لای ئێمە، لەوانەیە ئێمە پێویستمان بە ملیۆنەها ساڵی‌تر هەبێ تاکو بزانین چ

تەقینەوەیەكی بەسەر داهاتوە، بۆیە لە ماوەی ئەو ملیۆنەها ساڵەدا كە سەیری ئەستێرەكە دەكەین وا گومان دەبەین لە شوێنی خۆیدا بەرقەرارە و ماوەتەوە.

ئەمەش یانی، ئەستێرەكە بوەتە ڕوداوێك لە ڕوداوە زۆر كۆنەكانی ڕابردوو، بەڵام ئێمە وا دەزانین ڕوداوێكە لە ڕوداوەكانی حاڵی حازر، بە دەربڕینێكی دیكە: ئێمە كاتێ لەشەوێكی ساماڵ دا سەیری ئەستێرەكان دەكەین، مێژووی ئاسمان بە چاو دەبینین!

گەر وا بێ، ئایا ئەستەمە، ڕۆژێك لە ڕۆژان زانایان بتوانن ئامێرێك دابهێنن كە بتوانین مێژووی زەوی و ئەو ڕوداوانەی ڕابردووی پێ ببینین كە لەزەوی دا ڕویانداوە؟

من دەخوازم تا ئەو ڕۆژە بمێنم كە بتوانم لە بازێڕ ئامێرێكی ئاوها بكڕم.. تا بەهۆی ئەو ئامێرەوە بچمە مستنصریە و لەوێندەر غەزالی ببینم كە وتارێكی فەلسەفی بۆ قوتابیەكانی دەدات، یاخود بچم بۆ تاقی كیسرا و لەوێ "ئەنەوشیروان" ببینم كە لەسەر تەختەكەی دانیشتوە و یاساوڵ و جەللادەكانی دەوریان گرتوە.

**لەكۆشكەكانی فرسای دا:**

حەز ناكەم كۆتایی بەم بەشە بێنم، بەر لەوەی ئەو چیرۆكە سەیرە بگوازمەوە كە لە خانمان (موبرلی) و (گوردین) ڕوی دابوو... هەر دوو خانمەكە پێشتر مامۆستا بوون لە زانكۆی ئۆكسفۆرد ... پوختەی چیرۆكەكە ئاوهایە: ئەو دوو خانمە لەساڵی (١٩٠١) دا سەردانی (پاریس)یان كردوە و چونەتە سەردانی (فرسای).. كاتێ بەنێو كۆشكە مێژووییەكانی فەرسای دا گەڕاون هەستیان بە دڵتەنگی و خەمۆكی كردوە، دوای ماوەیەكی كەم وایان كەوتۆتە بەر چاو كە (ماری ئەنتوانێت) هاوسەری لوسیی شانزدەهەم بە بەرگە كلاسیكیەكانیەوە لەسەر لێواری یەكێك لە كۆشكەكاندا دانیشتوە... دواتر هەندێ دیمەنی مێژووییان هاتۆتە بەر چاو وەك ئەوەی خۆیان لەو سەردەمە دا بژین.. ئەم ڕوداوە نەك جارێك بەڵكو چەند جارێك بەسەر ئەو دوو خانمە دا هاتوە.

دوای ئەوەش خاتوو (گوردین) بەتەنها دوو جار سەردانی (فرسا)ی كردوە، ڕوداوی تری بەسەر دا هاتوە، هەندێ كەسایەتی سەدەی هەژدەیەمی دیوە و گفت و گۆی لەگەڵ

دا کردون.. لە کۆتا سەردانی دا ئەو خاتونە دەڵێت: دیمەنەکەی بەجۆرێ هاتۆتە بەرچاو وەك ئەوەی لەرزینێکی لەناکاوی کورت خایەنی توش بێت، وەك چۆن پەردەی سەر شانۆ دەلەرێتەوە ئاوها لەرزیوە.

لەساڵی (١٩١٤)دا، سێ پیاو هاتن بۆ چاوپێکەوتنی ئەو دوو خاتونە، هەر سێ پیاوەکە بەر لەشەش ساڵ لە نزیکی فرسای دا نیشتەجێ بوون و سەرپەرشتی ڕێکخستنی باخچەکانی فرسای‌یان کردوە، هەر سێ پیاوەکە ئەوەیان پشت ڕاست کردەوە کە ئەوانیش دیمەنی وەك ئەوەی هەر دوو خانمەکە دیویانە، ئەمانیش دیویانە و لە سەریشی ڕاهاتوون، تاکو مێشکیانی نارەحەت و ماندوو کردوە و شوێنەکەیان بەجێ هێشتوە، چونکە ئەوان ویستویانە لەسەدەی بیستەم دا بژین نەك لەسەدەی هەژدەدا...[١٦]

کاتێ ئەو چیرۆکە دەخەمە بەر دەستی خوێنەر، خۆیشم هەست بەسەر سامی دەکەم لە ئاقاری دا... ڕەنگە بەرەنجامی وەهمێ بێ کە زاڵ بوە بەسەر هەر دوو خاتونە بەڕێزەکەدا ،کاتێ بە نێو کۆشکەکانی فرسای دا گەڕاون... بەڵام پێ دەچێ شتێکی‌تریش بێ (نەك وەهم ـ وەرگێڕ).. لەوانەیە ئەو دوو خاتونە هەستێکی نائاساییان هەبێ بەڕادەیەك بتوانێ شەپۆلەکانی مێژوو لەو کۆشکانەوە وەرگرێت... بەڵام من لێرەدا دەپرسم: بۆچی ئەو هەستە لەو دوو خاتونەدا لەکاتی گەڕانیاندا بەنێو کۆشکەکانی فەرسای دا دەرکەوت و لەجێگەیەکی‌تر دا لێیان دەرنەکەوت؟

لێرەدا دووبارە دەگەڕێمەوە سەر ئەو قسەیەی کە پێشتر گوتومە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە نابێ لەم مەسەلانەدا بڕیاری یەکلاکەرەوە و کۆتایی بدەین.. چوزانین زانست لەداهاتوو دا چ ڕایەکی دیکە دێنێتە کایەوە سەبارەت بەو مەسەلەیە؟!

## پەراوێزەکانی پاشکۆی سێیەم:

١ـ بنوارە: سینل، الحاسة السادسة، ص ٢١.

٢ـ بنوارە: عبدالسلام فهمي، البساط السحرى، ص ٨ ـ ٩.

٣ـ بنوارە: Life Magazin, July 22, 1975

٤ـ بنوارە: سینل، الحاسة السادسة، ص٢١.

٥ـ تکا دەکەم لە ئافرەتان لەم قسەیەم پەست و دڕدۆنگ و تورە نەبن، چونکە ئێمە هیوادارین ژن بێتە گۆڕەپانی ژیان و بەشداری بکات لە بنیات نانی شارستانیەت دا بەهەمان ئەو ڕادەیەی پیاو بەشداری تێدا دەکات... لەو کاتەش دا ئیدی هیچ جیاوازیەك نامێنێ لەنێوان ئەو و پیاودا، بگۆ: ئینشائەللا.

٦ـ بنوارە: Sulivan, Outine of Modern Belief, Vol. II, P 908

٧ـ بنوارە: المقتطف، رسائل الارواح، ص ٢٢ ـ ٢٣.

٨ـ بنوارە: مجلة آخر ساعة، ژمارەی ڕۆژی ١٩٥١/١١/٢١.

٩ـ بنوارە: سینل، الحاسه السادسه، ص٥٧ ـ ٥٨.

١٠ـ بنوارە: علي الوردي، خوراق اللاشعور، ج ا ل ٢٠١.

١١ـ بنوارە: Heltihger, The Ultra prceptive Faculty

١٢ـ بنوارە: Obsom, The Super Physical

١٣ـ بنوارە: Tkisall, Personality of Man, p 187

١٤ـ بنوارە: Trosbury, In Quest of Truth, p 187

١٥ـ بنوارە: سینل، الحاسة السادسة، ص١١٢.

١٦ـ بنوارە: Joad, Guide To Modern Thought, p 175-177

## پاشکۆی چوارم

### نەست چییە؟:

خوێنەر لەوانەیە تێبینی ئەوە بکات، کە من لەم کتێبەدا زۆر جار باسم لە نەست یا خود ئاوەزی ناوەکی کردوە[1]... لە پەرتوکە پێشوەکانیشم دا هەر وام کردوە، وام داناوە کە نەست لەگرنگترین فاکتەرەکانی دروستکردن و پێکهێنانی کەسێتی مرۆڤە... ئەم قسەیەش بە لای زۆرێك لە نووسەر و ڕەخنەگرانەوە لە عێراق دا مایەی خۆشحاڵی نەبووە.. بەڵکو هەندێکیان جارێ تۆمەتباریان کردوم بە زیادەڕەوی و جارێکی‌تر بە ئەفسانەچێتی... بۆیە لێرەدا وای بەباش دەزانم کە لەسەر چی‌یەتی (ماهیەت)ی نەست باس و خواس بکەم بەو جۆرەی خۆم دەیبینم.

### ئایا "نەست" بابەتێکی میتافیزیکی‌یە؟

هەندێ لە ڕەخنەگران لە عێراق دا، وایان پێ‌خۆشە کە نەست ناوزەد بکەن بەوەی بابەتێکی میتافیزیکی‌یە... پتر لەجارێکیش بەو ناوزەد کردنە ڕوبەڕوم بونەتەوە.. سەبارەت بەو ڕەخنەگرانە هیچم نیە بیژمی، ئەوەندە نەبێت کە ئەوانە دەست لە ڕەخنە وەردەدەن بێ ئەوەی زانیاری تەواویان هەبێت لەو بابەتەدا کە ڕەخنەی تێدا دەگرن ... جاری وا هەیە دەبینین هەندێ ڕستە و دەربڕین لێرە و لەوێ دەهێنن و دەیکەنە شمشێری دەستیان و هەر کات بیانەوێت ئەو شمشێرە دادەهێننەوە، جا بەدبەختی بۆ ئەو کەسەی لە ڕێگەیاندا ڕادەوەستێت، چونکە لەو بارەدا دەبێتە کۆنەپەرست یا خود بەگرێ‌گیراوی داگیرکەر ـ پەنا بەخوا.

ئەگەر ئەو کەسانە لەو ڕستانە بەتەواوی تێ بگەن کە گرتویانە بەدەستیانەوە، قورسایی گرفتەکە کەم دەبێتەوە... وەلێ مەخابن تەنها بەوەندە دەست هەڵدەگرن کە دەقە ڕواڵەتیەکە لەبەر بکەن، بەو جۆرەش ناوەڕۆکی بنەڕەتی ئەو ڕستە و دەربڕینانەیان لێ بزر دەبێت.

## فرۆید و نەست:

لەبەشی شەشەمی ئەم پەرتوکەدا ئاماژەم بەوە دا کە فرۆید یەکەم کەس بوە سەرنجی (خەڵکی ـ وەرگێڕ) بۆ لای "نەست" ڕاکێشاوە، ئەم کارەی فرۆید لەکاتی خۆی دا زۆر بەنرخ بووە، چونکە بەو هۆیەوە توانی هەڵە و ناتەواوی ئاوەزپەرستە کۆنەکان دەربخات، ئەوانەی متمانەیەکی کوێرانەیان بە (بیرکردنەوەی وشیار)انە هەیە و بە تاکە بناغەیەکی دەزانن کە ڕەفتارە مرۆییەکانی لەسەر دروست دەبێ... فرۆید ئەوەی ڕون کردەوە کە مرۆڤ لەهەڵس و کەوتی دا هەمیشە بەو جۆرە ڕێ ناکات کە بیرکردنەوە یاخود ویست لێی داوا دەکەن... بەڵکو لەنێو قوڵاییەکانی دەروونندا، کۆمەڵێ هاندەری پەنامەکی هەن و مرۆڤ پاڵ دەنێن بەرەو کردنی کارێك بێ ئەوەی مرۆڤ بزانێ پاڵ پێوەنانەکە لە کوێوە بوە.

ئێمە ناتوانین نکۆڵی بکەین لە فەزڵی فرۆید لەو دۆزینەوەیە دا کە، پەردەی هەڵمالی لە ڕوی لایەنە شاردراوەکانی دەروونی مرۆڤ.. لەهەمان کاتیش دا ناتوانین ملەجەڕە بکەین لەو زیادە ڕەویەی ، لەم ڕووەوە فرۆیدی تێکەوتووە.. فرۆیدیش وەك هەر یەکێکیتری خاوەن تیۆر لەم دنیایەدا لە ڕویەکەوە ڕاستی دەپێکا تاکو لە ڕویەکیترەوە بەهەڵە دا بچێ... لەتەنها گۆشەیەکەوە سەیری "ڕاستی"ی کردوە و دەمارگیریش بوە بۆی و زیادەڕەویشی کردوە لە تەرکیزکردن لەسەری، بەوەش ئەو گۆشانەی دیکەی فەرامۆش کردوە کە لە "ڕاستی"ی یەکە دا هەڵە بوون.

## میتافیزیکیەتی فرۆید:

کاتێ لە تیۆرەکەی فرۆید لەمەڕ "نەست" دەکۆڵینەوە، دەبینین کەم تا زۆر هەستی میتافیزیکی بوونی تێدایە... ئەوەتانێ ئەو "نەست" بەوە لەقەڵەم دەدات کە وەك هێزێکی نادیار (غەیبی) وایە کە لەگەڵ دروست بوونی مرۆڤدا ئەویش دروست دەبێت.

جگە لەوە ئێمە کاتێ دان دەنێین بە بوونی هەستێکی میتافیزیکی لە بیردۆزەکەی (فرۆید)دا، نابێت هێندە لەو ڕووەوە زیادەڕەوی بکەین تا ئەندازەی ئەوەی هەموو

تیۆرەکەی ڕەفز بکەین... چونکە لە ڕاستی دا ئەگەر تیۆرەکەی فرۆید ڕووت بکەینەوە لە توێکڵە میتافیزیکیەکەی،کاکڵە و ناوکێکی چاکمان لە بەر دەست دا دەمێنیٚ، کە دەتوانین سودێکی باشی لیٚ وەربگرین لە لێکۆڵینەوەی کەسێتی مرۆڤ دا.

ئەگەر هەر یەکێك لەئێمە سەرنجی ناخی خۆی بدات و لە هەڵس و کەوتەکانی خۆی بڕوانێت، ناتوانێت نکۆڵی بکات ، لەبوونی هاندەرێکی خۆنەویست لە ناخی دا، کە پاڵی پێوە دەنێت بەرەو هەندێك کردار و گوفتار بەشێوەیەك خۆی هەستی پیٚ ناکات.

ئەو هاندەرە لەوانەیە لەگەڵ چەمکەکانی فرۆیددا نەچەسپێت، وەلیٚ لە هەموو مرۆڤێکدا بە مانا زگماکیەکەی بوونی هەیە... ئێمە ڕەنگە بە "نەست" ناوزەدی بکەین، یان هەر ناوێکیتری بەسەر دا ببڕین... ناونان لەم ڕووەوە هیچ گرنگیەکی نیە.. ئەوەی بە لامانەوە گرنگە ئەوەیە دەرك بکەین بەوەی لە پشتی ئەم ئەقڵەمانەوە کە بیر دەکاتەوە ئەقڵێکی دیکە هەیە پاڵمان پێوە دەنێت بۆ هەڵبژاردنی ڕەفتارێکی دیاریکراو بەرانبەر بەخەڵك و، بەرانبەر بەشتەکان بیٚئەوەی ویستێکی وشیارانەمان تیای دا هەبێت.

ئەمەش یانی، ئێمە هاودەنگین لەگەڵ فرۆیددا لەسەربوونی هاندەری نەستی لە مرۆڤدا، وەلیٚ لە لێکدانەوەی هاندەرەکاندا لەگەڵی دا ناکۆکین. ئێمە بەو ڕوداو و ئەزمونانە لێکی دەدەینەوە کە مرۆڤ لەژیانی دا بەسەریدا دێت لەکاتێکدا فرۆید بەچەمکی غەریزە یان ئەو چەمکانە لێکی دەداتەوە کە بیرمەندان لەسەدەی نۆزدەدا لەگەڵی دا ڕاهاتبوون.

### گەنجینەی دەماخ:

مرۆڤ لە ژیانی دا، ڕۆژانە هێندەی ڕوداو بەسەر دا دێت کە خەریکە نەتوانێت بیان ژمێرێت... ئیتر یان چێژ لەو ڕوداوانە وەردەگرێت یاخود ئازار، یان سوودمەند دەبێت لێیان یاخود زیانەومەند دەبیٚ... ئینجا زەمەن بەسەر ئەو ڕوداوانەدا تێدەپەڕێت و، دەچنە خانەی لە بیرچوونەوە و کەسەکەش وا دەزانێت بۆ هەتاهەتایە ڕوداوەکە لە هزری دا سڕراوەتەوە، هەروەها مرۆڤ زانیاری زۆر لەبەر دەکات و بەشی هەرە زۆریانی

لە یاد دەچێت، واش دەزانێت ئەو زانیاریانەی لە بیری چوون چیتر بەسوود نین بۆی، بۆیە بۆ هەتایە لە هزری دا بزر بوون.

لە ڕاستی دا هەموو ئەو ڕوداوانەی بەسەر مرۆڤدا دێن، بەشێوەیەك لەشێوەکان کار دەکەنە سەر هزری، کاریگەریەکەش لە قوڵاییەکانی هزردا دەمێنێتەوە، با مرۆڤیش وا بزانێت لە بیری چوە... لە بیرچونیش هیچ نیە جگە لەبزربوونی بیرۆکە لە ئاوەزی وشیار، لەو کاتەدا دەگوازرێتەوە نێو ئاوەزی ناوەکی... لەوێدا بەقەتیس کراوی دەمێنێتەوە و چاوەڕوانی دەرفەتێکی گونجاو دەکات بۆ بەدەرکەوتن... زۆربەی جاریش کاتێ بەدەر دەکەوێت کە ئاوەزی وشیار بێ ئاگا بوە یاخود نوستوە.. وەك لەبەر دا دیتمان.

وەك لەبەشی (شازدەهەم) دا ئاماژەمان پێدا، توێژینەوەکانی (دکتۆر بلومنفلد) ئەوەیان ڕوون کردەوە کە چۆن مێشکی مرۆڤ لەو ئەقڵە ئەلکترۆنیانە دەچێت کە لەم دواییانەدا زانایان دایان هێناوە... چونکە لە قوڵاییەکانی خۆیدا هەموو ئەو زانیاریانە سەیڤ دەکات کەبەسەری دا دێن... لێرەدا نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە ئەقڵی ئەلکترۆنی تەنها ئەو زانیاریانە سەیڤ دەکات کە زاناکان بەئەنقەست و خواستی خۆیان تیای دا تۆمار دەکەن... وەلێ دەماخی مرۆڤ هەموو ئەو ڕوداوانە زەخیرە دەکات کە بەسەر مرۆڤ دا دێن، ئیدی زیان بەخش بن یاخود سوودبەخش... لێرەوەیە کە دەبینین نەست هەندێ کەس نغرۆ دەکات و دەیانکاتە شێت یاخود (گێلە پیاو)، هەندێك کەسیتر بەرز دەکاتەوە و دەیانکاتە بلیمەت یان خاوەن بەهرەی نائاسایی.

ئەمەش ڕاستی ئەو گوتەیەی مامۆستا (مایرز) دەسەلمێنێت کە وەسفی چالاکیە نەستیەکان دەکات و دەڵێت: چالاکی نەستی لە مرۆڤ دا پێك دێ لە کانگایەکی ئاڵتون و سەلوێنکێك لە پیسایی.[٢]

ئەوە لە بەرژەوەندی مرۆڤدا نیە کە نکۆڵی لە ئاسەواری نەست بکات لە ژیانی دا، چونکە بەوە لایەنێکی گرنگی پێکهاتەی کەسایەتی خۆی فەرامۆش دەکات.. ئەو فەرامۆش کردنە لە لایەك دەبێتە هۆیگەورەترینی ئاڵۆزیە دەرونیەکان و لە لایەکی دیکەشەوە وەبەرهێنانی بەهرە نەستیەکانیش لاواز دەکات.

### رۆحانیەكان و نەست:

سەیر لەوەدایە لەو كاتەدا كە دەبینین هەندێ كەس نەست بە بابەتێكی میتافیزیكی دەزانن، لەهەمان كاتدا هەندێ كەسی دیكە بە پێچەوانەوە بە چەمكێكی (مادی) وای دەبینن كە سەر دەكوتێ بۆ بێباوەڕی.

یەكێ لەو سەیر و سەمەرانەی كە هەقە لەم ڕووەوە باس بكرێت، ئەم بەسەرهاتەی منە لەیەكێك لەو گۆڤارە ئاینیانەی لە عێراق دا دەردەچن، بابەتێكم خوێندەوە، نوسەری بابەتەكە سەركۆنەی موسڵمانان دەكات لەسەر بڵاو بونەوەی بیرۆكە لائیكیەكان لەنێویاندا، هەروەها داوا لە وەزارەتی (مەعاریف) دەكات دەسگاكانی فێركردن پاك بكاتەوە لەو جۆرە بیرۆكانە، یەكێك لە داواكاریەكانی ئەو نوسەرە بریتیە لە پاك كردنەوەی قوتابخانەكان لە تیۆرەكانی داروین و فرۆید و هەموو ئەو بیردۆزانەی تریش كە پێچەوانەی قورئان و ئاینی ئیسلامن.(٢)

نوسەرێكی تریش لە میسر سەركۆنەی توند و ڕەخنەی سەختی داباراندوە بەسەر ئەو زانا دەروونناسانە دا كە دان بە بونی نەست دا دەنێن لە مرۆڤ دا.. ئەو دەیەوێت چەمكی نەست بسڕێتەوە و چەمكی (ڕۆح)ی لە جێگەدا دابنێت، و بڕوای وایە لێكدانەوەی ڕۆحی دیاردە دەرونیەكان لە هەر لێكدانەوەیەكی تر نزیكترە لە ڕێبازی زانستیەوە.(٤)

وا دیارە زۆر كەسی وەكو (ئەبولخەیر) لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بونیان هەیە، و لەم ماوەیەی دوایش دا ژمارەیان ڕوو لە زیادبونە لەبەر هۆیەك كە شاردراوە نیە لە خوێنەری ژیر و هۆشمەند، من لێرەدا نامەوێت مشت و مڕیان لەگەڵ دا بكەم لەسەر ئەو ڕایەیان، وەلێ دەمەوێت سەرنجی خوێنەر ڕابكێشم بۆ ئەوەی كە ئەو جۆرە كەسانە سەرەڕای خۆدەرخستنیان بەوەی ڕەوتی زانستیان وەرگرتوە لە نوسینەكانیاندا، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نین جگە لە كەسانێكی "ئایدۆلۆژیست" و لەڕاكانیاندا لە بەر ڕۆشنایی داخوازیەكانی بیرو باوەڕە مەوروسەكاندا دەڕۆن بەرێوە، دواتر دەشیانەوێت زانست شوێن پێی ئەوان هەڵگرێت.

**بۆچونی (مکدوجل ):**

(ولیەم مکدوجل) یەکێکە لە زانا دەروونناسە بەناوبانگەکان.. لەساڵی ١٩٠٨ دا ناوبانگێکی گەورەی بۆ پەیدا بوو لەکاتێکدا هەوڵی دا دەروونناسی بەکار بێنێ لەخزمەتی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا، لەو ڕووەوە قوتابخانەیەکی تایبەت بەخۆی هەبوو. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە لە قوتابخانە دەرونیەکەی (مکدوجل) بکۆڵینەوە. تەنها مەبەستمان ئەوەیە بڵێین (مکدوجل) یەکێك بوو لە دوژمنەکانی (نەست) و هێرشێکی توندیشی کردۆتە سەری، تەنانەت نکوڵی لە بونیشی کردوە... ئنجا هەندێ لەکەسانی سادە بۆچونەکانی (مکدوجل)یان کردۆتە بەڵگە بە دەستی خۆیانەوە و هەوڵ دەدەن بەو بۆچوونانە بیردۆزی (نەست) لە بنەڕەتەوە پوچەڵ بکەنەوە.. جێگەی نیگەرانیشە کە دەبینین هەندێ لەمامۆستاکان لەعێراق دا شوێن پێی ئەو کەسە "سادە" و ساکارانە هەڵدەگرن.

لەڕاستی دا ( مکدۆجل ) لە بنەڕەتەوە چەمکی نەستی پوچەڵ نەکردەوە، بەڵکو تێگەشتنی ( فرۆید ) ی بۆ ئەو چەمکە بەهەڵە داوەتە قەڵەم ... بەدەربڕینێکی تر ئەو دانی ناوە بە بوونی هەندێ هاندەری پەنامەکی دا بەرەو جۆرە ڕەفتارێکی دیاری کراو بێ ئەوەی خۆیشی هەستیان پێ بکات ... گوێ بگرە ! ئەوەتا دەڵێت : ( من بەبێ خۆ بەستنەوە ، ئەو ڕیەم پێ پەسەندە کەپێی وایە زۆرێك لە چالاکیە هزریەکان لەدەرەوە ی چوار چێوەی کۆششی وشیارماندا ڕوو دەدەن ... هیچ بەر بەست ورێگری نابینملەوەی ئەو چالاکیانە بە نەست ناوزەد بکرێن ، هەر چەندە پێم باشترە گەر بە "ژێرە هەست " ناوبنرێن ... بەڕاستی ئەو چالاکیانە گرنگی یەکی گەورە یان هەیە.)[5]

**بەسەرهاتێکی خۆش :**

تکام وایە خوێنەر ڕێگەم بدات زنجیرەی ئەم باس وخواسە ی ببچرێنم ،تاکو بەسەرهاتێکی دەگمەن وخۆشی بۆبگێڕمەوە کەبەسەر خۆمدا هات لەکاتێکدا سەرقاڵی نوسینی ئەم دێڕانە بووم ... لەکاتی سەرقاڵیم دا بەنوسینەوە ی جانێ ﴿قاوە ﴾

وشوشەیەك ﴿ مرەكەب ﴾م لەبەردەمدابوو ،سەری شوشەكەم لابرد تاكو قەڵەمەكەم پڕبكەم لەمرەكەب ،بەڵام لەبریتی ئەوەی قەڵەمەكەمی تێ بكەم ،شوشەكەم بەرزكردەوە بۆلای دەمم وەك ئەوەی بمەوێت لێی بخۆمەوە ... دەركم بەم هەڵەیەشم نەكرد تائەو كاتەی كەخەریك بوو مرەكەبەكە بكەمە دەمم و بڕژێت بەسەر جلە كانمدا .

ئەم چیرۆكە لەوانەیە نمونەیەكی سادەی ئەوە بداتە خوێنەر كەنەست لەمرڤدا چۆن كار دەكات ... من كاتێ شوشەكەم بەرز كردەوە بۆ دەمم .لەژێر كایگەری پاڵنەری خواردنەوەی قاوەكەی بەر دەمم دا بووم ... ئەمەش یانی ، نیازی خواردنەوە ی‌قاوەكە لەسەرەتادا هاتووە بەمێشكم دا ، بەڵام دوای ئەوەی هەستم بەووشك بوونی قەڵەمەكەم كردووە ئەو نیازەم لەبیرچووە .. كەچی ئەونیازە لە ( ئاوەزی ناوەكی) مدا بەقەتیس كراوی ماوەتەوە ، هەر ئەوەش هانی داووم بۆ خواردنەوەی مرەكەبەكە لەبری قاوەكە . پێویست بەوە ناكات كەبڵێین ، ئەو كارەی من كردوومە زۆرینەی خەڵك لەكاروبارە جۆراوجۆرەكانی ژیانیاندا دەیكەن ، تەنانەت لەوانەیە كارەكانی ئەوان بەوشێوە كارە ساكارەی منەوە نەوەستێت ... بەڵكو هەندێ جار كارەكانیان سەرەنجامی مەترسی داری دەبێت . زۆری جاری وا هەیە مرۆڤ بەرەو كارێك پاڵ دەنرێت لەكاتێكدا خۆی كارێكی دیكەی گەرەكە ، نەخاسمە لەو كاتانەدا كە پاڵنەرەكانی هەست و نەست پێكدا دەكێشن .. بۆیە دەبینی سوێند دەخوات بەخودا كە ئەو كارەی بەئەنقەست نەكردووە ، كەچی خەڵكی بڕوای پی ناكەن !! .

زۆر جاری واش هەیە مرۆڤ سەهو دەكات ودەستەوسان دەبێت لەوەی شتێك لەنزیكی خۆیەوە ببینێت ، چونكە ئاوەزی ناوەكی ئەو كەسە ڕووی لەشتێكی تر كردووە ... بەردەوامیش بەبێ سوود بەشوێن شتە نزیكەكەدا دەگەڕێت . دەگێڕنەوە ئافرەتێك منداڵەكەیی بە باوەشەوە دەبێت ، كەچی بەشوێنیشی دا دەگەڕاو لەخەڵكی دەپرسی : كوانێ ؟ بۆ كوێ چوو ؟ خەڵكیش نازانن بەدووی ئەو منداڵەدا دەگەڕێت كەلە ئامێزی دایە .. هۆی ئەم ڕووداوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كەژنەكە زۆر ترساوە لەوەی كوڕە بچوكەكەیی لێ بزربێت .. ئەم ترسەش چۆتە نێو ئاوەزی ناوەكیەوەی وئەمەش

وایکردووە ونبونی منداڵەکەی بەخەیاڵدا بێت ، سەرەڕای ئەوەی لەبەر چاو و دەستیشی دا بووە ٠

**ئەزموونەکەی( بافلـــۆف ):**

هەنوکە دەگەڕێینەوە سەر لێکۆڵینەوە لە ( نەست ) لەڕووی سروشتە بابەتیەکەیەوە ، لەوانەیە لێرەدا باسکردنی ئەو ئەزموونە بەکەڵك بێت کەمامۆستا ( بافلۆف )لەسەر (سەگ ) جیبەجێ ی کرد٠٠ بەڕای من ئەو ئەزموونە پەیوەندیەکی زۆری هەیە بە بابەتی نەستەوە لەمرۆڤدا ٠

پوختەی ئەزموونەکەش ئاوایە : بافلۆف ، سەگێکی هێنا و شەویلگەی خوارەوەیی کون کرد، وبۆریەکی لەو کونە بەست بەجۆرێ لیکی سەگەکە لە وبۆریەوە بڕژێتە نێو دەفرێکی تایبەتی پێوانە کردنەوە٠٠٠ بافلۆف هەندێ جار خواردنێکی بەتام وچێژی بۆ دەهێناو لەهەمان کاتدا زەنگێکیشی لێدەدا ٠ مەبەستیشی لەوەبوو هەموو جارێ خواردنی خۆراکەکەهاوکات بێت لەگەڵ لێدانی زەنگەکەدا٠

لەکۆتایی دا ( بافلۆف ) تەنها زەنگەکەی لێ دەدا ، بەبێ ئەوەی خۆراکەکەی پێ بدات ، بۆی دەرکەوت لیکی سەگەکە لەگەڵ لێدانی زەنگەکەشدا دەڕژێت ٠٠٠ لێرە وە بافلۆف گەشتە بەرەنجامگیری ئەو ڕێسا زانستی یەی کەدەڵێت : ( بۆی هەیە هەر کاریگەریەکی لاوەکی ، ببێتە کاریگەری سەرەکی ، ئەگەر کاریگەریە لاوەکیەکە چەند جارێکی تەواو هاو کات وهاوڕێ بێت لەگەڵ کاریگەریە سەرەکیەکەدا٠٠٠ ) بافلۆف ئەم ڕیسا زانستی یەی ناونا ( بەدەمەوەچوونی مەرج دار ) ٠٠ [٦]

**مرۆڤ و بەدەمەوەچوونی مەرجدار :**

بەم دواییانە دەرکەوتووە کەبەدەمەوە چوونی مەرجدار ، وەك چۆن بەسەر سەگدا دەچەسپێ ، بەهەمانشێوە بەسەر مرۆڤیشدا دەچەسپێ ، تەنانەت دەگونجێ زۆرێك لە دیاردە دەرونیەکانی پێ شرۆڤە بکرێت ٠

بابۆ نمونە وای دابنیین ، گەنجێکی عاشق ، دەرفەتی ئەوەی بەدەست کەوتووە چەند ڕۆژێك لە باخێکدا لەگەڵ خۆشەویستە کەیدا ژوان بگرن ، ئەو ڕۆژانە لە خۆشترین ڕۆژگارەکانی تەمەنی بوبێتن ، واش هەڵکەوتووە لە باخەکەدا ( ناعور ) ێك هەیە کە بەدرێژایی ئەو چەند ڕۆژە دەنگێکی تایبەت دەردەکات ،ئەو کات ئەنجامەکە چی دەبێت ؟؟ ئەو گەنجە بەتێپەڕینی کات ئەو ماوە خۆشەی لەبیر دەچێتەوە کەپیای دا گوزەری کردووە ، بەڵام هەمیشە ئارەزووی بەلای دەنگی (ناعور ) دایە ، یان بەلای هەر دەنگێکدایە کە لەسەدای ناعور بچێت ٠٠ تەنانەت لەوانەیە بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت بەبیستنی ئەو دەنگە بکەوێتە گۆرانی گووتن وشانە لەرزە ( دەربڕینی وەرگێڕ ) ٠٠٠ دەگونجێت بڵێین کاریگەری دەنگەکە چۆتە قوڵاییەکانی دەروونی وئاسەواریان لەسەر هەڵس وکەتەکانی بەجۆرێکی نەستی وخۆنەویستانە داناوە٠

زۆربەی ڕواڵەتەکانی ڕەفتاری مرۆڤ بەم جۆرە بەڕێوەدەچن ، مرۆڤ کۆمەلێ کارو ڕەفتار دەکات بێ ئەوەی بزانێت سەرچاوەکانیان لەچ قوژبنێکی دەرونی دان ٠٠ جاری وا هەیە بۆ یەکەمجار کەسێك دەبینی ، بەڵام هەست دەکەیت ڕقێکی زۆرت لەو کەسەیە٠٠ کەلە هۆکاری ئەو ڕقەشت دەپرسیت ، وەڵامت پێ نیە ٠ لەڕاستی دا تۆ لەبەر هۆکارێکی شاردراوەی نێو قوڵاییەکانی ناخت ڕقت لەو کەسەیە، بێ ئەوەی تۆ بەجۆرێکی ووشیارانە ئاشنابیت بەو هۆکارە٠

ئەو کەسەی ڕقت لێیەتی لەوانەیە لەئەدگارەکانی ڕوخساری دا یاخود لەهەڵس وکەوتەکانی دا لە کەسێکی تر بچێت کەلەڕۆژگارەکانی ڕابردوو دا دەست درێژی کردۆتە سەرت یاخود ئازاری داویت ، بۆیە لەو کاتەدا زۆر ڕقت لێی هەستاوە و لەوانەشە هەوڵت دابێ تۆڵەی لێ بکەیتەوە ،بەڵام سەرکەوتنت بە دەست نەهێناوە٠٠٠ ڕۆژگاریش کەبەسەرتدا تێ پەڕیوە، ڕوداوی دەست درێژیەکەی لەبیرت بردۆتەوە، وەلێ بەردەوام ڕقت لە هەرشتێکە کە ئەو ڕوداوەت وەبیر بێنێتەوە٠

**نمونەیەکی ڕاستەقینە :**

خوالێ خۆش بوو (سلامە موسا ) باسی پیاوێکمان بۆ دەکات کەزۆر ڕقی لە جگەرەکێشان بووە ، بۆیە هەرکات بەناچاری جگەرەیەکی بکێشایە ، گورج دەچوو بە ئاو

دەستی دەشۆرد ، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە ئەو کابرایە لەسەردەمی منداڵێتیدا لە ژێر چاودێری خزمەتکارێکی دابووە ، کەپیاوێکی قەڵەوی گەورە بووە ، پەیوەندی ئەم لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا باش نەبووە ، چونکە زۆر جار خزمەت کارەکە وەك ئەوەی بێ کاری پێ بکرێت دەیبردە قوتابخانە... جگە لەوەش ئەو پیاوە شێوازێکی زۆر قێزەونی دەبێت لە کۆکردنەوەی ئاغزە جگەرە وجگەرە کێشاندا ، بە جۆرێ بۆنێکی زۆر ناخۆشی جگەرە کێشانی گرتبوو ، منداڵەکە بەو بۆنە ناخۆشە ئازاری پێ دەگەشت لەو کاتەی دەیبردە مەکتەو ... بۆیە کاتێ منداڵەکە گەورە بوو بەو جۆرەی بینیمان، (ڕق ) لەجگەرەکێشان) تیایدا بویە گرێ یەك و لەئاوەزی ناوەکی دا بنجی داکوتا... [٧]

**ئادەمیزاد وسپلۆت :**

فرۆید ئەم دیاردە دەرونیەو دیاردە هاوشێوەکانی بەوە ڕاڤە دەکرد کەبەرەنجامی ئارەزوویەکی خەفە کراون... وەلێ بافلۆف بەڕێسای ( بەدەمەوەچوونی مەرجدار ) لێکی دەداتەوە ... هەرچۆن بێت ، ڕاڤەکەی فرۆید ڕاست دەرچێت یان شرۆڤەکەی بافلۆف ، بەرەنجامەکەی هەر چوون یەك دەبێت ، ئەویش ئەوەیە کەمرۆڤ هەندێ کار دەکات ، بێ ئەوەی بیری کردبێتەوە لێ ی یاخود وەئاگا بێت لەکردنیان دا .

لێرەدا ئەوەی شیاوی ئاماژەپێدانە ، ئەوەیە کە (بافلۆف ) بەو ئەزموونانەی خوازیاری ئەوە نەبوو لە نەستی مرۆڤ بکۆڵێتەوە ، چونکە ئەو پسپۆڕ بوو لەزانستی (فەسلەجە ) دا ، بەو پێ ودانگەش لە (فەسلەجە )ی سەگی کۆڵیوەتەوە ، کەلە هەندێك ڕووەوە لەفەسلەجەی ئادەمیزاد دەچێت . لەڕاستی دا هەر وایە ، مرۆڤ جیاوازیەکی گەورەی نیە لەگەڵ سەگ و ئاژەڵە شیر دەرەکانی تردا لەڕووی فەسلەجیەوە... وەلێ کەلە ڕووی سایکۆلۆژیەوە لە سپلۆت و مرۆڤ دەکۆڵینەوە جیاوازیەکی گەورەیان لەنێواندا دەبینین .

سپلۆت ئاوەزی وشیار وبیرکردنەوەی نیە ، بەو جۆرەی کە مرۆڤ هەسی . ئەمەش گیانی سەگ وەك ئامێرێکی کەڕ دەچێتە ژێر کاریگەری بەدەمەوەچوونە مەرج دارە کانیەوە ،هیچ جیاوازیەك ناگات لەنێوان ئەو بەدمەوەچوونە وبەدەمەوە چوونە

ئاساییەکانی دا٠٠ وەلێ مرۆڤ ئاژەڵێکی بەبیرە ، لەبەر ئەوە دووچاری هەندێ لە ململانێی دەرونی دەبێت لەنێوان ئەوەی بیر کردنەوەی وەئاگای داوای لێ دەکات وئەوەشی کە بە دەمەوە چوونە مەرج دارەکانی دەیانەوێت ٠

مرۆڤ کاتێك ڕقی لەکەسێك دەبێت،بەبێ‌ئەوەی پێشتر ناسیبێتی ،ئەواناتوا نێت بەهۆی ئەم هەستەوە ،وەکو سەگ خۆی بدات بەدەم ئەوپاڵنەرەوە،چونکە ئاوەزی وشیاری بەربەستی ئەوهەستەی لێ‌دەکات ٠٠ لەوکاتەش دادەکەوێتەنێو هەڵوێستێکی بێزار کەرەوە ،لەلایەکەوە بەلایەوە نارەحەتە کەبانگەوازەکانی عەقڵی فەرامۆش بکات ،بەوەش بکەوێتە بەر ڕق وخەشمی خەڵکی ،لەلایەکی تریشەوە بەلایەوە نارەتەئەوهەستەی سەرکوت بکات بەبێ ئەوەی لەدەرچەیەکە هەناسەیەکی پێ بدات .

**ئەزمونێکی سێکسی :**

یەکێکی‌ترلەتوێژەران ،ئەزمونێکی لەسەر سەگ پەیڕەوکرد بەهەمان شێوە ئەزمونەکەی ( بافلۆف )

- ئەوەبوو (گەماڵێك)ی هێنا ولەماڵەوە لەگەڵ خۆیدا پەروەدەی کرد ،هەمووجارێ دەڵێکی دەهێناو بۆئاشنابونیان بەیەکتری و،وازی لێ دەهێناو لەدورەوە چاودێری دەکردن ٠٠٠ هەرکات گەماڵەکە بیوستایە بەدەم غەریزە سێکسیەکەوە بچێت ولەگەڵ دەڵێك دائەو غەریزەیە تێر بکات ،زاناکە تەزویەیەکی عەلەتریکی دەخستە سەری ووای لێ دەکرد سەگەکە بلورێنێت وڕابکات ٠٠٠ توێژەرەکە ئەم ئەزمونەی چەندجارێك دووبارە کردەوە ،تاوای لێهات سەگەهەژارەکە هەرکات دەڵێکی بەرچاو بکەوتایە ڕای دەکرد ٠٠ [٨]

ئەم ئەزمونە سەرەڕای ئەوەی سا دەو ساکارە ،وەلێ یارمەتیمان دەدات لەتێگەشتنی ئەولادانە ڕەوشتی یانەی کەهەندێ جار لەهەندێ خەڵك دا بەدی دەکەین ،هەروەها لەڕادەی کاریگەری نەستیش لەولادانانەدا تێمان دەگەیەنێت ٠ مرۆڤ بەسروشتی خۆی ئارەزوی بەلای شتێك دادەبێ ،بەلام دوای ئەوەی بەئەزمونی سەخت دادەڕوات ،وای لێ دێت ڕقی لەوشتە دەبێتەوە ٠

بۆنمونـە،ئەولادانـە سێکسـیە وەربگرە،کەلـەنێو پیـاوانی لای ئێمـەدا لەسـەردەمی عوسمانیەکانـدا تەشـەنەی کردبـوو ،وئێمـە دەزانـین ئـەو پیاوانـە بەسروشـتی خۆیـا ن حەزیان لەژن بووە،بەڵام لەژینگەیەکدا ژیاون کەئافرەت قێزەون ونەزان بـووە ولـەدنیادا هیچی نەزانیوە جگە لەهات وهاوار وسکاڵاکردن ٠ کـەوابێ دەبوا پیاو خۆیبەگـەورە تـر بزانیایە و لەگەڵیدا دانەنیشتایە وزۆرلەگـەڵی دانەمایەتـەوە ،وئەگـەر پیاوێکیش بـەوە ناوبانگی پەیدا بکر دایە کەحەزی لە دانیشتن وتێکەڵاویـە لەگـەڵ ژنـان دا ،هاوەڵـەکانی بەوەتۆمەتباریان دەگرد کەژنانیەو پیاوەتی ی ناتەواوە ٠

دەگونجێت بڵێین ئەوبارو دۆخە کۆمەڵایەتیە ، دروست لـەورِوداوە دەچێ کەبەسـەر ئەوگەماڵەداهاتبوو ،هەرکات لەدەڵێك نزیك بکەوتایەوە تەزویەکی کارەبایی بـەگیانی دا دەهات ٠٠ هەرپیاوێکیش لەدۆخێکی وادا بژی ،هەوڵ دەدات قەرەبوی خۆش ویستنی ژن بەخۆش ویستنی مێرد منداڵان بکاتەوە !!. گرفتەکەش لێرەدا لەوە تێ پەڕ ناکات ، کە گـرێ یـەکی نەسـتی هەیـەو وا لـەپیاو دەکات کـەم تـا زۆرێـك تـەرێز لـە ژن بکـات ٠ کاتێکیش وا دەکات خۆیشی نازانێت لە چ سەر چاوەیەکەوە حوکمی کردنی ئەو تەرێزەی بەسەردا دەدرێت ، بەڵکو لەژێر پاڵنانی ئەو گرێ دەرونیـەدا کارەکە دەکات کـە ژینگە کۆمەڵایەتی یەکەی تیای دا دروستی کردووە٠

لەم بارەوە باسێکی خۆش لەیەکێك لەشاعیرە عێراقیەکان دەگێڕنەوە، ئەو هۆزانڤانە نەوەیـەکی سـەدەی نۆزدەهـەم بـووە و نـاوی ( شـێخ صــالح تـەمیمی ) بـووە ٠٠ دەڵێن زۆری تەرێز لەئافرەتان وقسەکردنیان بووە و ، قەڵس بووە بەشێوەی لەشی ئافرەتـان ، تەنانەت یەکێك لـە لـە هۆنراوەکانی دا وەسفی سنگی ئافـرەتی کـردووە و گوتوویـەتی دومەڵێکە و بەتێپەڕینی کات دەپوکێتەوە٠٠٠ [٩]

بەهێزترین گومان ، ئەوەیە کەئەم شاعیرە ئەو قسەیەی لەژێر کاریگەری گرێ یـەکی دەرونی دا کردووە ، لەوانەشە گەر ئەو گرێ یـەی نەبوایـە قسـەیەکی پێچـەوانەی ئـەم قسـەی ئێستەیی بکردایـە ، لـەو کاتەشـدا سـنگی ژن لەبەرچاوی دا دەبـووە جوانترین گۆیەك ( دەربڕینـی وەرگێـڕ ) کـەخودا وەدی هێنابێت و دەنگی ئاخاوتنیشیانی لەبـەر گوێ دا دەبووە سەدای چەهچەهەی هەزار دەستان ٠

خەڵکی لە زۆربەی دیاردەکانی ڕەفتار و ڕەوشتیاندا بەو جۆرەن ٠٠٠ لەژێر کاریگەری ئەو ئاماژە کۆمەڵایەتیانەدا دەڕۆن بەڕێوە کە ڕۆدەچێتە نێو ئاوەزی ناوەکییان ، دوای ئەوە دێن دەست دەکەن بەهێنانەوەی بەڵگە گەلێ لۆژیکی بۆ پاساو دانی ئەو ئاکارەی لێیان وەشاوەتەوە٠

**ڕاو بۆچوون و ئایدۆلۆژیاکان :**

کاریگەری نەست، تەنها لەئاستی ڕەوشت و ئاکاردا گورت هەڵناهێنرێ ٠ بەڵکو کاردەکاتە سەر ئەو ڕاو بۆچوون و بیر وباوەڕانەی ، کە مرۆڤ بڕوایان پێ دێنێت و ، واش گومان دەبات گوایە لە دوای بیر کرنەوەیەکی ساغەوە گەشتۆتە قەناعەت کردن بەو بیروباوەڕانە:

بۆ نمونە ، ئەو کەسە دۆگمایانە وەربگرە ، کە دەمارگیریەکی زۆریان هەیە بۆ نەریتی ڕوپۆش (حیجاب ) ی ئافرەتان ، و بەڵگەی ئەقڵی ونەقلیش دێننەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو نەریتە باشترین قەڵایە بۆ پاراستنی ئابڕو و داوێن پاکی ئافرەت ٠٠هۆی ئەوەیە هەر یەکێکیان بگریت لە کۆمەلگەیەکدا ژیاوە، نەریتی ڕوپۆشکردن تیایدا توند و تۆکمە بووە ، بەڕادەیەك خەڵکی لەو کۆمەڵگەیەدا کەوەسفی ئافرەتێکی بە ئابڕویان کردووە گوتوویانە ( کیژی ماڵەوەیە ) و دەنگی ناچێتە دەرەوە و کەس تاکە پەنجەیەکیشی نەدیووە ٠

ئەو ئاماژەدانە کۆمەڵایەتیە دەچێتە قوڵاییەکانی دەروونەوە ، تازیاتر بەسەر مرۆڤدا چەند پات بکرێتەوە، هێندە زیاتر بە نێو قوڵاییەکانی ئاوەزی ناوەکی دا ڕۆدەچێت ٠٠٠ لە دواییش دا کەمرۆڤ بیردەکاتەوە ، واهەست دەکات لەبیرکردنەوەدا سەربەست وئازادە ، هیچ هەست بەبوونی ئەو ئەو پاڵنەرە نەستی یەی کەلەژێر ڕووپەری بیر کردنەوەی دا خۆی مەڵاس داوە و هانی دەدات بۆ تەرێزکردن لەهەر بیرۆکەیەك کەبانگەشە بکات بۆ دوور کەوتنەوە لە ڕوپۆش ٠

**دەمارگیری و بیر وباوەڕ :**

ئاسایی مرۆڤ لەژینگەیەكدا پێ دەگات ،كەخاوەنی بیروبا وە ڕێكی دیا ری كراوە ،هەرئەوەندەی چاوی هەڵهێنابەدنیادا، دەبینێ دایك وباوك وكەس وكارەكەی، بتێك یان گۆڕێك یان پیاوێكی مێژوبە پیرۆز دەزانن و،هەمووچاكەو فەزڵێكی دەدەنەپاڵ ٠٠ ئاوەزی مرۆڤیش لەوبارودۆخەدا گەورە دەبێت تاهێدی هێدی دەدرێ ٠٠٠ كەسەكە سنور بەندو كۆت كراوە وپێشی وایە سەربەستە ، لەبەرئەوەیە دەبینین هەموو خاوەن بیرباوەڕێك متمانەی پتەوە بەوەی ئایدۆلۆژیاكەی خۆی ڕاست ودروستە ،ئەوانەشی كەپێچەوانەی ئەمن ،كەسانی دەمارگیرن – بەدبەختی بۆیان !

زۆرجار هەندێ لەو خێڵە كیانە دەبینم ،ئەوانەی بیرو باوەڕیان لەباو باپیرانەوە وە رگرتووە ،كەچی دەڵێن دوای ئەوەی لێكۆڵینەوەی هەموو ئایدۆلۆژیاكانی ناو خەڵكمان كردوەو بەراوردمان كردون ،ئەوجا ئەم ئیدۆلۆ ژیایەمان پەسەند كروە ٠٠٠ ماوەیەك لەمەو بەر وتارێكی ناسكی یەكێك لەو كەسانەم خوێندەوە كەبەدڵنیاییەوە دەڵێت : هەموو خاوەن ئاینە كان دەمار گیرن جگە لە خۆی وكەسانێكی وەكو خۆی نەبێت ٠٠ ئەو پیا وە ،خوا چاو پۆشی لێ بكات ،نازانێت خۆی چی دەڵێت ، خاوەن ئاینەكانی تریش هەمان شت دەڵێن !!

هەریەكێكیان بگری ،سەرنجی هەموو ئاینە كانی داوە و ، لەئاینە كەی خۆی چاكتری نەدۆزیوەتەوە ٠ چونكە هە رلەمناڵیە وەلەگە ڵیدا ڕاهاتوە و، بەوەش ڕەگ وڕیشەی ئایدۆلۆژیاكە درێژ بۆتەوە بۆنێو قوڵایی ئاوە زی ناوەكی ، كەواتە ئەم ئایدۆلۆ ژیایە بیركردنەوە كانی ئەوكەسە سنو ر بەند دەكات، بەبێ ئەوەی خۆیشی هەست بكات ٠ ئەمەش یەك لەو هۆكا رە سەرەكیانە بووە كەوای لە زۆربەی خەڵكی كردوە تابەرانبەركێ و دژایەتی پێغەمبەران بكەن وبیان چەوسێننەوە و بەردیشیا بۆ بهاوێژن ،لەوەدا جیاوازی نیە لەنێوان محمد وعیساو بو دا وسوكرات دا ٠٠ ئەگەر نوسەری ئەو وتارەی ئاماژەمان پێكرد لە سە ر دەمی پێغەمبەرەكەی دا بژیابا ، ئەوا بەهێزترین گومان ئەوە یە كەدژایەتی پێغەمبەرەكەی دەكرد!!٠

بەڕاستی (جاحظ ) جوانی گوتووە کەدەڵێت : ( ڕاو بۆ چوون وبیروباوەڕەکانی مرۆڤ خۆ ویست نین ، بەڵکو بەسەریدا سەپێنراون ، جگە لەوش بەرەنجامێکی حەتمی چۆنێتی دروست بوون و پێکهاتنی ئەقڵی کەسە کەو، ئەو ڕاو بۆچونانەشە کەدەخرێنە بەر دەمی٠٠٠ هەرکەس ئاینێکی بخرێتە بەردەم و، پێی پەسەند نەبێ ، ناچارە بەوەی پەسەندی نەکات ٠٠ لە توانایدا نیە پەسەندی بکات ، چونکە ئەم خۆی بەرپرسیاری بیر و باوەڕەکانی خۆی نیە ، خوداش داوای شتێك لە کەسێك ناکات گەر ئەو شتەی لە تواندادا نەبێت ٠٠٠٠ هەرکەس توشی کوێری ڕەنگەکان بوبێت و ، سوور بە ڕەش ببینێ ، نابێ سەر زەنشت بکرێ ، چونکە ئەم ئەوەندەی لەتواناداا هەیە پێڵوەکانی چاوی بەرز بکاتەوە و دایان بخاتەوە ، وەلێ ئەوەی کە ئەم شتە بەڕەش وئەوی دیکەیان بە سووری ببینێ ، ئەمەیان لەتوانای ئەمـــــدا نیە ، سەبارەت بە شتە ماقوڵەکانیش هەر وایە ٠٠٠٠ ) [١٠] ٠

خودا پاداشتی ( جاحظ ) بداتەوە ! ئەوەتا بەر لەنزیکەی هەزار ساڵ دەرکـــــی بەکاریگەری (نەست ) کردووە لە بیرو باوەڕ و ڕاو بۆچوونەکاندا ، لە کاتێکدا زۆرێك لە نەوەکانی سەدەی بیستەم تا ئێستاکەش لێی بێ ئاگان ٠

بەڵـــــگەکان و بیروباوەڕ :

بیرمەندانی دێرین ، کۆمەڵێکی کەمیان نەبێ ، هەوڵیان دەدا تەنها لەڕێی بەڵگە ئەقڵیەکانەوە بیروباوەڕەکانیان بڵاوبکەنەوە ٠٠٠ دەمارگیرییش بە حاڵەتێکی ڕە فتەنی و لەناکاو دادەنێن کەبەسەر ئاوەزی مرۆڤـــــدا دێت و لە نەزانین ونەزۆکی بیرکردنەوە وە سەر هەڵئەدات ٠ لەبەر ئەوەیە دەمانبینین بەڵگە گەلێ ئەقڵی جۆراو جۆریان دادەباراند بەسەر هەر کەسێکدا کە بۆ غەیری بیرباوەڕەکەی ئەوان دەمار گیر بوایە، وایان گومان دەبرد ئەو کابرایە هەرکە گوێی لە بەڵگەکانی ئەوان گرت ، دان دەنێت بەڕاستی و دروستی بەڵگەکاندا و ، دەمارگیریە کۆنەکەی خۆی واز لێ دێنێت ٠ وەلێ هەر کەدەیان بینی بەڵگەکان کاریان لێناکات ، لێیان تورە و دڕدۆنگ دەبوون یان تەنانەت لەوانەیە لەبەر خاتری خودا بشیان کوشتنایە!!٠

ئەو جۆرە كەسانە، بێ ئاگان لەوەی ئەو بەڵگانەی لەدیدی خۆیاندا بەهێزن ، لەوانەیە لەدیدی كەسانی تردا وانەبن ، مرۆڤیش لەمیانەی ئەو پێوەرە نەستی یانەوە سەرنجی بەڵگەكان دەدات كەبەنێو ئاوەزی ناوەكیی دا ڕۆچوە٠٠٠ هیچ بەڵگەیەكی گشتی نیە كەهەموو خەڵكی وەكو ڕۆژی ڕوناك ببینن ٠٠٠ گەر لە دنیادا بەڵگەیەكی ئاوها هەبوایە ، ئەوا خەڵكی لەدێر زەمانەوە حەوابوونەوە٠

تۆ اناتوانیت كەسێك والێ بكەیت بڕوابەڕاستی نوێ بێنێت ، مەگەر لەسەرەتاوە بتوانیت پێوەرە نەستی یەكانی بەشێوەیەك بگۆڕیت كەلەگەڵ ئەو بیرو باوەڕەدا وێك بێتەوە٠٠٠ بانگەواز كارانی بیروباوەڕە جیاجیاكان لە مێژە پەییان بەم ڕاستی یە بردووە ، ئەوەتا دەبینین هەوڵ دەدەن جەماوەر ڕابكێشن بەرەو بیرو باوەڕەكەی خۆیان لەڕێگەی ئاهەنگ و ، كەرنەڤــــاڵ و ، مەراسیمی جۆراو جۆرەوە، پتر لەوەی هەوڵ بدەن لەڕێگەی بەڵگە ئەقڵیەكانەوە ئەو كارە بكەن ٠ لەهەمان كاتدا ئەو بەڵگانەش فەراموش ناكەن ، بەڵكە ئەو بەڵگانە دەخــزێنـــنـــە نێو هوتاف ومەراسیم وســروتەكان ، وبەو جۆرەش بەڵگەكان بەتواناتر دەبن لەوەی بەنێو قوڵاییەكانی دەروندا ڕۆبچــــن ٠

لە كۆندا بانگەواز كارانی بیروباوەڕە جۆراوجۆرەكان ، مەراسیمی نزا وسروتە ئاینی یەكانیان بەكار دەهێنا بۆ بەهێز كردن وبنج داكوتاندنی بیرو باوەڕەكە لەنێو ئاوەزی شوێنكەوتوانیاندا٠٠٠ وەلێ بانگخوازانی ئەم ڕۆژگارە ، هوتاف و كەرنەڤاڵ وئاهەنگ بەكاردێنن ٠٠ ئینجا هەركامیشیان بگریت یەك سروشتیان هەیە و كاریگەریەكی وێكــچووشیان دەبێت ٠

سروشتی ئەم كارە كۆمەڵایەتیانە، ئەوەیە كاریگەریەكی قوڵی نەستی لەسەر هــزر بەجێ دێڵن ٠ مــــرۆڤ كاتێ بەشداری لەو مەراسیمانەدا دەكات هەست بە گەرمایی عاتیفی دەكات، كەبە قوڵاییەكانی دەرونی دا دێت و دەچێت ٠٠٠ هەرگـــــا هوتاف بۆ بیرو باوەڕەگە زیاتر بدرێت ، مرۆڤ واهەست دەكات ئەو بیرۆكەیە بوەتە هەقیقەتێكی بەرجەستە و چیتر گومان لێكردنی سەختە ونەك هەر ئەوەندە بەڵكو

خەریکە بەچاو ببیبنێت ، جاگەر تۆ بوێریت مشت ومڕی لەگەڵدا بکەیت ، لێت تورە و قەڵس دەبێت و بە کوێرت دەداتە قەڵەم ،چونکە ئەو شتێ دەبینێ کە تۆ نای بینیت!! ٠

لەوانەیە ئەو مرۆڤە گۆڕانێکی بەسەردا بێت و، واوز لەو بیرۆکەیە بێنێت کەپێشتر بڕوای پێی هەبووە ، وڕو لە بیرۆکەیەکی تر بکات ٠ لەو کاتەشدا شەرم ناکات لەوەی تۆمەتی کوێرێتی بداتە پاڵ ئەو کەسانەی کەلەگەڵ ئەمدا واز لەبیرە کۆنەکەیان ناهێنن !!٠

**پاڵنەری بەرژەوەندی تایبەت :**

نکولی ناکەین لەوەی، زۆرینەی ئەوانەی دژایەتی بیرە نوێیەکان دەکەن، لەوکەسانەن کەخاوەنی بەرژەوەندی هەنوکەین ،بۆیە ڕقیان لەبیرە تازەکەیە چونکە دەترسن لەوەی بەرژەوەندیەکانیان هەرەس بێنێت ٠٠ ئەم جۆرە کەسانە قورئان ناوی ناون ﴿موتریف﴾ەکان ٠٠٠ لێرەوە ئیتر دەتوانین لەوئایەتە قورئانیە بگەین کەدەڵێت : (مارسلنا في قرية من نذير الاقال مترفوها انا بما ارسلتم به كــــافــــرون ) [11]٠

لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو کۆمەلگەیەکدا موتریفەکان کەمینەن ، هەندی جاریش ژمارەیان لە ئەنگوستەکانی دەست وقاچ تێپەڕ ناکات ٠٠ هەرچی زۆرینەی خەڵکیشە ، ئەمانیش دژایەتی بیرە تازەکە دەکەن ، سەرەڕای ئەوەی لەتەك بەرژەوەندیە کانیشیانــــدا دەگونجێت ٠ هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بیروباوەڕەکۆنەکەیان لەنێو قولاییەکانی دەرونیاندا بنجی داکوتاوە ، ئینجا موتریفەکان ، دێن وبەیداخی پارێزگاری کردن لەو بیروباوەڕە"پیرۆز"انە ، بەرز دەکەنەوە ، خەڵکیش وەکو مێگەل شوێنیان دەکەون٠

خودی موتریفەکانیش، هەندێ جار بێ ئەوەی هەست بکەن ، خۆیان دەخەڵەتێنن ٠٠٠ چونکە بەرژەوەندیەکانیان پێ دەچێت ڕەگ و ڕیشاڵیان ڕۆچوبێت بە نێو قولاییەکانی ئاوەزی ناوەگییاندا و، ئەمەش هانیان دەدات بۆ شاردنەوەی هەقیقەت ، لە خۆشیان ولە خەڵکیش ،لەکاتێکدا واگومان بە خۆیان دەبەن کەلەپێناوی هەقیقەت دا تێ دەکۆشن ٠٠٠ ئەوانەی بەرهەڵستی ودژایەتی بانگەوازەکەی ﴿ موحەممەد﴾ یشیان

كرد پێك هاتبوون لە دوو بەش،بەشی هەرە زۆریان خەڵكە ڕەشۆكیەكە بوون... بانگەوازەكەی (موحەمەد) لە بەرژەوەندی ئەم خەڵكە بوو، كەچی ئەمانیش دژایەتی (محەمەد)یان دەكرد لەژێر كاریگەری ئەو پڕوپاگەندە چەواشەكارانەی كە گروپە بچوكەكە (خاوەن دەسەڵات و بازرگان و پیاوە قۆشمەكان) لەدژی (محمد) بەكاریان دەهێنا... كاتێك لە سایكۆلۆژیای ئەوانە دەكۆڵینەوە دەبینین دان نانێن بەهۆكاری ڕاستەقینەی ئەو دژایەتی كردنەیان دا، بەڵكو دەڵێن گوایە لەپێناوی پاراستنی ئەو كەلەپورە پیرۆزەدا خەباتیان كردوە كە لەباو باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە، ڕەنگە هەندێكیشیان بڕوایان بەڕاستی ئەو قسەیان هەبێت، واتە ئەو فێڵە كاری لێكردوە كە خۆی خولقاندویەتی... بەو جۆرەش، بەڵا و مەینەتی لەسەر كۆمەڵگە سەخت تر دەبێ، بەتایبەت كە پاڵنەری بەرژەوەندی و پاڵنەری بیر و باوەڕ لە قوڵایی دەروونی دا یەك دەگرن... ئیدی بەو جۆرە پاڵ دەنرێ بەرەو كوشتنی كەسانی بێتاوان و، دەست درێژی كردنە سەر خەڵكی، ئەم پاڵ پێوەنرانەش لە سنورێكدا ناوەستێ.

### ئەست و ڕەوشت:

سیستەمی نوێی پەروەردە، چارەدۆزیی ڕەوشتی مرۆڤ لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ئەزمونەی (بافلۆف)دا دەكات كە لەسەر سەگەكە پەیڕەوی كرد، پتر لەوەی لەبەر ڕۆشنایی ئامۆژگاریە ئەبستراكتیكیەكاندا چارەسەری بكات، ئەو ئامۆژگاریانەی بیریارانی كۆن لەبانگەوازە تۆباویەكانیان دا بەكاریان دەهێنا.

مرۆڤ ئاژەڵە، بەرلەوەی مرۆڤ بێت. بۆیە كاتێ ئامۆژگاری دەكەیت بەپێچەوانەی ەریت و بەدەمەوەچونە مەرج دارەكانیەوە، لەوانەیە بەرێزەوە گوێشت بۆ بگرێت و، ێشت بلێت: "ئافەرینت كەم"، بەڵام نابێت و ناسڵەمێتەوە لەوەی ئامۆژگاری خەڵكی بكات... چونكە ئاوەزی وشیاری ئەو كەسە بەجۆرێك بیر دەكاتەوە و، ئاوەزی ناوەكیشی ە جۆرێكی دیكە، ئەو دوو جۆرەش جیاوازیان زۆرە!

هاوڕێیەكم سكاڵای دەكرد لەدەست ڕەوشت و ئاكاری منداڵەكانی، ئەو لای وابوو ەروەردەیەكی باشی كردون... باسی ئەوەی بۆ كردم كە چۆنی پەروەردە كران و، و

دەیگوت: "زۆرم ئامۆژگاری دەکردن، نەم دەهێلا کاتژمێرێك تێپەڕێت بە بێئەوەی ئامۆژگاریەکی بەسودیان بکەم، بەڵام بەداخەوە کە گەورە بوون پێچەوانەی ئەوە دەرچوون کە من لێیانم دەویست" !!.

ئەو پیاوە وا گومان دەبا ئامۆژگاری ڕەوشتی مرۆڤ پاکژ دەکاتەوە، و هەر کات مرۆڤ لێوان بوو لە بیرۆکە باڵاکان ئەو دەمە لە ژیانی دا بەگوێرەی ئەو بیرۆکە بلندانە ڕێ دەکات... ئەمە نەك هەر بڕوای ئەو پیاوە یە (وەرگێڕ) بەڵکو بڕوای زۆرینەی پەروەردەکاران بوون لەسەردەمە کۆنەکان دا، زۆرێکیان تا ئەمڕۆکەش پەیڕەوی لێ دەکەن... ئەوانە دان نانێن بە بونی شتێك دا ناوی (نەست) بێ لەمرۆڤ دا، جگە لە (ئاوەزی وشیار) بەهیچ شتێکی دیکە لەمرۆڤ دا ئاشنا نین و ئەو ئاوەزەیان کردۆتە سەرچاوەی هەموو ڕەفتارە مرۆییەکان. هەر کات ڕیزپەڕی یەکیان لە ڕەفتاری مرۆڤێکدا بەدی کرد، بۆ ئەوەی دەگێڕنەوە کە کەم و کورتی لە بیرکردنەوی دا هەیە و، لە ئەنجامدا دەست دەکەن بە دابارانی ئامۆژگاری و نەسیحەتی باڵا، گوایە دەیانەوێ چاکی بکەن، وەلێ لەو هەوڵەیان هیچیان دەستگیر نابێت جگە لەتۆز بەباداکردن!..

قەیمیەکان ئەو کەسە "خوێندەوارە تێگەشتوە"ی کە زۆرترین زانیاری کلاسیکی لە مێشکی دا هەلگرتوە، بە نمونەی کەسایەتی کامڵیان دەدایە قەڵەم. بۆیە هەر کات کەم و کورتیان لە ڕەفتاری دا بەدی بکردایە، لە چاو ئەوەی کە خۆیان ئومێدیان لێی کردوە، ئەوا سەریان سووڕ دەما و دەیان گوت وەکو نەخوێندەوارەکان ڕەفتار دەکات!.. بەدەربڕینێکی‌تر، ئەوان زانیاری ئەبستراکت دەکەنە چاوگی فەزیلەت و ئیدی ناشزانن کاریگەری زانیاری ئەبستراکت لەچوارچێوەی وتە و زمان بادان تێپەڕ ناکات، هەر چی کردەوەشە، لەژێر کاریگەری هاندەرە نائاگاکانی نێو قوڵایی دەروونەوە پەیدا دەبێ.

ئەزمونەکەی (بافلۆف) دەری خست، سەگەکە واز ناهێنێت لە نەریتەکانی سەبارەت بە لێدانی زەنگەکە، مەگەر بەهەندێ ئەزمونی دیکەدا تێپەڕ بێت کە لەڕوی کاریگەریەوە پێچەوانەی ئەزمونە کۆنەکەی بن... مرۆڤیش هەر وایە، لە نەریتەکانی دەست بەردار نابێت، لەکاتێکدا نەبێ کە کۆمەلگە هانی بدەن بۆ پەیڕەوکردنی نەریتێکی پێچەوانە... لەبەر ئەوەیە کە دەبینین مرۆڤەکانی لەمزگی دا چاکەکارن

نەخاسمە کە گوێ بۆ ئامۆژگارەیەکان دەگرن، وەلێ هەر کە چونە دەرێ بۆ بازێڕ، دەست بەجێ هەڵدەگەڕێنەوە و دەبنە دز و جەردە، هیچ دڕدۆنگیش نابن لەو گۆڕانەیاندا، چونکە لە لایەن خەڵکی بازاڕەوە ئەو کردەوەیان بەسووك سەیر ناکرێت.

**گەڕانەوەیەك بۆ سەرەتا:**

لەبەر دا باسمان لەوە کرد کە مرۆڤ هەندێ جار دەکەوێتە نێو هەڵوێستی بێزارکەرەوە، ئەوەتا لە لایەکەوە لە کۆمەڵگەیەکدا دەژی کە بەهای کۆمەڵایەتی و نەریتی خۆی هەیە و، لە لایەکی دیکەشەوە لە قوڵاییەکانی دەروونی دا کۆمەڵێ ئارەزووی تایبەتی هەیە کە پێچەوانەن بە بەها و نەریتەکانی کۆمەڵگەکەی، دەی کەواتە چی بکات؟ سێ ڕێگە هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ چارەسەریی ئەو هەڵوێستە

**بێزارکەرەی پێ بکات:**

١. بەر لە هەر شتێ ، هەوڵ بدات ئارەزوە تایبەتیەکانی سەرکوت بکات و دەریان نەبڕێ بۆ وەی خەڵکی پێی پێنەکەنن یاخود سزای نەدەن. وەلێ هەندێ جار ئەو ئارەزوانە بەهێز دەبن، تا ئەو ڕادەیەی بێئەوەی بەخۆی بزانێت لەدەستی دەردەچن، وەك ئەوەی لە بریتی قاوە، مرەگەب بخواتەوە، یاخود ورد دیقەتی بەژن و باڵای ژنان بدات کە لەشەقامەکاندا بە بەردەمی دا دێن و دەچن.

٢. لەو بارەدا مرۆڤ پەنا دەباتە بەر فێڵی (پاساودان).[١٢]

واتە پەنا دەباتە بەر دروستکردنی بەلگەیەکی ڕواڵەتی یاخود پاساوێکی لۆژیکی تاکو کردەوە ناشیرینەکەی خۆیی پێ بشارێتەوە... وەك ئەوەی دەڵێن بۆیە مرەگەبی خواردۆتەوە چونکە بە سوودە بۆ تەندروستی، یان دەڵێ بۆ گندۆرەی میوەفرۆشەکەی نواڕیوە نەك بۆ سمت و کلۆکی ژنان !!.

٣ـ جاری وا هەیە مرۆڤ ناتوانێ ئارەزوە تایبەتیەکانی سەرکوت بکات، بەڵکو بەجۆرێکی ئاشکرای وا لەژێر کۆنترۆڵی دەردەچن کە خۆیشی ناتوانێ پاساوی بدات، بۆیە هەر چەندە هەوڵ بدات پەردەپۆشی کات ، یاخود پاساوی بدات خەڵکی پێی

پێدەکەنن.. لەوکاتەدا مرۆڤ دەبینێت ناچار بوە بەوەی جیابونەوی خۆی ڕابگەیەنێت لەو کۆمەلگەیەی کە تیایدا دەژی، ئیدی شوێنی ئارەزووەکانی دەکەوێت و گوێ نادات بەوەی خەڵکی چی پێ دەڵێن... ئەوەش یەکەم هەنگاوی دەبێ لەسەرە ڕێگەی (شێت بوون )دا.

**شێوەکانی پاساودان:**

ئەو پاساوەی مرۆڤ بەکاری دێنێت بۆ پەردەپۆش کردنی پاڵنەرە خودیەکانی، شێوەی جۆراوجۆر و ئاستی جوداجودای هەیە، تاچەندە پاڵنەرەکە بەهێز بووبێت ، ئەوەندەش پاساوەکە باڵاترە و زیاتر بەئاسمانی خەیاڵ و نمونە باڵاکان دا دەفڕێت. ئەو کەسەی سەیری لەش و لاری ژنان دەکات، دەڵێ گوایە سەیری گندۆرەی میوەفرۆشەکەی کردوە (وەکو گوتمان)... ئەو کەسەش دژایەتی بیرێکی نوێ دەکات، ئەو دژایەتیکردنە بەوە پاساو دەدات گوایە جیهاد دەکات لەپێناوی خوادا یان لەپێناوی نیشتمان و ڕەوشت و هەقیقەت و ... هتد دا.

گرفتی مرۆڤ لەوەدایە کە تاچەندە زاناتر بێت لە هونەرەکانی قسەزانی دا، ئەوەندەش بە تواناتر دەبێت لە پاساودان و زیاتریش بەکاری دێنێ لە مامەڵەکانی ڕۆژانەی دا... لێرەوە دەرك بە مەترسی ئەو زمان لوسانە دەکەین کە لەمشت و مڕ دا لێزان و کارزانن... ئەمان لە ڕوی پاڵنەرە نەستیەکانیانەوە لەخەڵکیتر جیاواز نین، تەنها ئەوەندە هەیە ئەمان نمونە باڵاکان دەهێننەوە و پێی دەدەن لەگەردنی هەر کەسێك، لە گەڵ پاڵنەرەکانیان دا هەڵ نەکات.

ئەو زمان لوسانە زیانبەخش ترن لە سەر کۆمەڵگە، لە نەخوێندەوارەکان.. چونکە کاورای نەفام و نەخوێندەوار، کاتێ ڕقێکی نەستی لێت بێت، جنێوت پێ دەدات یان زللەیەکت پێدادەکێشێ یان هەر نا خنجێرەکەیت لێ هەڵدەکێشێ... وەلێ کابرای زمان لوسی قسەزان کاتێ هەست بە ڕقێك بکات لەبەرانبەرت دا، وەك نەفامانت لێ ناکات، بەڵکو سڵ ناکاتەوە لەوەی شمشێری بەڵگە ئەقڵی و نەقلیەکانت لە ڕوودا هەڵکێشێ،

ڕەنگە ئەم شمشێرەی ئەم مەترسیدارتر بێت ، لە شمشێرە ئاسنینەکەی کابرای نەخوێندەوار.

**تاقیکردنەوەیەکی سادە:**

ئەگەر بتەوێت لە هەقیقەتی خەڵکی بگەیت و بزانیت چەندە (مەعریفەی جەدەلی)ی کاریگەری هەیە لەسەر هەڵس و کەوتیان، پێویستە لەسەرت تاقیکردنەوەیەکی سادەی کرداری بکەیت، ئەم تاقیکردنەوەیەش هیچ قورساییەکت لەسەر دروست ناکات جگە لەسەرف کردنی کەمێ پارە و پول و هەوڵ و کۆششێکی ئەندك.

نێوەڕۆکی تاقیکردنەوەکەش ئەوەیە:خوانێکی چەور و بەچێژ برازێنیتەوە و جۆرەها خواردن و خواردنەوەی هەمەڕەنگی لەسەر دابنێیت، لەو خواردنانەی لێك بەلادەمدا دێننە خوارێ، لەوکاتەدا هەندێ لە هاوڕێ و ناسیاوەکانت بانگهێشت بکە بۆ سەر خوانەکە و هەندێکی دیکەیان فەرامۆش بکە، باشتر وایە ئەو گروپەی فەرامۆشی دەکەیت لەو کەسە خوێندەوارانە بن کە ڕۆشنبیری و پێگەیشتنی ئەقڵیانەوە دەمدرێژی دەکەن... ئنجا دوای ئەو داوەتە چەند ڕۆژێك چاوەڕوان بکە، ئەو سا دەزانیت ئەو (ڕۆشنبیرە ژیرانە) چیت پێ دەکەن!!.

بەهێزترین گومان بۆ ئەوە دەچێ کە ئەو کەسانە ڕق و تورەییەکی زۆرت لێ هەڵدەگرن، ئیدی ئەو پاساوە ئەقلی و بەڵگە زانستیانە هیچ سودێکیان نابێ کە بۆیان دێنیتەوە. چونکە ئەوان لەو ڕووەوە لە ئەقڵ و زانست تێ ناگەن. تەنها لەوە تێ دەگەن کە تۆ فەرامۆشت کردون و بەسوك سەیرت کردون، لە کاتێکدا ڕێزی کەسانیترت گرتوە و ئەو کەسانەش کە تۆ ڕێزت گرتون لە دێدی ئەماندا شایستەی ڕێز لێگرتن نین.

ئەگەر بتەوێت ئەزمونەکە بەرەنجامێکی ڕون و ئاشکرای هەبێت، چەند جارێك دووبارەی بکەرەوە.. بەوەش کاتێك بەخۆت دەزانیت دۆست و هاوەڵەکانت لێ بوەتە دوژمن، هەموو چاکەکانیشت لەدیدی ئەواندا بونەتە خراپە... بەدبەختیش بۆ کەسێك

بیەوێت لە لای ئەو کەسانەدا بەرەڤانیت لێ بکات، چونکە ئەویش لە بەر چاویاندا وەکو تۆ دەبێتە ناپاکێ بەرانبەر بە نیشتمان، یاخود هەڵگەڕاوەیەك لە دین!!.

**مەبەست لە ئەزمونەکە:**

ئەو ئەزمونە سادە و ساکارە، وەلێ مەبەست و ئامانجێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی گەورەی هەیە... چونکە نمونەی زۆرێك لەو پەیوەندیانەی خۆشەویستی و ڕق لێ بونە کە لەنێو خەڵکدا دروست دەبێت. خەڵکی دەرك ناگەن بەو هۆکارە ڕاستەقینانەی کە هانیان دەدات بۆ ئەو کارانەی پێی هەڵدەستن، تەنانەت لەوانەیە پاڵنەرەکان بە تێپەڕینی ڕۆژگار لە بیر بکەن، وەلێ بەرەنجامە نەستیەکانی لە دەرونیان دا دەمێنێتەوە.. دەبینی باس لە خۆشەویستی خودا و نیشتمان دەکەن، یاخود باس لە هەوڵ دان دەکەن بۆ گەیشتن بە هەق و هەقیانەت. بەڵام هەموو ئەو باس و خواسانەیان نابێتە ڕێگر لە بەردەمیاندا بۆ وەی ئازارت نەدەن یان فێڵ و تەڵەکەت بۆ نەنێنەوە و ناوت نەزڕێنن.. گەر پرسیاریشیان لێبکرێت بۆچی وات لێدەکەن، دیارە لەوەڵامدا دەڵێن لەپێناوی خودا و نیشتماندا ئازار تیان داوە.

جارێکیان لەدوای چاپکردنی یەکێك لەکتێبە پێشوەکانم، چوومە جڤاتێکی گچکەی ماڵی یەکێك لە هاوەڵەکانم... دەم و چاوەکانم بە دڕدۆنگ و گرژ هاتە پێش چاو... هێندەی نەبرد چەند کەسێ لە دانیشتوان دەستیان کردە ڕەخنەگرتنی توند وتیژ لەکتێبەکانم.. لە ڕوخساری دانیشتوەکانیتریشدا وام دەبینی کە زۆریان ئەو ڕەخنانە پێخۆشە و پشتگیری لێ دەکەن... بەڵامێکم بەخت یاوەرم بوو، لەو کاتەدا کۆمەڵێك ڕوونوسی پەرتوکە نوێ کەمم پێبوو کە بەشی هەموو ئامادەبوانی دەکرد، بۆیە بەپەلە ئەو ڕونوسانەم بەسەردا دابەش کردن و لەسەر بەرگی هەر دانەیەك لەو پەرتوکانەش هەندێ ڕستەی ئیعجاب ئامێزم بۆ ئەو کەسە نوسی کە پەرتوکەکەم پێ بەخشی بوو. لەو کاتەدا هەستم کرد ڕووخۆشی و خەندەیەکی کت و پڕیی ڕوخسارەکانی نەخشاند..!!. دواتر تێبینی ئەوەم کرد کە قسەکانیان هێدی هێدی گۆڕرا بۆ ستایش

كردنی من، بەجۆرێك كە لایان بوومە ئەو كەسەی شایستەی ڕێز لێنانم لەبەرانبەر ئەو هەوڵە زانستیانەم دا كە لەپێناوی خزمەتكردنی ئەم وڵاتەدا خستومەتە كار!

تكام وایە خوێنەر وا گومان نەبات كە خەڵكی هەموویان بەو شێوەیەن، چونكە خەڵكی لەم ڕوەشەوە جۆراوجۆرن، وەك چۆن لە ڕوەكانیتریشەوە چون یەك نین. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم : ناچون یەكیەكە لە پلە دایە نەك لەجۆردا. هەندێ خەڵك هەیە پاڵنەرە نەستیەكانیان پاڵیان پێوە دەنێت بەرەو خراپەكاری و دەست درێژی كردن. هەندێكیتریان پاڵنەرەكانیان هانیان دەدات بۆ ڕق لێبوون و سەركۆنەكردنێكی ئاسایی. بەڵام خەڵكی بەگشتی ناتوانن بەتەواوی قوتار بن لە هەستی پاساودان. ئەوەندە هەیە كاتێ مشت و مڕ دەكەن نكۆڵی لەبوونی ئەو هەستە لەخۆیاندا دەكەن. بەڵام لەڕاستیدا درۆزنن، ڕەنگە بەخۆشیان نەزانن كە درۆزنن.

**ناسیاوێكم:**

ناسیاوێكم هەیە، لێوان لێوە لەگرێی دەروونی، سەرەڕای ئەوەی ڕۆشنبیریەكی فراوانی هەیە، گومانی خراپ بەهەموو كەسێ دەبات، هەر جوڵەیەك لە هەر كەسێكەوە ببینێ ڕاڤەیەكی خراپی بۆ دەكات.. زۆر بەدەگمەن دەبینرێ گومانێكی چاك ببات بە كەسێك، ئەم خەسڵەتەش بەڵگەیە لە سەر ناچیزەیی خاوەنەكەی، خۆی ناچیزەیە و، واش دەزانێت هەموو كەس وەك خۆی ناچیزەن.

وا دیارە ئەو ئاشنایەم، لێكۆڵینەوەیەكی باشی نەستی كردوە، وەلێ لەو لێكۆڵینەوەیەی شتێكی دەست نەكەوتوە كە سودی لێ وەربگرێ، بۆیە دەبینی لە زۆربەی كار و كردەوەكانی دا بەگوێرەی ئاماژەكانی گومانە خراپ و گرێ دەرونیەكانی ناخی دەجوڵێتەوە. هەر كە مشت و مڕیشی لەگەڵدا بكەین ، دەست دەكاتە داباراندنی بەڵگەی زانستی و ئەقڵی، و لەوانەشە نەقڵی، تاكو بۆت بسەلمێنێ كە ئەوەی خۆی دەیەوێت ڕاست و دروستە و پێویستە هەموو خەڵك لەسەری بڕۆن، ئەو برادەرەم حەزی لەهەرشتێ بێ‌دەتوانێ بەبەڵگەی جۆراوجۆر بیسەلمێنێت و پشتگیری بكات، گەر واش ڕێ بكەوێ دوای ساتێ‌تر ئارەزوی بچێتە سەر شتێكیتری پێچەوانەی ئەوەی یەكەمجاری، ئەوا

دەستە وسان نابێ لەوەی بەڵگەی زۆر و زەوەند بێنێتەوە، بۆ سەلماندنی ئەمی کۆتایی و، ئەوەی لەبیر دەچێت کەساتێ پێشتر بەڵگەی بۆ مەسەلەیەکی پێچەوانە هێناوەتەوە.

خەسڵەتێکیتری ئەو ناسیاوەم ئەوەیە کە بەهیچ بەڵگەیەك قەناعەت ناکات، جگە لە بەلگەکانی. ئینجا ئەگەر بەلگەیەك وەبیر بێنێتەوە کە پێشتر هێناویەتیەوە و، پێچەوانەوەبێت بەم بەلگانەی بۆ هەنوکە دەیان هێنێتەوە، دەست دەکاتە نکۆڵی لێکردنی و بەلگەهێنانەوە بۆ پشت ئەستوورکردنی ملەجەڕێکەی.. واتە ژیانی فیکری ئەو بوەتە زنجیرەیەك بەڵگەی یەك لەدوای یەك ... بێکۆتایی.

هەمو شتێکی لەخەڵك دەوێت، ناشیەوێت لەبەرانبەردا هیچ شتێ بدات بەو خەڵکە، بێگومان بەلگەکانیشی پشتگیری خواستەکانی دەکەن، لەئەنجام دا وای لێهاتووە زۆرینەی خەڵك ڕقیان لێیەتی.

لەوانەیە زیادەڕەوییم نەکردبێ گەر بڵێم: هەر مرۆڤێ بگری، تووێکی گەورە یان گچکەی لەو خوە تێدایە کە لەو برادەرەماندا بینیمان. هەموو مرۆڤێ گرێی دەروونی تایبەت بەخۆی هەیە، سەرنج لە هەر مرۆڤێکیش بدەی دەبینی هەستی پاساودانی هەیە بۆ داپۆشینی ئەو گرێیە. بەڵام زۆرینەی خەڵك زۆر بەتوندی ناچنە ژێر کاریگەری ئەو پاڵنانەوە، چونکە دەزانن گەر وا بکەن ئەوا کۆمەڵگە تەریزیان لێدەکات و ڕقیان لێ هەڵدەگرێ.

ژیانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە جۆرێك لە (وەرگرتن و بەخشین)، هەر کەس خوازیارە لەژیانی دا سەرکەوتن بەدەست بێنێ پێویستە لەگەڵ خەڵکیدا هەڵبکات و بەو ئەندازەشیان پێ ببەخشێ کە لێیان وەردەگرێت... وەلێ گەر بەتوندی دەست بگرێ بە داواکاریەکانیەوە، گوایە پێویست و ماقوڵن، لەو بارەدا خەڵکیش بەهەمان شێوە ڕووبەڕویان دەبنەوە، بەوەش دنیا لەسەر ئەویش و کەسانیتریش دەگۆڕێت و دەبێتە دۆزەخ.

**پوختەی مەبەست:**

لەکۆتایی ئەم بەشە دوور و درێژەدا، دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کە نەست و کاریگەریەکانی لەژیانی مرۆڤدا، بابەتێکی زۆرگرنگ و پڕ بایەخە و نابێت چاو لەئاستی

دا دابخەین یاخود بەکەم سەیری بکەین، بەرژەوەندی هەر مرۆڤێکیش لەوە دایە لەوبابەتە بکۆڵێتەوە تاکوو سودی لێوەربگرێ لە وەبەرهێنانی بەهرە دەروونیەکانی دا لە لایەك، و لەلایەکیتریشەوە بۆ وەی بتوانێ چارەسەری گرێ دەرونیەکانی خۆی پێ بکات.. وەلێ تێڕامان و لێکۆڵینەوەکەی ناشێت (ئەزبەر)کردن بێت بە مەرەدی ئەو ناسیاوەمان کە ئاماژەمان پێدا... چونکە هەر شتێکی ئەزبەرکراو لەوانەیە سودیش بگەیەنێ و زیانیش. هیچ چاکەیەك لە زانینێکدا نیە کە مرۆڤ لەسەر کەسانیتر پیادەی بکات و بەخۆی هیچ کەڵکێکی لێ وەرنەگرێت.

## پەراوێزەکانی پاشکۆی چوارەم:

١ـ نەست و ئاوەزی ناوەکی دو وشەی هاوواتان، ئەوی شیاوی باسە یەکەم کەس کە واژەی (ئاوەزی ناوەکی) لە وڵاتانی عەرەبی دا بەکار هێنا بریتی بوو لە (سلامە موسی)ی خوا لێخۆشبوو، وەلێ لەکۆتا ڕۆژگارەکانی دا وازی لەو واژەیە هێنا و دەستی کردە بانگەشە کردن بۆ بەکارهێنانی (العقل الکامل) گوایە ئەم واژەیەی کۆتایی پتر واتا بەخشە.. ئەم بانگەشەیەی لە لایەن زۆرینەی نوسەرانی عەرەبەوە گوێی پێ نەدرا، دوای ئەوەی بەکارهێنانی یەکەم واژە لەنێو خەڵکی دا بڵاوەی کرد.. من بۆ خۆم ڕاهاتووم لەسەر بەکارهێنانی هەر دوو وشەی (نەست) و (ئاوەزی ناوەکی) بەبێ جیاوازی، ئیدی باکم نیە بەوەی ئەمیان یان ئەویتریان ڕاست نەبێ، مادەم خوێنەران لێی تێدەگەن و لەنێویاندا بڵاوە، ئەمەش یانی من پەیڕەوی لەم ڕێسایە دەکەم کە دەڵێ (هەڵەیەکی بەربڵاو چاکترە لە ڕاستیەکی پشت لێکراو).

٢ـ بنواڕە: Tyrell, Personality Of Man, P 26

٣ـ بەڕاستی وەزارەتی (مەعاریف) گوناهە!! چونکە ئەگەر بەدەم هەموو ئەو داخوازیانەوە بچێت کەلێی دەکرێن، ئەوا لە پرۆگرامی قوتابخانەکانی دا تۆزقاڵێک زانیاری نامێنێتەوە.

٤ـ بنواڕە: احمد فهمي ابوالخير، السیکولوجیا و الروح، ل ١١ ـ ١٢.

٥ـ بنواڕە: Macdogal, Psychoanalysis and Social Psychology, P 18 – 19.

٦ـ بنواڕە: یعقوب فام، المذهب السلوکی، ل ٢ ـ ٤.

٧ـ بنواڕە: سلامة موسي، اسرار النفس، ل ١٩ ـ ٩٢.

٨ـ بنواڕە: یعقوب فام، المذهب السلوکی، ل ٦.

٩ـ بنواڕە: داود سلام، الادب العراقي، ل ٦٨.

١٠- بنوارِة: احمد امین، ضحي الاسلام، ج ٢، ل ١٢٢ - ١٢٤.

١١- بنوارِه: القرآن، سورة سبأ، آیه ٢٤.

١٢- بنوارِه: زانایان (فێڵی پاساودان)یان ناو ناوه (Rationalzation) ئەمیش واژەیەكی داتاشراوە لە وشەی (Ration)ەوە كە بەمانای ئەقڵ (ژیری) دێت.



## پاشکۆی پێنجەم:

## لەنێوان دێوانەیی و بلیمەتی دا

### دید و بۆچوونێ:

لەمانگی ئەپریڵی ساڵی(١٩٥٨ز)دا، مامۆستایەکی پسپۆڕی دەروونزانی کۆوتارێکی گشتی لەهۆڵی کۆلیژی زانست دا پێشکەش کرد، لەو کۆوتارەدا باسی لە نەست و کاریگەریەکانی نەست کرد لەسەر ڕەفتار و هەڵس و کەوتی مرۆڤ... لەبڕگەیەکی گوتەکانی دا بەم شێوەیەدوا: "کاریگەری نەست پێچەوانە دەگونجێت لەگەڵ ڕۆشنبیری و تەندروستی دەروونی کەسەکە دا، تاچەندە مرۆڤ خاوەنی ئەقڵ و بیری خۆی بێت، ئەوەندەش کاریگەری نەست لەسەر ڕەفتاری کەم دەبێ... کە گوتمان نەست کاریگەری دەبێ لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ، یانی کاریگەری ئەقڵ و بیر لەسەر ڕەفتاری لاوازە... ئەمەش بە حەتمی لەگەڵ سەرنجێکی سادەی ژیانی ڕۆژانەی تاکەکاندا دەگونجێ".

مامۆستا بەم جۆرە لەسەر گوتەکانی بەردەوام بوو گوتی: "بەڵێ، نەست هەوڵ دەدات لە ناوچەی هەست دا کار بکات و بەدەر بکەوێت، وەلێ چاودێرێك هەیە و بەربەستی لێ دەکات، ئەو چاودێرەش ئەقڵە، کان" تا دەڵێت: "تەنها لەیەك باردا نەست ئاراستە و کۆنترۆڵی ڕەفتاری مرۆڤ دەکات ئەویش لەو کاتەدا کە مرۆڤ ئەقڵی نەخۆش دەبێت" [١].

### ڕەخنە و توانجێك:

مامۆستا ئاوهای گوت: ...قسەکەیشی ڕاستە گەر ئێمە بەو واتا تایبەتە لەنەست تێبگەین کە زانا دەروونناسەکان بە باڵایدا بڕیویانە. ئەو زانایانەش، شاردراوە نیە کە چەمکی نەست کورت دەکەنەوە لەو گرێ و ئارەزوو و حەزە خەفەکراوانەدا کە لەتەك چەمکەکانی ئاوەزی وشیاردا ناکۆکن، بەو پێودانگەش، نەست زاڵ نابێ بەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤ دا، لەحاڵەتی لاوازی ئەو ئاوەزە و ، نەخۆش بوونی دا نەبێ.

هەر چۆن بێت ئێمە دەتوانین لەو قسەیەی مامۆستادا دووخاڵ هەڵبهێنجین:

یەكەم: كاریگەری "نەست" پێچەوانە دەگۆڕێ لەگەڵ ڕۆشنبیرێتی تاك دا.

دووەم: كاریگەری (نەست) لە لایەنە بەدەكانی ڕەفتاری مرۆڤدا كورت هەڵدەهێنرێ، كەواتە نەست زیان لە مرۆڤ دەدات و سوودی پێ ناگەیەنێت. لەبەشەكانی ڕابردووی ئەم پەرتوكەدا خوێنەر ئەوەی لا ڕوون بوەتەوە كە بەندە ناكۆكم لەگەڵ مامۆستادا لەو دوو خاڵەدا، ڕا و بۆچوونی هەندێك لەو زانایانەشم گواستۆتەوە كە پشتگیری بۆچونەكەی من دەكەن، هەر چۆنیك بێت نازانم كاممان ڕاستیمان پێكاوە و كامیشمان بەهەڵەدا چووین.

وەك لەبەردا ئاماژەم پێدا، من بڕوام وایە، ڕۆشنبیری هەندێ جار هیچ سوودێكی نابێ لەخەفەكردنی ئەو پاڵنەرانەی لەنەستەوە هەڵدەقوڵێن، چونكە لەوانەیە لەم ڕووەوە ڕۆشنبیرێك جیاوازی نەبێ لەگەڵ برادەرێكی نەخوێندەواری دا، تەنانەت لەوانەیە ڕۆشنبیری یارمەتی خاوەنەكەی بدات بۆ پاساودانی ئەو كارانەی دەیانكات هەر لە ڕق و كینە و ڕژدی و حەسادەتەوە تا ... هتد، بەوەش دەرگای ئەو ڕێگەیەی لێ دەكاتەوە كە خۆی بداتە دەم داخوازیەكانی ئارەزوە خەفە كراوەكانیەوە و، دواتریش بالۆرەی ئەوە لێ بدات كە لەپێناوی هەق و هەقیقەت دا ئەو كارانەی كردووە.

لەبەشی ڕابردوودا، باسی ئەو ڕۆشنبیرە خوێندەوارەم گێڕایەوە كە لێوان لێوە لە گرێی دەروونی، باسم لەوە كرد كە چۆن خۆی دەداتە دەم گرێ دەرونیەكانیەوە و دواتر بەلگە و پاساو دێنێتەوە بۆ پشتگیری كردەوەكانی.. نمونەی ئەم ڕۆشنبیرە دەگمەن نیە ، لە نێو برادەرە ڕۆشنبیر و مامۆستا و موجتەهیدە مەزنەكانماندا. تەنانەت لەوانەیە ڕق لەیەكتر بوون و ململانێی ناچیزانە لە نێو ئەمانەدا زیاتر بێت تاكو لای خەڵكە بازاڕیەكە... ئەوەندە هەیە خەڵكە بازاڕیەكە ڕوهەڵماڵراون و پاڵنەر و هاندەرە نەستیەكانیان بەسەر ئەدگارەكانی ڕوخسار و زاربادانەكانیانەوە دەردەكەوێت...وەلێ ڕۆشنبیرەكان دەتوانن ئەوەی لە ناخیاندایە دەری نەبرن. بەدەربڕینێكیتر: ڕۆشنبیرەكان بەتواناترن لە داپۆشین و پەردەپۆش كردنی پاڵنەرە شاردراوەكانیان،

بەهۆی ئەو زانیاریە جوانانەوە کەمێشکی خۆیانیان لێ پڕ کردوە. هەر لەبەر ئەوەش دەبینین بەڵای ئەمانە لەسەر کۆمەلگە سەختتر و مەترسیدارترە... زۆر بەداخەوە...

**خاڵی دووەم:**

سەبارەت بەخاڵی دووەمی نێو گوتەکانی مامۆستا، من پێم وایە کاریگەری (نەست) تەنها لە لایەنە خراپەکانی ڕەفتاری مرۆڤدا کورت هەڵناهێنرێ، بەڕای من (وەك لە پێشەوەش ئاماژەم پێداوە) نەست بریتی‌یە لە گەنجینەیەکی گەورە و، لە قوڵاییەکانی دا پێك هاتوە لەشتی زیان بەخش و بەسوودیش. هەندێ جار لایەنە بەسوودەکان زاڵ دەبن بەسەر دەروونی گرۆهێکی خەڵکدا و، دەیانکەنە بلیمەت یاخود دەیانکەنە خاوەنی بەهرەی نائاسایی، لەو لاتر لایەنە زیان بەخشەکان بەسەر دەروونی دەستەیەکی دیکەی خەڵکی دا زاڵ دەبن و پاڵیان دەنێن بەرەو تێکچوونی دەماری یاخود بەرەو شێتی و دێوانەیی.

ئەمە ڕای زۆرێك لە توێژەر و زانایانە، لەو ڕوەشەوە لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەیان کردوە و لێرەدا بواری ئاماژەپێدانیان نیە. تەنها لەم بەشەدا بەوەندە دەست کۆتا دەکەم کە سەرنجەکان چڕ بکەمەوە لەسەر لایەنێکی ئەو لێکۆڵینەوانە، ئەویش بریتی‌یە لە ڕوەکانی جیاوازی و لێکچون لەنێوان (بلیمەتی و شێتی)دا، هەر کام لە (بلیمەتی و دێوانەیی) لەیەك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن، سەرچاوەکەش بریتی‌یە لە (نەست).

لێرەدا تکام وایە لەخوێنەر، چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەکات ،بەهەمان شێوە ڕاڤەی نێو پەرتوکە زانستیەکان، ڕاڤەی ئەم بابەتە بکەم. چونکە سودێ لەو شێوە نوسینەدا نابینم بەتایبەت کەمن بۆ خوێنەرانی هەمەچەشن دەنوسم نەك بەتایبەت بۆ زانایان... لەهەموو پەرتوك و وتار و کۆوتار و کۆڕەکانمدا شێوازی ئاسانکردن و ساکارکردنەوە و ڕون کردنەوە و دووبارە کردنەوەم پەیرەو کردووە، ئەمەش شێوازێکە، هەندێ لە مامۆستایان پێی قایل نابن بەو بەلگەیەی کە لەگەڵ وردبینی زانستیدا وێك نایەتەوە. وەلێ من گوێ نادەم بەوەی ئەوان چی دەڵێن، چونکە بەلای منەوە ئەم شێوازە بەسوودترە بۆ خەڵکی لەو شێوازە وشك و برینگ و پڕ لە گرێ و تەم و مژەی هەندێ

لە مامۆستا بەڕێزەکان پەیڕەوی دەکەن.. چونکە من بازرگانم و ئەوان زانان. دەی کەواتە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەسەر خراپە ، جگە ئەو سوپاسی کەسی دیکە ناکرێ.

**ئەفسانەیەکی کۆن:**

لێرەدا ئەوەی شیاوی باسکردنە، ئەوەیە کە عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی هەر یەک لە (بلیمەتی و شێتی)یان دەدایە پاڵ کردەوەی پەری (جنۆکە). لای ئەوان دێوانە (شێت) پیاوێکە جنۆکە دەپەڕنە مێشکی‌یەوەو یاری بە ئەقڵی دەکەن، وەلێ بلیمەت (العبقری) پیاوێکە نیگای ئەفراندنەکانی لەدۆڵی (عبقر)ەوە وەردەگرێ. دۆڵی (عبقر) دۆڵێ بوو عەرەبەکان بڕوایان وابوو پەریەکان لەوێندەر نیشتەجێن.

تەنها عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی نەبوون، ئاوا بڕوایەکیان هەبێ، بەڵکو وشەی بلیمەت لە زۆرێك لە زمانە (ئیفرنج)یەکاندا نزیکە لە وشەی (جن)ی عەرەبییەوە.. لە زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی دا بە (عبقری) دەڵێت: (جینس) یاخود (جینی)، ئەم وشەیەش بەجیاوازی فۆرمەکانیەوە لەبەرانبەر وشەی (دیمون)ی ئیگریکی دایە کە بەواتای (شەنینە یا خود شەیتان) دێت.[٢]

قەیمیەکان تەنها بەوەندە دەستیان کۆتا نەکردووە، بەڵکو بەشێوەیەکی زۆر سەیر بلیمەتێتی و دێوانەییان تێکەڵ بەیەکتر کردبوو، هەندێ لە شێتەکانیان کردبوە بلیمەت و بەپێچەوانەشەوە، مێژوو باسی زۆرێك لەو بلیمەتانەمان بۆ دەکات کە لەسەرەتا دا بە (شێتی) تۆمەتبار کراون.

بەشێوەیەکی گشتی، گرفتی خەڵك لەوەدایە کە دەیانەوێت هەموو مرۆڤێك لە خوو و نەریت و بیر و بۆچوونەکانی دا وەك ئەوان وابێت، لەو کاتەدا بە ئاقڵ و (ژیر) ناوزەدی دەکەن.. وەلێ هەر ئەوەندەی کەمێك لە نەریتە باوەکانی ناو ئەو خەڵکە دەرچوو ئەوا دەست دەکەن بەگاڵتە پێکردنی و بەشێت لە قەڵەم دانی، لەوکاتەدا هیچ گوێ بەوە نادەن ئایا ئەو مرۆڤە هەر بەڕاستی شێتە یان بلیمەتە.. گەر لە دوایی دا بۆیان ڕون بویەوە کە لادان و ڕیزپەڕ بوونەکەی لە جۆری باڵا بووە و، بەڕاستی داهێنەرێکی گەورە

بووە، با دەدەنەوە بەلای گەورەکردنی دا، ئەمە دوای ئەوەی گالتە و سوکایەتیان پێ کرد.. خەڵکی جار لەدوای جار و وەچە لەدوای وەچە ئەم نەریتە بە بێ شەرمانە و بێپەشیمان بوونەوە دووبارە دەکەنەوە.

## ئاقڵ کێیە؟:

وەك گوتمان، خەڵکی ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی ناوی (ژیر) بنێین لەهەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵ بەها کۆمەلایەتی و خوو و نەریتەکانیان دا خۆ دەساچێنن... دایکان هەر لەدێر زەمانەوە ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی بەرگری بکەن لەوەی منداڵەکانیان هەر کردارێکی پێچەوانە بە خوو و نەریتە باوەکان بکەن.. هەر منداڵێك کارێکی پێچەوانەی نەریتەکان بکات، دایکی دەکێشێ بە سەر دەستی دا و پێی دەڵێ (عەیبە)!!. وەلێ گەر کارێکی گونجاوی کرد ئەوا دەست دەهێنێ بەسەر شانی دا و بزەیەکی بۆ دەکات و، شیرینییەك یاخود پارەیەکی وەکو دەست خۆشانە پێدەبەخشێ.

کاتێ زارۆ گەورەش دەبێ، هەمان ئەو شتە لەکۆمەڵگە وەردەگرێ کە لەسەردەمی منداڵێتی دا لەدایکی وەرگرتوە. خەڵکی بەئەندازەی گونجانی لەتەك بەها باوەکاندا ڕێزی دەگرن و بەئەندازەی پێچەوانەبوونیشی لەگەڵ ئەو بەهایانەدا بەسووکی سەیر دەکەن، زۆر جار کەسایەتی مرۆڤ لەسەر ئەو بناغەیە دروست دەبێ... لێرەوە دەبینن کەسی (ژیر)ی ئاسایی لەمیانەی ئەو دەلاقەیەوە لە مەسەلەکان دەڕوانێت کە کۆمەڵگە بۆیان دروستکردوە، و هەرگیز حەز ناکات لەو چوارچێوەیەش لا بدات.

## مرۆڤ و شەرم:

مرۆڤ بەوە لە ئامۆزا ئاژەڵەکانی تری جیا دەبێتەوە، کە ئەم ئاژەڵێکی شەرمنە. چونکە هەمیشە ئارەزووی لە وەیە نەریت و بەها باوەکانی نێو خەڵکی لەبەر چاو بگرێت شەرم دەکا لەوەی لەو نەریتانە دەربچێت بۆ وەی خەڵکی پێی پێنەکەنن. هەر ئەمەش وای کردووە دەرکەوتن و دروست بوونی کۆمەڵگە لەنێو ئادەمیزاد دا گونجاو بێت.

لە ڕاستی دا هەر مرۆڤێ بگری لە قوڵاییەکانی ناخیدا، ئارەزوگەلێ یاساغ و قەدەغەی هەیە و دەخوازێ لە دەرچەیەکەوە هەناسەیەکیان پێ بدات، هەروەها ئارەزووییەکی پەنهانیشی بۆ نوێ بوونەوە و داهێنان لەهەناو دایە، ئیدی ئەو ئارەزوە کەم بێت یان زۆر... مادەم مرۆڤ لەکۆمەڵگەیەکدا دەژی کە خاوەنی کۆمەڵێ بەهای دیاری کراوە، ئەوا هەر لەنێو ئەو بەهایانەدا هەندێ بەربەست دەبینێ کە دەبنە ڕێگر لەوەی ئارەزوە یاساغەکانی تێر بکات... کەوابێ ناچارە بەوەی ئەو هاندەر و ئارەزوانە سەرکوت و خەفە بکات و نەیانخاتە بەرچاوی خەڵکی، لەترسی ئەوەی نەبادا لەبەر ئەو ئارەزوانە خەڵکی ڕقیان لێی بێت و بەسوك سەیری بکەن.

لێرەدا نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئەم ڕێسایە، ڕێسایەکی گشتی نیە یاخود ڕێسایەك نیە هەڵا بواردنی تێدا نەبێ... جاری وا هەیە لەکۆمەڵگەدا کەسانێك وەدەر دەکەون (سروشتی شەرمنێتی) تیایاندا لاوازە.. بۆیە بێ‌پەروا شوێنی ئەو هاندەرە نەستیانە دەکەون کە لە قوڵاییەکانی دەرونیانەوە زریان دەکات... هاندەرەکانیش لەوانەیە زیان بەخش بن، لەوکاتەدا هاوەڵەکەمان شێت دەردەچێ، یان بەپێچەوانەوە هاندەرەکە بەسود بێ هاوڕێ کەمان دەبێتە بلیمەت.

پرسیارێ کە ڕەنگە لێرەدا بکرێ ئەمەیە: ئەم جیاوازیە بۆچی لەنێو خەڵکیدا هەیە؟ بۆچی لەکاتێکدا کۆمەڵێکیان ڕوە و شێت بوون دەچن، کۆمەڵێکی دیکەیان ملی ڕێی بلیمەتی دەگرن؟

**خاڵی دەستپێکردن:**

هاوڕێەکم هەیە لەخوێندنی زانکۆدا پێکەوە بووین، لەخوێندن دا زۆر لاواز و سست بوو، ئەمەش وای لێکرد واز لەخوێندنی زانکۆ بهێنێت و، بەشکست خواردوویی بگەڕێتەوە بۆ (بەغدا)... ماوەیەکی زۆر تێپەڕی هیچم لەبارەی ئەو هاوەڵەمەوە نەدەزانی و لێی بێئاگا بووم... لەم دواییانەدا ڕۆژێك لەناکاو هات بۆ ماڵەوە و کاغەزێکی بچوکی لە باخەڵ دابوو، دەیگوت گوایە دۆزینەوەیەکی گەردونی مەزنی تێدایە.

هاوڕێکەم دەستی کردە سکاڵاکردن لەدەستی خەڵك ، کە دژایەتی خۆی و بەرهەڵستی و بەربەرەکانێی دۆزینەوە مەزنەکەی دەکەن... هاوڕێکەم باسی ئەوەی دەکرد کە،

چوەتە لای هەندێ لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان و داوای لێکردون دۆزینەوە گەورەکەی بۆ خەڵکی بڵاو بکەنەوە، وەلێ ڕۆژنامەکان داواکاریەکەیان ڕەت کردۆتەوە.. بۆیە هاتوە بۆ لای من داوام لێ لێبکات تاکو هاوکاری بکەم و یارمەتی بدەم لە بڵاوکردنەوەی دۆزینەوەکەی دا، لە ڕێ ڕۆژنامەکانەوە تاکو خەڵکی سودی لێ ببینن و زانیاری مرۆڤ گەشە بکات.

سەیری کاغەزەکەم کرد هیچم تێدا نەبینی، جگە لەهەندێ دێڕی بێ ناوەڕۆک لەبارەی هەیڤەوە. دواتر بۆم دەرکەوت هاوڕێکەم شێتە و، وا گومان دەبا ئەو دێڕە پوچانە دۆزینەوەیەکی گەردونی مەزنن... لەئەنجامی شکست هێنانی لە خوێندنی زانکۆدا ، گرێیەکی دەروونی بەهێز بەسەری دا زاڵ ببوو.. ئەو هیوای ئەوە بوو ببێتە زانایەکی بەناوبانگ و بەئەنگوست ئاماژەی بۆ بکرێ... وەلێ سەرکەوتوو نەبوو لە هیواکەیدا... ئەم ئاواتەش پاڵی پێوە ناوە تاکو لە ڕێی مانگەوە هەوڵ بدات بەدوای ناوبانگی زانستی دا !.

کاتێ سەرنجی بلیمەتە ناودارەکان دەدەین، دەبینین لەسەرەتا دا لەم هاوڕێیەی من دەچن... زۆر پێداگری دەکەن لە دۆزینەوەی شتێکی نوێ دا و، بەجۆرێکی سەیر پێیەوە سەرقاڵ دەبن، بە ئەندازەیەك سەرقاڵ دەبن خەڵکی گاڵتەیان پێ بکەن.. وەلێ لەکۆتایی دا سەرکەوتن بەدەست دێنن و ئەوەی گەرەکیان بوە دەستگیریان دەبێت، ئیدی دید و بۆچوون و تێڕوانینی خەڵکیش لە ئاقاریاندا دەگۆڕێت، لە شەو و ڕۆژێکدا لە شێتەوە دەبنە بلیمەت، خەڵکیش بۆیان پێ دەکەنن، لە بری ئەوە پێیان پێ بکەنن.

**چیرۆکی دۆزینەوەی چەتر:**

بێگومان ئەو (چەتر)ەی خۆمانی پێدەپارێزین لەباران دۆزینەوەیەکی گرنگە. دۆزەرەوەی ئەم داهێنانەش دەبێ کەسێکی بلیمەت بووبێ، لانی کەم لەکاتێکدا بەم دۆزینەوەیە هەستاوە... کاتێ لەو ماوەیەی ژیانی دەکۆڵینەوە دەتوانین هەندێ لە ڕوەکانی وێکچون و جیاوازی لە نێوان (دێوانە و بلیمەت) دا بدۆزینەوە.

ئەو قسەیە ڕاستەكە بڵێین داهێنەری (چەتر) لە هیچەوە داهێنانەكەیی نەكردوە، بەڵكو وەكو هەر داهێنەرێكی دیكە ، دوو بیرۆكەی كۆن لە ئاوەزی ناوەكی دا یەكیان گرتوە و، بیرۆكەی داهێنانەكەیان لێ كەوتۆتەوە. وا دیارە زۆر سەیری ئەو ڕێبوارانەی كردوە كە لەكاتی باران بارین دا بەشەقامەكاندا ڕۆشتون... دوو شت سەرنجیان ڕاكێشاوە. یەكیان ئەوە بووە كە ڕێبوارەكان هەر یەكە و شتێ دەگرن بە سەریانەوە بۆ ئەوەی لە دڵۆپەكانی بارانەكە خۆیان بپارێزن.. دوەمیش ئەوە بوو كە هەندێكیان داردەستێك بە دەستەوە دەگرن تاكو خۆیان بپارێزن لە خلیسكان... لێرەوە بیرۆكەیەك بەمێشكی ئەو برادەرەماندا هاتوە كە شتێ دا بهێنێ ... هەم داردەست (گۆچان) بێت و هەم سەرچەفێ بێت بۆ پاراستن لەباران، لەوانەیە بێئەوەی خۆیشی بزانێ، ئەم بیرۆكەیەی دوای بینینی ئەو چەترە نەخشێنرا وانە بۆ هاتبێ، كە سوڵتانەكانی ڕۆژهەڵات لە كەژاوە قەشەنگەكانیان دا هەیان بوو... بەڵام ئەم سەرچەفە نەخشێنراوەكەی گۆڕیوە بەو سەرچەفەی كە بە پێی خواست دەتوانرێت بپێچرێتەوە و بڵاویش بكرێتەوە.

گومان لەوەدا نیە، خەڵكانێكی زۆر ئەو بیرە جوانەیان بەمێشك دا هاتوە، بەڵام لە قوڵاییەكانی ناخیان دا شاردوویانەتەوە و كاریان بۆ بەرجەستەكردنی نەكردوە، لەترسی ئەوەی خەڵكی پێیان پێ بكەنن... وەلێ ئەم برادەرەمان ئەو بوێریەی كردوە و بیرۆكەكەی خستۆتە بواری كردارییەوە بە بێترس و شەرم.

هیچ سەیر نیە گەر خەڵكی لەسەرەتاوە ئەم بلیمەتە بەشێت تۆمەتبار بكەن، و منداڵان بەدوایدا ڕابكەن و بەردی بۆ بهاوێژن... كە هەر بەڕاستیش وایان دەرهەقی كرد... چونكە ئەو دەرچوە لە بەها باوەكانیان... وەلێ نەهاتووە لە ڕێی (چاوبڕینە) لە مانگەوە داوای ناوبانگ بكات، وەك هاوڕێ شێتەكەی من، بەڵكو لە ڕێی ئەفراندنێكەوە كە سود بەخەڵكی دەگەیەنێت داوای ناوبانگی كردوە... بەوەش بوەتە بلیمەت!

### هۆکارەکە چی‌یە؟:

جارێکی تریش دەگەڕێینەوە سەر ئەم پرسیارە: ئەو هۆکارە چی‌یە کە جیاوازی خستۆتە نێوان ئەو دوو کەسەوە ، یەکێکیانی بەڕێگەی شێت بوندا بردوە و ئەوی دیکەشیان بەڕێگەی بلیمەتی دا؟

(فرۆید) بڕوای وابوو، هەر یەك لە (بلیمەتی و دێوانەیی) بەرەنجامی ئارەزویەکی خەفەکراون، بەڵام (شێت) هەوڵ دەدات لە ڕێی وەهمەوە هەناسە بدات بەو ئارەزووەوە، لەکاتێکدا کەسێکی (بلیمەت) لەڕێگەی هەوڵدان و داهێنانی بەسودەوە ئەو هەوڵە دەدات.

(ئەدلەر)یش ڕایەکی هاوشێوەی هەیە ، لەلێکدانەوەی شێتی و بلیمەتی دا، تەنها ئەوەندە هەیە (گرێی خۆبەکەم زانین) دەخاتە بریتی (ئارەزوی خەفەکراو).. بەڕای ئەمیش هەر یەکە لە (دێوانە و بلیمەت) دووچاری ئەو گرێیەن و هەر یەکێکیان هەوڵ دەدەن بەشێوازی تایبەت تێری بکەن.

هەر چۆن بێ، ئێمە ناتوانین بەو بۆچونەی (فرۆید) و (ئەدلەر) گرفتەکە چارەسەر بکەین، سەرەڕای ئەوەی بەڕواڵەت ڕایەکی جوانن.. چونکە هێشتر دەستەوسانین لەوەی ئەو هۆکارە بزانین کە وا دەکات لەکەسێك، پەنا بەرێتە بەر وەهم بۆ هەناسەدان بە گرێکەی یاخود بە ئارەزوە خەفەکراوەکەی، و لە ولاتر کەسێکی تر هان دەدات تاکو پەنا بەرێتە بەر کۆشش و داهێنان... هەر یەکە لە (فرۆید و ئەدلەر) جیاوازی ئەو ڕێگەیان باسکردوە کە هەر یەك لەشێت و بلیمەت دەیگرنە بەر بۆ گەشتن بەیەك ئامانج... وەلێ هۆکاری ئەم جیاوازیەیان ئاماژە پێ نەداوە.

### زیرەکی و بلیمەتی:

هەندێك لە توێژەران ڕایان وایە (بلیمەت) کەسێکە بەشێکی گەورەی زیرەکێتی هەیە، هەر ئەمەش وای لێکردوە، جیاواز بێت لە شێت، بەتایبەتی لەشێوازی هەناسەدان بە ئارەزوە خەفەکراوەکانی دا... ئەم، بە زیرەکێتی خۆی دەرکی بەو ڕاستییە کردوە کە

وەهەم هیچ سودێكی پێناگەیەنێت لەوە داگە ناوبانگ لەنێو خەڵكی دا پەیدا بكات. سەرباری ئەمەش، توانای ئەوەی هەیە كاری داهێنەرانەی وا بكات كە لەنێو خەڵكی دا ناوبانگی پێ پەیدا بكات. ئێمە هەر كات ویستمان دەست بەو ڕایەوە بگرین و پەسەندی بكەین، پێویستە بپرسین: ، ئایا هەموو بلیمەتەكان زیرەك و بیرتیژن، وەك هەندێ وا گومان دەبەن؟

ئەو لێكۆڵینەوانەی هەندێ لە زانا دەروونناسەكان پێی هەستاون، دەریانخستوە كە پەیوەستەگی تا ڕادەیەك لاوازە لەنێوان ڕادەی زیرەكێتی و بلیمەتیی دا.. ئەمەش ڕاستییەكە لەوانەیە خوێنەر پێی سەرسام بێت، چونكە لەنێو خەڵكی دا بڵاوە هەموو (بلیمەت)ەكان، زۆر زیرەك و بیرتیژن.. وەلێ ئەم ڕایە، ڕایەكی هەڵەیە.

ئێمە نكۆڵی ناكەین لەوەی هەندێ لەبلیمەتەكان زۆر زیرەك بوون، وەلێ هەندێكیتریشیان زیرەك نەبوون.. لانی كەم بەگوێرەی ئەو پێوەرەی كە خەڵكی زیرەكێتی پێ پێوانە دەكەن... ئەو توێژینەوەی مامۆستا (دكتۆرە كوكس) مامۆستا لەزانكۆی (ستانفۆرد) پێی هەستا، ڕون بویەوە كە زۆرێك لە بلیمەتەكان پلەی بەرزی تاقیكردنەوەی زیرەكێتییان بەر نەكەوتوە.[٣]

لەراستی دا كاتێ پەیوەست دەبین بەهەندێ لە بلیمەتە مەزنەكانەوە، لە هەڵس و كەوت و جمو جوڵەكانیان دەكۆڵینەوە، لە ڕویەك لە ڕوەكانەوە هەست بەنادانی و گەمژەیەتی دەكەین تیایان دا. زۆر جار دەبینین ئەو بلیمەتانە لەساكارترین مەسەلە بێ ئاگان و لەهەندێ مەسەلەی دیكەش حاڵی نابن كە هەر كەسێكی ئاسایی بگری لەو مەسەلەیە بە ئاسانی تێدەگات .. چەندین جاریش مێژوو باسی ئەوەمان بۆ دەكات كەچەندین كەسی بلیمەت هەبوون و كەس و كاریان لەسەرەتاوە بێئومێد بوون لێیان لەبەر تەمبەڵی و بیركولییان.

پرسیارێ لێرەدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەمەیە: ئایا ئەو ناتەواوی زیرەكیەی بەرواڵەت لەهەندێ كەسی بلیمەت دا دەبینرێ، ناتەواویەكی ڕاستەقینەیە، یاخود ناتەواویە لەو پێوەرەدا كە زیرەكی ئەوانمان پێ پێواوە؟!.

ئاسایی ئەو پێوەرەی زانایانی دەروونناسی بەکاری دێنن بۆ پێوانە کردنی زیرەکی، ئەو جیاوازیە دەردەخات کە لەو زیرەکیە دایە کە لەناو خەڵکی دا بڵاوە، پشتیش بەو زانیاریانە دەبەستێ کە خەڵکی دەماودەمی پێ دەکەن و لەبەر دەستیان دایە لەو شارستانێتی‌یەی تیای دا دەژین... جا ئایا ئەو پێوەرە دەگونجێت بۆ تاقی‌کردنەوە و پێوانەکردنی زیرەکێتی بلیمەتەکان کە لەوانەیە جۆرە زیرەکێتی‌یەکی تایبەت بەخۆیان بێت؟!

گرفتی بلیمەتەکان لەوە دایە کە هەر یەکیان تایبەتمەندی لە بابەتێك دا پەیدا دەکات و تەواو تیای دا ڕۆ دەچێت تا ڕادەیەك جگە لەو بابەتانە هەموو شتێکی دیکە فەرامۆش دەکات. ڕەنگە هەر ئەمەش وایان لێ بکات لەبەر چاوی خەڵکی دا بەدەبەنگ سەیر بکرێن... وەلێ هەر چۆن سەیر بکەین، ناتوانین لەپەیوەندی (زیرەکێتی ـ بلیمەتی) تێبگەین، تاکو لەسروشتی زیرەکێتی تێنەگەین.. ئایا لە هەموو خەڵك دا یەك پێوەری هەیە؟ یاخود پێوەرەکەی دەگۆڕێ بەگوێرەی ئەو هونەرەی کە هەر کەسێ تیای دا شارەزایە.

**بلیمەتی و تێکچوونی دەرونی:**

هەندێ لەزانا دەروونناسەکان ڕایەکیان هەیە سەبارەت بە بلیمەتەکان کە بەڕاستی جێگەی سەرنج و تێڕامانە. ئەو زانایانە پێیان وایە بلیمەتێتی بارێکی ساغی کەسێتی مرۆڤ نیە!!. بەڵکو یەکێکە لە ڕواڵەتەکانی تێکچونی دەرونی... ئەمەش هۆکاری ئەو ڕەفتارە ڕیزپەڕ و نامۆیانەیە کە زۆر جار لەکەسانی بلیمەتی دەبینین و، دەبنە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ ئاکاری کۆمیدی لەو کەسە بلیمەتانەدا کە دروست لە ڕەفتاری شێت و گەلحۆکان دەچێت.

بەڕای ئەو زانایانە کەسی بلیمەت ،لەوانەیە جۆرێکی تایبەتی زیرەکێتی هەبێت، وەلێ لەگەڵ زیرەکێتی‌یەکەی دا تێکچونێکی دەرونیشی هەیە کە دڵەڕاوکێ و ئاڵۆزی دەماری تێدا دروست دەکات و دەبێتە هۆی هەمیشە ئازار بچێژێت و لەژیانی کۆمەڵایەتی دا ئاسودە نەبێت.. مامۆستا (کرسشمر) دەڵێت: "گەر بێت و کەسی بلیمەت

دابڕنین لەو دڵەڕاوكێ شەیتانی و ئاڵۆزیە دەرونیەی، ئەوا هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لەكەسێتی‌یەكی ئاسایی كە پشكێك لە زیرەكێتی هەیە" لەدیدی (كرشمر) دا تێكچونی دەروونی وا لەخاوەنەكەی دەكات نەتوانێ لەگەڵ كۆمەلگەدا خۆی بگونجێت، لەبەر ئەوە دەست دەكاتە بەرانبەر كێی كۆمەلگە و هەوڵ دان بۆ گۆڕینی لە ڕێگەی ئەفراندنەوە.[٤]

بۆ ئێمە ئاسان نیە ئەو ڕایە پەسەند بكەین، چونكە ئێمە دەزانین زۆرێك لە بلیمەتەكان كەسێتی‌یەكی هاوسەنگ و ڕەفتار گەلێ ئاساییان هەبووە، گەر لە هەندێكیشیان دا جۆرە تێكچونێكی دەروونی یاخود ڕەفتاری نامۆ دەربكەوێت، ئەوە بەو مانایە نایەت كە هەموو بلیمەتەكان بەو جۆرەن. تەنانەت لەوانەیە ئەو تێكچونەی باسی لێوە دەكرێ زیادەڕەوی تیادا كرابێت. خەڵكی بەسروشت، زیادەڕەوی دەكەن لە گێڕانەوەی هەر هەواڵێكدا كە كەمێك دیاردەی دەگمەن و سەیر لەخۆ بگرێت، نەخاسمە گەر ئەو هەواڵە باس لە ڕەفتار و ئاكاری گەورە پیاوان و بلیمەتەكان بكات.

هەروەها دەتوانین بڵێین: هاندەرە نەستی‌یە داهێنەرەكان، كاتێ بەسەر بلیمەتاندا زاڵ دەبن، هەندێ جار وایان لێ دەكەن ئاكاری وا پەیڕەو بكەن كە پێی ئاشنا نەبن... لەوكاتەشدا ئیدی خەڵكی بەگوێرەی تێگەیشتنە سادە و ساكارەكانی خۆیان ئەو ڕەفتارانە لێك دەدەنەوە و ڕەنگە بەگوێرەی ئارەزووی خۆشیان زیادەڕەوی تێدا بكەن.

**نمایش كردن و لێ‌خوێندنەوە:**

كاتێ ئەو ڕاو بۆچونانە نمایش دەكەین، لەكە و ناتەواویەكی گەورەی تێدا بەدی دەكەین، ئەویش بریتی‌یە لە لەكەی لێخوێندنەوەی ناتەواو... شیاوی ئاماژەپێدانە بلیمەتێتی، هەمووی لەسەر یەك شێواز و مۆدیل نیە، بەڵكو فاكتەر و ڕواڵەتی جۆراوجۆری هەیە.. توێژەریش كاتێ لە بلیمەتێتی دەكۆڵێتەوە نا بێت سەرنجی چڕ بكاتەوە لەسەر تەنها جۆرێكیان و دواتر بەرەنجام گیریەكەی بگشتێنێ بەسەر هەموو جۆرەكانی دیكەدا.

زۆر ناڕەحەت نیە گەر لەگروپێكی بلیمەتەكاندا ئارەزووی خەفەكراو بدۆزینەوە و لەگروپێكی دیكەش دا زیرەكێتی‌یەكی زۆر، و لە گروپی سێیەمیش دا تێكچونی دەرونی،

و لەنێو گرۆکانی دیکەش دا کۆمەڵە هۆکارێکی دیکە کە ئێمە ناتوانین پەنجەیان بخەینە سەر.. وەلێ لەو بارەش دا گرفتەکە بە بێچارەسەر لە لامان دەمێنێتەوە. ئایا کۆمەلکەی هاوبەشی نێوان هەموو بلیمەتەکان چییە کە تیایاندا بەدەر کەوێت و وایان لێدەکات بیرۆکەی نوێ دابهێنن؟!

مامۆستا (هایلبرونر) هەولی داوە وەلامی ئەو پرسیارە بداتەوە. بەڕای من لەوەلامدانەوەکەیشی دا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە... گۆڤاری (مایفیر) بەم دواییانە وتارێکی مامۆستا (هایلبرونر)ی بلاو کردەوە کە باسی لەوە کردوە، هەموو بلیمەتەکان لە دوو خەسلەتدا هاوبەشن، خەسلەتەکانیش ئەمانەن:

یەکەم: توانای گەورەی بلیمەتەکان لەسەر چڕکردنەوەی هزر... هەموو بلیمەتەکان بەبێ جیاوازی بەهەموو هەستەکانیانەوە سەرقالی کارەکەیان دەبن، هەروەها توانای ئەوەیان هەیە لەهزریان دا چەندین سال پرۆژەیەکی دیاریکراو هەلبگرن ، بێئەوەی بێتاقەت و بێئومێد ببن.. بێگومان ئەمەش بەلگەیە لەسەر بوونی پەیوەستەگییەکی دەرونی قول و بەتوانا لەسەر کۆکردنەوە و مۆلدانی هەموو هەولە ئاگا و نائاگاکان لەخزمەتی یەك مەبەست دا.

خەسلەتی دووەمی ئاشکرا لە کردەوەی بلیمەتەکاندا بریتییە لە بەتواناییان لە تێبینی کردن و دەرك کردن بە پەیوەندی نەمەتی نێوان شتەکان.. بلیمەتەکان دەتوانن ڕوالەتی دەرەکی هەقیقەتەکان تێبپەڕێنن و دووبارە لەشێوەیەکی نوێ و پاکیزە و جوان دا وێنای بکەنەوە... واتە بلیمەتەکان بەچاوی پشکنەرانەی مندال سەرنجی گەردون دەدەن، نەك بە چاوی ماندوی بالقەکان، گەر ئەم بۆچونەی (هایلبرونر) ڕاست بێت، دەتوانین بلێین: کەسی بلیمەت لەناخی خۆیدا دوو خالی هاودژ کۆ دەکاتەوە... لەیەك کاتدا مندالیشە و پیاوێکی گەورەشە.. مندالە، لەوەدا کە زۆر پرسیار دەکات و سەرسام دەبێت لەو دیاردانەی دەوروبەری کە پیاوی گەورە بەدیاردەی ئاساییان دەزانێت و پێی وایە هیچ پێویست بەوە ناکات پرسیاریان لەبارەوە بکرێت.

لە لایەکیترەوە، کەسی بلیمەت جیاوازیەکی هەیە لەگەل مندال دا، ئەو جیاوازەیش بریتییە لەوەی کە بەخێرایی هەراسان و بێتاقەت نابێت، بەلکو زۆر پێداگر و

بەئارامە، و چەند جارێ توێژینەوەو بە دوداگەڕان لەسەر پرۆژەیەکی فیکری دەکات ئەو جا بەکردەوە دەستی پێ دەکات... لەو توێژینەوەیەشی دا، بەجۆرێ نقوم دەبێ تا خۆی و بژێوی ماڵ و منداڵیشی لەبیر دەکات (دەربڕینی وەرگێڕ).

## پرسیارکردنی بلیمەت:

کەسی ئاسایی زیاتر بەلای ئەوە دایە کە بەبێ‌سەرسوڕمان و پرسیارکردن سەرنجی دیاردەکانی گەردون بدات. تەنها بەوەی بەدیاردەیەك ئاشنا بێت، ئیدی ئەو دیاردەیەی پێی ڕۆتێنی‌یە و لای وایە جۆرە نهێنیەك لەخۆ ناگرێت، تەنانەت گاڵتەش بەهەر کەسێك دەکات کە پرسیار بکات لەنهێنی‌یەکان و سەرسام بێت پێی، و پێدەچێ بە بێ‌ئەقڵ و دێوانەشی بداتە قەڵەم !!.

بۆ نمونە، کەسی سادە ڕاهاتووە لەسەر ئەوەی موگناتیس دەبینێ کە ئاسن بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت... لەڕاستیدا ئەم ڕاکێشانە موگناتیسی‌یە دیاردەیەکی زۆر سەیرە... چونکە چۆن پارچەیە مادەی بێ‌گیان دەتوانێ پارچەی مادەیەکی دیکە بەرەو خۆی ڕابکێشێت بەبێ ئەوەی هیچ هۆکارێکی بەرهەست لە نێوانیاندا هەبێت... وەلێ کەسی سادە گوێ نادات بەوەی پرسیاری ئاوها لەخۆی بکات... هەر کات پرسیارێکی لەوجۆرەش هات بەمێشکی دا، دەچێت بۆلای (دانا) یانی نێو خزمانی خۆی و پرسیارەکەیان ڕوبەڕو دەکاتەوە، ئینجا ئەوان هەر چی‌یان گوت، ئەم پێی قایل دەبێت و دەڕوات بە ڕێی گاری خۆیەوە.

وەلێ کەسی بلیمەت بەپێچەوانەی ئەوەوە، خاو نابێتەوە لە پرسیارکردن و بەو وەڵامانەش کومسایی نایەت کە دانایان پێی دەدەن... تایبەتمەندی وی لەوە دایە کە حەز ناکات چاولێکەری خەڵکی بکات لەو بیر و ڕەفتارانەی خەڵکی لەسەر ڕاهاتوون.. دزێوترین شت لای کەسی بلیمەت ئەوەیە کە ببێتە فۆتۆکۆپی دەقاودەقی کەسانی‌تر.. هەر ئەمەشە وا دەکات کەسی بلیمەت بتوانێ لەسادەترین دیاردەی باو، هەقیقەتی نوێ بدۆزێتەوە.

دەڵێن گوایە (نیوتن) لەکەوتنە خوارەوەی سێوێکەوە لەنزیکی دا یاسای کێش کردنی زەوی دۆزیەوە... لێرەدا دەمەوێت بپرسم: ئایا چەند کەس لەژیانیان دا کەوتنە خوارەوەی سێویان بینیوە؟، ئەی بۆچی وەکو نیوتن سودیان لێوەرنەگرتوە لە دۆزینەوەی هەقیقەتی نوێدا؟

هەروەها دەڵێن (گالیلۆ) یاسای (جوڵە و کەوتنە خوارەوەی تەنەکان)ی دوای ئەوە دۆزیوەتەوە کە سەرنجی گڵۆپی سەقفی دێری داوە، کە بەلای ڕاست و چەپ دا ئەملا و ئەولا دەکات... من بۆخۆم چەند گڵۆپی وام دیوە بەسەقفەکاندا دێنە خوارێ هیچ دیاردەیەکم تێدا نەدیوە کە شایستەی سەرنج لێدان و تێبینی کردن بێت، منیش وەکو خەڵکانی ڕەشۆکی تر جوڵە (لەرە)ی گڵۆپەکانم بەمەسەلەیەکی سروشتی دەزانی کەهیچ کات جێگەی سەرسوڕمان نیە!!.

سەبارەت بەو بلیمەتانەی توێژینەوە لە دیاردە کۆمەڵایەتی و دەرونیەکانیش دەکەن دەکرێت هەمان قسە بکەین... هەر یەکێ لەوانە بگری هەمیشە سەرنجی کار و کردار و گوفتاری خەڵکانی ڕەشۆکی دەدات و، بەسەرچاوەیەکی زانستی لەبن نەهاتوی لەقەڵەم دەدات، و جار لەدوای جاریش ڕاستی نوێ لەو سەرچاوەیەوە دەدۆزێتەوە.. بەڵام کەسی سادە، گوێ بەدیاردە کۆمەڵایەتیەکانی دەوروبەری نادات، چونکە دەبینێ ڕۆژ بەڕۆژ ئەو دیاردانە دووبارە دەبنەوە، ئیتر بەبێ ئەرزشیان دەداتە قەڵەم، لەکاتێکدا گرنگیەکی زۆریان هەیە لەدیدی بلیمەتەکاندا.

**سەرقاڵ بوون و نغرۆ بوونی بلیمەتەکان:**

کەسی بلیمەت بەو سەرنجە قوڵانە لەدیاردەکانی گەردون دەست هەڵناگرێ، بەڵکو وەك ئاماژەمان پێدا، سەرقاڵ دەبێ بە لێکۆڵینەوە لەو نهێنیانەی کە لەوانەیە لەپشتی دیاردەکانەوە هەبن، بەجۆرێ تیای دا نغرۆ دەبێت و خۆی لەبیر دەچێت.

بەڕاستی کەسی بلیمەت هەندێ جار دەتوانێت خۆی بتوێنێتەوە و، خۆی لەنێو بەرێ لەنێو ئەو شتەدا کەلێکۆڵینەوەی لە سەردەکات، ڕەنگە ئەو سەراسیمەییەی لە بلیمەتەکان دەگێڕدرێتەوە، هیچ نەبێ جگە لەڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی لەناوبردنی

خود. لەم ڕووەوە لە سۆفیەکان دەچن، چونکە سۆفیەکانیش دەڵێن لەکاتی (وجد)دا لەنێو زاتی خوادا فەنا دەبن!!.

بلیمەتەکان لەنێو زاتی خوادا فەنا نابن وەکو سۆفیەکان، بەڵکو لەو نهێنییانەدا فەنا دەبن کە خودا لەگەردونـدا وەدی هێنـاوە، پێـی دەچێ لـەم ڕوانگەیەشـەوە ئـەمان لەسۆفیەکان لەخوداوە نزیکتر بن.

لێرەدا نامـەوێت باسی خـودی مرۆیـی بکـەم و ڕونـی بکەمـەوە کـە چۆن دەگرێ لەشتێکی دەرەوەی خۆی دا فەنا بێت، چونکە ئەمە بابەتێکی پڕ لەگرێ و گۆڵە و لێرەدا بواری باسکردنی نیە.[5] تەنها ئەوەندە دەڵێین: کەسی ئاسایی ناتوانێ خۆی لـەبیر بکات، یاخود بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی فەرامۆش بکات لە پێناوی شتێکی دەرەکی دا. لەبـەر ئەوەی هەمیشە سەرقاڵە بەخودی خۆیەوە و لەهەڵپەی ئەوەدایە پلە و پایەی مـادی و مەعنەوی خۆی بەرز بکاتەوە. هەندێ جاریش دەمدرێـژی دەکات و ئـەو تۆمـەتی خـود پەسەندیە لەخۆی دوور دەخاتـەوە، بـەڵام لە ڕاستیدا وا نیـە. کاتێ دێینـە سـەر باسی (بلیمەتان)، دەبینین ئـەم ڕووەوە جیاوازن لەکەسانی ئاسایی، ئیدی ئـەم جیاوازیـە زۆر بێت یان کەم.. ئێمە ملە جەڕە ناکەین لـەوەی کەسـی بلیمـەتیش کەسێکی سادەیە بـەر لەوەی بلیمەت بێت.. هەر چۆن بێت ناتوانێت خاڵی بێت لـە هەستی خودپەسـەندی... بـەڵکو لەوکاتـەدا جیـاواز دەبـێ لـە کەسـانی ئاسـایی کـە سـەرقاڵ دەبـێ بـەکارە داهێنەرانەکەیەوە... لەو کاتەشدا گوێ نادات بەوەی زیانی لێ بکەوێت یاخود سوکایەتی پـێ بکرێـت، تەنانـەت بەسنگێکی گوشادەوە بـەرەو پـیری مـەرگ و ئەشکەنجە دانـیش دەچێت.

دوبارە لێرەش دا هەست بە ناکۆکی دەکەین لە ژیاننامەی بلیمەتەکاندا، ئەوەتا کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ سەرباری کەسێتییە ئاساییەکەی خۆی، وەك هەر کەسێکی دیکە گرنگی بەخۆی دەدات، وەلێ لەو کاتەشدا هەستی داهێنان سێبەری بەسەردا دەکات، خـۆی لـەبیر دەکات.

ئەم ناکۆکیەمان لەکاتێکدا بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێ کە لەژیاننامـەی ئـەو بلیمەتانـە دەکۆڵینەوە کە ڕێگەی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی دەگرنـە بـەر... وا دەبـێ یـەکێکیان ڕێبـازی

نوێ بۆ چاکسازی دێنێتە کایەوە، لەنێو ئەم ڕێبازەدا دەتاوێتەوە و هەر چی شتی دیکەیە (جگە لەڕێبازەکە) لە بیر دەکات، تاکو دەشمرێت پێداگر دەبێت لەسەر ڕێبازەکەی..

کەسی بلیمەت بەتەواوی دەرباز نابێ لە چڵك و چەپەڵیە مرۆییەکان، لەبەر ئەوەشە کە دەبینین لە یەك کاتدا خودیشە و بابەتیشە. وەك چۆن لە بەردا بینیمان لەیەك کاتدا: منداڵیش بوو پیاویش بوو، دەبەنگیش بوو زیرەکیش بوو، دێوانەش بوو، ژیریش بوو.

بەدەربڕینێکی تر، مرۆڤی بلیمەت بریتی‌یە لە کۆمەڵێ ناکۆکی و جیاوازی، لەگەڵ خەڵکی دا دەژی و نامۆشە پێیان، بەسەر زەوی دا دەڕوات کەچی هزری بە عاسمانێ دا هەڵواسراوە.

**ناکۆکی و بلیمەتێتی:**

لۆژیکی نوێ دەڵێت: ناکۆکی خەسڵەتێکی ڕەسەن و بنەڕەتیە لەسروشتی هەموو شتێك دا.. چونکە ناکۆکی فاکتەری گۆڕانکاریە لەگەردوندا و پاڵنەری بازدانە یەك لەدوای یەکەکانیەتی بەرەو نادیار.

گومان وایە تاکو بونەوەر بەسەر پلەکانی پێشکەوتن دا سەربکەوێ، بەو ئەندازەیە ناکۆکیەکان تیای دا بەهێز دەبێ.. ئەمەش یانی: ئاژەڵ ناکۆکی و جیاوازی تیادا زۆرترە لە بێگیان، مرۆڤیش ناکۆکیەکانی پترە لە ئاژەڵ.. گەر وای دابنێین کەسی بلیمەت لەڕوی پێکهاتنی کەسێتی‌یەوە لە مرۆڤی ئاسایی ناوازەترە، ئەوا دروستە بۆمان بێژین: بەو پێودانگە لەمرۆڤی ئاسایش ئاڵۆزتر و ناکۆك ترە لەنێوخۆیدا.

شیاوی باسە قەیمیەکان، لەم بۆچوونە نەدەگەشتن و پەسەندیان نەدەکرد، ئەم خاڵەش وای لێکردبوون لە وێناکردنی پیاوە مەزنەکانی مێژوو و بلیمەتەکاندا بەهەڵەدا بچن.. ئەوان وایان دێ بە ئەندێشەدا کە مرۆڤی بلیمەت وەدی هێنراوێکی تۆکمە و تەواوە و هەرگیز ناتەواوی ڕوی لێناکات، بۆیە گەر جارێ ببیستن کەسە بلیمەتەکە کارێکی دزێوی کردوە، ڕاستەوڕاست ئەو هەواڵە بەدرۆدا دەخەنەوە، چوون بڕوایان وایە بلیمەت کاری وا ناکات.

ئەم هەڵەیە تا هەنوكەش لەنێو خەڵكی دا باوە، ئەوەتانێ بەهالەیەك لە بێگوناهی و كامڵێتی دەوری مرۆڤی بلیمەت دەدەن.. گەر ڕێ بكەوێ یەكێك لە بلیمەتەكان لە نێویاندا بژی، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەكەن بەگوێرەی ئەندێشەكانی وان هەڵس و كەوت بكات، هەر ئەوەندەی هەندێ كەم و كورتی مرۆیی لێ بەدی بكەن ئیدی قیامەتیان هەڵدەستێ (دەربڕینی وەرگێڕ) و لەوانەشە لەهەموو بەهرە و توانا و زیرەكیەكی دابڕنن (دەربڕینی وەرگێڕ). بەدبەختی بۆ بلیمەتێ كە لەناو ئەو خەڵكەدا بژی. ئەمیش وەكو هەمو خەڵكی گوزەران دەكات، خواردن دەخوات و بەبازاڕیش دا دەگەڕێت، وەلێ خەڵكی ئەمەی لێ چاوەڕان ناكەن، بەو پێیەی ئەم بلیمەتە، ئیدی لەبیریان چوە كە بەرلەوەی بلیمەتێ بێت مرۆڤێكە.

دووبارە دەگەڕێمەوە سەر ئەم گوتەم و دەڵێم: بلیمەت ناتوانێ دەرباز بێ لە كەم و كورتیە مرۆییەكان، ڕەنگە ئەم ناتەواویانەش پتر لەمدا بەدەر بكەون وەك لە مرۆڤی ئاسایی دا. مرۆڤی ئاسایی حەزی لەوەیە چاولێكەری خەڵك بكات لەكردەوە و بیروبۆچونەكانیاندا. لەبەر ئەوە هاندەرە نەستیەكانی خۆی خەفە دەكات. ئیدی ئەو پاڵنەرانە باش بن یان خراپ.. لەترسی ئەوەی نەبادا خەڵكی بەسوكی سەیر بكەن. هەرچی بلیمەتیشە ڕقی لە چاولێكەریە و سوكایەتیش بە شتە باوە كۆمەڵایەتیەكان دەكات... هەر ئەمەش هەندێ جار وای لێدەكات بە بێ شەرم و سڵەمینەوە خۆی بدات بەدەست پاڵنەرە نەستیەكانیەوە... وەك (ئەرخەمیدس) كە لە گەرماو هاتە دەرێ و بە ڕوت و قوتی بەسەر شەقامدا ڕای دەكرد: "خودایە وەك ئەو كاتەی دروستت كردم!"

مرۆڤی ئاسایی زۆرینەی كات مل كەچی ئاوەزی وشیاری دەبێت، وەك ئاماژەشمان پێدا ئەو ئەقڵە چ نیە، جگە لە دروست كراوی كۆمەڵگە و بەرەنجامی نەریت و دیاردە باوەكانی نێو كۆمەڵگە.. وەلێ بلیمەت، دروستە گەر بەوەی وەسف بكەین كە خاوەنی دوو ئاوەزە.. جاری وا هەیە مل كەچی ئاوەزی وشیار دەبێ، لەو كاتانەدا وا دەزانین لە داناترینی كەسانی نێو خەڵكە، جاری واش هەیە مل كەچی (ئاوەزی ناوەكیی) دەبێت و، لەو كاتەدا دەبینین وەك منداڵ سەراسیمەیە، یاخود هیچ و پوچە وەكو شێت.

بۆ زیاتر ڕون بونەوەی مەبەست، دەكرێ خەڵكی بەگشتی پۆلێنن بۆ سێ گرووپ:

١ـ گروپێ مل کەچی ئاوەزی وشیارن، ئەمانە چینی ژیرەکانن.

٢ـ گروپێ مل کەچی ئاوەزی ناوەکین، ئەمانە شێت و دێوانەکانن.

٣ـ گروپێ مل کەچی هەر دوو ئاوەزەکەن، ئەمانەش بلیمەتەکانن.

جا ئایا خوێنەری بەڕێز دەخوازێ سەر بەکام لەم سێ گروپە بێت؟ گومانم وایە دەخوازێ سەر بەگروپی سێیەم بێت... بەڵام بەر لەوەی بڕیاری سەر پێبوونی خۆی بدات بۆ گرووپی سێیەم، پێویستە بزانێت، ئەم گروپە پڕە لە سەریەشە و ماندووبوون، لەدنیاشدا هیچ شتێ بە بێنرخ و بەها نیە.. وەك لە پەندە گۆنەکەشدا هاتوە: "هەنگوین جگە لە ڕێنگاڵی جوان، چزوی هەنگیشی تێدایە ـ دەربڕینی وەرگێڕ".

**بلیمەت و خووگرتن:**

(کاریل) لە پێناسەکردنی (بلیمەتێتی) دا دەڵێت: توانایەکی بێسنورە لە بەرگەگرتنی ئازاردا..[٦]

مەبەستی لەوەیە، کەسی بلیمەت توانا و وزەیەکی زۆری هەیە لە لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕان و بەردەوام بوون لەسەری.. لە ڕاستیش دا هەر وایە، کەسی بلیمەت زۆر خوگرە بە هەوڵ دان بەدوای هەقیقەتدا، زانیاریەکان کۆ دەکاتەوە و بەراوردیان دەکات و دید وبۆچون و سەرنجەکان لەبارەیەوە ئەمدیودیو دەکات. وەلێ ئەمە ناکاتە هۆکارێ بۆ زماندرێژی و شانازی کردن لە جڤاتەکان دا... بەم خەسڵەتەش لەو کەسانە جیا دەبێتەوە کە لەدنیادا هیچ نازانن، جگە لەبەرکردنی زانیاری لێرە ولەوێ، بۆ وەی دواتر بیرشێننەوە بەسەر خەڵکی دا بێئەوەی خۆیان هیچی لێ تێبگەن.

زۆربەی خەڵك حەز دەکەن بلیمەت بن، بۆیە حەزیان لێیەتی تاکو بەهۆیەوە خۆیان بەسەر خەڵکی دا بابدەن... وەلێ بلیمەتی ڕاستەقینە سەرقاڵی کاروباری خۆیەتی و نایپەرژێتە سەر خەڵکی... کاتێکیش سەرقاڵی کاری خۆی دەبێت و تیای دا نقوم دەبێت نە لەخەڵکی تێدەگات و نە ئەمانیش لەو تێ دەگەن.. لەوکاتەدا لە جیهانی کۆمەڵگە دەردەچێت و دەچێتە نێو جیهانی تایبەتی خۆیەوە.. هەر لەبەر ئەوەیە لەکەوتنە

خوارەوەی سێوێك دا یان لە گلۆپێكی هەڵواسراودا، مانایەك دەبینێ كە خەڵكی ئاسایی
نای بینن.. ئەو لە دۆڵێك دایە و خەڵكی لەدۆڵێكی‌تر دان...

## بلیمەت و كۆمەڵگە:

(شوبنهور) پێناسەی بلیمەت دەكات، بەوەی كەسێكە هەوڵ دەدات كەسێتی خۆی
ەناو بەرێت و نكۆڵی لەخودی خۆی بكات، لەپێناوی ئەوە دا كەڕاستی‌یە دەرەكیەكان
وەك چۆن هەن وا ببینێت.

(شوبنهور) دەڵێت: "لەبەر ئەوە دەبینی مرۆڤی بلیمەت لەنێو خەڵكی دا نامۆیە،
ەدید و بۆچوون دا لەگەڵیاندا یەك ناگرێتەوە، ئەم شتانێك نابینێ كە لێیەوە نزیكن،
ەلكو سەرنجەكانی ئاراستەی ئاسۆی دوور دەكات.. بەم جۆرە ریزپەڕبوونی كەسی
بلیمەت لەكۆمەڵگەداو تێكەڵ نەبوونی بەخەڵك دروست دەبێ، چونكە ئەم لەبنەڕەتی
شتگیر و نەمری شتەكان دەكۆڵێتەوە.. بەڵام خەڵك سەرنجی وێنەی شتەكان دەدەن،
كەوایە لەنێوان ئاوەزی ئەمان و ئەودا پانتاییەك نیە بۆ وێك هاتنەوە.. كابرای بلیمەت
ئارەزووی لەگۆشەگیری‌یە، هیچ پێویستی‌یەكی بەهۆز و هاوڕێ نیە وەكو ئەو خەڵكانەی
تر، كە لەژیانیان دا پشت بەشتانێك لە دەرەوەی خۆیان دا دەبەستن. ئەو چێژ و تامەی
لەوێنەكانی جوانی وەردەگرێت و، ئەو سوكناییەی لە هونەرەوە چنگی دەكەوێت وای لێ
دەكەن سەرقاڵیەكانی ژیانی لەبیر بچێتەوە، چونكە جێگەی ئەو ئازارەی بۆ پڕ
دەكەنەوە كە لەمرۆڤ دا زیاد دەكات بە ئەندازەی ڕون بوونەوەی ئیدراكی"[٧]

ئەم وەسفەی (شوبنهور) بۆ بلیمەتێتی كرد، لەزیاد ڕۆچون خاڵی نیە، لەهەمان كاتدا
كرۆكێكی گەورەی هەیە و، ڕەنگە كەمێكمان لەپەیوەندی كەسی بلیمەت بەكۆمەڵگەوە
بۆ ڕوون بكاتەوە.

یەكێك لەو گوتانەی زۆر دووبارە دەكرێنەوە، ئەو پەیڤەیە كە دەڵێت: مرۆڤ تاكو
كەمتر بیر بكاتەوە، زیاتر كەسێكی كۆمەڵایەتی دەبێت... ئەم پەیڤەش لە چەردەیەك
ڕاستی بێ‌پشك نیە... لەولاتریش دەتوانین بڵێین: تا چەندە مرۆڤ تێكەڵ بێت لەگەڵ
كۆمەڵگەكەیدا، بەو ئەندازەیە لە بلیمەتێتی دوور دەكەوێتەوە.. ئەو كەسە

کۆمەڵایەتیەی کە نەریتی وایە بەجوانی ڕەفتار دەکات (لەگەڵ خەڵکی دا - وەرگێڕ) و هەوڵی ئەوە دەدات لە لای خەڵکی خۆی خۆشەویست بکات و ڕەزامەند بیان بەدەست بێنێ، ناتوانی بیری نوێ دابهێنێ کە پێداویستی‌یەکی بلیمەتێتی‌یە... دەتوانێت لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا سەرکەوتن بەدەست بێنێ... بەلام سەرکەوتنی کۆمەڵایەتی شتێکە و بلیمەتێتیش شتێکی‌ترە.

ئێمە نکۆڵی ناکەین لەوەی هەندێ لە بلیمەتان سەرکەوتنی باشیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یاندا بەدەست هێناوە، بەڵام ئەو سەرکەوتنە خواست و مەبەستی بەئەنقەستی ئەوان نەبووە، بەڵکو پێدەچێ هەر لە خۆوە دەستیان کەوتبێ، ئەمە دوای ئەوەی کەخەڵکی بە گەورەیی داهێنانەکەیان ئاشنا بووبن، ئیتر لەدەوریان کۆ بوونەتەوە و ڕێزیان گرتون و چاویان لە هەر کەلێنێکیش پۆشیوە کە لە ئاکاریاندا بەدەر کەوتبێ.

## پەراوێزەکانی پاشکۆی پێنجەم:

١- بنواڕە: جريدة الشعب البغدادية، ژمارەی ڕۆژی ١٩٥٨/٤/٢٠.

٢- بنواڕە: Encyclopedia of Social Sciences, Art Genius

٣- بنواڕە: مجلة المختار، ژمارەی مانگی کانوونی دووەم ١٩٥٨.

٤- بنواڕە: Encyclopedia of Social Sciences, Art Genius

٥- ئەم ڕووەی نهێنی‌یەی سروشتی مرۆڤم لەیەکێك لە کتێبە ئامادەکراوەکانمدا بۆ چاپکردن بەوردی خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوە، کتێبەکەم ناو ناوە "لغز الشخصيه البشريه" نیتر نازانم کەی دەتوانم بڵاوی بکەمەوە.

٦- بنواڕە: Tyrrell, Personality of Man. P 36

٧- بنواڕە: محمد امين و زكى نجيب محمود، قصة الفلسفة الحديثة، ج ٢. ل ٤٤٢ ـ ٤٤٣.

## پاشکۆی شەشەم:
## دێوانەیی و کۆمەڵگە

### ڕێخۆشکاریەکی لۆژیکی:

بیرمەندانی کۆن وا ڕاهاتبوون، مرۆڤیان بەگشتی دەپۆلاند بۆ دوو گرۆی سەرەکی، کە سێیەمینی نەبوو: ژیر و شێت... مرۆڤ لەدیدی ئەواندا یان دەبوا ژیر بوبا یاخود دێوانە. هەرگیز نەدەکرا لەیەك کاتدا مرۆڤ هەم ژیر بێت و هەم دێوانە.

بیریارانی کۆن لەسەر ئەم پۆلاندنە دوو جەمسەریە دەڕۆشتن بەڕێوە لەهەموو خەسڵەتە مرۆییەکانی تریش دا... لەهەموو خەسڵەتەکاندا مرۆڤ دەکەن بە دوو بەشەوە: چاکەکار و خراپەکار، دادگەر و ستەمکار، ئازا و ترسنۆك، چاك و خراپ، ناشیرین و جوان... هتد. لەنێوان هەر گرۆهێك و دژەکەیشی دا سنورێکی جیاکەرەوە دادەنێن کە لەحوکمداندا نابێ ئەو سنوورە پێشێل بکرێت، جگە لەوە، کەوشەنەکە بە زاکونێکی سروشتی دادەنێن. ئەگەر پیاوێ دادگەر بێت، ئەوا پێویستە لەهەموو جموجوڵ و کاروکردارەکانی دیکەشی دا هەر دادگەر بێت، وا دەزانن نابێ هیچ ئاماژەیەکی ستەمگەرانەی لێ دەربکەوێ با ئەو ئاماژە زۆریش بچوك بێت.

لەکتێب و نوسراوەکانی گرۆ ئیسلامیەکاندا ڕاستی ئەم قسەیە بەڕونی دەبینین. ئەوەتا دەبینین گەر باسی پیاوێك لە پیاوەکانی مێژوو بکەن و خەسڵەتێکی دیاریکرا و بدەنە پاڵی، ئیتر دوای ئەوە ناتوانن خەسڵەتێکی تری باس بکەن کەپێچەوانەی ئەوی یەکەمجار بێت.. لەبەر ئەوە هەردەم پێویستیان بەوە بوو پەنا ببەنە بەر لێکدانەوە و ڕاڤەکاری زۆر لەخۆکارانە لەکاتی وتوویژ و هەڤپەیڤینەکانیان دا. لەلۆژیکی کۆندا ئەم (گری ــ وەرگێڕ)یە ناو نراوە یاسای (نێوەندی بەرزەوەگراو) یاخود (سێیەمی بەرزەوەگراو)... ئەم یاسایەش بیریارانی کۆن بەیەکێ لەو زەروراتە عەقڵینانەیان دەدایە قەڵەم کە ناکرێ گومانیان لێ بکرێ.. ئێستاکە ناڕاستی ئەو یاسایە و دووری وی لە بویەری ژیانەوە دەرکەوتووە. هیچ خەسڵەتێکی ڕوت نیە لەهیچ مرۆڤێکدا، بەجۆرێ

کە ئەو مرۆڤە لەخەسڵەتە دژەکەی خاڵی بێت، هەر چەندە ئێمە بەلامانەوە ئەو مرۆڤە کامڵ و تەواو بێت.. دەبێ هەر مرۆڤێ لەهەر خەسڵەتێ هاودژەکەیشی تێدا بێ، تەنها ئەوەندە هەیە ڕێژەی یەکێك لە خەسڵەتەکانی تێدا زیاد دەبێ ، لەبەرانبەر کەم بوونەوەی ڕێژەی هاودژەکەی تری دا، بەو جۆرەش نازناوێکی دیاریکراوی بەسەردا دەبڕین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ چاوەڕوانی ئەوە بکەین لەهەندێ کاتدا خەسڵەتی پێچەوانەی نازناوەکەیی لێوە بەدەر بکەوێت.

لۆژیکی نوێ یاسای (نێوەندی بەرزەوەکراو)ی واز لێهێناوە، لەبریتی دا یاسای پلەبەندی (continum)ی داهێناوە، ئەمەش بەو مانایە دێت کە مرۆڤەکان لەهەموو خەسڵەتەکانیان دا لەپلەدا جیاوازن نەك لە جۆردا.. گەر بمانەوێت بیان پۆلێنین پێویستە لە پلەبەندی یەك بەدوای یەك دا دایان بنێین، بەگوێرەی زیاد وکەمی خەسڵەتێك تیایاندا.

بۆ ڕونکردنەوەی مەبەست نمونەی کورتی و درێژی، نێو خەڵك دێنینەوە، ئێمە کاتێ ژمارەیەکی زۆری خەڵك کۆ دەکەینەوە بەگوێرەی درێژی و کورتی باڵایان دەیان خەینە ڕیزێکەوە، دەبینین سەریان شێوەی هێڵێکی لاری وەرگرتوە، بەو جۆرەش نارەحەتە بۆمان سنورێك بکێشین بۆ جیاکردنەوەی باڵابەرزەکان لە باڵاکورتەکان.. گەر لەبەر هەندێ مەبەستی گرداری ناچار بین ئەو سنورە دیاری بکەین، ئەوا سنورێکی ئیعتیباری دەبێت و هیچ بناغەیەکی ڕاستەقینە و واقعی نابێت.. ئەو کەسەی بەتەنیشتی هێڵە ئیعتباریەکەوە دەوەستێ، بۆ نمونە لەوانەیە بە باڵاکورتی بدەینە قەڵەم، ئەمە لەکاتێکدا جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ ئەو کەسەی تر دا کەهەر بە تەنیشتی ئەمەوەیە و کەوتوەتە ئەو دیوی هێڵەکە.

### لەنێوان شێت و ژیردا:

زانایانی دەروونناسی، هەنوکە بەگوێرەی ئەو بیردۆزی پلەبەندیە سەرنجی شێت و ژیرەکان دەدەن. لەنێو خەڵکی دا ژیرێکی تەواو یان شێتێکی تەواو بوونی نیە. دەگونجێت خەڵکی لەڕوی شێتی و ژیریەوە ڕیزبەندی بکەین، بەهەمان ئەو شێوەیەی

کە ڕیزبەندیمان بۆ کردن لە ڕوی بالآکورتی و بالآدرێژیەوە.. ئەو سنورەی خەلکی لەسەری ڕاهاتون بۆ جیاکردنەوەی شێت لە ژیر، هیچ نیە جگە لە سنورێکی ئیعتباری. زۆر جاریش بەها کۆمەلایەتیەکان ڕۆلی خۆیان دەبینن لەدیاریکردنی ئەو کەوشەنەدا، بەو پێیە کەسێك بەشێت لەقەلەم دەدەن ، لەکاتێکدا هەر ئەو کەسە لەبەر ڕوناکی بەها گەلێکی دیکەدا بەگەورەی ژیران دێتە ئەژماردن.

جاری وا هەیە دەبینین ، پیاوێکی ژیر هەندێ جار کاری وای کردوە ئەقل قبولی ناکات. ئینجا ئێمە پیاوەکەمان خۆش بوێ دەست بەجێ کردنی ئەو کارەی لێ دوور دەخەینەوە. لەدیدی ئێمەمانان دا کابرایەکی ژیری وا کاری بەدی بەو جۆرەی لێناوەشێتەوە!! ئێمەش بەو حالّ و بالەمانەوە لە لۆژیکیستە کۆنەکان جیاواز نابین ، لەوە دا کە بڕوایان بە یاسای (نێوەندی بەرزەگراو) هەبوو، چوون ئێمەش گومانمان وایە کەسی ئاقلّ هەرگیز ناگونجێت کارێکی شێتانە بکات، و هەروەها شێتیش ناگونجێ کاری ماقولّ بکات. ئەمە لەکاتێکدا هەر تکە ئەگەرەکە گونجاون. جیاوازی نێوان شێت و ژیر، وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا، جیاوازیە لە پلە دا نەك لەجۆردا.

هەر مرۆڤێ کەلەسەر ئەم زەویە دەژی، پێویستە لەقولایی دەروونی دا کەم تا زۆرێك تۆوی شێتێتی هەلگرێ. وەلێ زۆرینەی خەلّك دەتوانن لەگەلّ ئەم تۆوەدا خۆ بگونجێنن و دای بپۆشن، لەم پەردەپۆش کردنەشدا مالّ و سامانیان یاخود پلە و پایەی بۆماوەیان یارمەتییان دەدات.. جا بەدبەختیش بۆ ئەو هەژارە داماوەی کە هیچکام لەو شتانەی نیە، چونکە زیاتر ئەگەری شێت بوونی ئاشکرای لێ دەکرێت بەر لەکەسانیتر... گەر دروست بێت قەیمیەکان بلێن: "خەریکە هەژاری ببێتە کوفر" ئەوا دروستە بۆ ئێمەش بێژین: "خەریکە هەژاری ببێتە دێوانەیی".

## پوخت گیریەکی زانستی:

گەنجێك هات بۆ لای پزیشکێکی دەروونی و سکالای گرێیەکی دەروونی بەلاوە کرد کە بەسەری دا زالّ بوە و دەترسێ شێتی بکات. گرێی گەنجەکەش ئەوە بوو کچێکی خۆش ویستوە و بڕواشی وایە کیژەکە ئەمی خۆش دەوێ.. ئەم بڕوایەشی بۆتە هۆی

ئەوەی وەهمی زۆر هیچ و پوچ بێتە دڵیەوە.. پزیشکەکە پێی دەڵێت: "مادەم لەناخی خۆت دا بڕوات وابێ کچەکە خۆشی دەوێ و بەوەندە کومسایت بێت، ئەوە هیچ مەترسیەکت لێناکرێ، بەڵام ئەگەر بەشێوەی کردەیی ئەم بڕوایەت بەدەر بخەیت و لەژیانت دا بەگوێرەی ئەو بڕوایە بەڕێوە بچیت ئەوە تۆ شێتیت".[١]

قسەی ئەو پزیشکە کلیلێکمان دەداتە دەست، کە دەتوانین بەهۆیەوە لەسروشتی ژیریی و شێتی تێ بگەین.. هەر یەکێك لەئێمە بگریت، هەندێ جار وامان بەخەیاڵدا دێت کە جوانین و ژنان ئاشقمان دەبن، یاخود بلیمەتێکین بەئەنگوست ئاماژەمان بۆ دەکرێ، یاخود هێند قارەمان و پاڵەوانین خەڵکی لێمان دەترسن، بەڵام شەرم دەکەین لەوەی ئەم ئەندێشەیەمان ئاشکرا بکەین، تەنانەت ڕەنگە بیشارینەوە و بەپێچەوانەی ئەندێشەکەشەوە ڕەفتار بکەین.

چاودێری ئاوەزی ئاگا تیای دا بەهێزە، بەڕادەیەك ڕێگەی لێ دەگرێت بەجۆرێ خۆی نیشان بدات کەخەڵکی لێی قایل نەبن.. لەهەندێ ماوەی دیکەش دا ئەو چاودێریە تیای دا لاواز دەبێت، بۆ نمونە (مەی) دەخواتەوە یاخود توشی (تا)یەکی سەخت دەبێت، لەو کاتەشدا، ئەوەی لەژێر بەڕەیە دەیخاتە سەر بەڕە (دەربڕینی وەرگێڕ) و نهێنی‌یەکانی خۆی ئاشکرا دەکات..هەرچەندە ئەو ماوانە ڕەفتە نین و بەکۆتایی هاتنی هۆکارەکانیان کۆتاییان دێت.

وەلێ گەر ئەو ماوانە درێژەیان کێشا و مرۆڤ گوێ ی نەدا بەوەی خەڵکی چی لەبارەوە دەڵێن، ئەوا هێدی هێدی دەچێتە نێو بەهەشتی شێتی‌یەوە.

مامۆستا (کمبال یانگ) دەڵێت: مرۆڤ لەژیانی دا بەرەو ڕووی دوو جیهان دەبێتەوە: جیهانێکیان ناوەکی و خودیە و پێك هاتووە لە هاندەر و حەز و خولیا و ئامانجە تایبەتیەکانی.. ئەوی دیکەشیان بابەتی و دەرەکییە و پێکهاتووە لە بەها کۆمەڵایەتیەکان و ئەو پێودانگانەی خەڵکی بەسەر تاکی دا دەسەپێنن، ئەو مرۆڤەی خاوەنی کەسێتی‌یەکی هاوسەنگە دەتوانێت ئەو دوو جیهانە پێکەوە بگونجێنێت.. وەلێ مرۆڤی ریز پەڕی نێو خەڵك ئەوەیە کە لەشوێنی ئارەزوە تایبەتیەکانی دەچێت، بێ گوێ دانە ئەوەی خەڵکی چ بۆچونێکیان لەبارەیەوە هەیە[٢].

**فاکتەری شێت بوون:**

ڕەنگە یەکێك بپرسێت: ئەو هۆکارە کامەیە کە وا دەکات لەکەسێك لەخەڵکی‌تر دابڕێت و شوێن ئارەزوە تایبەتیەکانی بکەوێت تا ئەو ڕادەیەی کە شێت ببێت؟

تکام وایە خوێنەر چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەکات وەڵامێکی تێروتەسەل و وردی ئەم پرسیارەی بدەمەوە، چونکە ئەز پسپۆڕ نیم لە نۆژداری دەروونناسی دا، تاکو بتوانم وەڵامی دروستی ئەو پرسیارە سەختە بدۆزمەوە.

لەراستی دا گرۆی دەروونناسانیش تاهەنوکە فاکتەری شێت بوونیان دەست نیشان نەکردوە بەجۆرێ کە هیچ ناکۆکیەکی لەسەر نەبێت، هەر چۆن بێت، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم باس لەشێتی (یاخود شێت بوون) بکەم لەو ڕوەوە کە پەیوەندی بەکۆمەڵگەوە هەیە.. چونکە هەنوکە ڕون بۆتەوە، کە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگەی لەژێر قورسایی گوشاری بارودۆخە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی دەوروبەریان دا شێت بوون.. ئەگەر لە بارودۆخێکی دی دا بژیابان لەوانەیە بیان توانیایە بەجۆرێك لەجۆرەکانم لەدەبەنگی شێت بوون خۆیان قوتار کەن.

قەیمیەکان فاکتەری شێت بوونیان دەگەڕاندەوە بۆ هۆکارە تاکەکەسیەکان و بەوەش فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکانیان فەرامۆش دەکرد. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەی ئەو قەیمیانە بوو، بەهۆی ئەو هەڵەیەوە زیانیان دا لەشێتەکانیش و ژیرەکانیش!!

میللەتە دێرینەکانیش هەر وایان دەکرد، شێت بونیان دەدایە پاڵ کاری (جندۆکە)، لەدیدی واندا (شێت) کەسێکە جنۆکە بەسەری دا زاڵ بووە، لەبەر ئەوە دەروێشیان دەهێنا تاکو جنۆکەکەی لەسەر دا دەربکەن، دەروێشەکان دوعایان بەسەر دا دەخوێند یاخود بە شوڵك (دەربڕینی وەرگێڕ) بەتوندی لێیان دەدا و هاواریان دەکرد: "بچۆ دەرەوە.. بچۆ دەرەوە"، بڕوایان وابوو بەو جۆرە جندۆکەکە لەکابرا دوور دەکەوێتەوە.. وەلێ لەوانەیە ئەنجام بەپێچەوانەی ئامانجی ئەوانەوە بێت، و جنۆکەکە پێدادەگرێت لەسەر مانەوە لە سەری کابرا دا و ماوەیەکی دورودرێژ و ململانێی مانەوە دەکات.

توێژینەوە تازەکان کە لەبابەت جنۆکەوە سازکراون، ڕەوتێکی پێچەوانە بە ڕەوتی قەیمیەکان وەردەگرن، چونکە گرنگی تەواو دەدەن، بەفاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان لەپێکهێنانی کەسێتی شێت دا.. نکولیش ناکات لەبوونی فاکتەرگەلێ دەروونی و فەسلەجی کە ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن لە پرۆسەی شێت بووندا.. ئەوەندە هەیە ئەم فاکتەرە تاکە کەسیانەش لەمیانەی فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکانەوە کار لەکەسەکە دەکەن.. بەوەش ئەو بیرۆکە کۆنەی پوچەڵ کردەوە کە پێی وابوو ئاوەزی مرۆڤ دەزگایەکی خۆڕسک و زگماکیە و بەسەربەخۆیی (کار دەکات ـ وەرگێڕ).

ئەقڵ وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا، دروستکراوی کۆمەڵگەیە، چ ئەقڵێکی ریزپەڕ بێت یان هاوسەنگ، لەهیچ کام لەو دوو بارەدا بەدەر نیە لەوەی بەرەنجامی کارلێکردنی کۆمەڵایەتی بێت.

لەماوەی دادێ، کۆمەڵێ نموونەی ڕاستەقینە دێنینەوە، لەو نمونانەدا دەردەکەوێ کە سنوری جیاکەرەوەی نێوان (ژیریی و شێتی) هیچ نیە جگە لەسنورێکی ئیعتباری کە لەنێو بەها کۆمەڵایەتیەکانی نێو خەڵکەوە هەڵدەقوڵێت و پەیدا دەبێت.

**لەنێو گەلە سەرەتاییەکاندا:**

کاتێ لە بەها کۆمەڵایەتیەکانی نێو هەندێ لەگەلە سەرەتاییەکان دەکۆڵینەوە، چەمکی شێت بوون و تێگەیشتنمان لەو چەمکە گۆڕانی گەورەی بەسەر دا دێت.. چونکە زۆر بەدەگمەن کەسێکی شێت لەنێو ئەگەلە سەرەتاییانەدا دەردەکەوێ بەو شێوەیەی کەسانی شارستانی لێی حاڵی بوون.. گریمان شتێکی نێو ئێمە دەچێتە نێو هۆزێکی سەرەتاییەوە، ئەو دەمە لەوانەیە لەنێویاندا ببێتە قەشە یاخود جادوبازێ و لەسەردەستی دا چەندین مۆجیزە، ڕو بدات.

ڕەنگە ڕاست بێت گەر بڵێین، لەدیدی هەندێ لەگەلانی سەرەتایی دا یەکێك لەپێداویستی یەکانی کەسێتی جادوگەر یاخود قەشە ئەوەیە کە لەڕەفتار و بیروبۆچوونەکانی دا ڕیزپەڕ بێت.. ئەوەتانێ تا ئێستەش پاشماوەیەکی ئەم باوەڕە لەنێو

نەخوێندەوارەكانماندا باوە و دەبینین جاری وا هەیە هەندێ لە كەرامەت یاخود پیرۆزێتی دەدەنە پاڵ هەندێ لە شێتەكان.

بەر لەچەند ساڵێك لەبەغدا شێتێكم بینی، ئەم شێتە ڕاهاتبوو لەسەر ئەوەی هەر گەڕۆك (سەیارە)یەك بەلایدا تێ پەڕیبا لەسەر پێشەوەی گەڕۆكەكە دادەنیشت، شۆفێرەكانیش ڕێگری ئەم كارە سەیرەیان لێ نەدەكرد، لەترسی ئەوەی نەبا دۆعایان لێ بكات و گەڕۆكەكانیان لەكار بكەوێت!!

مامۆستا (سژرلند) دەڵێت: "ریزپەڕبوونی جەستەیی یاخود ئەقڵی، یەكێكە لەپێداویستییەكانی كەسێتی جادوباز لەنێو گەلانی سەرەتایی دا.. جادووباز پێویستە دووچاری ئەو ریزپەڕبوونە بوبێت، هەمیشە جادووبازەكان لە ڕوی جەستەییەوە تێكچون یاخود بەڵەكی یان هەیە یان كوێرن یاخود لادانی سێكسیان تێدایە یاخود زۆر كورتە بالآن و توشی تێكچونی دەماریی یاخود هیستریا بوون"[٣]

مامۆستا (باستید) باسی یەكێك لەهۆزە سەرەتاییەكانمان بۆ دەكات و تیشك دەخاتە سەر ئەوەی كە چۆن پیاوێك لەناو ئەو هۆزەدا دەتوانێت ببێتە جادوباز، ئەو هۆزە پێیان وایە كاتێك كەسێك دەبێتە جادوباز كە كەسێكی تر بكوژێت و تەرمەكەی بخاتە چاڵێكەوە و لەشی خۆی ببەستێتەوە بە تەرمەكەوە بەجۆرێك لەشی بەرلەشی مردووەكە بكەوێت و دەمیان لەسەر دەمی یەكتر بێت، چەند رۆژێك بەو جۆرە بێ خواردن و خواردنەوە بمێنێتەوە.. ئەم وەرزشە دەرونیە قێزەونە جۆرێك لەتێكچونی دەماریی تێدا دروست دەكات، لەكاتێ تەواویش دەبێ، دەبێتە جادوگەر.[٤]

مامۆستا (بنكت) باسی هەندێ لەهۆزەكانی هندیە سورەكانمان بۆ دەكات، لەنیچو ئەم هۆزانەدا ئەو كەسەی بیەوێت ببێتە جادوباز پێویستە لەخەڵكی دوور بكەوێتەوە و بچێتە نێو جەنگەڵ و دارستانەكان و شوێنە چۆڵ و هۆڵەكان، لەوێندەر واز لەخواردن دێنێت و دەست بەوەرزشێكی توند و سەختی دەرونی دەكات و، خۆی سزا دەدات بەو وەرزشە، دەگری و لەگیانە شاردراوەكان دەپاڕێتەوە كە خەونە پیرۆزەكانی پێ ببەخشن، چەند رۆژێ لەسەر ئەم كارەی بەردەوام دەبێ، تاكو خەو دەبینێت و خەونەكەی

فەرمانی پێ دەدات بگەڕێتەوە بۆ نێو هۆزەكەی دوای ئەوەی بەهرە جادووییەكەی پێ بەخشراوە بۆ چاكردنەوەی نەخۆش، یاخود سەركەوتن بەسەر دوژمندا.

**لەنێو هۆزە دەشتەكییەكاندا:**

لەڕۆژگارەكانی نەفامی دا، هۆزە دەشتەكیەكان بەجۆرێ سەرنجی (شێتی)ییان دەدا كە كەمێك جودا بوو لە تێڕوانینی گەلە سەرەتاییەكان بۆ هەمان مەسەلە.

هەندێ جار لەنێویاندا (شێت) بەدەردەكەوت، ئەوانیش بۆ چارەسەر كردنیان پەنایان دەبردە بەر لێدانی زۆر و (هەندێ چارەسەری دیكەی وەك نزا و نوشتە و ... هتد - وەرگێڕ) شێتەكانیش هەندێ ڕەفتاریان دەكرد كە پێچەوانەی بەها باوەكانی دەشتەكێتی بوون، وەك ئەوەی هەندێ قسەی بێ مانایان دەكرد، یاخود هەندێ جموجوڵیان دەكرد كەهیچ هۆیەكیان نەبووە، بێگومان لەدیدی هاوتا دەشتەكیەكانیانەوە.

لەسەردەمی نەفامی دا جۆرە شێتێكی تر پەیدا بوون، بەڵام هۆزە دەشتەكیەكان بەچاوی ڕێز و حورمەت و لێترسانەوە سەیریان دەكردن.. ئەو شێتانە لەسەردەمی نەفامی دا ناو نرابوون (لەنێو بەری عەرەب).

(لەنێوبەری عەرەب)ی سەردەمی نەفامی لەهەڵس وكەوتی دا ریز پەڕ بوو، لەقوڵاییەكانی ناخیدا ئارەزوویەكی زۆری مۆڵ دابوو بۆ كوشتن و خوێن ڕشتن. هەر ئەوەندەی كەسێكی بدیبا كە هەستی بە تەریز و رق لێبوونی بكردایە، دەست بەجێ هەڵپەی كوشتنی دەكرد.. مێژوو باسی (لەنێو بەری عەرەب)مان بۆ دەكات كە وازیان لەهۆزەكانیان هێناوە و لە دەشت ودەردا ژیاون ئەو بیابانەیان كردۆتە لانكەی ژیانیان.. هۆزەكانیشیان لێنەدەگەڕان ئەو جۆرە كەسانە لەنێویاندا بمێننەوە، چونكە نەدەچونە ژێر باری ئەو تۆڵەكردنەوانەوە كە لە ئەنجامی لە (نێوبردن)ە بەردەوامەكان ئەو جۆرە كەسانەوە سەری هەڵئەدا.. سەرباری ئەوەش هێشتر هۆزەكان ڕێزیان دەگرتن و بە ئازا و قارەمانیان دەدانە قەڵەم.

یەك لەو ڕوداوە کۆمیدیانەی لەو بارەوە دەگێڕدرێنەوە، ئەم ڕوداوەیە: کابرایەکی دەشتەکی باس و خواسی "لەنێوبەری عەرەب" دەبیستێ و حەز دەکات وەکو ئەوان ئازا و قارەمان بێت، دەچێتە لای یەکێك لەو کەسانە و داوای لێ دەکات "لەنێو بردن"ی فێر بکات.. کابرا لەوەڵامی دا دەڵێت: "ئەگەر حەزت لێکرد، بیکە".. وادیارە دەشتەکیەکە لەم وەڵامەی تێ ناگات، بۆیە بۆ جاری دووەم و سێ یەم پرسیارەکە دووپاتە دەکاتەوە.. لەم کاتەدا کابرا شمشێرەکەی لێ بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: "لەنێو بردن ئاوایە... حەز دەکەم شمشێرەکەت لێ بدەم"[٦]

بەهێزترین گومان بەلای ئەوە دایە، ئەگەر بێت ئەو (لەنێو بەر)انە بەنێو کۆمەڵگەیەکی شارستانی دا بژیابان، ئەوا بەزنجیر دەیان بەستنەوە و لەنێو سەردابەکان دا بەندیان دەکردن، تەنانەت لەوانەیە دەروێشیان بۆ بهێنانایە تاکو بەگاڵۆك لێیان بدەن بۆ وەی جنۆکەکن لەمێشکیان دەربکەن.

## لەدیرۆکی ئیسلامیدا:

دروستە بێژین: ئیسلام ئەو شێتە "قارەمان"انەی لەنێو بردو چیتر ئەو بوارەیان لەبەردەمدا نەمایەوە کە تەراتێنی تێدا بکەن و خراپە لەسەر زەوی دا بڵاو بکەنەوە.. لەسەردەمی خەلیفەکانی راشیدینیش دا هەر وا مایەوە، چونکە سەردەمی خەلیفەکانیش درێژبونەوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی بوو.. وەلێ کاتێ معاویە هەوڵی دا عەرەب بگەڕێنێتەوە سەر سەردەمی نەفامی یان، ئەوانیش دوبارە سەریان هەڵدایەوە ... وادیارە معاویە لە هەندێ لەو جەنگانەشی دا سودی لەو کەسانە وەرگرتووە، کە گەرەکی بوە خەڵکی پێ بترسێنێ.

دەگێڕنەوەی یەکێك لەو کەسانەی ناوی (بسر کوڕی ارطأة) بوو، ئەم پیاوە (معاویە) بەسەرکردایەتی سوپایەك ناردی بۆ حیجاز و یەمەن، ئەو پیاوە لەوێندەر تاوان و خراپەکاری و خوێنڕێژیەکی ترسناکی بەرپا کرد، چێژیشی لەو تاوانکاریە دەبینی، تا ئەو ڕادەیەی کە دەڵێن منداڵیشی کوشتوە.

لەڕاستی دا ئەو پیاوە شێت بوو، لەو قۆناغە مێژوویەشدا ئەو بوارەی چنگ کەوت کە تیای دا بتوانێت ئارەزووەکانی تێر بکات.. ڕواڵەتی شێت بوون لەدوای خانەنشین کرانی بەسەری دا زاڵ بوو.. مێژونوسەکان لەبارەی ئەو پیاوەوە لەکاتی خانەنشین کرانەکەی دا دەڵێن: ئۆقرەی نەدەگرت تاکو شمشێری بەدەستەوە گرت و شمشێری دەوەشاند، تەنانەت کەس و کاری ناچار بوون لە تەختە شمشێرێکی بۆ دروست بکەن و سەرین (پشتی) بخەنە بەر دەستی، ئەوەندەی بەو شمشێرە دارینە دەکێشایە سەرینەکاندا، تاکو لەهۆش خۆی دەچوو، کاتێ وە ئاگاش دەهاتەوە هەمان کردەوەی دووبارە دەکردەوە، ئەمە خووی ئەو کابرایە بوو تاکو مرد و حەوایەوە.[٧]

**لەنێوان گەلانی شارستانی دا:**

مێژووی هیچکام لە گەلە جوداجوداکان خاڵی نیە لە کەسانێکی وەك (لەنێوبەرانی عەرەب).. ئەو جۆرە کەسانە هەندێ کاریان بۆخۆیان دۆزیوەتەوە کە لەگەڵ شێتێتی یەکەیاندا بگونجێت، گەر وا نەبا ئەوا شتێکی بێ پەردە دەبوون.. کەسانی لەو جۆرە لەسەردەمەکانی ستەم و چەوسانەوە دا پتر دەبن، لەو کاتەدا دەبنە جەلاد یان زیندانەوان یاخود لێکۆڵەرەوە.. لەوکاتە دا بەکوشتن و بڕین و ئەشکەنجە دان دا دەبارنە سەر قوربانیەکانی بەردەستیان، لەو کردەوەیەشیان چێژ وەردەگرن، دواتر پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە بۆ گوێڕایەڵی فەرمانی سوڵتان ئەو کارانە دەکەن، چونکە خودا گوێڕایەڵی فەرمانی سوڵتان ئەو کارانە دەکەن، چونکە خودا گوێڕایەڵی سوڵتانی لەسەر بەندەکانی فەرز کردوە.

هەروەها ئەو جۆرە کەسانە لەکاتەکانی جەنجاڵی و پاشاگەردانی دا ئەو ماوانەی دەستەڵاتی یاسا تێیدا لاواز دەبێت: پتر دەبن.

لەو کاتانەدا پێشڕەوی خەڵکی ئاژاوەچی دەکەن و هانیان دەدەن بۆ دەست درێژی و سزا و ئەشکەنجەدان، کە ئەم کارانە دەکەن هەست بە خۆشحاڵی، کەفاڵەکانی خوێن و ناڵە و هاواری بریندارەکان و قیژ وهوڕی ئافرەتان لەگەڵ ئەو ئارەزووە خەفەکراوانەدا دەگونجێن کە لەناخی دا پەنگیان خواردۆتەوە.

**دێوانەیی پادشایان:**

زۆر جار لەمێژووی نەتەوەکاندا هەبوە، پادشایەکی شێتۆکە چوەتە سەر تەختی دەستەڵات، هاوڵاتیە هەزارەکانیشی هیچ لەبارەی شێتی یەکەی پادشاوە نازانن.. پادشا دەورە دراوە بە خزمەتکار و دەست و پێوەند و وەزیر و گزیر، ئەمانە ئارایشتی کردەوەکانی بۆ دەکەن و ستایشی دەکەن، ئەمیش خۆی لێ دەبێتە سەردار و گەورەی ژیرانی دونیا، دەمێ دەچێتە دەرێ بۆ نێو خەلکی، سوارەکان دەوری دەدەن و کەژاوە لەبەر دەستی یەوە و پیاو ماقوڵانیش لە دوایەوە دەڕۆن.. خەڵکیش کەبەو شێوە سەیری دەکەن وا دەزانن دانایی (هەموو دنیا ـ وەرگێڕ) تیای دا بەرجەستە و کۆبوەتەوە، ئیدی نازانن لەژیانی تایبەتی دا ڕەفتاری منداڵان دەکات!

(ئاغاخان) لەیاداشتەکانی دا باسی پادشای پێشوتری ئێران (موزەفەرەدین شا)مان بۆ دەکات.. (ئاغا) لەساڵی (١٩٠٠) دا لەشاری (پاریس) چاوییە پاشا کەوتوە و دواتر باسی ئەوە دەکات کە تا ڕادەیەك زۆر نەفام بوە، حول حولی بووە، میزاجێکی ریزپەڕ و نامۆی هەبووە.. ماڵ و سامانێکی زۆری بەفیڕۆ دەدا لەپێناوی مەراسیمی هیچ و پوچدا.. تا دەڵێ: سەرۆك وەزیرانەکەی ئەو ڕەفتارە منداڵانەی لەپێناوی مەرامەکانی خۆی دا دەقۆستەوە.. لەدانیشتنەکانی سەر لەبەیانیانی دا هیچ راپۆرتێکی جیدی پێشکەش نەدەکرد، بەڵکو چیرۆکی ئەندێشەیی وای بۆ دەگێڕایەوە کە مرۆڤ بۆ منداڵی بچکۆلەی دەگێڕێتەوە، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی شادومانی و خۆشی بخاتە دڵیەوە.

ئەو دەمەی پادشا لە (پاریس) دەبێت هەواڵی دۆزینەوەی (ڕادیۆم) لەلایەن خاتوو (کوری)یەوە دەبیستێ، جەنابی شا حەز دەکات رادیۆم ببینێت، کوری خان بەدەم ئەم داوایەوە دێت و لەگەڵ مێردەکەی دا پارچەیەك لەمادەی (ڕادیۆم) دێنن و لەنێو هۆڵێکی تاریك دا[8] نیشانی پادشای دەدەن، پادشا کە دەبینێ تیشکێکی لێوە دەرچێت و هەموو هۆڵەکە دەگرێتەوە، زۆر دەترسێت و لەناو هۆڵەکەدا دەست بە هات وهاوار و ڕاکردن دەکات و خاتو کوری و مێردەکەیشی بەوە تاوانبار دەکات گوایە دەیانەوێت بیکوژن.[9]

ئاغاخان لەم چیرۆکە دەدوێت و ئاماژە بەوە دەکات کە چیرۆکێکی دەگمەن نیە لەمێژوی ئەو پادشایانەدا کە لە باپیانەوە پادشاییان بۆ ماوەتەوە.. لەهەموو ئەو بنەماڵانەدا کە مێژوو باسیانمان بۆ دەکات لەسەرەتاوە پێشەوایەکی بەهێز هەڵکەوتوە، ئەم پێشەوایە بناغەی پادشایەتی یەك دادەمەزرێنێ بۆ وەی دوای خۆی بیداتە دەست وەچەیەکی لاواز کە بە هالەیەك لە پیرۆزێتی دەوری خۆیان دەتەنن.. وەچەکانیش بە گەمژەیی کورت یان درێژ حوکمەکەیان هەرەس دێنێت، ئنجا پیاوێکی نوێ سەر هەڵئەدات تاکو بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای تۆی دروست بکات.. بەو جۆرەش بنەماڵە فەرماندارەکان یەك لەدوای یەك دێن.

ئەم ڕایەی (ئاغا خان) لەراستی یەکی زۆر بێ پشك و خالی نیە، وا دیارە ئەم ڕایەشی لە (ابن خلدون) وەرگرتوە[١٠] سەیریش لەوەدایە (ئاغا خان) کە بەو جۆرە خراپەکانی بنەماڵە فەرماندارە بۆ ماوەکان باس دەکات، ئەوە لەبیر دەکات کە خۆیشی سەر بەبنەماڵەیەکی ویراسیە، تەنانەت لە جێگەیەکی دیکەش دا دان بەوەدا دەنێت کە لەتەمەنی هەشت ساڵی دا کراوەتە پێشەوای خێڵەکەی[١١]، باپیشی هەر پێشی وابوە و باپیرانیشی هەر هەموویان پێشەوای ئەو خەڵکە بوون (سڵاوی خوایان لە سەر بێت)!

هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوانی ئەوەی میراتگرەکە پادشا بێت یان پێشەوا.. مادام هەر کامێکیان بگری لەماڵی بابی موتریفی دا پێگەشتوە و، چوار دەوری گیراوە بەخزمەتکار و کەسانی ماستاوچی.. ئەوا هەر دەبێ ستەمکارێ یان شتێکی لێ دەربچێت، سەرباری ئەوەش خۆی بە سێبەری خوای بەسەر بەندەکانیەوە لەقەڵەم بدات!

هەر ئەم هۆکارە بوو، وای لەموسڵمانە یەکەمینەکان کرد، تەرێز و قێز بکەنەوە لەو کارەی (معاویە) لەکاتێکدا خەلافەتی گۆڕی بە پادشایەتی بۆ ماوەیی... کە هەر بەڕاستیش ئەوی لێ ی دەترسان ڕوی دا، ئەوە بوو چەندین ستەم کار و شێتی وەکو (هارونە ڕەشید) لەرێگەی ویراسەتەوە هاتنە سەر عەرشی خەلافەت.

**هارونە ڕەشید:**

خەڵکێکی زۆر بەم کابرایە خەڵەتاون، و بەیەکێك لە پادشا هەرە دادپەروەر و داناکانیان داوەتە قەڵەم، کە لەڕاستی دا ئەو لەهەمان کاتدا ستەم کاریش و شێتیش بوو.

مێژوو باسی ئەو کابرایەمان بۆ دەکات و دەڵێ هەندێ جار پێدەکەنی و شۆخی دەکرد، کەیف و خۆشیی دەکرد، هێندەی نەدەبرد لەناکاودا لەو بارە دەگۆڕا بەتایبەت ئەگەر گوێبیستی ئامۆژگاریەك یاخود هۆنراوەیەك بوبا لەبارەی دونیانەویستی یەوە، لەوکاتەدا لەترسی خودا دەستی دەکردە گریان و دادو فیغان.. گەر پیاوێکی هەژار ئاوهای بکردایە، جار لەدوای جاریش دوبارەی بکردایەتەوە، ئەوا خەڵکی پێی پێ دەکەنین و بەرد بارانیان دەکرد، تەنانەت لەوانەیە بەو هۆیەوە ببوایەتە شتێکی دەست بە زنجیر بەستراو.

خاوەنی پەرتوکی (الاغاني) دەڵێت: "لەکاتی ئامۆژگاری دا ڕەشید یەکێك بوو لەو کەسانەی زۆر بەخوڕ ئەسرین دەڕژن، لە ساتی توڕەیش دا زۆر سەخت و دڵڕەق بوو" جگە لەویش گوتویانە: "هارونە ڕەشید زۆر ئایندار بووە، لە ڕۆژێك دا سەد ڕکات نوێژی کردوە" هێندە توڕەش بووە بە بێ هۆ خوێنی ڕشتوە.. تا دەڵێت: ئەم خەسڵەتانەش ئاسان نیە لەیەك کەس دا و پێکەوە کۆ ببنەوە"[١٢].

هەندێك لەمێژونوسەکان وای بۆ دەچن کۆبونەوەی هەموو ئەو خەسڵەتانە لە (هارونە ڕەشید) دا، لەنیشانەکانی سوارچاکی و بەسۆزیە.. وەلێ من لەو مێژوونوسانە دەپرسم: گەر ئەو خەسڵەتانە لە میوە فرۆشەکەی هاوسێ یاندا یاخود لەو بارەهەڵگرە دا کە کۆڵەکانیان بۆ هەڵدەگرێت ببینن، ئایا بەهەمان ئەو شێوەیە لێکی دەدنەوە کە بۆ هارونە ڕەشید لێکی دەدەنەوە؟

لەڕاستی دا ئەم خەسڵەتە پێچەوانانە، لەزۆر کەسی ئاسایی دا هەن، بەڵام ئەمان هەوڵ دەدەن بیان شاردنەوە و پەردەپۆشیان بکەن لەترسی ئەوەی نەبادا، خەڵکی تەرێزیان لێ بکەن، ئەگەر نەشیان توانی بیشارنەوە، ئەوا دەبنە جێگەی گاڵتەپێکردن و چەوساندنەوە، لەوانەشە لەکۆتایی دا ببێتە هۆی شێت بونیان. ئەمەش ئەو ڕایەی

لەمەو بەرمان بەهێزتر دەكات كە گوتمان: بارودۆخە كۆمەڵایەتیەكانی دەوربەری ڕۆڵی گەورە دەگێڕن لەدانانی مرۆڤەكە لەلیستی شێتەكان یاخود ژیرەكاندا.

**هاودژبون ( ناكۆك بون ) و شێتی :**

ناكۆك بون، وەك لەبەشی پێشوشدا ئاماژەمان پێدا، لەهەموو مرۆڤیكدا بوونی هەیە. لەمرۆڤی بلیمەتیش دا زیاترە وەك لەمرۆڤی ئاسایی.. لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی (شێت)یش وەكو (بلیمەت) ناكۆكی زۆری تێدایە، وەلێ جیاوازیەكی گەورەش هەیە لە نێوان ناكۆكی نێوان ناخی بلیمەتەكان و ئەو ناكۆكیەی لەنێو كەسێتی شێتەكاندا هەیە.

بلیمەت لەخەسڵەتە ناكۆكەكانی دەسگایەك بۆ داهێنان پێك دەهێنێ، چونكە لەنێو خۆی دا تایبەتمەندیەكانی هەست و نەست (یاخود بابەتی و خودی) كۆ دەكاتەوە، هەردوكیان پێكەوە بەكار دەهێنێت بۆ گەشتن بە بیرۆكەیەكی نوێ.. وەلێ شێتی بابەتی بوون تیای دا زۆر لاوازە، ناشتوانێت بەشێوەیەكی ڕاستگۆیانە لەبویەر حاڵی بێت، هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین بێ ئەوەی بەربەستی هەبێت خۆی دەدات بەدەم پاڵنەرە نەستیەكانیەوە.. لێرەوە ئیدی ناكۆك بوون تیای دا دەردەكەوێت و ڕەنگ دەداتەوە.

ئەمەش یانی: ناكۆكی لەشێت دا لەهەستە زۆر توندە خودیەكەیەوە هەڵدەقوڵێ، لە ڕەفتاری بەگوێرەی داخوازی گرێ دەروونی و ئارەزوەكانی دەڕوات بەڕێوە و هیچ گوێش نادات بەوەی پاش كاتژمێرێك كردەوەیەكی پێچەوانە بەهی ئێستای بكات.

بەم دواییانە زاناكان جۆرێكی دیكەی (شێتی)یان دۆزیوەتەوە و ناویان ناوە (شێتی سایكۆبایی).. خاوەنی ئەم جۆرەی (شێتی)، بەوە لە شێتیەكانی دیكە جیا دەكرێتەوە كە ژیرە لەبارەی هەر شتێكەوە كە پەیوەندی بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەوە هەبێت، زۆر جار ڕوخۆش و خۆساچێن دەبێت لەمامەڵەكردنی لەتەك كەسانی دیكەدا، تەنانەت هیچ جیاوازیەكی نیە لەو كەسانەی ئێمە ناومان ناون (ژیرەكان)! تەنها ئەوەندە هەیە ئەم خاڵێكی زۆر لاوازی تێدایە كە بریتی یە لەوەی لە ڕوی كاتەوە (پەیوەستەگی كەسێتی) زۆر لاوازە.. بۆ نمونە: جاری وا دەبێت، دێت قەرزێكت لێ دەكات بەو مەرجەی لەپاش

كاتژمێرێك بۆت بگەڕێنێتەوە، كەچی كاتژمێرێك و دوان و بەڵكو دەیان كاتژمێری تێ دەپەڕێت، بەبێ ئەوەی هەست بەگرنگی بەڵێن و پەیمانەكەی بكات. تەنانەت لەوانەیە بە ناشرینی یەكی سەیرەوە ڕووبەڕوت بێتەوە، وەك ئەوەی قەردی لێ وەرنەگرتبی یان هیچ بەڵێنێكی پێت نەدابێت. گەر پرسیاری لێ بكەین كە ئایا بۆچی، ئاوها ڕەفتار دەكات؟ لەوانەیە بەزەردە خەنەیەكەوە پێت بڵێت: "قەیدی نیە! ئەو برە پارەیەت پاش كاتژمێرێكی تر دەدەمێ، چاوەڕوانم بكە، تاكو دێمە لات" ئنجا دەڕوات بێ ئەوەی بگەڕێتەوە.

كەسێكی ئاسایی ناتوانێت كاری بەو شێوەیە بكات و دڵنیاو بێ خەمیش بێت.. چونكە ئەگەر نەیتوانی بە ئەمەك بێت بەرانبەر بەو بەڵێنەی بەتۆی داوە، بە لایەنی كەمەوە لە لای تۆ دا شەرمەندەیی دەردەبڕێت.. كەسی ئاسایی دەتوانێت لەهەستی خەڵكی تێ بگات بەرانبەر بەخۆیی و بەڵێنەكانی.. وەلێ كەسی (سایكۆبایی) تا ڕادەیەكی زۆر سەیر بەهەست بە شەرمەزاریی ناكات[١٣] خود پەسەندیەكەی وی سەربەخۆ كار دەكات و هیچ گوێ نادات بەوەی كەسانی دی چۆنی لێ دەڕوانن.

مامۆستا (جرجیس) دەڵێت: ژیانی سایكۆبابیەكان لەچوارچێوەی بەها كورت خایەنەكاندا دەسوڕێتەوە، لەژیانیان دا بەگوێرەی بنەمای چێژ ڕێ دەكەن، چونكە هەمیشە هەست بەپێویستی بەخێرایی تێركردنی ئارەزوەكانیان و قایل كردنی پاڵنەرەكانیان دەكەن.. دەستەوسانیش لەوەی ئەو قایل كردنە خێرایە پەی گیر كەن بۆ خودێ كە زیاتر بمێنێتەوە و سەقامگیرتر بێت.. ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە پێگەیشتن و پێكفەگونجانی كۆمەڵایەتی، تا ڕادەیەك، بەندە لەسەر قوربانی دانی تاك بە خود كاتیەكەی لەپێناوی بەها دوور یاخود سەقامگیرەكاندا.. وەلێ كەسی سایكۆبائی چێژی بەپەلە و خێرا هەڵدەبژێرێت، سەرباری ئەوەش كە دەزانێت ئەو چێژە بەها سەقامگیرەكانی تەندروستی و ژیانی خێزانی و كاری پیشەیی یە لەنێو دەبات و دەیان ڕمێنێت.[١٤]

مامۆستا (سلامە موسی) كە پێناسەی سایكۆبابیەكان دەكات دەڵێت: "ئەوانە لەنێو خودگەراییەكی زیادەڕۆدا نقوم بوون.. دروشمیان تەنها بریتی یە لە من ...من.. من ..

مەبەستیانە سەر بکەون و زۆر جاریش سەرکەوتن بەدەست دێنن. کەسانی دی هیچ پلە و جێگەیەکیان نیە لەدیدی ئەمان دا و تەنانەت ئامادەباشن بۆ وەی کەسانی دیکە بپلیشێننەوە"[١٥].

دەکرێت بڵێین: ئەم خودگەراییە زیادەڕۆیە خەسڵەتی هەموو شێتەکانە، ئەوەندە هەیە کەسی سایکۆبایی دەتوانێ بۆ ماوەیەکی کاتی بەڕووی خۆشی و زمان شیرینی پەردەپۆشی بکات، ئیدی خەڵکیش بە ژیری لەقەڵەم دەدەن، لەکاتێکدا ئەم شێتە.. یان ڕەنگە هەندێ کەس بیانەوێت کەسی سایکۆبایی چاك بکەن لەڕێگەی ئامۆژگاریەوە، بۆ نمونە پێی دەڵێت: "ئەمەکداری یەکێکە لەو خوە باشانەی خودا فەرمانی پێ کردوە" کەسی سایکۆبایی بەڕێزەوە گوێ یان بۆ دەگرێت و لەگەڵیشیاندا کۆکە. لەوانەش بەڵگە و نمونەی دیکەش بۆ بەهێز کردنی ڕاگەیان بهێنێتەوە.. وا دیارە لە وتەکەی دا دڵسۆز بێت، وەلێ ئەمَ دڵسۆزیەی لەو چرکەیە گوزەر ناکات کە تێیدا دەدوێ.. هەر کە ئەو چرکەیەی تێ پەڕاند، ئەمیش هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە کەسێتی یەکی دیکە، بەگوێرەی ئارەزوە تازەکانی.

**هەڵگەڕانەوەی پێوەرەکان:**

گرفتی کەسی سایکۆبایش، وەك هەر شتێکی دیکە وایە، بارودۆخە ئابوری و کۆمەلایەتیەکان ڕۆڵی گەورەیان هەیە لەسوك کردنی یاخود قەبەکردنی دا..

بۆی هەیە کەسی سایکۆبایی، دەوڵەمەند بێت، یان پلە وپایە دار وبەدەستەلات بێت، لەم کاتەدا خەڵکی پاساو بۆ کارەکانی دەبیننەوە، تەنانەت لەوانەیە کردەوە ناکۆك و پێکەوە نەگونجاوەکانیشی بەنیشانەی بلیمەتی و مەزنێتی بدەنە قەڵەم.

یەکێك لەمنداڵەکانی خۆمم بینی، پەرتوکێکی دەخوێندەوە کەلەقوتابخانە پێی درابوو، پەرتوکەکە بەشێکی تێدا بوو بەناوی (مەزنێتی ڕەشید)ەوە، لەوەش سەیرتر، گوێم لێی بوو، هەر ئەو منداڵەی خۆم سرودی (بەغداد ئەی شاری ڕەشید)ی دەگوتەوە[١٦].. لەو کاتەدا زانیم کە چۆن دەستەلات و دیاردە کەشخەکان و دەوڵەمەندی دەتوانن شێت بکەنە بلیمەت و کەسێکی سایکۆباییش بکەنە مەزنە پیاوێ.

دیتمان، ڕەشید ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ چۆن پیاوێکی بوو، چەندە خوەکانی سەیر بوون، سەرگەرمی جوت و چەقەنەلێدان بوو (دەربڕینی وەرگێڕ) کەچی لەناکاودا، دەستی بەگریان دەکرد لە بەر دونیا نەویستی و پارێزگاری خۆی.. لە لایەکەوە بەماڵ و سامانی نەتەوە سێ هەزار کەنیزەکی دەکڕی و ئنجا لەترسی خودا دەبورایەوە.. لە وڵاتی ڕۆژانە سەد ڕکات نوێژی دەکرد، کەچی خوێنیشی لەپێناوی شتێك دا دەڕشت کەشیاوی خوێن بۆ ڕشتن نەبوو.[17]

ئەگەر ڕەشید شێت نەبوبێت، ئەوە بە لایەنی کەمەوە کەسێکی سایکۆبایی بووە، لەهەمانکاتدا گەورەی بڕواداران و سێبەری خوداش بووە بەسەر جیهانیاندا!

## پلەو پایە ساختەکان:

ڕەنگە زیادەڕەوی نەکەم، گەر بڵێم، زۆربەی ئەو گەورە پیاوانەی لەسەردەمە سوڵتانیەکاندا ژیاون لەم جۆرەی ڕەشیدن.. لەقولاییەکانی دەرونیان دا تۆوێکی بەهێزی شێتی شك دەبەن، وەلێ دەستەڵاتە ساختەکەیان دەیان شارێتەوە.. ئەوان دەتوانن ئەو ناکۆك بونە بێ ئەرزشەیان بەلوت بەرزی و پۆزلێدان بشارنەوە. کاتێکیش قسان دەکەن هەوڵ دەدەن زمانێکی کەشخەی ناسك بەکار بێنن، خەڵکیش کاتێ بەو شێوەیە گوێ یان لێ دەگرن، ئەو کەسانە لایان دەبنە زیرەك و دووربین و بیرتیژ.

لەسەردەمی رابردو و سەردەمی سوڵتانی تر دا ژمارەیەکی زۆرمان لە نمونەی ئەو کەسانە دێت.. بارودۆخی ڕیزپەڕ یارمەتی دابوون بۆ وەی پۆستی بەرز یاخود پلە وپایەی بەرێزی کۆمەڵایەتی بەدەست بێنن. خەڵکیش ڕاهاتبون لەسەر ئەوەی سڵیان لێ بکەنەوە و لەهەموو جڤاتێك دا لەبەریان هەستن.. سەرەنجامی ئەمەش، ئەوە بوو سەرەداوی کاروبارەکان زۆر جار دەکەوتنە دەستی شێتەکان.

یەك لەتایبەتمەندیەکانی سەردەمە سوڵتانیەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەوەیە کە خەڵکی بەگوێرەی ئەو رێز لەپیاوێك دەگەن کە چەندە ڕواڵەتی قەشەنگ و ئارەزووی خۆسەپاندنی هەیە.. تا ئەمڕۆکەش پاشماوەیەکی ئەم خوە لەنێو خەڵکێکی زۆر دا ماوەتەوە، ئەوەتانێ تەنها رێز لە پیاوێ دەگرن کە بەشان و باهۆ بێت (دەربڕینی

وەرگێڕ) و گاتێكیش قسان دەكات لەلوتیەوە دەری بكات!! وەلێ گەر بزانن پیاوێكی بەستەزمانی و خۆبەكەم زانە، ئەوا هەرچی چاكە و تایبەتمەندی هەیە لێی دادەماڵن.. خەڵكی بەم كردەوەیە بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن ستەم لەخۆیان دەكەن.. چەندە بلیمەت بەو هۆیەوە بلیمەتێتی یەكەی لەدەست دا، و چەند شتیش لە لایان بوەتە سەرتۆپی زانایانی!!

لەسەردەمی پێشوودا، كابرایە هەبوو، بەیەكێ لە مامۆستا مەزنەكان دادەنرا، دەوڵەت سەرتاپا، سەرسام بوون بەبلیمەتی ئەو مامۆستایە، بۆیە ئەركی گرنگی پێ دەسپێردرا.. ئەوە بوو ئێستگەی ڕادیۆ خەریك بوو دەتوایە بۆ ڕێزلێنان لە وتە جوانەكانی.. وەزارەتی مەعاریفی بەڕێزیش لۆی دەمردن!! كەش و هەوای كۆلێژ و پەیمانگا باڵاكانیش بێ دەنگی دای دەپۆشی بۆ گوێ گرتن لەو بیرۆكە نوێیانەی لەزگی مامۆستاوە دەردەچن.. ئەز، ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا كە لەو پیاوە بكۆڵمەوە، لەئەنجامدا هیچ تایبەتمەندیەكم تێیدا نەبینی ئەوەندە نەبێت كە وا ڕاهاتبوو، لە لوتیەوە قسانی دەردەكردە دەرێ، بەختیشی باش بوو كەپۆیە زلی هەبوو!!

**شێتی و گەلحۆیی:**

مادامێك باسی (شێتی) و جۆرە جوداگانی دەكەین، پێویستە باسی (گەلحۆیی، گەمژەیی)ش بكەین، كە بەڕای بەندە ئەمیش جۆرێكی سوكە لەشێتێتی.. هەندێ كەسیش بەرەو شتێتی تەواوەتی دەبات لەكاتێكدا بارودۆخە كۆمەلایەتیەكان و ئابوریەكان لەسەریان سەخت دەبن.

(گەلحۆیی) ئاسایی لەو گوفتار و كرداره (بێتامانە) دا خۆی دەبینێتەوە كە خەڵكی بێزیان لێی دەێتەوە، كەچی خاوەنەكەی پێی وایە باشترین كردار و گوفتارێكن مرۆڤ بیان كات!! بۆ نمونە: نوكتەیەكی (بێ تام) دەگێڕێتەوە و خۆیشی یەكەم كەسە بە نوكتەكەی خۆی پێ دەكەنێت، زۆر جار ئەوەندە پێدەكەنێت وا گومان دەبات دانیشتوان هەموویان پێدەكەنن بەنوكتەكەی، كەچی دانیشتوان بەكابرا پێدەكەنن نەك بە نوكتەكەی!!

دەگونجێت هەمان قسە بكەین لەمەڕ هەموو ئەو كردار و گوفتارانەی گێلەپیاوەكان دەیكەن.. كاتێ بەڵاكە سەخت تریش دەبێتەوە لەسەر خەڵكی كە ئەو گێلە پیاوانە خاوەنی كورسی بۆماوەیی و سامانی زۆر و زەوەند و دەستەڵات بن.

یەكێكی دیكە لە بەڵاكانی گەلحۆیی، ئەوەسانێ كە پەتائاسایە.. گەر بێت و سوڵتان كە سەری كۆمەڵگەیە، لەو جۆرە پیاوانە بوو، ئەوا وەزیر و گزیر و دەستە و پێوەندەكانیشی كەم و زۆر چاوی لێدەكەن و توشی ئەو پەتایە دەبن.. چونكە ئەوان لەڕێگەی ماستاوكردن بۆ (سوڵتان)ەوە گەشتونەتە ئەو پلە وپایەیە، بۆیە وا چاوەڕوان دەكەن دەست و پێوەندەكانی خواری خۆشیان وایان بۆ بكەن، ئەمان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ سوڵتان كردووە، خوارەوەی خۆشیان بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ ئەماندا بكەن.. بەو جۆرە ماستاوچێتی و خۆبردنە پێشەوە دەبێتە نەریتێكی كۆمەڵایەتی گشتی، هەر كەسێك بگری بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ كەسێكی لەخۆی پلەدارتر و بەرزتر دادەكات.. بەو جۆرەش پەتای گەلحۆیی و گێلەپیاوی بەجۆرێكی ترسناك لەنێو خەڵكی دا بڵاو دەبێتەوە، قورساییەكەیشی دەكەوێتە سەر چینی خوارەوەی هەژار ونەدارەكان. چونكە چینی هەژارەكان و نەدارەكان پێویستە بۆ هەر كارێكی گەمژانە و ستەم كارانەی چینی باڵا، پاساوێك بدۆزنەوە، بەڵام ئەبێ باجی گوناهی كردەوەكانی خۆیان بدەن!!

## گوناهەكانی هەژار:

لەسەردەمە سوڵتانیەكاندا پێویستە مرۆڤی هەژار تاوان وگوناهەكانی دنیا و پاشەڕۆژیش پێكەوە لەئەستۆ بگرێت، پێویستە لەبەرانبەر گوناهە زۆرەكانیشی دا بچێتە ئاگرەوە، لەدنیادا بەچاوی سوكایەتیەوە سەیری دەكرێت. لەسەردەمە سوڵتانیەكاندا خەڵكی ڕاهاتبوون لەسەر لێپرسینەوەی هەژار لەسەر هەموو جموجوڵێكی. لەبەرچاویاندا بێ ئەرزش و بێ بایەخە بەجل و بەرگی دڕاو و شێوە ناشیرینەكەیەوە.. بۆیە هەر ئەوەندەی كەمێك گەلحۆیی یاخود (ناكۆكی كەسێتی) تێدا بەدی بكەن، بەگاڵتە پێكردنەوە دادەبارێنە سەری.

خەڵكی كاتێ بەو شێوەیە لەگەڵ هەژاردا دەجوڵێتەوە، پرکێشی ئەوە ناكەن هەمان ڕەفتار لەتەك دەوڵەمەندێكدا بكەن، نەخاسمە ئەگەر كابرای دەوڵەمەند ڕوخساری جوان و كەشخە بێت.. گەر دەوڵەمەندێكی بەو شێوەیە قسەیەك بكات، پێی دەڵێن: "ئافەرین"، بەوەندەش دەست هەڵناگرن بەڵكو ڕوی دەمیان دەكەنە ئەو هەژارەی لەتەنیشتیانەوە دانیشتوە و سەرزەنشتی دەكەن و پێی یەژن: "كابرای هەژاریش بێدەنگە و نازانێت چۆن وەڵام بداتەوە. چونكە ئەم لە بابای دەوڵەمەند جوانتر دواوە. وەلێ گرفتەكە گرفتی سامانە خودا دزیوی بكات، سامانە كە لەدەبەنگی دانایی و لەقسەی پوچ و بێناوەرۆكیش ڕەسەنایەتی دەخولقێنێ"(١٨)

هەژارێ كەلە كۆمەڵگەیەكی بەم شێوەیەدا بژی بەر لەهەر كەسێكی‌تر مەترسی شێت بوونی لەسەرە. هەر ئەمەیشە وای كردوە لای ئێمە زۆرینەی شێتەكانی شێتخانەكان لەچینی هەژار و ڕوخسار دزێوەكانن.

شێتێك دەناسم لەسەرەتادا گەنجێكی ڕێك و پێك بوو، بەڵام ناشیرین و هەژار بوو، حەزی لەوە بوو وەكو هاوڕێكانی دیكەی لای ژنان خۆشەویست بێت.. هاوڕێكانی لەم ڕووەوە (داو)یان بۆ دەتەنی، نامەی دڵدارییان لەسەر زمانی كیژانەوە بۆ دەنوسی، ئەمیش بڕوای پێ دەكرد و هیوایەتی زۆر و زەوەندیشی لەسەر بنیات دەنا.. هاوڕێكانی حەزیان لەوە بوو پێی راببوێرن، پێی پێ بكەنن.. تاكو زیاتریش پێ‌ی پێ بكەنینایە، ئەو لەلای خۆیەوە زیاتر بەعاسمانی ئەندێشە و هیوا جوانەكاندا دەفڕی.. دواتر وای لێهات خۆی لێ بوبە (یوسف) لەڕوی جوانیەوە و، وای دەزانی ژنان لەبەر جوانی وی خۆ بەكوشت دەدەن.. كاتێ هاوڕێكانی لەپێكەنین بەو گەنجە بێ تاقەت بوون، دەستیان كردە ئازاردان و دەست درێژی كردن بۆ سەری.. ئەم لە لای خۆیەوە وای گومان دەبرد هاوڕێكانی ڕژدی پێ دەبەن چونكە لە ڕوی سێكسیەوە توانای سەرنج ڕاكێشانی كیژانی زۆرە (دەربڕینی وەرگێڕ).. هیچ چارەیەكی نەدیتەوە، ئەوە نەبێ قەمە (كێردی گەورە)یان لێ ڕابكێشێت و هەڕەشەیان لێ بكات. بەوجۆرە لەناو هاوەڵەكانی دا بە(پاڵەوانی قەمەكێش) ناوی دەركرد.. ئەو هەنوكە لە ژێرزەمینێك دا بەزنجیر بەستراوەتەوە لەترسی ئەوەی نەبادا

کەسێك بەقەمە بڕندەکەی بکوژێت.. بەڕاستی ئەو کەسە جوانی گوتوە کە دەڵێت: کۆمەڵگە هەندێ جار بکوژانی خۆی بەدەستی خۆی دروست دەکات!

گەر ئەو گەنجە ڕۆڵەی دەوڵەمەند بوایە، لەژیانی واقعی خۆیدا ئارەزوی سێکسی سەرکوت کراوی خۆی بۆ تێر دەکرا، ڕەنگە کێژیکیشی بدۆزیایەتەوە کە بەدڵخواز ئەمی قبوڵ بکردایە.. دواتر ماستاوچیەکانیش دەهاتن و جوانیە (یوسفی)یەکەییان بۆ ئارایشت دەدا.. لەوکاتەشدا ئیتر ئەمیش هۆکارێکی تەواوەتی نەدەبینی بۆ وەی شێت ببێت.

## شێتی وبارودۆخی خێزانی:

بارودۆخی خێزانی کاریگەری گەورەی هەیەلە سەر پێکهێنانی کەسێتی شێت. تەنانەت پێ دەچێ ئەم بارودۆخە ئاسەواری بەهێزتر بەجێ بهێڵێت لەبارودۆخە کۆمەڵایەتیە گشتی یەکە.. ئەوانەی سەرقاڵی پەروەردەی نوێن دەرکیان بەم ڕاستی یە کردوە و گرنگی زۆریان پێی داوە.

بۆ نموونە: سەرنجی منداڵێك بدە کە لەنێو خێزانێکی هەژاردا پێ دەگات، خێزانەکەی دەیانەوێت ئەو منداڵە بچێتە قوتابخانە و، وەك منداڵی خەڵکی لە پاشەڕۆژدا ببێتە کارمەندێکی گەورە یان پزیشکێکی ناودار یان ئەندازیارێکی سەرکەوتوو .. هتد. منداڵە هەژارەکە ئەو بەهرە و ئامادەسازیانە لەخۆی دا نابینێت کە بیکەنە قوتابیەکی سەرکەوتوو.. لەوانەیە باشتر بێت ئەگەر ببێتە وردەواڵە و داو دەرمان فرۆش یاخود دارتاش یان قۆندەرە فرۆش.. وەڵێ کەس و کاری هەرگیزاوهەرگیز ئەوەی لێ قبوڵ ناکەن. چونکە ئەمان دەیانەوێت سەری خۆیان بەم منداڵە لەناو خەڵکی دابەرز بکەنەوە، وەك فلان وفیسار کە بەهۆی منداڵەکانیانەوە سەریان بڵندە!! (دەربڕینی وەرگێڕ).

لێرەدا ئەوەی شیاوی باسکردنە، ئەوەیە منداڵی دەوڵەمەند، دەتوانێت بگاتە مەرامی خۆی ئیدی چ پۆستی بڵند بێت یان پیشەی بەرێز و چاك.. چونکە ڕێگەکانی واسیتەکاری و بەرتیل دان لەبەردەمیدا واڵا وکراوەن، خەڵکیش بەهەموو جۆرێك

ئامادەن هاوکاری بکەن. لەو کاتەشدا لوتی بەرز دەکاتەوە و وادەزانێت بەتوانا و هەوڵی خۆی گەشتۆتە ئەو قۆناغە .. لەوانەشە نەسڵەمێتەوە لەوەی شانازی بکات بەسەر هاوەڵەکانی دا و پێیان بڵێت: (هەر کەس بەڕاستی هەوڵ بدات دەگاتە مەبەست) یاخود (هەر کەس بەسەر رێگەیەکدا بڕوات دەگاتە مەنزڵ!!) هەژارەکانیش کاتێ ئەم قسەیەی لێ دەبیستن بڕوای پێ دەکەن، بۆیە دەبینین دەست دەکەنە ئامۆژگاری وشکی منداڵەکانیان و بەسەریاندا دەقیرێنن و دەڵێن: "هەر کەس بەڕاستی هەوڵ بدات دەگاتە مەبەست"، کابرای هەژاریش دەیەوێت منداڵەکەی سەرکەوتن بەدەست بێنێت وەکو منداڵە (بەناز)ەکەی کابرای دەوڵەمەند!!

منداڵە هەژارەکە سەری هەڵدەکرێنێ و هەموو هەوڵی دەخاتە کار، بەڵام بێ سودە.. هەمیشە شمشێری (هەر کەس بەڕاستی هەوڵ بدات دەگاتە مەبەست) بەسەر سەریەوە ڕاست کراوەتەوە.. ئنجا لە لایەکەوە ناتوانێ دەمبەدەمەی ئەو پەندە بکات و نەی سەلمێنێت، لە لایەکی تریشەوە ناتوانێت سودی لێ وەرگرێت.. ئەمەش لەسەرەتاوە دەبێتە هۆی ململانێی دەرونی تیای دا، لەکۆتایش دا دەبێتە هۆی شێت بوونی.

### شێتێک دەناسم:

گەنجێک دەناسم ئێستاکە شێت و دێوانەیە. من ئەو هەلەم دەست کەوت کە هەر لەسەرەتایەوە سەرنج و تێڕامانی ژیانی ئەو گەنجە بدەم، دەرکم بەوە کرد کە (شێتی) تیای دا سەری هەڵداوە، بەهۆی ململانێیەکی بەهێزەوە کە کەوتۆتە نێوان جیهانی ناوەکی ئەو گەنجە و جیهانی دەرەکی دا، دواتر ئەم ململانێیە تیای دا ئاڵۆز وگەورە بوو، تا بوە هۆی ئەوەی لەکۆمەڵگە دابڕێت ولەجیهانی ئەندێشە تایبەتەکانی خۆی دا بژی.

ئەم گەنجە لەسەردەمی منداڵێتی یەوە لەژینگەیەکی پڕلە هەژاری و نەفامیدا دەژیا، دایکێکی هەبوو زۆر لوت بەرز بوو، بەچاوی سوکایەتیەوە سەیری هەموو خەڵکی دەکرد.. ئاماژەی ئەم لوت بەرزیەشی رۆژ لەدوای رۆژ دەدایە کوڕەکەی.. وەکو هەموو منداڵانی تری هاوسێ و خزمەکانی ئەم کوڕەش خرایە بەر خوێندن، وەڵێ تیای دا

سەرکەوتوو نەبوو، ساڵ لەدوای ساڵ لەوانەکانی دا دەکەوت، دایکی بەهۆیەوە زۆری ئازار دەچەشت.. ئەو دەیویست بەهۆی کوڕەکەیەوە شانازی بکات بەسەر خزم و هاوسێکانی دا، کەچی بینی لەمندالآنی دیکە خوارترە.. ئیدی دەستی کردە سەرزەنشت کردنی و پێی دەگوت: "ئەی بەدبەخت! تۆیش وەکو باوکت وایت، خەلکی بەرەو سەرەوە دەچن، تۆ بەرەو خوارەوە دێیت!".

بەم هۆیەوە ماڵ لەم گەنجە هەژارە بویە دۆزەخ، لە لایەکەوە دەیەوێت لوت بەرزی خۆی و دایکی تێر بکات، لە لایەکی دیکەشەوە هەست دەکات ناتوانێ شان بەشانی هاوڕێکانی لەخوێندن دا سەرکەوتن بەدەست بێنێت.. هەر سەرزەنشت کردنێکیش کە لەدایکی دەبیست، ململانێی ناخی ئەمی پتر ئالۆز و گەورە دەکرد.

سەردەمێك هاتە پێشەوە، هەندێ لە هاوڕێکانی چونە نێو ئەرك و وەزیفەی دەوڵەتیشەوە و تیایشی دا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئەمیش لەجێگەکەی خۆی دا مایەوە و، داوای درهەمێ یان دوو درهەمیشی لە باوکی دەکرد، بە ناڕەحەتی پێی دەدا.. ئەمیش وەکو هاوڕێکانی حەز و ئارەزووی هەیە و خوازیاری ئەوەیە تێریان بکات بەلام ناتوانێت!!

لێرەوە ئیدی ئەو هەژارە بەسەر خۆی دا مۆڵی خوارد و دەشکایەوە، ناچار لەڕێگەی خەونەوە ئارەزووەکانی خۆی تێر دەکرد.. خۆیی بە بلیمەتێکی ستەملێکراو و بیریارێکی مەزن دەهاتە بەر چاو کە خەڵکی بەچاکی ڕێزی ناگرن.. تا خەڵکی کەمتر ڕێزی بگرن ئەو زیاتر بەنێو ئەندێشە و خەونەکانیدا دەفڕی.

ئەمڕۆکە ئەو گەنجە بێ دەنگە، بەتەنها دەڕوات بەڕێدا و ئاوڕ بە لای کەسدا ناداتەوە، وەلێ لەناخی خۆیدا شۆڕشێکی بەلێشاوە.. جارێکیان چاوم بەو گەنجە کەوت و پرسیاری حاڵ وبالیم لێکرد، ئەوە بوو دەستی کردە باسکردنی مەزنێتی خۆی بیرە بلیمەتانەکانی و، ئاماژەیشی دا بەوەی کە چۆن ئیمپریالیزم لێی دەترسێت.. ئەو وای دادەنێت کە لەهەموو لاوە سیخوڕان چاودێری دەکەن و دوژمنەکانیشی گۆبەندی بۆ دەنێنەوە.. منیش دەترسم ئەو گەنجە سەرمەستانەتر بەنێو ئەندێشە بالآکانیدا نغرۆ

ببێت، لەئەنجامیشدا (قەمە) لەدژەکانی ڕاکێشێت وەك هاوڕێکەی لەمەوبەر قەمەی لە دژەگانی ڕاکێشا.

**سەردەمی رابردوو:**

بارودۆخی ئەو گەنجە دەگمەن لەنێو لاوەکانماندا، بەڵکو لەسەردەمی رابردودا نمونەی ئەو لاوە زۆر بوون.. وادیارە بارودۆخەکانی ئەو کەم تا زۆرێ یارمەتی زیادبوونی ژمارەیانی دابوو.

سەردەمی رابردوو لەدوای جەنگی گەردونی یەکەمەوە دەست پێ دەکات، ئەو دەمەی شارستانیەتی رۆژئاوا بەلایەنە باش و خراپەکانیەوە روی تێکردین، ئەوێ دەمێ قوتابخانە نوێکان دەرگاکانیان والاً کرد، دۆخی نێو ئەو قوتابخانانە پڕ بوو لە ئامۆژگاری بەتاڵ لەجۆری (هەر کەس بەڕاستی هەوڵ بدات دەگاتە مەبەست). منداڵانیش بەو هۆیەوە کەوتنە بەر ڕەحمەتی هەر تکە بەردی دەستاڕەکە.

قوتابخانەکان دەزگایە بوون بۆ دەرچواندنی کارمەندان (ی دەوڵەت ـ وەرگێڕ) ئەرك و وەزیفەی میریش جێ تەماحی زۆربەی دایکان و باوکان بوو. بۆیە پاڵیان بەمنداڵەکانیانەوە دەنا ڕووەو مەکتەب بەهیوای ئەوەی لەپاشەڕۆژ دا ببنە (ئەفەندی) و بەئەنگۆست ئامازەیان بۆ بکرێ.. قوتابی لە قوتابخانەدا کۆمەڵێ بیرۆکەی دەخوێند کە پێچەوانە بوون لەگەڵ واقعی ژیانی دا.. بۆیە ئەگەر بۆی هەڵکەوتایە لەقوتابخانە دەربچونا، دەبینی دنیا پێچەوانەی ئەندێشەکانی وی ڕێ دەکات. ئەوەتا فەرمانگەکان پڕن لە هامشۆکەرانی ناونابانگ و دەستەڵات دار، کە دێت واسیتە بۆ منداڵەکانیان یان بۆ ئەو کەسانە دەکەن کە هانایان بۆ هێناون، ئینجا هەژارەکان با هەر خۆڵ بخۆن!!

لەیادمە کاتێ لەساڵی (۱۹۳۷) دا لەقوتابخانەی دواناوەندی دەرچوم، بومە خۆش هامشۆکەرێکی فەرمانگەکانی میری بەتایبەت فەرمانگەکانی وەزارەتی مەعاریف (بەڕێز) .. ئەوە بوو لەبەیانی تا ئێوارێ بەنێو ڕێرەوەکانی دا دەهاتم و دەچوم یاخود خۆم بەسەر حەسارەکانی دا دەدا.. رۆژێك پیرەژنێکم بینی کە وەکو من لەسەردانی فەرمانگەکاندا بوو، بۆ دامەزراندنی کیژەکەی بەمامۆستا... پرسیارم لێکرد: "پورێ

گیان، واسیتەت هەی؟!" پیرەژنەکە دەستی کردە گریان و گوتی: "واسیتەی من تەنها خوایە". هیچ وەڵامێکی ئەم قسەیەم پێ نەبوو، ئەوە نەبێ کە گوتم: "پلکە گیان، بەدوای واسیتەیەکی دیکەدا بگەڕێ!".. ناشزانم ئایا ئەو پیرەژنە سودی لەو ئامۆژگاریەم وەرگرت، یاخود پشتی بە واسیتەی خودا بەستبوو لە سەردەمێکدا کە شەیتان زاڵ وبەدەستەڵات بوو!

کاتێ ئەو پیرەژنەم بینی، ڕۆڵەی دەوڵەمەندەکانیشم دەبینی کە دنیایان لوش دەدا، دەست درێژییان دەکردە سەر خەڵك و یاساغ کراوەکانیان پێشێل دەکرد و ماڵ و سامانی خەڵکیان تاڵان دەکرد، میریش پاساوی ئەو کارانەی دەدانەوە.. ئەدی چۆن پاساویان بۆ ناهێنێتەوە لەکاتێکدا واسیتەکان لە هەموو لاوە دەوریان گرتوون. گریمان یەکێك لەو مێردمنداڵە بەنازانە، بەگەڕۆکەکەی کەسێکی بەئەنقەست گردە ژێرەوە و کوشتی، یان یەخەی ئەفسەرێکی پۆلیسی لەسەر شەقامێکدا گرت و زللە و بۆکس و جنێوی زۆری ئاراستە کرد، یاخود پارمەتی دزینی ڕۆنی دا بەناوی دۆشاوی خورماوە.. ئایا حکومەت چ کارێکی لەگەڵدا دەکات؟ زۆرینەی گومان بەلای ئەوە دایە کەچاوپۆشی لێ دەکات و لێی دەبورێت... وەلێ گەر ڕۆڵەی چەوساوەکان بوایە و ڕەخنەی لەحکومەت بگرتایە کە لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا خاوخلیچك و نەرمە، ئەوا دنیای لێ دێتە سەر چنگ و داناکەون تا دەیکەنە پەند بۆ هەموو بەچکەی هەژارەکانی تریش..(دەربڕینی وەرگێڕ).

حکومەتی پێشوو بەوەندە دەستی هەڵنەدەگرت، بەڵکو زۆربەی نێوەند و پۆست و پەیمانگاکانی خۆی قۆرخ کردبوو بۆو مێردمنداڵە بەنازانە.. هەندێ جاریش بنکڕ و پاشماوەی ئەو نێوەندانەی دەهاویشت بۆ هەندێ لە نەوەی چەوساوەکانی وەك من بۆ داپۆشینی ئەو ریسواییە.

لەسەردەمی ڕابردوودا، ساڵێکیان پڕوپاگەندەیەك بڵاو بوویەوە، گوایە ئەوانەی لەیەکێك لە کۆلیژەکاندا وەرگیراون دوو گرووپ بوون: گروپێکیان بەواسیتەی پیاوە پلە وپایە دارەکان وەرگیراون.. گروپی دووەمیشیان بەواسیتەی خاتو (عفیفە ئەسکەندەر) وەرگیراون.. ئەم چیرۆکە بڵاو بویەوە، لەوانەیە پڕوپاگەندەیەکی ناڕاستیش بووبێت.. چونکە پڕوپاگەندەی بەو شێوەیە لەو سەردەمەدا زۆر بوو، ئێمە بەلامانەوە گرنگ نیە

ئەو چیرۆکە ڕاست بوو یان نا، گرنگ ئەوەیە بڵاو بویەوە و کەسانێکی زۆریش بڕوایان پێی کرد، چونکە لەدەوروبەری خۆیاندا ئاماژەی ڕاستێتی بەسەرهاتی ئاوهایان هەست پێ دەکرد.. بەهەر حاڵ ئەو ڕوداوە وێنەیەکی (کاریکاتێری) ئەو دۆخی ناشایستەیەمان دەداتێ کە وڵات لەو سەردەمە دا لەسەری ڕێی دەکرد.. جا ئێمە سەخت گیر دەبین لەبەرانبەر منداڵە چەوساوەکانمان دا کاتێ داوایان لێ دەکەین لەو بارودۆخە سەیر و سەمەرەیە دا هەموویان (ژیر) بن!!

**پەروەردەکردنی ساغ:**

ئێمە لەکاتێکدا لەخراپەکاریەکانی سەردەمی ڕابردوو دەکەین، پێویستە خراپەی ئەو بەهایانەشمان لەبیر نەچێت کە لەچاخە پیشوەکانەوە بۆمان ماونەتەوە و ڕۆڵ و کاریگەریشیان هەبوو لە تێکدانی پەروەردەی زۆرێك لەمنداڵەکانماندا.

یەکێك لەخەسڵەتەکانی پەروەردەی ساغ و تەندروست ئەوەیە کەمنداڵ کورت هەڵناهێنێ لەو شتەدا کە توانای نیە بیکات.. ئەمرۆکە ئەو ڕاستیە سەلمێنراوە کە زیرەکی و بیرتیژی و بەهرە جۆراوجۆرە، لەوانەیە منداڵێك بۆ پیشەیەك نەشێت، کەچی بۆ پیشەیەکی دیکە زۆر باشە.. وەلێ بەهاکانی پەروەردەی کۆن هیچ گرنگی یەك بەم مەسەلەیە نادەن.. لێرەوەیە کە دەبینین دایکمان داوامان لێدەکات ئەو پیشەیە هەڵبژێرین کە خۆی ئارەزووی دەکات، بێ ئەوەی سەرنجی زیرەکێتی ئێمە و توانا ئەقلیەکانمان بکات!!

خودا بەزەیی بەدایکمدا بێتەوە،

حەزی لەوە بوو من ببمە "عەتار" و لەو پیشەیەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنم تا لەکۆتایی دا ببمە "پیری عەتاران": ئەو زۆر سەرسام بوو بەعەتارێکی دەوڵەمەندی ناسیاوی خۆی، بۆیە دەیویست جێ پێ ئەو هەڵبگرم و بەجێ کەوشەکانی وی دا هەنگاو بنێم. ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی وایان لێکردم لەهەرزەکاریم دا پێنج ساڵی ڕەبەق لە قوتابخانە دوور بکەومەوە و لەسەرەتاوە ببمە "عەتار": وەلێ لەم پیشەیەم دا شکستێکی ترسناکم بەرکەوت.

هەر لەمنداڵیمەوە حەزم لەخوێندنەوەی كتێب بوو، وەلێ مامۆستا عەتارەكەم پێ وابوو، كتێب خراپترین بەڵایە كە دامێنی كاسپێ دەگرێ كە لەبەر دەروازەی خوا دا دانیشتوە (بۆ بژێوی) لەدیدی وی دا پەرتوك نە نانێك دەبەخشێت و نەبرسیەیەگی پێ تێر دەكرێت ... وەستاكەم دەیویست قنج و قیت لەبەر ئەو كڕیارانە هەستمەوە كە دێنە دووكانەكە و بەڕوویەكی خۆشەوە ڕووبەڕوویان ببمەوە، بەڵام لەناخی خۆمدا ڕقم لەهەموو كڕیارەكان بوو هەر ئەوەندەی یەكێكیان ڕووی لەدوكان دەكرد، لە ژێر لێوەوە دەستم دەكرد بەنەفرەت كردن لەویش و لە وەستاكەیشم.. ئەو كاتانەم بەهەل دەقۆستەوە كە مامۆستاكەم لەدوكان نەدەبوو، سەرقاڵی خوێندنەوەی پەرتوك دەبووم، لەو كاتانەدا گوێم نەدەدا بەوەی كڕیار دێتە دوكان یان نا... سەرئەنجام وەستاكەم زۆر بەخراپی لەدوكانەكەی وەدەر نام. سوپاسی خوا دەكەم لەسەر ئەو دەركردنە، چونكە توانیم یەك لایی ببمەوە بۆ كتێبە خۆشەویستەكانم.. گومانیشم وایە گەر هەر عەتار بوومایە، هەنووكە لەشێتخانە دەبووم (پەنا بەخوا!).

## پەراوێزەكانی پاشكۆی شەشەم:

١ـ بنوارە: Young, Personality, P 765

٢ـ بنوارە: eit. Loe

٣ـ بنوارە: Sutherland, Introductory Sociology. P 145

٤ـ بنوارە: روجيه باستيد، مبادىء علم الاجتماع الديني، ل ٢٩ ـ ٤٠.

٥ـ بنوارە: Benedict, patterns of Cultture, P 72 - 80

٦ـ بنوارە: محمد بن حبيب، المجبر، ل ١٩٢.

٧ـ بنوارە: طه حسين، الفتنة الكبرى، ل ١٥١.

٨ـ مامۆستا دەڵێت (في فبو مظلم) قبويە مانای شوێنێكی تری و گەوانەی دێت وەك لە منجد دا هاتوە، من پێم جوان بوو بە (هۆڵ) لێكی بدەمەوە.

٩ـ بنوارە: آغاخان، مذكرات آغاخان، ل ١٢١ ـ ١٢٢.

١٠ـ بنوارە: ابن خلدون، المقدمة، ل ١٢٦ ـ ١٢٧.

١١ـ بنوارە: آغاخان، مذكرات آغاخان، ل ١١.

١٢ـ بنوارە: عمر ابوالنصر، هارون الرشيد، ل١١.

١٣ـ بنوارە: Bowlbey, Personality and Mental Illnese, P 179.

١٤ـ بنوارە: صبري جرجيس، مشكلة الملوك السيكوباني، ل ٢٥٨.

١٥ـ بنوارە: سلامة موسي، عقلي و عقلك، ل ١٧٥.

١٦ـ زۆر بەداخەوە كە لەم رۆژگارەماندا ئەم سرودە لەقوتابخانەكانماندا و زۆر جاریش لەئێستگەی ڕادیۆدا دەخوێندرێتەوە.. لەسەردەمی رابردوودا وتنەوەی ئەو سرودە جێگەی سەرسامی نەبوو، چونكە ئەو سەردەمەش زۆر جیاواز نەبوو لەسەردەمەكەی ڕەشید یان سەردەمی هەر سوڵتانێكی تر، بەڵكو سەیر لەوە دایە ئەو سرودە لەسەردەمی كۆمارە میللی یەكەماندا بگوترێتەوە!!

١٧ـ بنوارة: أحمد امين، ضحي الاسلام، ج ١، ل ١١٧.

١٨- بەڕاستی دەوڵەمەندی زۆرێک لەپێوەرە ئەقلیەکان لنگە وقوچ دەکاتەوە، ئەو پەیڤانەی ماموستا وەردی ئەو هۆنراوەی قانعی شاعیری وەبیر هێنامەوە کە بە (فلس) دەڵێت:

وابزانم بێ ئەدەب نابم ئەگەر ئەمڕۆ بڵێم
تۆ لەلوقمان وئەرستۆ عالِم و داناتری
تا دەڵێت:
گلکی گەر بەرز گەیتەوە ئەیکەیتە پێشەنگی قەتار
ئافەرین بۆ تۆ فلس، بێشک لەمن داناتری

ئێمە لەئاقار ئەو واقعەدا کە ماموستا وەردی و قانعی لەمەڕ خۆمان ئاماژەیان پێ داوە، هەر ئەوەندە دەڵێین: ئێمەش ئەمڕۆ بەچاوی سەر دەبینین. چەندین قورمساخ و زەبەلاح و تەڕاح و گەلحۆ، پارە و سامان کردوینەتە پیاوی باڵەبان و قۆشمە و دەمڕاست.. ئیدی ئەمە واقعی ژیانە و پێویستە لەگەڵی دا هەڵبکەین (وەرگێڕ).

## ووتەی ماڵئاوایی:

لەكۆتایی ئەم پەرتوكەدا كە پێم وایە كۆتا كتێبمە كە بۆ خەڵكی بڵاو دەكەمەوە حەز دەكەم كورتە وتارێك بۆ ماڵئاوایی كردن لەخوێنەران بنوسم.. لام وایە زۆرێك لەخوێنەران هیچ ئەفسوس ناخۆن بۆ ئەم ماڵئاوایی كردنە، بگرە هەندێكیان پێشی شادومان دەبن. لەسەردەمی ڕابردودا پێنج دانە پەرتووكم بڵاو كردەوە، ئەم پەرتووكەش شەشەمین و دوایەمین پەرتوكمە... لەمەڕ پەڕاوەكانی پێشووم ڕاو بۆچوونی خوێنەران جودا جودا بوو. هەندێكیان لایان وایە زەمینە سازی كردن و ئاوات خواستن بۆ شۆڕش، هەندێكی تر لەخوێنەران بەپێچەوانەوە لایان وابوو پەڕاوەكانم هیچ نین جگە لەئامرازێ بۆ تێكدانی هزرەكان وبڵاوكردنەوەی بیری نامۆ و ئاوردەكراو.. من بۆ خۆم سەبارەت بەو دوو گروپەی لە ئاقار پەرتووكەكانم دا دروست بوون هیچم نیە بیڵێم، بەڵكو خۆیشم و ئەوانیش دەدەمە دەست دیرۆكێ، تاكوو حوكمی خۆی بەسەر منیش و ئەوانیش دابدا.

بەهەر حاڵ، من پڕوپاگەندەی ئەوە ناكەم كە لەسەردەمی ڕابردوو بووم یەكێك بووم لەنوسەرە خەباتكار و تیكۆشەرەكان، چونكە ئەمە سیفەتێكە وەها جوانترە نەیدەمە پاڵ خۆم، لەسەردەمی رابردوو دا نووسەرانێك وەدەر كەوتوون كە لەمن پتر ئامانجیان روون بوو، كەواتە ئەوان لەبەندە شایستەترن بۆ هەڵگرتنی ئەو سیفەتە جوانە.

نكولی ناكەم لەوەی منیش چەردەیەكم لەهەستی میللی و چەپڕەوی هەڵگرتبوو، ئەو هەستەش بەڕادەیەك پێگەشتنەوە لەهەندێك لەپەرتووكە پێشوەكانم دا ڕەنگی داوەتەوە. هەندێ جار میری بەو هۆیەشەوە تۆمەتباری كردووم.. هەرچەندە كە ئەمڕۆ دان بەوڕاستیە دادەنێم، نامەوێت شانازی و زمان درێژی پێوە بكەم، ڕەنگە پاڵنەرێكی خودی لەناخمدا هەبووبێت و هانی دابم بەرەو ئەو هەستە میللی یە.. پاڵنەرەكەش ئەوەیە كەمنیش وەكو میلۆنەها رۆڵەی ئەم گەلە بەشی خۆمم لە تاڵاوی هەژاری و ئازار و بێبەری بوون چێشت.. لەبەر ئەوە من ئەوەم بۆ پاساو نادرێت گروپێكی كەم پۆز

لێدەن بەسەر خەڵکی دا و قۆرخی هەموو فەزڵێك بۆ خۆیان بکەن. بەڕاستی هیچ دووڵ نیم کاتێ دەڵێم جیهانی نوێ بەهەموو ڕێچکە و ئارەزووەکانی یەوە بەرەو ئەو هەستە دەچێ.. چونکە لەراستی دا ئەمە ئامانجی مێژووە.. ئێستاکە لەوانەیە نەتەوەکان جیاوازییان هەبێت سەبارەت بەوردەکاریەکانی ئەو ئامانجە و شێوازی گەیشتن پێی، بەڵام ناتوانێ لەو ڕاستییە خۆ هەڵاوێرێ کە گەل سەروەرێتی و هەژاریش پتر پێویستی بەچاودێری و یارمەتی و گرنگی پێدانە وەك لەدەوڵەمەند.

## ژەهر لەنێو هەنگوین دا:

یەکێك لەبەرپرسان لەسەردەمی رابردوو دا منی وا پێناسە کردبوو گوایە "ژەهر دەکەمە نێو هەنگوین"ەوە.. هەنووکە پێویستیم بەڕاڤەی مەبەستی ئەو گوتەیە نیە لە نەریتی ئەو سەردەمەدا.. چونکە لەو سەردەمە دا ژەهر بەهەموو ئەو ڕاو بۆچوونانە دەگوترا کە دەسەڵاتداران پێی قایل نەبوون.. هەر چەندە نایشارمەوە، لەو سەردەمەدا درێغیم نەدەکرد لە "ژەهر" کردنە نێو هەموو ئەو بابەتانەی دەمنوسین یاخود وتارم لەسەر دەدان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دان بەو ڕاستییەدا دەنێم کە "ژەهر"ەکەی من هێندە پەنامەکی بوو هیچ تامێکی نەبوو، بەرەنجامی داخوازی لێکراویشی لێ نەدەکەوتەوە.

بەدەربڕینێکیتر، من شێوازی خۆگونجاندن و "مراوغە"م پەیڕەو دەکرد لەهەموو نوسین و کۆڕ و گوتارەکانم دا، یانی شێوازی "کەلیلە و دیمنە"م پەیڕەو دەکرد کە "بەیدەبا" لەدێر زەمان دا دایناوە.. هەندێکی دیکە ڕەخنە توند و تیژتریان ئاراستە دەکردم لەسەر ئەوەی ئەو شێوازە "بەیدەبا"یی یەم گرتۆتە بەر. لەمەڕ من دەیانگوت گوایە بەدەوری بیرۆکەکەدا دەسوڕێمەوە بێ ئەوەی بچمە نێو کرۆکەکەیەوە، و تەنانەت زۆر جاریش بە بێ ئەنجامێك لێ دێمە دەرەوە. هەموو ئەمانە ڕاستن و نامەوێ خۆمیان لێ بێ بەری بکەم.

من لەسەردەمی ڕابردوودا سەرپشك بووم لەنێوان دوو ڕێگەدا: یان ئەوەیە بەڕاشکاویەکی تەواوەتیەوە ڕای خۆم دەربڕم و بەو هۆیەشەوە ملی ڕێگای زیندان

بگرمە بەر، یاخود بێنەوبەرێ لە ڕایەكانم دا بكەم و بەوەش خۆم لە گرتووخانەش و لە ڕۆژی بڕینیش دەرباز بكەم.. ئینجا لەدوای سەرنج و تێڕامان، هەستم كرد ڕێگەی دووەم بۆ منیش و بۆ خوێنەرانیش بەكەڵك ترە. هەر چۆن بێت، كتێبەكانی پێشووم ڕەواجێكی باشیان لە لای خوێنەران هەبوو، بە گوێرەی ئەو ژمارە زۆرانەی لێیان چاپ كرا، ئەوە بوو لەدوای ماوەیەكی كەم لە چاپكردنیان لەبازاڕدا نەمانەوە.. ڕەنگە خوێنەران - سەرەڕای ناتەواوی پەرتوكەكانم- هەندێ شتی باش یان ئازاربەخشیان لەپەرتوكەكانم دا چنگ كەوتبێ.. سەیریش لەوەدایە زۆرێكیان پەرتوكەكانیشمان دەخوێنندەوە و جنێویشیان پێ دەدا... لەم ڕووەوە پەرتوكەكانم هەمان ئەو قسەیان بەسەر دا دەبڕێ كە لەبارەی گۆشتی ماسی یەوە كراوە و پێیان دەگوت "ماكول مزموم"!!.

**لایەنێكی دی:**

لەپەرتوكەكانم دا لایەنێكی دیكە هەیە كە هەندێ لەخوێنەران لێی رازی نین، ئەویش بریتییە لەشێوازی "گومان كردن".. من بەزۆری واژەكانی ("پێ دەچێ" و "لەوانەیە" و هتد...) م بەكار هێناوە لەكاتێكدا بۆچونێك دەخەمە ڕوو.. بەڕاستی من لەژیانی زانكۆم دا ئەم شێوازەم بەكار هێناوە و ماوەیەكی زۆریش لەگەڵی دا ڕاهاتووم و خۆ لێ قوتاركردنیش سەختە بۆم. سەرباری ئەوەش لەچەرخی نوێ دا، ڕێبازی زانستییانە لێكۆڵینەوە ئەو شێوازە دەسەپێنێت بەسەر نووسەر و توێژەردا.

گرفتی هەندێ لەنووسەرەكانمان لەوەدایە كە شێوازی دڵنیا و یەكلاكەرەوە و دەركردنی حوكمی بێ مشت و مڕ و گومان هەڵنەگریان گرتۆتە بەر.. ئەو شێوازەش دیارە لەسەردەمە دێرینەكانەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەو دەمەی ڕێچكەی "عەقلی" زاڵ ببوو بەسەر هزرەكاندا.. یەكێك لەچەمكەكانی ئەو ڕێبازە كۆنە ئەوە بوو كە پێ وابوو ئاوەزی مرۆڤ لەڕێگەی بیركردنەوەی ئەبستراكتەوە دەتوانێت بگاتە دۆزینەوە ڕاستی ڕەها، بەو پێودانگەش بیرمەند بۆی هەبوو "لەكاتێكدا ڕاستییەكەی دەدۆزیتەوە"

حوكمی یەكلاكەرەوەی تێدا دەربكات و سەرجەم ڕاو بۆچوونە پێچەوانەكانیشی بەناڕاست و هەڵە بژمێرێت.

لەیەكێك لەبەشەكانی ئەو پەڕاوە دا ئاماژەم داوە بەڕادەی ئەو هەڵەیەی كە لەم چەمكە "ئەقڵی"یە كۆنەدا هەیە.

جێگەی نیگەرانیمە كە لەم سەردەمەدا و "بەتایبەت لەم وڵاتەشدا" هەندێ خەڵك دەبینم، دەخوازن نوسەر بەوشێوازە بۆیان بنوسێت كەهیچ گومانی تێدا نیە، یاخود بەوشێوەیەی كە "دوو كەس لەسەری ناكۆك نین".. خۆیان لەبنەڕەتەوە بڕوای تەواویان بەهەندێ بۆچوون هەیەو دواتر گەرەكیانە نووسەریش هاوڕاو گونجاو بێت لەگەڵ ئەو بۆچوونانەیاندا.. بۆیە كە نووسەر ملەجەڕێ دەكات دەست بەجێ گومان لەنیاز و مەبەستەكانی دەكەن و تەریزی لێ دەكەن.

خەڵكی لەو هەڵوێستەیان دادروست لەو پیاوە لادێیە دەچن كە براكەی خۆی بە كوژراوی دەبینێتەوە، و دەست بەجێ و بەهەڵەداوان ڕادەكاتە سەر دوژمنە بكوژەكانی بۆ وەی بیانكوژێتەوە، لەوكاتەش دا بڕوای تەواوی هەیە بەوەی كە ئەو دوژمنانە براكەیان كوشتوە.. لەم دەمە دا ئەگەر لێكۆڵەرەوەی دادگەر هاتن و لەگەڕانیان دا بەدوی بكوژدا شێوازی گومان كردن و لێكۆڵینەوە بابەتیان گرتە بەر، لەودەمە دا پیاوە لادێیەكە دەكەوێتە گومان لێیان و پێیان دا هەڵدەشاخێ، و تەنانەت لەوانەیە بەلایەنگیری كردنی دوژمنەكانی تۆمەتباریان بكات.

### خوێنەرانی سەردەمی شۆڕش:

لەسەرەتای ئەم كتێبەدا باسم لەوە كرد كە ئارەزووی خوێنەران لەسەردەمی شۆڕشدا گۆڕانی بەسەر دا هاتووە لەچاو سەردەمی پێشوو، گەر لەبەر دا خوێنەران نوسراوی من و كەسانی وەك منیان قبوڵ دەكرد، هەنوكە نوسەری تازە بابەتیان گەرەكە، ئەم گۆڕانەش كە لەئارەزووی خوێنەران دا ڕوی داوە شتێكی سەیر نیە، چونكە لەسەرەتا و دەستپێكی هەموو شۆڕشەكاندا ئەم جۆرە گۆڕانە ڕوو دەدات، مێژوو باسی زۆرێك لەو دانەرانەمان بۆ دەكات كە لەسەردەمانی بەر لەشۆڕشەكان دا ڕەواجێكی زۆریان هەبووە،

ئینجا کە شۆڕش سەری هەڵداوە لە ماڵەکانیان دا دانیشتوون و چی دی نەیانزانیوە چۆن بیر بکەنەوە و بنوسن.

ئاسایی هەر شۆڕشێ بگری لەنێو ڕۆڵەکانی گەل دا دڵ گەرمی یەکی زۆر دروست دەکات بۆ پشتگیری کردنی .. ئەم دڵ گەرمیەش پێویستی بەدانەرانێکی نوێ هەیە کە لەگەڵ خەڵکەکەدا خۆیان بگونجێنن و شێوازێکی پڕلەحوکمی یەکلا کەرەوە و ئاراستەکاری توندو تۆڵیان بۆ پەیڕەو بکەن.. ئەو دانەرەش کە ڕاهاتووە لەسەر شێوازی بەر لەشۆڕش، لە ڕووی پەیڕەوکردنی گومان کردن یان خۆ گونجاندن، ئەوا پێویستە مل کەچی بویەر بێت و لەپلە پێشوەکەی دابەزێت و بەدڵخوازی خۆی بیبەخشێتە ئەو نوسەرانەی خاوەنی شێوازی دوای شۆڕشن.

هەرکەسێکیشیان پێداگری بکات لەسەر پاراستنی پلە و پایەکەی، ئەوا تەوژمەکە تێك وپێکی دەشکێنێ، لەدنیاش دا شتێکی دیکە نیە وەکو تەوژمی کات تێکشکێنەرێکی باڵادەست بێت!.

هەندێ جار لەماوە مێژووییەکاندا، نوسەرانێ پەیدا دەبن کە دەتوانن شێوازی خۆیان بگۆڕن بەگوێرەی ئاڵ و گۆڕەکان.. وەلێ ئەو جۆرە کەسانە کە من یاخود دەگمەنن.. لەم ماوەیەی رابردوو دا کتێبێکی مامۆستا (لنین)م دیتەوە کە لەسەردەمی (قەیسەری) دا نوسیویەتی و لەدوای لەناوچونی (قەیسەر)یش پێشەکی‌یەکی نوێی بۆ نوسیوە (لنین) لەپێشەکی‌یەکەی دا دەڵێت: مەترسی (سانسۆری قەیسەریی) لەبەرچاو گرتوە کاتێ پەرتوکەکەی نوسیوە، ئەوپەڕی حەزرەتیشی کردوە کاتێ تێبینی یە سیاسیەکانی تۆمار کردوە، لەو ڕووەوە شێوازی ئاماژە دانی گرتۆتە بەر لە ڕێگەی (ئیزۆب)[1]ەوە.. ڕەنگە خوێنەر پرسیار لەبارەی ئەو ئیزۆبەوە بکات کە لنین باسی کردوە.. ئیزۆب کەسایەتیەکی شێوە ئەندێشەییە و ئیغریقە کۆنەکان بەسەرهات و چیرۆکە جەفەنگ ئاساکانیان داوەتە لای وی، بەهەمان شێوەی چیرۆکەکانی (کەلیلە و دیمنە)...

ئەمەش بەو مانایە دێت کە (لنین) بەدوای شۆڕش توانیویەتی شێوازی خۆی بگۆڕێت.. لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێ کە (لنین) بەر لەوەی نوسەر بێت سەرۆکی پارتێك و خاوەنی (مبدا)یێك بووە...

لەو ڕوەشەوە (لنین) جیاوازە لەنوسەرە پرۆفیشناڵەکانی هاوشێوەی نوسەری ئەم چەند دێرە.. ئێمە دەمانەوێت بنوسین بۆ ئەوەی بژین، وەلێ ئەو لەپێناوی پارتەکەی و بیر وباوەڕەکانی پارتەکەی دا دەژیا، ئەو بلیمەت بوو، وەلێ ئێمەی خەڵکی ڕەشۆکی لەخۆمان و منداڵەکانمان دەترسین تەنانەت لەوەڕەی سەگیش دەسڵەمینەوە.

### بازاڕی کتێبت:

وا ڕێ دەکەوێ نوسەرێك کتێبێك بڵاو دەکاتەوە لەماوەیەکی زەمەنی تایبەتدا، کتێبەکە ڕەواجێکی زۆری دەبێ.. کابرای نوسەریش وا دەزانێ خەڵکی سەرسام بوون بەشێوازی نوسینەکەی و بیرۆکە (بلیمەتانە)کانی.. بۆیە بەپەلە پەرتوکێکی دیکەی دەرکرد، ئەمیان بەپێچەوانەوە هیچ ڕەواجێکی لەلایەن خوێنەرانەوە نەبوو.. لەم کاتەدا نوسەرەکە دەستی کردە هەشەردان لەخوێنەران گوایە زۆر لەبابەتە (بلیمەتانە)کان ناموڕێنەوە!!

من بۆ خۆمی بەڕەوا نابینم وەکو ئەو پیاوە بم.. چونکە بوغزایی پەتاو بەڵایەکی ناڕەحەتە و لەخەڵکی تر زیاتر ئازاری خاوەنەکەی دەدات.. لەکتێبی (ئەفسانەی ئەدەبی باڵا) دا گوتومە: خەڵکی وەك چۆن ڕو دەکەنە کڕینی قۆندەرە یان هەر کاڵایەکی دیکەی بازێڕێ، ئاوهاش ڕو لەکڕینی پەرتوك دەکەن، کەواتە لەم ڕووەوە هاندانی بلیمەتێتی یان بەکەم زانینی لەگۆڕێ دا نیە.. نوسەر لەم ڕووەوە لە دوکاندار دەچێت، پێویستە ئەو کاڵایە بخاتە بەردەمی خەڵکی، کە خەڵکەکە گەرەکیانە، نەك ئەوەی ئەم لێیانی دەوێت.. لەوانەیە بەئاڵ وگۆڕی بارودۆخ خوێنەران لەپەرتوکێکەوە ڕو بکەنە کتێبێکیتر.. کەواتە لەو کاتەشدا پێویستە نوسەر لەگەڵیاندا هەڵ بکات، یان لەماڵەکەیدا کڕ بێت و خۆشی بحەوێتەوە و، خەڵکیش بحەوێنێتەوە.

**وێژەوانان و بازرگانی:**

هەندێ لەوێژەوانان لەو قسەیەم دڕدۆنگ بوون لە پەرتوکی (ئەفسانەی ئەدەبی باڵا) دا خوێندبویانەوە.. لەدیدی واندا نوسەر نابێت بازرگان بێت، چونکە لایان وایە بازرگانی پیشەیەکی ناشیرینە و، ناشایستەیە بەو کەسانەی خاوەنی وێژەی باڵان!!

شاردراوە نیە کە برادەرە ئەدیبەکانمان ئەم بۆچونەیان لەسەر دەمە سوڵتانیەکانی رابردووەوە بۆ ماوەتەوە.. لەو سەردەمەدا ئەدیبەکان لەسەر پاشماوەی سەرسفرەی سوڵتانەکان و دەست و پێوەندەکانیاندا دەژیان، لە ڕاو بۆچون و تێگەشتنیان دا چاویان لەسوڵتانەکان دەکرد، سوڵتان و دەست و بۆچۆن و تێگەشتنیان داچاویان لەسوڵتانەکان دەکرد، سوڵتان و دەست و پێوەندەکانیشیان بەچاوی سوکایەتیەوە سەیری بازرگانی و هەموو کارو پیشە بەرهەم هێنەرەکانیان دەکرد گوایە پیشەی سەرشۆڕەکانە![٢]

هەر لەبەر ئەوەیە کە دەبینین ئەدیبەکان ئەوەیان پێ باشترە کەیەکێکیان لەبەر دەم ماڵی گەورەکانی دا سواڵ کەرێك بێت، وەك لەوەی بازرگان بێت و بەئارەقی نێو چاوانی بژێوی پەیدا بکات، تا ئەمڕۆکەش پاشماوەیەکی ئەو حەزە لەنێو هەندێ لەئەدیبەکاندا ماوەتەوە، ئەوەتا دەبینین رێزی کەسێك دەگرن کە بەهۆنراوەیان بەکتێبەکانی ماستاوچێتی بۆ (ستەم کار) و موتریفەکان بکات، بەڵام کەسێك بەسوك سەیر دەکەن کە لەبازاڕی کتێب دا بیرۆکەکانی خۆی بفرۆشێت.

بەڕاستی لەم سەردەمەدا چەمکەکانی خەڵکی ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا هاتوە، وەلێ برادەرە ئەدیبەکانمان تا هەنوکەش دەستیان گرتوە بەچەمکە کۆنە سوڵتانەکانیانەوە.. تا ئێستاش وا دەزانن بازرگانی بە مانای چاو بەست و خەڵەتاندن و دەست بڕین دێت.. ئیدی ئەوەیان لەبیرچوە کە ئەمانە خەسڵەتی ئەو بازرگانانەن کە لەبازرگانیەکاندا پەنا دەبەنە بەر بەرتیل دان بە ئەمیر و موتریفەکان و خۆنزیك کردنەوە لێیان[٣].

ئەو بازرگانەی کە لەکارەکەی دا تەنها پشت بەخۆی دەبەستێ بە بێ یارمەتی و هاوکاری دەستەڵات دار و سوڵتانەکان ناتوانێ لەکارەکەی دا سەرکەوتن بەدەست بێنێت

ئەگەر دەست پاك و ڕاستگۆ نەبێت، هەر ئەمەشە وا دەكات خەڵكی ڕوی تێ بكەن و لەمامەڵە كردنیان لەگەڵی دا دڵنیا بن.

**كاڵا مادی و فیكری یەكان:**

ئەوەی شیاوی باسە، لەم ڕووەوە جیاوازیەك هەیە لەنێوان بازرگانی كاڵا مادیەكان و بازرگانی كاڵا فیكریەكان دا.. ئەویش بریتی یە لەماوەی كاڵا و شت و مەكە مادیەكان پێوەری ڕون و ئاشكرایان هەیە و، كڕیارەكان دەتوانن جۆری كاڵاكەی پێ بپێون و بەگوێرەی ئەوە هەند مادە لەهەندێكی دیكەیان بەباشتر بزانن. وەلێ كاڵا فیكریەكان ئەو جۆرە پێوەرە ئاشكرا یان نیە، زۆر جاریش خەڵكی لە ئاقاریاندا ناكۆك دەبن و هەندێكیان ستایشی دەكەن و هەندێكی دیكەشیان سەركۆنەی دەكەن، بەگوێرەی ئەو ئاراستە كۆمەڵایەتی و دەرونیانەی لەناخیاندایە.

هەر ئەمەشە كە ئەو هەڵەی ڕەخساندوە بۆ هەندێ لە بازرگانە چاوبەست كارەكانی فیكر تا سەركەوتن بەدەست بێنن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ لەم سەركەوتنەیان بەردەوام بن. هەر دەبێ ڕۆژێك لەڕۆژان دەمامك لەڕوی فێڵ و چاوبەستەكەیان هەڵبماڵرێت. بەتایبەت لەدوای ئەوەی خەڵكی ڕۆشنبیر دەبن و دەتوانن جیاوازی بكەن لەنێوان بیرە چاك و خراپەكاندا.

بازرگانی دەست پاكی نێو فرۆشیارانی بیر، ئەم ڕاستی‌یە بەباشی دەزانێت و دەرك دەكات بەوەی چاوبەست كردن لەفرۆشتنی فیكرەكاندا زیان لەبەرژەوەندی هەمیشەیی دەدات.. ئەمەش بەو مانایە نایەت كەپێویستە لەهەموو بیرۆكەكانی دا ڕاستی بپێكێت.. وەلێ دەبێ بەلایەنی كەمەوە بڕوای بە ڕاستی و دروستی بیرۆكەكەی خۆی هەبێت لەوكاتەدا كە دەیخاتە بەر دەمی خەڵكی.. بەدەربڕینێكی تر، فیكرەكە بەخۆی بفرۆشێت بەر لەوەی بەكەسانی دیكەی بفرۆشێت، ئنجا دوای ئەوەی دەرك بەهەڵەیەتی ئەو بۆچونە دەكات، قەیدی نیە پشتی تێ بكات و وازی لێ بێنێت...

هەندێ جار بازرگانی دەست بكات ڕێگە وشێوازی خۆگونجاندن و مراوەغە دەگرێتەر بە، بەتایبەت لەو كاتانەدا كە مەترسی یەكی لەخۆی هەبێت، بەڵام گرتنە بەری ئەم

شێوازە ناگاتە ئاستی چاوبەست کردن و دەست بڕین.. لەوکاتەدا ئیدی داخستنی دوکانەکەی پێ باشترە لەوەی کاڵای غەش تیاکراو بفرۆشێت بەخەڵکی.

**ئەوەی لێی دەترسێم:**

پڕوپاگەندەی ئەوە ناکەم کە لە پەرتوکە پێشوەکانم دا لەجۆری ئەو بازرگانە دەست پاکە بووم، وەلێ دەتوانم پڕوپاگەندەی ئەوە بکەم کە هەوڵم داوە بە پێی توانا لێکچونم هەبێ لەگەڵی دا.. سەرباری ئەوەش هەڵەی وام بەسەر دا تێ پەڕیوە تا ئێستاکەش پەژیوانم لێیان.

هەر چۆن بێ، لەسەردەمی رابردوو دا چەند پەڕاوێکم نوسین بێ ئەوەی بڵاویان بکەمەوە بۆ نێو خەڵکی ... گەر ئەو پەرتوکانەم بڵاو بکردایەتەوە بێگومان توند دەکرام لە قوڵاییەکانی بەندیخانە.. گومانیشم وایە لەم سەردەمە نوێیەشدا هەر ناتوانم بیانخەمە بەر دیدی خەڵکی.

لێرەدا دەخوازم ڕاشکاوانەتر لەگەڵ خوێنەردا بدوێم و قسەیەکی بدەم بەگوێدا کە لەوانەیە لێم وەرنەگرێت و پێی قایل نەبێ.. قسەکەشی ئەوەسانێ من لەسەردەمی رابردوودا لە تورەیی (دەستەڵات داران) دەترسام، تکام وایە سەردەمە نوێ یەشدا لەتوڕەیی (ئاژاوەچیەکان) دەترسێم. تکام وایە خوێنەر بەخراپ لەم پەیڤەم حاڵی نەوێ. چونکە ئاژاوەچێتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە و لەهەموو کۆمەڵگەیەکدا بوونی هەیە، ئاسەواری ئەو دیاردەیەمان لەعێراقیش و کۆمەڵگە و وڵاتانی دیکەشدا بینیوە.. تاکو ڕادەی نەزانین لەوڵاتێکدا زۆر بەهێز بێت مەترسی ئاشوبچیەکانیشی تێدا فرە دەبێت.

هەندێ لەو بیریارانەش کە ئێمە گومانمان نیە لەمیللی بوون و دیموکراسیخوازییان ئاماژەیان بەمەترسی ئاشوبچیان داوە.. مارکس و ئەنگلس لە (مانیفستۆی کۆمۆنیزم)دا ئاماژەیان پێ داوە، بەر لەسەدان ساڵیش (عەلی کوڕی ئەبی تالب) ئاماژەی پێ داون، ئەوەتا لەبارەی ئەو چینە (هەرچی و پەرچی)یانەوە دەڵێت: "ئەوانە خەڵکی هەرچی و پەرچین و وەك مێگەلی لاتۆکە بەدەم هەر ئاوازێکەوە دەچن و بۆ هەموو بایەکیش

خوار دەبنەوە" هەروەها، هەر لەبارەی ئەو چینەوە دەڵێت: "ئەو چینە ئەگەر کۆ ببنەوە زیان دەگەیەنن و ئەگەر پەرتەوازە بن سودبەخشن"[٤]

جێگەی سەرنجە هەندێ لە بیرمەندەکانمان دڕدۆنگ دەبن لەئاماژەدان بە (ئاشوبچیەکان)، چوون پێیان وایە ئەوانیش بەشێکن لەمیللەت، یاخود گەل بریێتیە لەوان، ئەمەش هەڵەیەکە هەندێ جار بەرەنجامی کۆمەڵایەتی زیانبەخشی لێ دەکەوێتەوە.

لەراستی دا گەل برێتی نیە لەئاشوبچیان... ویستی گەل لەو بڕیارە هێمن و تۆکمانەدا خۆی دەبینێتەوە کە لەبەرژەوەندی زۆرینەوە هەڵدەقوڵێن.. وەلێ ئەو چینە زۆربەی جار سەدایان بەشێوەیەکی شپرز و بێ بەرنامە و بەربەست دەردەکەوێ.. بەڵام نکولی ناکەین لەوەی هەندێ جار (گەل وئاشوبچیەکان) پێکەوە لەیەك سەنگەر و یەك بەرەدا بەدەردەکەون، سەرباری ئەوەش هێشتر ڕەوا نیە بۆمان لەهەموو کاتەکاندا ئەو دووە تێکەڵاو کەین.[٥]

هەواڵی هەندێ لەوڕوداوە دڵتەزێن و ترسناکانەم بیستوە کە ئاشوبچیەکان لەهەندێ ناوچەی عێراقدا بەرپایان کردوە، کەسانی بڕواپێکراو و متمانەدار کەبەچاوی خۆیان ڕوداوەکانیان دیوە، بۆمیان گێڕاوەتەوە، کەچی خەریك بوو بڕوام نەدەکرد لەبەر ترسناکی و بیمداری ئەو ڕوداوانە.. جاری وا هەبووە ئاژاوە چیەکان، هەڵیان کوتاوەتە سەر پیاوێك و لەبەر دەمی خێزانەکەی و منداڵەکانی دا بەخنجێر لەت و پەتیان کردوە، چاویان دەرهێناوە و بەگوریس ڕایان کێشاوە، ئەمیش بە بێ سود هەر لێیان لاڵاوەتەوە و هانای بۆ بردون.

یان ئاشوبچیەك قەمەیەك دەگرێت بەدەستەوە و شاڵاو دەباتە سەر ناسیاو و نەناسەکانیشی، ڕەنگە بیکێشێت بەڕوخسارو شان و سنگی کابرایەکی هەژاردا، وەك ئەوەی خنجێری دابێت لەفەردەیەکی "کا"! زۆرینەی هەر زۆری ڕۆڵەکانی گەل پاساوێ بۆ ئەو کارانە نابینن و بەرگەی بیستنیشی ناگرن. تەنانەت لەوانەیە هەندێکیان بەرگەی ئەوە نەگرن لەبەرچاویاندا ئازاری مشکێك بدرێت یاخود باڵندەیەك سەر ببڕدرێت، ئەمە سروشتی هەر مرۆڤێکی ئاساییە کە تۆزقاڵێ بەزەیی لەدڵی دا بێت.

مرۆڤ هەر چەندە لەهەست و خولیاکانی دا میللی بێت، ناتوانێت بگاتە ئەو پلە سەیر و سەرسام کارە.

ناچیزەیی ئاشوبەچیەکان: لەڕۆژێك لەڕۆژگارەکانی خەلافەتەکەی دا کابرایەکیان هێنایە بەردەستی (عەلی کوڕی ئەبی تالب). کابراکە تاوانێکی لەدەست قەومابوو، کۆمەڵێ ئاژاوەچی دەوریان گرتبوو، هەوڵیان دەدا دەست درێژی بکەنە سەری.. ئیمام هاوارێکی بەناودا کردن و فەرمووی: "مەرحەبا نەبێت لەو ڕوخسارانەی کە نابینرێن لەکاتی ڕودانی خراپەیەکدا نەبێ"!

خوێشم ڕۆژێك کۆمەڵێ ئاژاوەچیم بینی، تەرمی کەسێکیان بەگوریس ڕادەکێشا و تەرمەکەیان تێك دەدا، تاقەکەسێکم لەو کۆمەڵەدا نەبینی ڕێزی خۆی بگرێت.. لەوکاتەدا ئەو فەرمودەیەی ئیمامم بیر کەوتەوە کە کەمێك لەبەردا باسکرا.. ئەو کەسانەی بەوجۆرە کردەوە ترسناکانە هەڵدەستن، چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکەن هاوڵاتی باش بن. بەڵکو خەڵکی هیچ و پوچ و بێ ئەرزشن.. توێژینەوە کۆمەڵایەتیە نوێکان، دەریان خستوە زۆربەی تاکەکانی نێو ئەو گروپە ئاژاوەچیانە لەژێر کاریگەری پاڵنەرە ناچیزەکانی نێو قوڵاییەکانی ناخیان دا ئەو کردەوانە دەکەن[٦] چونکە لە ساتەوەختە ئاساییەکاندا ناتوانن ئەو مەبەست و پاڵنەرانەی نێو ناخیان بەرجەستە بکەن و بەدی بێنن، بۆیە چاوەڕوان دەکەن هەلێکیان دەست بکەوێ، زۆر جاریش لەنێو پانتایی خۆپیشاندان و ڕاپەڕین و خرۆشانە میللیەکاندا ئەو هەلەیان دەست دەکەوێ، ئیدی خۆیان دەخزێننە نێو ڕیزەکانی گەل و، ئەو بارە دلگەرمی یەی نێو گەل دەقۆزنەوە و دەست دەکەنە کوشتن و بڕین.

گەل پێکهاتوە لەکۆمەڵێك هاوڵاتی باش، کە لەژێر کۆڵی قورسی ژیاندا دەناڵێنن.. بۆیە پێویستە لەسەرمان هەوڵ بدەین و کۆشش بکەین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و کۆمەڵایەتی ئەو هاوڵاتیانە، هەر چەندە نابێ ئەم ڕاستیە هاندەرمان بێت بۆ چاودێری کردنی ناچیزە و خوێنڕێژەکان، بەبەڵگەی ئەوەی گوایە ئەوانیش ڕۆڵەی گەلن.

**دید وبۆچونێ:**

لەسەردەمە سوڵتانیە بەسەرچوەکاندا، دەستەڵاتداران ڕاهاتبوون لەسەر بەسوك سەیرکردنی گەل و لەقەڵەمدانی هەموو میللەت بەئاژاوەچی.. هەموو رابەرێکی میللیشیان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە ئاژاوەگێر و ئاشوبچیە. لەیەکێك لە پەرتوکە پێشوەکانمدا باسم لەم مەسەلەیە کردوە و لایەنە هەڵەکانیم ڕون کردۆتەوە[٧] لەڕاستی دا ئەم بۆچونە، راوبۆچونی چینە ستەمکار و زاڵ دەست و خۆسەپێنەکانە. هەر ئەم پێڕەش ئەو دید وبۆچونە لەنێو خەڵکی دا بڵاو دەکەنەوە تاکو لەو ڕێگەیەوە پلە وپایە و تایبەتمەندیەکانی خۆی بنج داکوتاوتر بکات.. گەل لەدیدی وی دا نەفام و دوژمن کارە، بەو پێیەش شایستە نیە بەوەی جڵەوی فەرمان ڕەوایی بگرێتە دەست یاخود ململانێی ئەو چینە بکات لەسەر دەستەڵات. ئێمە لەکاتێکدا، ئەمڕۆکە دان بەهەڵەیەتی ئەو دیدو بۆچونەدا دەنێین، نابێت لەکاردانەوەی بەرانبەری دا توندڕەو بین بەڕادەیەك هەر گردبونەوەیەکی ئاژاوەچییانە، بەوە بناسین کە کرۆکی گەلە و پێویستە ڕێزی بگرین!! فەرمانداران لەسەردەمی رابردوودا هەموو گەلیان بەئاشوبچی لەقەڵەم دەدا، ئێستاکەش لەسەردەمی شۆڕش دا هەندێك لەئێمە هەموو ئاشوبچیان بە گەل دەزانین، بەو پێیەش ڕاستی (نێوەندگی) لەنێو ئەوان و ئەماندا بزر بووە!

(مارکس) ئاشوبچیانی بە (لۆمپ برولیتاریا) ناوزەد کردوە، مەبەستیشی لەو توخمە لە پەت بەربوەیە کەلەپەراوێزی چینی کرێکاردا دەژین، مارکس بەم جۆرەیان پێناس دەکات: "ئەو جانەوەرە دۆگمایانە، خڵتەی نزمترین گرۆی کۆمەڵگەی کۆنن، لەوانەیە شۆڕشی برۆلیتاریا ڕایان کێشێتە نێو بزاڤ و جموجوڵ، بەڵام بارودۆخی ژیانیان و حاڵ و باڵی بژێویان وایان لێدەکات زیاتر لەئامادەباشی دابن بۆ خۆفرۆشتن بەکۆنەپەرستی"[٨] ئەم قسەیە زۆر ڕاستە... ئەو ئاژاوەچی یانەی ئەمڕۆکە دەیان بینین زۆر دلگەرمن بۆ شۆڕش، لەوانەیە سبەینێ هەڵگەڕێنەوە و ببنە سەرسەخت ترین دوژمنی، گەر خوانەگردە شۆڕش ڕو لەپاشەکشە بێت.

**من و ئاژاوەچییان:**

ئەم قسەیە بەبێ هۆدە ناکەم، چونکە بەخۆم مەترسی ئاژاوەچییەکانم تاقی کردۆتەوە و پەیم بەڕادەی ناچیزدییەکەی برد، لەکاتێکدا پەرتوکی (واعیزەکانی سوڵتان)م لەساڵی (١٩٥٤) دا چاپ و بڵاو کردەوە. من لەنوسین و چاپکردنی پەرتوکی (واعیزەکانی سوڵتان) دا مەبەستم لەوە بوو (دین) خاوێن بکەمەوە لەو چڵک و چەپەڵیە سوڵتانیەی کە پێوەی لکاوە... چونکە ئاین لەبنەڕەتی سروشتەکەیدا بزاڤێکی شۆڕشگێڕیە، وەلێ سوڵتانەکان و واعیز و یاساوڵەکانیان، ئاینیان لەو سروشتە یەکەمینەیەوە گۆڕیوە و کردویانەتە ئامرازێ بۆ بێهۆش کردن و لەخشتەبردن و گوێڕایەڵی کوێرانە. هەر چۆن بێت، ئاژاوەچییەکان بەجۆرێکی زۆر سەیر لە نوسەری ئەم چەند دێڕەدا خرۆشان، پتر لەجارێکیش هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد... هەندێکی تریان نەدەسڵەمینەوە لە وەی لەمنبەرن دا بیبینن کە بەرەو دۆزەخ دەبرێ و نەفرەتی خودا رشەموو فریشتەکانیشی بەسەر دا رژدەکرێ.

پێمیان دەگوت: چۆن دەگونجێت تۆ پێغەمبەر و هاوەڵە بەڕێزەکانی و ئال و بەیتە پاکیزەکەی ناوزەد بکەی بە (شۆڕشگێڕان - ثوار)، لەکاتێك دەشزانیت وشەی (شۆڕش - الثورة) لەوازەی (ثا - الثور)ەوە هاتووە! چونکە ئەمە یاخی بونە لە فەرمانی خودا و بانگەشە کردنە بۆ ئاشوب و فەوزا.. من لە ئاثار ئەو قسەیەدا کەوتبومە هەڵوێستێکی بێزارکەرەوە.. لە لایەکەوە نەمدەتوانی بە شێوە زانستییەکەی واتای (شۆڕش - الثورة)یان بۆ ڕون بکەمەوە، چونکە دەستەڵاتداران رێی قەڵس و تورە دەبوون. لە لایەکی دیکەشەوە نەم دەتوانی بێدەنگ بم و بوار واڵا بکەم ئاژاوەچییەکان پێی لێ ڕاکێشن.. بەو هۆیەوە وەك کەسێکم لێهات کە دەرزی یان مۆرسی قوت دابێ، نەمدەتوانێ لەگەرویدا دەری بێنیتەوە و نەیدەشتوانێ قیروسیایی لێ بکات و وازی لێ بێنێت.

سەیریش لەوەدایە ئێستا هەندێك لەو کەسە ئاشوبچیانەی گەرەکیان بوو بمکوژن دەبینم. رەوتێکی پێچەوانەیان وەرگرتوە، هەنوکە دەیانەوێت دژەکانی من بکوژن، ئیدی ناشزانم سوبحەینێ چی دەکەن، لەوانەیە هەوڵ بدەن منیش دژەکانیشم پێکەوە بکوژن!

## مەترسی لاوە دڵ گەرمەکان:

لێرە خەڵکانێکی دیکە هەن، کە بەئەندازەی ئاژاوەچی‌یەکان لەمەترسی ئەمانیش دەترسێم.. ئەوانیش ئەو گەنجە دلگەرمانەن کە کەم تا زۆرێکیان لە رۆشنبیری نوێ هەلگرتوە. بە لای منەوە هەندێ جار ئەمانە لە ئاژاوە چی‌یەکان مەترسی دارترن، چونکە ئەمان بە چەکی بەلگە و ئەقلی و نەقلیەکان دەجەنگێن... ئەم چەکەش وەك لەبەشێکی رابردوودا گوتومە، زۆر لەو چەکە ترسناك ترە کە لەئاسن دروست کراوە..

گرفتی ئەوان لەوە دایە کەم دەخوێننەوە و زۆر دەمبەدمە دەکەن، ئەر بیرۆکەیەکی دیاریکراویشیان وەرگرت، بە لەبەر کردنی تێکستە ڕواڵەتیەکەی دەست هەڵ دەگرن و ئیدی هەر دەی هێنن و دەی بەن، تەنانەت لەوانەیە هێرشیشی پێ بکەنە سەر هەر بیرۆکەیەك کە نەچێتە دڵیانەوە، بائەو بیرۆکەیەش لە کرۆکی ئەو فیکرەیە دابێت کەخۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن.

ڕەنگە لەو سنورەش دا نەوەستن، بەلکو شێوازی توندوتیژی و ڕەقێتی‌وە کار دەبەن لەهەر دەمبەدمەیەك کە لەگەڵیاندا دەکرێ.. هەندێکی دیکەیان پەنا دەبەنە بەر دەست بەجێ تۆمەتبارکردنی ئەو کەسەی هاوڕا نیە لەگەڵیاندا و بۆی هەیە دەست درێژی بکەنە سەر و سوکایەتیشی پێ بکەن.. نازانن بەو کارەیان خەلکی دور دەخەنەوە لەو بیروباوەڕەی بانگەشەی بۆ دەکەن و دلگەرمن بۆی.

بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ خاوەنی (دڵ و سۆزە) وەك لەوەی خاوەنی (ئاوەز و لۆژیك) بێت، هەر بۆیە خەلکی لەهەر ڕێبازێك ئەو شێوەیە وەردەگرن کە شوێنکەوتوانی ڕێبازەکە پەیرەوی لێدەکەن، ئەگەر شوێنکەوتەکان خراپ بوون، خەلکی وا گومان دەبەن کە ڕێبازەکەش خراپە، زۆربەی جاریش هەقیقەت لەسەر دەستی شوێنکەوتەکانیدا بەو هۆیەوە بزر دەبێ.

قورئان لەئامۆژگاری کردنی شوێنکەوتوە یەکەمینەکانی دا دەلێت: "لاتستوی الحسنة و لا السیئة، إدفع بالتي هی احسن، فاءذا الذي بینك و بینه عداوة کأنه ولیي حمیم"[٩]...

چەندە گونجاو و شیاوە گەنجەکان سود لەم ئامۆژگاریە وەربگرن کە قورئان سەدان ساڵ لەمەوبەر هێناویەتی.

## رونکردنەوەیەکی پێویست:

تکام وایە خوێنەر لەقسەکانم بەو جۆرە تێ نەگات کە مەبەستم گەنجەکانی پارتێکی دیاری کراوە، لەو پارتانەی کە لەم رۆژگارەماندا لە ململانێی یەکتر دان، ئەوەی من ئاماژەم پێداوە دەچەسپێت بە سەر زۆرێك لەگەنجە دلگەرمەکانی نێو هەموو پارتەکان و لەهەموو وڵاتێکیش دا، نەخاسمە لەم وڵاتە ئارامەی هێمەدا!

هەر حیزبێك بگری، گەر بواری سەرکەوتنی بۆ بڕەخسێ لەماوەیەکی مێژوویی دا، ئەوا گەنجەکانی هەمان ئەو کردەوەیە دەکەن کە گەنجەکانی حیزبێکی تر کردویانە.. ئەزمونی زۆرمان گوزەراند و، زۆربەی لاوەکانمان، لەهەموو پێڕو شێوە و ڕەنگەکان تاقی کردەوە، دیتمان لە ڕەفتاریاندا جیاوازیەکی ئەوتۆیان نیە، لەکاتێکدا دلگەرمی زۆریان بۆ دێنێ.

ئێستاکە من هەواڵی زنجیرەیەك دەست درێژی بێ پەردە دەبیستم کە باندەکانی گەنجان لە هەندێ ناوچەی (بەغدا) دا پێی هەڵدەستن، سواری دووچەرخە دەبن و بەدوی نێچیرێکدا وێڵ دەبن تاکو تێر وپڕی بکوتن، گەر هەلی تەواو بۆ ئەو کەسانە بڕەخسێ، هیچ دوودڵ نابن لەوەی دزێوترین کردار ئەنجام بدەن.

## سەرانی حیزبەکان:

سەرکردەی حیزبەکانیش لەم قۆناغە جەنجاڵەدا بەدەست گرفتێکی سەختەوە دەناڵێنن، ئێمەش ستەمیان لێ دەکەین لەکاتێکدا ئۆباڵی هەموو ئەو کردەوانە دەخەینە ئەستۆیان کە لایەنگر و شوێنکەوتەکانیان پێی هەڵدەستن. بەپێچەوانەوە هەقە خەفەتیان بۆ بخۆین (دەربڕینی وەرگێڕ) لەبری ئەوەی سەرزەنشتیان بکەین. هەمان ئەو گرفتەیان هەیە کە سەرانی ڕێباز و بیروباوەڕ و پارتەکانی بەر لەمان هەیانبوو، هەر کامیان بگری کەوتۆتە نێوان دووباری یەك لەوی دی تاڵ ترەوە: یان ئەوەتا جڵەو

شل دەكات بۆ شوێنكەوتەكانی و بەگوێرەی دلگەرمی خۆیان چی دەكەن بیكەن، یان ئەوەتا توند دەبێ لەگەڵیاندا بەو جۆرەش دلگەرمی یان نامێنێت و هێز و پێزیشیان لاواز دەبێت.

شیاوی گوتنە هەموو حیزبێك هێز وتوانای خۆی لەزۆری شوێنكەوتوەكانیەوە وەردەگرێ، بەڵام كاتێ شوێنكەوتەكانی زۆر دەبن خەڵكانی هەلپەرست و خوێنرێژ و ستەم كار خۆیان دەخزێننە نێوانیانەوە.. سەركردەی حیزبەكانیش بەو هۆیەوە دەكەوێتە نێو سەرسامیەكی ناتەندروستەوە.. ناشزانێت لەو دوو لایەنەدا كامیان وەربگرێت... ڕەنگە لادانێكی كەم بەلای هەر لایەكیاندا ببێتە هۆی پاشەكشەكردن و شكست هێنانی حیزبەكە.

هەلی ئەوەم بۆ ڕەخساوە كەلەگەڵ هەندێ لەسەركردەی حیزبەكانی لای خۆماندا بدوێم، هەستم دەكرد خاوەنی نەرم و نیانی و پیاوەتی و هەڤپەیڤینی هێمنی و تۆكمەن... یەكێك لەو سەركردانە باسی ئەوەی بۆ كردم كەچۆن هەوڵی داوە دلگەرمی نێو لایەنگرانی كەم بكاتەوە و ڕێنماییان بكات بەرەو ڕێگەی ڕاست و مام ناوەند بەڵام ئەوا گوێیان پێ نەداوە.. چیرۆكێكی دیكە هەیە و كەسانێكی زۆر دەیگێڕنەوە.. چیرۆكەكەش باس لەوە دەكات پیاوێكی ناوداری نێو حیزبێك، لەنێو ئاپۆرەیەك لەئەندامان و لایەنگرانی حیزبەكەی دا دەبێت، دەستی كردوۆتە هات و هاوار بۆ ئامۆژگاری كردنیان، ئەوانیش نایكەنە نامەردی (دەربڕینی وەرگێڕ) دەست دەكەن بە لێدانی تەنانەت خەریكە بیكوژن... ئەمەش كاتێ دیویانە قەوی و قۆڵ و گۆشتن بوە و وایان زانیوە دەرەبەگە یاخود یەكێكە لە بەكرێ گیراوانی ئیمپریالیزم.. ئەگەر بهاتبا و هەندێ لە هاوڕێكانی لەدەستی خەڵكەكە ڕزگاریان نەكردایە، ئەمڕۆكە لەژێرخاكدا شاردرابویەوە و خەڵكیش فاتیحایان بۆ دەخوێند (دەربڕینی وەرگێڕ) و حەسرەتبار بوون بەمردنی.

**كورتە بەرەنجامگیریەكی كۆمەڵایەتی:**

مێژوو باسی زۆرێك لەو بزاڤ و ڕاپەڕینە میللیيانەمان بۆ دەكات كە لەنێو نەتەوە جۆراوجۆرەكاندا لەكۆن و نوێ دا سەریان هەڵداوە، لەزۆرینەی ئەو ڕاپەڕینانەدا ئاژاوەچێتییەكی خراپ و دلگەرمییەكی ستەمگەرانە هەست پێ دەكەین.. وەلێ نابێ ئەو ڕاستییەمان لەیاد بچێت كە ئاژاوەگێڕی و دلگەرمی لەڕوی بەرەنجامەكانیانەوە بەگوێرەی سروشتی ئەو كۆمەلگەیە دەگۆڕێن كەتیای دا بەدەر دەكەون.

لەشۆڕشی فەرەنسیدا بینیمان چۆن قەنارە بەرپا دەكرا و بەلێشاو خەلكی تاوانبار و بێ تاوانی پێدا دەكرا، جەماوەریش لەدەوری قەنارەكاندا دادەنیشتن و بەقوربانیەكان پێ دەكەنین.

لەشۆڕشەكەی ئێمەدا قەنارە بەرپا نەكرا وەك لەشۆڕشی فەرەنسی دا بەرپاكرا، بەلكو گوریس و خنجەر و گالۆك و بتلی تێدا بەكار هێنرا، گەر ماوەی شۆڕشەكەمان زیاتر درێژەی بكێشایە، لەوانە بوو شتی وامان تێدا بدیبا كە جگە خودا كەس نازانێت ئەو شتانە چۆن دەبوون و هەروەها ڕوایەكان باسی ئەو ڕوداوانەمان بۆ دەكەن كە لەسەرەتای شۆڕشە مەزنەكەی (چین) دا ڕویان داوە، لەسالی (١٩٥١)دا، لە ولاتی چین بزاڤێكی كۆمەڵایەتی بەدەر كەوت بەزمانی چینی ناو نرا (سن فن وو فن)، مەبەست لەو بزاڤە پاككردنەوەی ولات بوو لە خیانەتكاران و گەندەلكارانی دەسگا و دامەزراوەكانی حوكم.. جاری وا هەبوو خەلكی لەدەوری یەكێك لە (گەنجینە)كان كۆ دەبونەوە ئەمە لەدوای ئەوەی حكومەت لە ڕوكاری دەرەوەی گەنجینەكەدا ئاگاداری یەكی هەڵدەواسی و تۆمەتێكی دەدایە پاڵ خاوەنی گەنجینە كە، لەوكاتەشدا خاوەنی گەنجینەكە هەستی بە سەرشۆڕی و ریسواییەكی زۆر دەكرد و لەبەردەمی خەلكەكەدا لەسەر زەوی و، گەر ڕەوانەی دادگاش بكرایە خەلكی ئاپۆرەیان لێ دەدا و سوكایەتیان پێ دەكرد و تەماتە و هێلكەی بۆگەن كردویان بۆ دەهاویشت.

خەلكی (چین) هەر چی بكەن دەرهەق بەو تۆمەتبارە، هێشتر ناوێرن بەقەمە هێرشی بكەنە سەر یاخود بەگوریس ڕای كێشن، ئەو پەڕی شتێ كە لەبەرانبەریدا

بیكەن ئەوەیە چاوەڕوان بكەن تاكو فەرمانی دادگای لەسەر دەردەچێت، لەدوایدا ئەوان داوا بكەن سزاكەی سەخت تر بكرێت یاخود لەسێدارە بدرێت.. زۆر جاریش كابرای تۆمەتبار كراو دان بەگوناهەكەی دادەنێت و پەژیوان دەبێتەوە و بەوجۆرەش بە بێ وەی دەگەڕێتەوە نێو ماڵی خۆی.

وادیارە خەڵكی (چین) كەلتورێكی كۆمەڵایەتی وایان هەیە كە ڕێیان لێدەگرێت لەوەی لەدلگەرمی شۆڕشگێڕیاندا بەئەندازەی ئێمە زیادەڕەوی بكەن... تەنانەت لەوانەیە دروست بێت بڵێین ئێمە هێندە زیادەڕەویمان كردوە لەدلگەرمی یەكەماندا، بەجۆرێ نمونەی لەهیچ جێگە و وڵاتێكی تردا نیە.

گوێم لێ بوو یەكێك لەگەنجەكانمان بەشانازیەوە دەیگوت: (گەلی عێراق لەناو هەموو گەلانیتردا ئەو تایبەتمەندیەی هەیە كە شێوازی سەركوت كردن و پێست كەنینی داهێناوە) نازانم ئەم گوتەیە چەندە ڕاستە، بەڵام لە قوڵایی دڵمەوە هیواخوازم ڕاست نەبێت، چونكە نەتەوەكانی ئەمڕۆ هۆكارگەلی جوداجودا دادەهێنن بۆ چونە سەر هەیف و مەریخ... ئێمەش شانازی بەداهێنانی شێوازی ئەشكەنجە و ئازاردانەوە دەكەین.

**لە پشتی حیزبەكانەوە:**

لەم رۆژگارەدا ململانێی حیزبی لای ئێمە توند بوە، هەر حیزبە و دژەكانی خۆی جنێوباران دەكات و توندڕەوی و تاوانكاریان دەداتە پاڵ، ڕاستی زانستیش لەنێوەندی ئەو ململانێ توندوتیژەدا وون بووە.

بەڕای من، ئێمە نابێ لەجنێودانە حیزبەكانماندا زۆر بڕۆین، بەجۆرێ ئەو باگگراوندە لەیاد بكەین كە لەپشتی حیزبەكانەوەیە و خۆی لەسروشتی كۆمەڵایەتی دا دەبینێتەوە.. ئەو حیزبەی كردەوە ترسناكەكان دەداتە پاڵ دژەكانی، بیر لەوە ناكاتەوە كە خۆیشی هەمان ئەو كارانە دەكات، یاخود بەلایەنی كەمەوە بەشێك لەو كارانە دەكات، ئەمە گەر بێت و هەلی لەباری بۆ بڕەخسێت ـ ئەمیش لەو كۆمەڵگەیەدا دەژی كە دژەكانی تێیدا دەژین. كەواتە ئەمیش دوچاری هەمان ئەو نەخۆشیانە بوە كە ئەوان توشی بون.

بۆ نمونە سەرنجی ئەو کردەوە ترسناکانە بدە کە لە (کەرکوك) ڕوياندا.. لای هەندێکمان ئەو ڕوداوانە وەکو (کراسەکەی عوسمان)یان لێ هاتووە، ئەوەتا هەندێك لەبەها و قورساييەکەی کەم دەکەنەوە ياخود لەئاستی دا چاو دادەخەن، کەچی هەندێکیتر زیادەڕەوی تێدا دەکەن و، لە گێڕانەوەیدا ترش و خوێ پێدا دەکەن (دەربڕينی وەرگێڕ). هەر هەموشيان لەگۆشەنيگای حيزبی تەسکەوە سەيری دەکەن و ئەو ڕوکارە کۆمەڵايەتيەی تێيدايە پشت گوێ دەخەن.. تەنانەت لەوانەيە هەندێکیتر هەمان ڕێگەی پێشينان بگرنە بەر، ئەوەندەی بۆ دەربڕينی ڕق لە عەلی بەسەر کراسەکەدا دەگريان، بۆ دەربڕينی خۆشەويستی معاويە نەبوو.

نابێت نکولی لەو کردەوە ترسناکانە بکەين کە لە (کەرکوك) و شوێنەکانی ديکە دا ڕوياندداوە، کە بەڕاستی، کردەوە گەلێکی دڕندانە بوون و هەر مرۆڤی هەست بەکەرامەتی خۆی بکات ناتوانی خۆی لێ بێئاگا بکات. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ هەموو ئۆباڵەکەی بدەينە لای فلان يان فيسارە حيزب.. ئەو کەسانەی کردەوەکانيان ئەنجامدا، گەنج و دلگەرمەکان بوون، بەر لە هەر شتێکی تريش عێراقی بوون، من بەدوری نازانم لەگەڵ ئاواز هەڵبڕينی هەر بانگ دەرێ يان لەگەڵ هەڵکردنی هەر بايەکدا هەمان کردەوە دووبارە بکەنەوە.

گرفتەکە، گرفتی حيزب نيە، بەئەندازەی ئەوەی کێشەی کۆمەڵگەيەکی ناساغ و ناتەندروستی وايە کەچەندين پەتا ونەخۆشين وەچە لەدوای وەچە ڕويان تێکردوە. بۆيە لەکاتێکدا ئەم ڕاستيیە فەرامۆش دەکەين، يارمەتی دەر بين تاکو جار لەدوای جار ئەو ڕوداوانە لەوڵاتەکەماندا دووبارە و چەند پات ببنەوە.

دەڵێن: دەستی بيانی لەپشتی قەسابخانەکانی کەرکوکەوە بوون. ئەم گوتەيەش ڕاستە، بەڵگە گاڵتەپێنەکراو لەبەردەست دان کە پشتگيری ئەو قسەيە دەکەن. سەرباری ئەوەش لەکاتێکدا دان بەو ڕاستيیە دادەنێين، پێويستە دان بەو ڕاستيیەشدا بنێين کە دەستی بيانی کاتێ کاريگەری لەسەر کۆمەڵگەيەك دادەنێت کە بواری دەست تێوەردان و کاريگەری دانانی هەبێ... ئەو پڕيشکەی ئاهر دەنێرێتە سەر خەڵکی، جا ئەگەر لەنێو خەڵکی دا بوارێ نەبێ بۆ ئاگرگەوتنەوە، ئەوا پڕيشکەکان دەست بەجێ خامۆش دەبن.

## سروشتی گەلان:

ئەگەر هەر کەسێك خاوەنی کەسێتی تایبەتی خۆی بێت و لەکەسانی دیکە جیاواز بێت، ئەوا هەر گەلێکیش لەجیهاندا، سروشتی تایبەتی یاخود مۆرکێکی هەیە کە لەسەرجەم گەلانی دیکە جیاوازترە و پێی دەناسرێتەوە. هەر چەندە گەل، هەر گەلێ، لەهەندێ خەسڵەتی دا باش و رێك وپێك بێت، ئەوا لەخەسڵەتگەلێکی دیکەی دا خراپ و دزێو دەبێ. لەدنیادا گەلێکی کامڵ بونی بەمەرەدی ئەوەی مرۆڤی بێگوناه بوونی نیە.

لەوانەیە هەندێ گەنجی دلگەرممان ئەم قسەیان پێ هەرس نەکرێ، چونکە لەم رۆژگارەدا هەستیاریەکی زۆریان لەمەڕ گەلان بۆ دروست بوە، دەشیانەوێت ئێمە کاتێ باسی گەلان بەگشتی و گەلی عێراق بەتایبەتی دەکەین، بەرز و پیرۆزی ڕاگرین و هەموو چاکە وڕەفتارێکی بڵندی مرۆڤانەیە بیدەینە پاڵی.

ساڵی (١٩٥١) نامیلکەیەکم بڵاو کردەوە، ناوم نا (کەسێتی تاکی عێراقی)، لەو نامیلکەیەدا گوتومە خەڵکی عێراقی خاوەنی کەسێتی‌یەکی دوو جەمسەرن.. کەچی ئەم قسەیە روداوێکی کۆمێدی ئاوقە کردم، ڕوداوەکەش ئەوە بوو کە یەك رۆژ لەدوای هەڵایسانی شۆڕش یەکێك لەگەنجە دڵ گەرمەکانم بینی کە پێشتر هاوڕێی زۆر نزیکم بوو، کەچی لەو رۆژەدا بینیم مۆنە و حەز ناکات لەگەڵمدا بدوێ، دواتر بۆم ڕون بویەوە کە ڕاستەوخۆ لەدوای ڕودانی شۆڕش ئەو برادەرەم رقی لەمن هەڵگرتوە.. ئەم بڕوایەشم کاتێ لا دروست بوو کە سەرنجم دا لۆمەم دەکات ولێم دەپرسێ: (چۆن دەگونجێت ئەم گەلە کەسێتی‌یەکی دوو جەمسەری هەبێت، ها؟) لەوکاتەدا نەمدەزانی چۆنی (تێ بگەیەنم - وەرگێڕ) بۆیە بەناچاری داوای لێبوردنم لێکردو گوتم: "من تاوانم دەرهەق ئەم گەلە مەزنە کردوە، بۆیە داوای لێبوردن لەخودا دەکەم و پەشیمان دەبمەوە".

نکولی ناکەم لەو ڕاستی‌یەی کە ئەو گەنجەو هاوشێوەکانی دڵسۆزن لەو گوفتارو ڕەفتارەیاندا. زۆریش دلگەرمن بۆ پشتگیری کردنی شۆڕش.. جگە لەوەش شۆڕشەکە بەلای هەموانەوە ئازیزە و پێویستە هەرچی دەتوانین لەپێناویدا بیکەین.. سەرباری

ئەوەش، کاتێ پشتگیری ئەو دلگەرمیەی لاوەکان دەکەین، ناتوانین لەگەڵیاندا بڕۆین تا ئەو ڕادەیەی ئەرکی زانستی خۆمان لەهەمبەر شۆڕشەکەدا ون دەکەین.

بەڕاستی شۆڕشەکە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زانستی هەیە، وەك چۆن پێویستی بەپشتگیری دلگەرمانە هەیە.. بێگومان لەهەر شۆڕشێکدا، گەنجەکان ئەرکێکی زۆریان لەسەر شانە.. چونکە ئەمان دەبنە سوتەمەنی بزاوت و ژیلەمۆی هەلایسانی شۆڕش (دەربڕینی وەرگێڕ).. هەر شۆڕشێکیش بگری، پێویستی بەسوتەمەنی هەیە تاکو بتوانێ ڕێ بکات، بەو جۆرەی (کەشتی هەڵمی) پێویستی پێیەتی، وەلێ ئەوەندە هەیە (کەشتی) پێویستی بە کەشتیەوانی دانا وشارەزا هەیە بۆ وەی سوتەمەنیەکە بکاتە شوێنی گونجاویەوە و پاشان ئاراستەی بکات بەرەو ئامانج، دەنا لە جوڵەی بێبەرنامە دا بەرەو لەناوچون مل دەنێ.[10]

گەلی عێراق: داوا دەکەین لەگەنجەکانمان بەر لەوەی دلگەرم بن بۆ گەلەکەیان، پێشەکی لەسروشتی ئەو گەلە بکۆڵنەوە، چونکە پێدەچێت دلگەرمی زۆر لەهەموو گەلانی دیکە پتر، زیان بەخش بێت بۆ ئەم گەلە.

گەلی عێراق ماوەیەکی دوور و درێژە لەژێر کۆلی قورسی بارودۆخی ئابوری و ڕامیاری ستەمکارانە دا ژیاوە، بەئارامگریەکی زۆر سەرسوڕهێنەوە چوەتە ژێر باری ستەمەوە، هەر چۆن بێت، سەردەمی عوسمانی یان مەغۆلی و تەتەریش لەسەردەمی ڕابردوو باشتر نەبوون.. ئەمەش یانی: خەلکی عێراق لەو ماوە شۆمانەدا لەگەڵ ئاکار و ڕەوشتێکدا ڕاهاتووە، کە بەخێرایی لەدوای هەلایسانی شۆڕش، ئاسان نیە بۆی دەست بەردار بێت لەو ڕەوشت و ئاکارانە.

لەلایەکی دیکەشەوە خەلکی عێراق لەگەڵ ئاکارێکی دیکەش دا ڕاهاتوە کە لە بیابانەوە بۆی هاوردە کراوە.. ئەم ئاکارەش، وەك ئاشکرایە، لەڕوی هۆکار و بەرەنجامە کۆمەلایەتیەکانەوە لەو ئاکارە جیاوازە کە لەژێر قامچی یاساوڵەکاندا بۆی دروست بوە.

لەوانەیە زیادەڕەویم نەکردبێ لەو بەرەنجامگیریەمدا کە بڵێم، تاکی عێراقی، بە شێوەیەکی گشتی هەلگری دوو کەسێتیە، لەکەسێتیەکیانی دا دەشتەکی و زۆر تورەیە،

وەلێ لەکەسێتی دووەمیدا شارستانی‌یەکی مل کەچە و سکاڵاکەر و گازندەکارە لە دەست زەمانە. بەگوێرەی بارودۆخیش یەك لەو دوو کەسێتی‌یە لەخۆیدا نمایش دەکات.

ڕاستی ئەم قسەیە لەو کەسە نەخوێندەوارەکاندا دەبینین، بەتایبەت لەکاتێکدا یەکێکیان ئارەق دەخواتەوە و سروشتی شاردراوەی نێو قوڵاییەکانی ناخی دەردەخات.. ئەوێ دەمێ دەست دەکات بە سکاڵا و هات و هاوار و ڕەنگە لەپرمەی گریانیش بدات. بەڵام هەر ئەوەندەی بینی خەڵکی سوکایەتی پێ دەکەن، ئەوا بەیەکجاری دەبێتە شێرێکی دڕندە و قەمەکەی هەڵدەکێشێت و پەلاماری دەوروبەری دەدا.

هەر ئەو کەسە ناسڵەمێتەوە لەوەی لەژیانی (ئاسایی)شدا، هەندێ جار بەو جۆرە بجوڵێتەوە.. لەبەرانبەر قامچی یاساوڵەکاندا پەنا دەباتە بەر سکاڵا لەقاپی خودادا.. ئنجا هەر کە کەمێك رۆشتە ئەولاتر و کەسێکی لەخۆی لاوازتری بینی، ئەوا بەسەریەوە دەبێتە (یاساوڵ) و لەو دەمەشدا خواوەندی بەخشندەی خۆی لەبیر دەکات!

بەدەربڕینێکی کورت: هەندێ جار ڕەفتاری دەشتەکیەکەی زاڵ دەست دەکات و هەندێ جاری دیکەش ڕەفتاری شارنشینێکی ژێردەستە. وا دیارە لە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژەوە ئەم دوو جەمسەرێتی‌یەی وەرگرتوە، تا ئەوەتا لە لای بوەتە نەریتێکی کۆمەڵایەتی کە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە.[11]

## هەڵاوێردکاریەك:

مەبەستم لەوە نیە بڵێم هەموو گەلی عێراق لەهەمان مۆدیلی ئەو کابرا نەخوێندەوارە نەفامەن. گەلی عێراق کۆمەڵێ چاکە و ڕەفتاری جوانی هەیە کە نکولی لێ کردنی ئاسان نیە بۆمان، وەك هەموو گەلانی تر کە هەم چاکەیان هەیە و هەم خراپە.

تەنها گەرەکمە سەرنجی هەموان رابکێشم بۆ لای بوونی کەسانێك لەنێوماندا کە بەڕوونی لە ئاکاریاندا ئەو توراسە دو جەمسەریە ڕەنگ دەداتەوە، و لە قوڵاییەکانی ناخیاندا سەرەڕۆیی دەشتەکیەك و مل کەچی شارنشینێك هەڵدەگرن. ئەمانەن کە لە لای ئێمە گرۆی ئاژاوەگێڕان پێکدێنن. نەخاسمە لەدوای هەڵایسانی شۆڕشەوە. ئەو پێرە

لەهەمووان زیاتر توند وتیژ بوون و تەرمی مردوانیان دەشێواند، لەکاتێکدا پێشتر لەهەموو خەڵکی زیاتر مل کەچ بوون و بەسەر مردووان دا دەگریان.

رۆژێکیان ئاپۆرایەکی جەماوەری بەرفراوانم بینی، بەشەقامەکانی (بەغدا)دا دەهاتن و دەچون و هوتافیان بۆ ئاشتی دەکێشا و بۆ ئاشتەوایی دەتوانەوە (دەربڕینی وەرگێڕ). بەڵام لەهەمان کاتدا گوریسیان هەڵگرتبوو بۆ هەڕەشەکردن لەو کەسانەی مل نادەن بە بانگەشە ئاشتیخوازەکانیان.. ئاشتی و ئاشتەوایی شایستەی ئەوەیە هەر مرۆڤێ بانگەشەی بۆ بکات کە گەردیلەیە بەزەیی لە دڵی دابێت، چونکە لە پاکیزەترین هەستی مرۆڤ و نمونە باڵاکانیەوە هەڵدەقوڵێ، بۆیە پێویستە بانگەشەکارانی شێوازی نەرم و هێمنانە بگرنە بەر. کەچی دیتمان لەعێراق دا، توندڕەوبون لە ئاشتی خوازیش دا، بەجۆرێ هەر کەس لێی بنواڕیبان پێی وابوو بانگەشەکاری (جەنگ)ن، نەك (ئاشتی).

لەدوای شۆڕش کۆمەڵێ ڕوداو وبەسەرهاتی دیکەم کۆکردۆتەوە، سەرجەمیشیان بەلگەن لەسەر ڕادەی ئەو دوو جەمسەریەی بەناخی هەندێکمان دار ڕۆچوە، بەڵام من بانگەشەی ئەوە ناکەم کە ئەو ڕایەی پێی گەشتوم لەئەنجامی شیتەڵ کردن شرۆڤە کردنی ئەو (دوو جەمسەرێتی)یەدا ڕاست و دروستە، بگرە لەوانەیە بەهەڵەشدا چوبم. هەر چۆن بێت هەوڵێکی سەرەتاییە، لەوانەیە ڕاست بێ و لەوانەشە هەڵە بێ.. لەم ڕوەشەوە هەڵەکردن ڕێگەی بەرەو (ڕاستی) چوونە!

### ڕەخنەیەکی بەجێ:

لەوانەیە کەسێك پێم بڵێت: ئەو شێوازەی تۆ گرتۆتە بەر لەگەڕان وەدوی ناتەواویەکانی گەلەکەماندا، لەم قۆناغە کۆمەڵایەتی‌یەدا کە پێیدا گوزەر دەکەین زیان لەگەلەکەمان دەدات. چونکە هەر گەلێ چاو داچەقێنێ بەسەر ناتەواویەکانی دا، متمانەی بەخۆی لاواز دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی لاواز بوونی هێز و پێزی گەل لەبەرانبەر دوژمنەکانیدا.

ئەم قسەیە ڕاستە، هەر ئەمەشە وای لێکردووم لەسەردەمی کۆمارە گەشەکردوەکەماندا واز لە نوسین بێنم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم: زیادە

ۆزچون لەشوێن کەوتنی ئەم ڕایەشدا، دووبارە زیان بەخشە بۆ گەل.. چونکە ئەگەر ـەڕان بەدوی ناتەواویەکاندا متمانەی گەل بەخۆی لاواز بکات، پەردەپۆشکردنی اتەواویەکانیش لە ڕویەکیترەوە گەل لاواز دەکات، چونکە پاڵی پێوە دەنێت بەرەو ـتەمکاری و دلگەرمی زیاد لەپێویست. ئەو گەلەی ناتەواویەکانی خۆی نەزانێت و پەی ـەبات بە خاڵە لاوازەکانی ئاسان نیە بۆی لەبەرانبەر دوژمنەکانی دا بەهێز وتوانا بێت. ۆژمنی ناوخۆ، هەندێ جار لەو دوژمنە مەترسیدارترە کە لەدەرەوە خۆی مەڵاس داوە.

ئێمە ئەگەر دامان بەگوێی گەل دا، کە گەلێکی تۆکمە و تەواوە و ئەویش بڕوای کرد ـەو قسەیە، ئەمە دەبێتە هۆی لە خۆبایی بوونی، لەوانەشە بەهۆی ئەو لەخۆبایی ونەیەوە بە ئاقارێکدا بڕوات کە بەسودی دوژمنان بشکێتەوە، یان کەلێنێکیان لە یزەکانی خۆی دا بۆ بکاتەوە کە لێیەوە بتوانن جارێکی دیکە بێنەوە سەری و دەست ڕێژی بکەنە سەر.

## هەڵەیەکی بەربڵاو:

هەندێ لەبیرمەندەکانمان پێیان وایە پێویست ناکات لەناتەواویەکانی گەلەکەمان کۆڵینەوە، چونکە لەدیدی واندا ئەو ناتەواویانە لە بارودۆخ و کەش و هەوایەکی ەسەرچودا دروست بوگن، هەر گا ئەو بارودۆخانە گۆڕان دەست بەجێ ناتەواویەکانی ـەلیش لەتەکیدا دەڕۆن، و هیچ گرفتێ لەئارا دا نامێنێ.

ئەم ڕایەی لەساڵانی ڕابردوودا شوێنکەوتوانێکی زۆری هەبوو، کە دەمارگیری بون و ەدلگەرمیەکی سەختەوە بەرەڤانیان لێ دەکرد، وەلێ بەم دواییانە شوێنکەوتەکانی ێدی هێدی لە کەمی دەدەن، بەتایبەت پاش ئەوەی توێژینەوە کۆمەڵایەتیە نوێ کان وچەڵی و ناڕاستی بۆچونەکەیانی سەلماند.[١٢]

هەندێ خلتەی فیکری و کۆمەڵایەتی هەن کە لە ماوەی چەندین وەچەدا بە ولاییەکانی دەرونمانەوە نیشتون، بۆیە ناگونجێت تەنها بەگۆڕانی سیستەمی ئابوری و امیاریمان دەست بەجێ ئەو خلتەنیشتوانە لەناو بچن.. چونکە بەڵخێ نیە لە ڕۆژێکدا روست بوبێ تا لەڕۆژی دوەمدا ئاسەواری نەهێڵدرێ.. بەڵکو بەهێزترین گومان ئەوەیە

کە تا ماوەیەکی دور ودرێژ کاریگەر دەبێت لەسەر ڕەفتار وئاکارمان.. تەنانەت لەوانەشە ببێتە کۆڵەکەی هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت گۆبەنگ بۆ ڕژێمە تازەکەمان بنێنەوە. ئێمە پێویستمان بە شۆڕشی فیکری و سۆسیۆلۆژی هەیە، وەك چۆن ئاتاجمان بەشۆڕشی رامیاری و ئابوری هەیە.. بۆیە ئێمە چاوەڕوانی ئەوە ناکەین لە شۆڕشەکەمان کە بەڕێبازی ڕێکی خۆیدا بڕوات، ئەگەر نەتوانین ڕێنمایی گەل بکەین بۆ ئەو خڵتە نیشتوانەی نێو (ئاوەزی ناوەکی)یان، کە دەخزێنە نێو قەوارەی کۆمەلایەتیان و ژیانیان لێ پڕدەکات لە کۆسپ و لەمپەر.

**شالیارێکی شۆڕشگێڕ:**

یەکێك لەوەزیرەکانی (مەعاریف) لەسەردەمی شۆڕشدا بانگهێشتی مامۆستاکانی کرد بۆوەی لە نوسینگەی خۆی دا لەدیوانی وەزارەت کۆبونەوەی لەگەڵدا گرێ بدەن. مەبەست لەو کۆبونەوەیە ئەوە بوو، شۆڕشەکەمان وەك چۆن شۆڕشێکی رامیاری و کۆمەلایەتیە ئاوها شۆڕشێکی فیکری و کۆمەلایەتیش بێت.. وەزیرەکە داوای لە ئامادەبوان کرد ڕۆڵی خۆیان لەو ڕوەوە بگێڕن.

وەزیرەکە بیرۆکەیەکی مەزنی پێ بوو، ئامادەبوان پێی سەرسام بوون و بەڵێنیان دا هاوکاری بکەن و پشتگیری بن، منیش یەکێك بووم لە ئامادەبوان، منیش وەك هاوڕێکانی دیکەم بەڵێنی هاوکاریم دا بەوەزیر، بەلام زۆر بەداخەوە! دواتر بەڵێنەکەمم شکاند و لێی پاشگەز بومەوە.

لێرەشدا ئەو قسەیە دووبارە دەکەمەوە کە پێشتر کردومە: ئێستاکە ئێمە پێویستمان بە جۆرە نوسەرێکیترە، جیاواز لەو شێوە نوسەرانەی جەنابی وەزیر گەرەکیەتی. کاتەکە، کاتی ئەو نوسەرەیە کە بەشێوازی توند وپاراو بەرەو کامڵ و تۆکمەکردنی کۆمارەکە دەچێت، نەك کاتی ئەو نوسەرە (سارد)ەی کە لەسەر گردۆلکەیەك ڕادەوستێ و بەدوی هەڵە و ناتەواویەکاندا دەگەڕێت و لەم ڕوەشەوە جارێ ڕاستی دەپێکێ و چەندین جاری دیکەش هەڵە دەکات.

**عەبدولکەریم قاسم:**

بەرلەوەی کۆتایی بەم (وتەی ماڵئاوایی)ە بهێنم، دەخوازم ئاماژە بکەم بۆ هەڵوێستی پێشەوا (عەبدولکەریم قاسم) لەم قۆناغە کۆمەڵایەتیە گرنگەی مێژووەکەماندا.. ئەو پیاوە پتر لەجارێك ڕای گەیاندوە کە لەسەروی ئارەزوو ڕەوتەکانەوەیە. بڕوام وایە لەو قسەیەدا ڕاستگۆیە. لەگەڵ ئەوەشدا من ناتوانم ئەو هەڵوێستەی بەوە بژمێرم کە خاڵیە لە وردبینی و قەڵس بوون.

ئەو سەرکردەی پارت نیە، بەڵکو سەرکردەی وڵاتێکە تیایدا پارتەکان ململانێی یەکدی دەکەن. بەم پێودانگە پتر لە هەر سەرکردەیەکی دیکەی حیزبی ڕووبەڕوی سەراسیمەبون دەبێتەوە.. هەر چەندە بیر لە قەڵسی هەڵوێستی ئەو کابرایە دەکەمەوە هەست بەو قورساییە زۆرە دەکەم کە کەوتۆتە سەر شانی ـ خودا یارمەتی بدا!

لەلایەکەوە ناتوانێ گرنگی دڵگەرمی میللی لە پشتگیری کردنی شۆڕشدا فەرامۆش بکات، ئەو شۆڕشەی دوژمنانی لەسەر زۆر بوون، هەروەها ناشتوانێ لەگەڵ ئەو دڵگەرمیە دا ڕێ بکات تا ئەو ڕادەیەی دەمارگیرەکان دەیانهەوێ..

لە لایەك وڵاتێکی لەبەردەستدایە کە پێویستی بەسەقامیگرییە، لەو لاشەوە شۆڕشێکی هەیە کە پێویستی بە پشتیوانیە، بۆیە ئەو کابرایە پێویستە جارێك بەم لادا بنواڕێ و جارێك سەرنج لەو لا بدات.

من بۆخۆم هەست بەدەستەوسانی دەکەم لە ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی پۆلێکی قوتابیاندا لەکاتێکدا دەمبەدمە و ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئیدی ئەبێ حاڵی ئەو پیاوە چۆن بێ کە شۆڕشێکی گەورەی وەك شۆڕشی (١٤ی تموز) بەڕێوە دەبات لەکۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی عێراقی دا.

هەر چۆن بێت، پێویستە سەرمان دانەوێنین بۆ دان نان بە لێهاتوویی ئەو کابرایەدا، لەسەرکردایەتی کردنی کەشتی ئەم وڵاتەدا لەنێو ئەو هەموو شەپۆلە سەرشێتەدا.

## پەراوێزەكانی وتەی ماڵئاوایی:

١. بنواڕە: الاستعمار اعلى مراحل الرأسمالية، ل ٥ ـ ٦.

٢. بنواڕە: Veblen, Theory of Leisure Class

٣. لەنێو بازرگانەكاندا چەند برایەك دەناسم كە لەشەقامی ڕەشید كۆگایەكی گەورەیان هەیە و، لە هەموو كەس زیاتر لە بازرگانیەكەیاندا سەركەوتنێكی گەورەیان بەدەست هێنا، لەم سەركەوتنەشیاندا پەنایان بردوە بەر خۆنزیك كردنەوە و ماستاوچێتی بۆ دەستەڵات دارانی دەوڵەت و وەزیرەكان، بەرتیل یان پێ دەدان و كاڵای گرانبەهاشیان بەنرخی هەرزان پێ دەدان.. ئێمەش ئاواتە خوازین ئەو كەسانەو هاوشێوەكانیان ڕیسوا ببن لەدوای واژگون بونی ئەو سەردەمە ستەمكارە قێزەونە.

٤. بنواڕە: محمد عبدة، نهج البلاغة، ج٢، ل ١٩٨.

٥. لەنێو ڕۆشنبیریی میللی و شۆڕشگێری كوردیش دا ئەو چینەی مامۆستا علی الوردی بە (ئاژاوەچی یان غەوغا) ناویان دەبات، پانتاییەكیان داگیر كردوە، لە ساتەوەختەكانی ڕاپەڕینەكەی گەلی كوردستان دا ئەو چینە بە ڕونی بەدەر كەوتن و دەستیان كردە تاڵان وبڕۆ لە پەنای ڕاپەڕین و قین و تۆڵەی بەرینی خەڵكی ستەمدیدەدا خزمەتی بەرژەوەندیەكانی خۆیان دەكرد، لەئەدەبیاتی كوردی دا ئەو چینە بە (فەرهودچییەكان) ناوزەد كران. وەرگێڕ.

٦. بنواڕە: Young, Social Psychology, P 397

٧. بنواڕە: علي الوردي، خوارق اللاشعور، ج١، ل ٢٧٢ ـ ٢٧٣.

٨. بنواڕە: ماركس و انجلز، البيان الشيوعي، ل ٢٨.

٩. بنواڕە: القرآن الكريم، سورة السجرة، آيه ٢٤.

١٠. دەمەوێ ئەم هەلە بقۆزمەوە و ستایش و سوپاسی قوتابیەكانم بكەم لە كۆلێژە جیاجیاكاندا... لە زۆرێك لەو قوتابیانە هەستم بە ڕۆحی زانستی و ئارەزووی جەدەلی

زانستی کردوە. گەر ئەو نەبوایە ناچار دەبوم واز لە (تەدریس)یش بێنم، وەك چۆن ناچار بوم واز لە نوسین و دانان بێنم.

١١ـ هەندێ لەمامۆستایان ڕەخنەیان هەبوو لە واژەی (کەسێتی دوو جەمسەر) کە وەسفی خەڵکی عێراقم پێ کردوە، بەلایانەوە واژەیەکی زانستی نیە، من تکام وایە لەو مامۆستا بەڕێزانە لە ڕوی وێناکردنی واقعی حاڵەوە سەرنج لەو واژەیە بدەن، نەك لەڕوی دەربڕینەوە، بەلای منەوە ڕاستی واتا گرنگترە لە (لفظ).

١٢ـ بنوارە: ابراهیم کبە، نظرة سریعە في تطور النظام الاقتصادي، ل٩.. وە بنوارە: ماوتسی تونگ، حول التناقض، ل ٤٥ ـ ٤٦.

# زنجیرەی بڵاوکراوەکانی ( خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما )

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هونەری هاوڕێگرتن /چاپی یەکەم | دەروونزانی | دیل کارنجی | عدنان سجادی | ٢٠٠٤ |
| ٢ | عەشقێکی شووم /چاپی یەکەم | ڕۆمان | طیبە ی تشکینی | فواد کەوڵۆسی | ٢٠٠٤ |
| ٣ | ڕێبەری کابان /چاپی یەکەم | دروستکردنی خۆراك | دستەیەك | محمد وەسمان | ٢٠٠٥ |
| ٤ | خۆشەویستی قۆناغەکان و پەرە پێدانی / چاپی یەکەم | دەروونزانی کۆمەڵایەتی | ناصرجرجیس | کەمال عەلی | ٢٠٠٥ |
| ٥ | حەوتتایبە تمەندیکەسە سەر کەوتووەکان / چاپی یەکەم | دەروونزانی | ستیڤن.ڕ. کویی | عمران هاواری | ٢٠٠٥ |
| ٦ | کەسێتی خۆت بناسە /چاپی یەکەم | دەروونزانی | سهام ابوروس | دیاری عەلی | ٢٠٠٥ |
| ٧ | من و میکانیزمەکانی بەرگری / چاپی یەکەم | دەروونزانی | انا فروید | هەژار جوانڕۆیی | ٢٠٠٥ |
| ٨ | دەروونزانی ورفتار /چاپی یەکەم | دەروونزانی | فرانك .س . کابریز | سۆران خورماڵی | ٢٠٠٥ |
| ٩ | یانەی دڵان / چاپی دووەم | شیعر | حەمە عەلی مەدهۆش | ................ | ٢٠٠٥ |
| ١٠ | ڕەخنە لە بەختیار عەلی / چاپی یەکەم | ڕەخنە و لێکۆڵینەوە | تەمانەحمەدڕەسول و حەمەئەحمەدڕەسول | ................ | ٢٠٠٥ |
| ١١ | خەونەکان لەنێوان زانست و بیروباوەڕدا /یەکەم چاپی | لێکۆڵینەوە | د.عەلی وەردی | عەبدوڵا جەبار | ٢٠٠٥ |

**Xeunekan**

**Le Newan Zanistu Biru Bawerda**

بەشەکانی ئەم پەرتوکە:
لەسەرەتای ئەم پێشەکیەدا وئاماژەم کرد بۆ ئەوەی ئەم پەرتوکە کراوەتە سێ بەش.. شیاوی گوتنە مەبەستی یەکەمینی دانانی ئەم پەرتوکە لەبەشی یەکەمیدا قەتیس دەبێت ، چونکە لەم بەشەدا لەرووی کۆمەڵایەتییەوە تاوو توێی خەون دەکەین . بەڵام دوای ئەوەی دەستم بەتاڵ بوو لەنووسینی ئەم بەشە هەستم کرد ، بابەتەکە ناتەواو دەردەچێت ، ئەگەر هاتوو توێژینەوەیەکی لەمەڕ بیردۆزو بۆچوونەکانی تایبەت بە خەون ، بەدوادا دەنوسرێت...
ئەم بیردۆزو رایانەش دابەش دەبن بۆ دووبەش.. لقێکیان لە خەون دەکۆڵێتەوەو لە ژێر رووناکی ( زانستی شیکردنەوەی دەروونی ) دا ، لقەکەی دیکەشیان لەخەون دەکۆڵێتەوە لە ژێر رووناکی زانستێکی نوێدا . کە هەنوکە ناونراوە ( زانستی پاراسایکۆلۆژی ).. لەبەر ئەوە لە بەشی دووەمدا هەوڵمداوە بیردۆزەدەرونیەکانی تایبەت بەخەون کورت بکەمەوە . پاشان لەبەشی سێیەمدا هەوڵم داوە بیر دۆزە پاراسایکۆلۆژیەکان کورت بکەمەوە .

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣

نرخی ( ٦٠٠٠ ) دینار